محوی، محمد، ۱۸۳۷ _ ۱۹۰۹.
دیوانی مەحوی/مەلا موحەممەدی کوری مەلا عوثمـان بـالخی. لیکدانـەوە و لیکولینـەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس. محمدی مەلا کەریم. ـ سنندج انتشارات کردستان، ۱۳۸۱.
سی و دو، ۵۹۷ص.
ISBN: 964 - 7638 - 18 - 3 ۸۰۰۰۰ ریال
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کردی.
چاپ سوم.
۱. شعر کردی ـ ـ عراق ـ ـ قرن ۱۹. الف. مدرس، عبدالکریم، ۱۲۸۳ ـ، شارح. ب. ملا کریم، محمد، شارح. ج. عنوان.
۸فا۹/۲۱ PIR ۳۲۵۶ / ۷۴۳م۳س
۱۳۷۹ د۳۶۹م
۱۳۷۹
کتابخانه ملی ایران ۱۲۹۸۷ ـ ۷۹م

# دیوانی مەحوی

«مەلا موحەممەدی کوڕی مەلا عوسمانی باڵخی»

لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی:

**مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و موحەممەدی مەلا کەریم**



انتشارات کردستان

سنه - ۱۳۸۷



انتشارات کردستان

Kurdistan Publication

سنە - پاساژی عیززەتی - تەلەفوون - ۲۲۶۵۳۸۲

---

# دیوانی مەحوی



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | دیوانی مەحوی |
| ✓ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی (شرح و تحقیق): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | پێنجەم (پنجم)؛ ۱۳۸۷ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۵۰۰۰ دانە (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۶۴۸ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

شابک: ۶-۰۱۹-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸
ISBN: 978 -964 - 980 - 019 - 6

نرخی:
۸۰۰۰ تمەنە

## مەحوی پێشەنگی هۆنەرانی خوداناس

وەك ئاشكرایە دەورانی زێڕینی شیعر و ئەدەبی كوردی ـكە دەگەڕێتەوە بۆ یەك دوو سەدە لەمەوبەر، چ لە كوردستانی رۆژهەڵاتدا لە زەمانی ئەردەڵانییەكان و چ لە كوردستانی باشووردا لە زەمانی حكوومەتی بەبەكان و چەند دەهە دوای ئەوان ـ تەمەنێكی زۆر كورتی بووە، بەڵام كاریگەرییەكی ئەوتۆی بووە كە ئەمڕۆ بە راشكاوی ئەتوانین بڵێن ئەدەبیاتی كوردی دەوڵەمەند كردووە. گەورە ئەدیبانێكی وەك نالی و سالم و كوردی و وەفایی و مەستوورە و مەهجووری و مەولەوی و حاجی قادر و... پەلكەزێڕینەیەكن لە ئاسمانی ئەدەبی كوردەواری و خاڵی یادانەوەن لە مێژووی ئەدەبی كورددا.

بەتایبەت ئەم پیرە رووناك زەمیرەی وتە پڕ تەئسیرەی زاخاو دیتووە لە كوورەی هەڵگیرساو بە دەمەی سۆزی تەریقەتە، ئەم شارەزا لە شارێگەی شەریعەتە، ئەم رێبردووە لە بازاڕی حەقیقەتە، ئەم سەرمەستە جام بە دەستەی هۆشیاری رۆژی ئەلەستە، ئەم پەروانە بێپەروا لە سووتانەی شەیدای عیرفان و زانستە، ئەم مۆمە هەڵگیرساوەی ئەنجومەنی شیعر و هەڵبەستە، كە سەوداگەرێكە لە بازاڕی ئەویندا بێ پوول و پارە بەدڵێكی پڕ سۆز و سەرێكی سەودا زەدەوە بۆ یوسفی عەشق كڕیارە، كە دیارە لەم بازاڕەدا پارە دراوی چرووكە و دەروونی بووریان و دڵی پارەپارە بەهادارە، بۆیەش بەڕێزیان (مەلا موحەممەدی مەلا عوسمانی باڵخی نازناو بە «مەحوی») بەو سۆز و گودازە راستەوە كە هەیانبوو توانیان ئەم كەلێنە (نزا و گازەی خوداناسانە) لە ئەدەبیاتی كوردیدا پڕبكەنەوە و ئەم منەتە بنێنە سەر شانی چینی دوایی. خودا پاداشی بەخێر هەم بە مامۆستا وە هەم بە راڤەكەرانی ئەم دیوانە واتە: جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس و رۆڵەی شیاوی كاك موحەممەد بداتەوە.

### ئەم نوسخەیە

لەم نوسخەیەدا گۆڕانكارییەك ئەبینرێ كە هۆی جیابوونەوەیەتی لە باقی نوسخەكانی تر كە بریتین لە:

١. پیت‌چینی نوێ و گۆڕینی ڕێنووسەکەی بە ڕێنووسی نوێ، بەم ڕەنگە تەواوی وشە عەرەبییەکانی بە شێوەی کوردی نووسراون، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەران نەکەونە هەڵەوە لە پەراوێزدا ئەسڵی وشە عەرەبییەکەمان بە ڕێنووسی عەرەبی لە ناو دووکەوانەدا (« ») دووبارە نووسیوەتەوە.

٢. گۆڕینی ئەو وشانە کە «ی»یەکیان پێ زیاد کرابوو بۆ ڕاست کردنەوەی کێشی بەیتەکە، بەڵام ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەبێ ئەو کشاندنە زەوقی خوێنەر دروستی بکات و نابێ بنووسرێت؛ چونکە «واو»ی بادانەوە (عەتف) یا واوی پەیوەندی (ڕەبت) کاتێ بە دوای وشەیەکەدا هات کە دواپیتی «یاء»بوو خۆی بۆ خۆی بە شێوەی «یو» ئەخوێنرێتەوە.

٣. گواستنەوەی شیعری پیتی «ث» و «ذ» و «ظ» و «ط» بۆ پیتی «س» و «ز» «ت».

٤. ئەو هەڵانەی کە لە پاشبەندی چاپە پێشووەکەدا ڕاستکرابوونەوە، ئێمە ڕاستەکانیمان خستە جێ و لە جێی خۆیاندا دامانان.

٥. لە هەر شوێنێکدا ئەگەر وشەیەك یا ڕستەیەك بە پێویست زانرابێت زیاد بکرێت، لە پەراوێزدا یا لە ناو دوو کەوانەی گۆشەدار ( [] )دا نووسراوە. وە بە هیچ کلۆجێ تەنانەت پیتێکیش کەم نەکراوەتەوە.

لەکۆتاییدا سپاس و پێزانینی خۆمان سەبارەت بەو برادەرانە دەرئەبڕین کە لە ڕاستکردنەوە و هەڵەگیری ئەم بەرهەمە ڕۆڵێکی بەرچاویان بووە:

١. کاك عەتائوڵڵای حەواری‌نەسەب، کە لە ڕێنوێنییەکانی کەڵکی زۆرمان وەرگرت.

٢. کاك مەلا ڕەفیقی ڕۆستەمی.

٣. کاك مەلا مەسعوودی ئەحمەدی.

٤. کاك سیروان ڕەحمانی (سەلاس‌وباوەجانی).

٥. کاك مەلا سەلمانی فەرەجیان.

٦. کاك عەبدولحەمیدی شیری (مەریوانی).

لە هەموو خوێنەرانی بەڕێز داوا ئەکەین ئەگەر هەڵەیەکیان بەرچاو کەوت ئاگادارمان بکەنەوە تا لە چاپەکانی‌تردا بتوانین نوسخەیەکی پاکتر بخەینە بەردەستیان.

**بڵاوکردنەوەی کوردستان**

# بەکورتی مێژووی ژیانی «مەحوی»

«مەحوی» ناوی مەلا موحەممەد و کوڕی مەلا عوسمانی باڵخیە لە نەوەی پـیر و زانای ناودار «شێخ ڕەش». باپیریشی، وەك باوکی، ناوی مەلا عوسمان بـووە و وەك شێخ مارفی نۆدێ لەگەڵ دروست کردنی سلێمانیدا هاتووەتە شاری نوێوە. «باڵخ»یش دێیێکە لە ناوچەی «ماوەت» لە شارستانی سلێمانی. مێژوونووسی کورد موحەممەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێ: لەساڵی ١٢٥٢ی-ك (١٨٣٦-١٨٣٧ی-ز)دا لەدایك بـووە. مامۆستا «عەلائەدین سـەجادی»یش دەڵێ: لە ١٨٣٠ (١٢٤٦ی-ك)دا لەدایك بـووە. کاکەی فەللاحیش دەڵێ: لە ١٢٤٧ی-ك (١٨٣١ ١٨٣٢ی-ز)دا لەدایك بووە. باوکی خەلیفەی شێخ عوسمان سیراجەدینی تەوێڵە بووە. حەوت ساڵان بووە خراوەتە بەر خوێندن و ماوەیەك لای باوکی خوێندوویەتی. بۆ خوێندن چووەتە سنە و سابڵاغیش و لای مەلا «عەبدوڵلا»ی پیرە باب خوێندوویەتی. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لای مەلا ناودارەکانی ئەو ناوچەیە خوێندوویە. ئەوجا چووە بۆ بەغدا و بووە بە فەقێی زانای بەناوبانگی کورد، موفتی زەهاوی و ئیجازەی مەلایەتی لای ئـەو وەرگـرتووە. دیسان مامۆستا عەلائەددین سەججادی دەڵێ: پاش ئیجازە وەرگرتنی لە (١٨٥٩ی-ز)دا بووە بە مەلای مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم لە بەغدا، بەڵام لە ١٨٦٢دا بـەغدای بـەجێ هێشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و بووە بە ئەندامی دادگا. لە ١٨٦٨دا بە هۆی مردنی باوکیەوە دەستی لە کاری میری کێشاوەتەوە و بووەتەوە بە مەلا و دەستی کردووە بـە دەرس وتنەوە بە فەقێیان.

مەلا حەسەنی کوڕی مەلا عەلی قزڵجی و مەلا مەحموودی مەزناوەیی و مەلا سەعید ئەفەندی، نایب ئۆغڵی کەرکوك و مەلا عەزیزی موفتی سلێمانی لە بەناوبانگترینی

فەقێکانی بوون. هەر بە ڕێچکەی باوکیا ڕێگای تەریقەتی گرتووەتە بەر و بووە بە خەلیفەی شێخ «بەهائەدین»ی کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵە.

وەك مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵیش لە «موفتی زەهاوی»یەکەیدا نووسیویە: مەحوی لە ساڵی ١٢٩١ ی.ك (١٨٧٤ ـ ١٨٧٥ ی.ز)دا لەگەڵ چەند مەلایەك لە سلێمانییەوە نەفی کراوە بۆ بەغدا. ناوبراو هیچی تری لەبارەی ئەم نەفیکردنە و هۆیەکەی و چۆنیەتی گەڕانەوەی مەحوییەوە لەوەوپاش بۆ سلێمانی، نەنووسیوە.

مەحوی، لە ١٨٨٣دا ـ بە پێی قسەی مامۆستای سەججادی ـ چووە بۆ حەج و لەوێوە چووە بۆ ئەستەمووڵ و لە ڕێگای پیاو ماقووڵانی کوردەوە لە ئەستەمووڵ چاوی بە سوڵتان «عەبدولحەمید»ی عوسمانی کەوتووە. سوڵتان ڕێزێکی زۆری لێ گرتووە و فەرمانی داوە خانەقایەکیان لە سلێمانی بۆ کردووەتەوە کە ئەوەتە ئێستا بە «خانەقای مەحوی» بەناوبانگە. مەعاشێکیشی بە ناوی خزمەت کردنی هەژارانەوە بۆ بڕیوەتەوە. کە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی تا مردنی لە سەرەتای شەشەلانی ١٣٢٤ (تشرینی یەکەمی ١٩٠٦)دا[1] هەر خەریکی دەرس وتنەوە بە فەقێ و بڵاوکردنەوەی ئایین و خزمەت

---

(١) هەموو ئەوانەی مێژوویەکی تریان بۆ کۆچی دوایی «مەحوی» نووسیوە، بەهەڵەدا چوون. «بێخود»ی شاعیر ساڵی کۆچی دوایی مەحوی لەم بەیتەدا دیاری کردووە:

چو بشنید «بیخود» وفات سلف     بتأریخ گفتا: «عمر شد خلف»

واتە: کە «بێخود» هەواڵی کۆچی دوایی پێشینی [مەبەست لە «مەحوی»یە] بیست، بۆ مێژوو وتی: «عمر شد خلف» واتە عومەر بوو جێنشین. ئەم ڕستەی «عمر شد خلف»ە بە حیسابی حورووفی ئەبجەد دەکاتە ١٣٢٤ [بڕوانەوە: «دیوانی بێخود»، کۆکردنەوە و ڕێك خستن و لەسەر نووسینی موحەممەدی مەلاکەریم، بەغدا، ١٩٧٠]. ئەم عومەرە کە بێخود لەم بەیتەدا باسی دەکا شێخ عومەری کوڕی مەحوی و باوکی شێخ موحەممەدی مەحوییە.

سەرچاوەکانی ئەم کورتە مێژووەی ژیانی مەحوی:

١ـ پێشەکی دیوانی مەحوی، نووسینی باپیر ئاغازادە عەلی کەمال، سلێمانی، ١٩٢٢.

٢ـ موحەممەد ئەمین زەکی، «خلاصة تاريخ الكُرد و كردستان»، تەرجەمەی موحەممەد عەلی عەونی، «قاهرە»، ١٩٣٦.

کردنی موسوڵمانان و بڵاو کردنەوەی گیانی سۆفیەتی بووە. لە یەکێ لە ژوورەکانی خانەقاکەی خۆیدا بە خاك سپێرراوە.

***

## ئەم دیوانە...

* ئەو سەرچاوانەی ئەم دیوانەیان لە سەرەتادا لە روو نووسراوەتەوە، نوسخە دەسخەتەکانی شێخ مەلا عومەری مەحوی کوڕی شاعیر و هەندێ نوسخەی دەسنووس و بەیازیتری کتێبخانەی بنەماڵەکەیانن، کە چەند پارچەیەکی خەتی مەحوی خۆیشییان تیایە.

*لە پێشاندا شێخ موحەممەدی مەحوی بە بەراورد پێ کردنی نوسخە چاپەکەی ١٩٢٢ ـکە پڕە لە هەڵە ـ و ئەو دەسنووس و بەیازانە نوسخەیەکی دیوانەکەی نووسیوەتەوە.

* پاشان لە ساڵانی ١٩٦٠ ـ ١٩٦١دا پێکەوە لەگەڵ مامۆستایان گۆران و کاکەی فەللاحدا ئەو نوسخەیان راست کردووەتەوە و هێناویانەتە سەر رێنووسی نوێی کوردی.

---



٣ـ موحەممەد ئەمین زەکی، «مشاهیر الکرد و کردستان فی الدَّوَر الاسلامی»، ترجمة کریمتە، «بغداد»، ١٩٤٥.

٤ـ شێخ موحەممەدی خاڵ، موفتی زەهاوی، «بەغدا»، ١٩٥٣.

٥ـ «عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، «بەغدا»، ١٩٧١.

٦ـ هەندێ وردە دەستنووسی شێخ موحەممەدی مەحوی.

٧ـ کاکەی فەللاح، «نبذة موجزة عن حیاة الشاعر الکردیّ المعروف والعالم الدّینیّ الکبیر الملقّب بـ«محوی»»، مجلة المثقف الجدید (رۆشنبیری نوێ)، العدد ٢٢، حزیران) ١٩٧٤.

٨ـ سۆران مەحوی، ناوەندە ئەدەبییەکی ئاڵوز و ژیانی ئەدەبیمان، رۆژنامەی عێراق «پاشبەندە کوردیەکەی رۆژنامەی [العراق]»، ژمارە٢، ١٩٧٧/٤/٢١.

* لە ساڵی ١٩٦٢دا ئەو نوسخە راست کراوەیە دراوە بە باوکم و ئەویش لەسەری نووسیوە و مەعنای شیعرەکانی لێك داوەتەوە.

* لە ١٩٦٣دا من بەسەر نووسینەکەی باوکمدا هاتمەوە و دامڕشتەوە و لێم زیاد کرد و پاکنووسم کردەوە.

* لەپاش ١٩٦٤ شێخ موحەممەدی مەحوی هەندێ پارچە شیعری تری مەحوی دەستگیر بوو، نوسخەیەکی پاکنووسی نوێی دیوانەکەی لەسەر بناغەی نوسخە لێکۆڵراوەکەی خۆی و گۆران و کاکەی فەللاح نووسیەوە.

* لە ساڵی ١٩٧٥دا کاکەی فەللاح بە وردی چاوی بەو نوسخەیەدا گێڕایەوە کە باوکم لەسەری نووسیبوو و من بە سەریدا هاتبوومەوە و دامڕشتبوەوە.

* کاکەی فەللاح کۆمەڵە سەرنجێکی بەجێی لە لێکدانەوەکەی باوکم و پیاچوونەوەکەی من پیشان دا و بە نووسراوەیی بۆی ناردین.

* لە سەرەتای ١٩٧٧دا بەر لە دەست کردن بە چاپ، من و مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوی و کاکەی فەللاح دانیشتنێکی درێژمان لە سلێمانی کرد و لە سەرنجەکانی کاکەی فەللاح و کۆمەڵێ سەرنج و پێشنیاری مامۆستا شێخ موحەممەد کۆڵینەوە و هەموو شتێکمان لە بارەیانەوە بڕیەوە و بڕیاری پێویستمان لەبارەی چونیەتی لە چاپدانی دیوانەکەوە دا و شێخ موحەممەد نوسخە دەسنووسە تازەکەی خۆی و هەموو نوسخە دەسنووسە کۆنەکانی خستە بەردەستی من.

* لە سەرەتای مانگی مارتی ١٩٧٧ەوە لەسەر بناغەی لێکدانەوە پێشووەکەی باوکم کە خۆیشم پیاچووبوومەوە دەستم کرد بە ئامادەکردنی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەیەکی نوێ، لەگەڵ رچاو گرتنی سەرنجەکانی کاکەی فەللاحیشدا و شیعرەکانیشم لەگەڵ دەسنووسەکان بەراورد کردەوە و جیاوازییەکانیانم لە پەراوێزدا نووسیەوە. ئەنجا بەرە بەرە بابەتە ئامادە کراوەکانم خستە ژێر چاپ.

* لە کاتی دەست کردن بە چاپدا نوسخەی تایبەتی مامۆستا مەلا ئەسعەدی مەحویشیان دایە لام کە نوسخەیەکی چاپ بوو و لە هەندێ شوێندا ئیشارەتی ئایەتێك

یا حەدیسێکی روون کردبووەوە، یا مەعنای وشەیەك یا رستەیەکـی لێك دابـووەوە. منیش هەرکام لەو ئیشارەت و مەعنا لێدانەوانەی مامۆستا مەلا ئەسعەدم، کە خۆمان پێشان بۆی نـەچووبووین، وەرگـرت و خسـتمە چـوار چـێوەی لێك دانـەوەکـانی خۆمانەوە.

*لە بنەماڵەی مەحوی، سەرەڕای مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوی، کاك سۆران مەحویش، بۆ ئەوەی کارەکەمان پوختتر و جوانتر بێ پەیتا پەیتا لەم ماوەی لە چاپ دانەدا، بە پێشنیار و سەرنجی بەجێ، یارمەتی داوین و بە سەری کردووینەتەوە.

*بو لێکدانەوەی ئەو ناو و وشە فارسی و عەرەبییانەی لەم دیوانەدا هەن تەماشای کتێبی «کشف الظّنون» و فەرهەنگی «عمید» و «برهان قاطع»ی فارسی و «المنجد»ی عەرەبی کراوە.

*بەرهەمی رەنجی تێکڕای ئەم چەند ساڵەی ئەم چەند کەسە، ئەم کتێبەیە کـەوا ئێستا دەیخەینە بەردەستی خوێندەوارانی کورد، ئاواتە خوازی ئەوەین بە دڵیان بێ و پەسەندی بکەن و هەر کەم و کورتی و ناتەواوییەکیان دی ئاگادارمان بکەنەوە.

**موحەممەدی مەلاکەریم**

# پێشەکی

زۆر لەوانەی خەریکی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری دەبن، داب و رەوشتیان وایە ئەگەر لە رێگای سەرچاوەی مێژووییەوە شارەزای جۆری بیر کردنەوە و لێکدانەوە و سەرنجی کۆمەلایەتی و باری دەروونی ئەدیبێك یا هونەرمەندێك نەبن، پەنا بەرنە بەر بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکانی و لە رێگای شی کردنەوە و لێ ورد بوونەوەی ئەو بەرهەمانەوە لە کەسایەتی و تەرزی بیر کردنەوە و باوەڕی کۆمەلایەتی و ژان و ئازار و ئاواتەکانی گیانی ئەو کەسە بگەن. ئەم کارە ئەگەر لەگەڵ لێکۆڵینەوەی مێژووی کۆمەلایەتی و بیر و باوەڕە بەگژی یەکدا چووەکانی کۆمەڵی سەردەمی ژیانی ئەو ئەدیبە یا ئەو هونەرمەندە و بەگوێرەی رێو شوێن و پێڕەوێکی زانستییانەی وایش بێ کە خەباتی کۆمەلایەتی بکا بە سەرچاوەی بیری کۆمەڵە و ماکی رەنگ رشتنی، ئەوە بێ گومان بەپێی توانا و لێ هاتوویی ئەو کەسەی دەست دەداتە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی بەرهەمە ئەدەبییە یا هونەرییەکە، سوودمەند و بەکەڵك دەبێ و لێی دەوەشێتەوە لە دیاری کردنی خاسیەتەکانی ئەو ئەدیبە، یا ئەو هونەرمەندەدا دەستی خوێندەواران بگرێو پەنجەیان بخاتە سەر راستی.

بەلام وەنەبێ ئەم کارە، هەر بەم چەشنە کە ئێمە خستمانە روو، ئاسان و بێ گرێو تەگەرە بێ. تێ گەیشتنێکی ورد و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەکی راستی بەرهەمەکە، شارەزایی لە باری کۆمەلایەتی و زۆرانبازی بیری سەردەمی خاوەن بەرهەمە تۆژراوە و لێکۆڵراوەکە، زانینی زانستی خەباتی کۆمەلایەتی و قانوونە هەڵسووڕێنەکانی، ئەمانە هیچکامیان شتێك نین هەروا بە ئاسانی دەسگیر ببن تا هەرکەسێك بیەوێ دەستیان بداتێ. بۆیە منیش کە دەمەوێ لەم پێشەکییەدا بە یارمەتی بەرهەمی مەحوی خۆیەوە

کەمێك لە خۆی بکۆڵمەوە، بە ترسێکی زۆرەوە پێ هەڵدێنمەوە و بە تەمای لەوە زیاتر نیم کە توانیبێتم نیشانەیەك لەم مەیدانەدا دانێم؛ ئەوەندەی لەبارەدا بێ دەسە چیلەیەك بدا بە دەستی توێژەرەوە و لێکۆڵەرەوەی دوا رۆژەوە، تا لە تاریکایی رێگای کـاریدا بەرپێی خۆی پێ روون بکاتەوە.

لە داوێنی ئەم کتێبـەوە بـەشی زۆری ئـەو بـابەتانەم نـووسیوەتەوە کـە لەبـارەی مەحوییەوە نووسراون. بابەتەکانی‌کەش تێکڕا لە چوار چێوەی ئەم بابەتانە دەرناچن و شتێکی زیاتریان تیا نیە. نووسینەوەی ئەو بابەتانە یارمەتی خوێندەوار دەدا کەوا بزانێ تێکڕا ئەو رۆشنبیرە کوردانەی کە بە بابەتی ئەدەبەوە خەریکن، بە چ چاوێ دەڕواننە مەحوی و چۆنی هەڵدەسەنگێنن. من خۆم لەگەڵ گەلێ سەری بیر و راکانی مامۆستایان «علاءالدّین» سەججادی و کاکەی فەللاح نیم. بەڵام ئەوە بە هیچ جۆرێ وا ناگەیەنێ قەدری تەواوی نووسینی ئەو دوو مامۆستایە و هەروا مامۆستاکـانی‌تریش لەبـارەی مەحوییەوە نازانم. بە پێچەوانەوە ئەو نووسینانە دەستی خوێندەوار دەخەنە سەرگەلێ لە خاسیەتەکانی شیعری مەحوی و لە جۆری بیرکردنەوەی خۆی. بۆیە لام وایە ئەمانە گەلێ سەری ئەو ئەرکەیان ئاسان کردووە کە من دەمەوێ بیخەمە سەرشانم و لێرەدا دەمەوێ زیاتر بایەخ بە لایەنی وای بیری مەحوی بدەم کە ئەوان لێی نـەدوا بـن، یـا بایەخی پێویستی خۆییان نەدابێتێ.

مەحوی بەرهەمی سەردەمێکە کە لەبارەی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بۆی بڕوانـێ دەبینی میر نشینی بابان لەناو چوو بوو. ئەو چەکەرەی کەسایەتی سیاسی کوردە کە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرا لە ناوچەی باباندا سەوز بێ‌و پێ بگا و شتێکی نوێی لێ بێتە بەرهەم، پووکابووەوە و وشك بوو بوو؛ تا پاشان تۆوێکی لێ بەجێ بمێنێ سـەر لەنوێ لە زەمینەی نیشتماندا شێ هەڵمژێ‌و بە شێوەیەکی‌تر سەوز ببێتەوە و شتێکی تازەی بەرگە گرتووتری لێ بێتە بەر.

هاتنی عوسمانییەکان بۆ ناوچەکە و ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی بەسەر سلێمـانییاندا هێنابوو، بارێکی نوێی بیر و ژیانی هێنابووە ئاراوە. لە ئەنجامی ئەوەوە دەزگای نوێی

میری، پەیوەند لەگەڵ ژیانی نوێ، کولتووری نوێ، خوێندەواری نوێ، بازرگانی نوێ، باری نوێی چینایەتی، تا رادەیەکی بەرچاوکەوتوو پەیدا بوو بوو. ئەو هەرایەی کە تازە بوونەوەی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستانی خوارووەدا نایەوە و بەربەرەکانێ و کێشەی توند و تیژی نێوان نەقشبەندی و قادری و دەسەڵاتی زۆری تەریقەتی قادری لەناو شاری سلێمانیدا لە شەخسی بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەدا کە سەیید و ئەولادەی پێغەمبەر بوون و بە پێچەوانەی ئەوەوە دەسەڵات پەیدا کردنی تەریقەتی نەقشبەندی بەسەر بەشێ لە لادێکانی ناوچەی دەور و پشتدا لە رێگای خەلیفەکانی مەولاناوە پاش هەڵاتنی مەولانا خۆی بۆ بەغدا و شام، کە مەولانا خۆیشی کوڕی کابرایەکی نەناسراوی جافی مکایەلّی بوو، هەروەها موتوربەبوونی تەریقەتی قادری لەگەڵ دەسەڵاتی دەرەبەگییانە و هاتنە ئارای بەکار هێنانی دەسەڵاتی ئایینی بۆ سوودی دنیایی و هەوڵی زۆر و بە تینی عوسمانییەکانیش بۆ سڕ کردنی مێشك و بیری خەڵك و هەڵخڵەتاندن و خەڵافاندنیان لە رێگای پشتیوانی کردنی بیری سۆفییەتی و دەروێشییەوە، کە لەو هەموو دەسگرۆیی کردنەی شێخەکان و تەکیە و خانەقا بۆ کردنەوە و مووچە و مانگانە بۆ بڕینەوەیاندا دیاری دەدا... ئەمە هەمووی نەخشەیەکی ئەو بارە کۆمەڵایەتیەمان پیشان دەدا کە مەحوی تیا هاتە دنیاوە و تیا پێ گەیشت...

تەریقەتی نەقشبەندی خۆی لە خۆیدا دەمارێکی تیژی بیر کردنەوە و فەلسەفەکاری تیایە، لەوانەیە بەشێکیشی لە هیندەوە هێنابێ و لە کەلەپووری سامانە فەلسەفییە دەوڵەمەندەکەی ئەو وڵاتە بێ. لە بارەی رێشەی چینایەتیشەوە تەریقەتەکان هەموویان و بە تایبەتی تەریقەتی نەقشبەندی لە پێشا رێبازی رەش و رووت و هەژار و چەوساوەکانی کۆمەڵ بوون. سۆفیەتی خۆی دەنگی بێزاری دەربڕینێکی سەلبییە لە رووی توێژە ئاوساو ئینتیلاکردووەکانی چینە خوێنمژەکانی کۆمەڵگای ئیسلامدا، کە هەر بە رابواردن و دنیا پەرستییەوە خەریك بوون. ئەو بەرەنگار بوونەش کە ناحەزان هەر لە سەرەتاوە بەرەنگاری تەریقەتی نەقشبەندییان پێ کرد، ئەوەندەی تر گیانی یاخی گەری و بەربەرەکانێی ئۆلیگارکێتی ئایینی سەبردەمی تیا بەهێز کرد و کردی بە

شەهیدێکی ڕێگای بیری ئازاد و نوێکاری بەرابەر بە کۆنی جێ گیر بوو... شاعیریش بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست و چەرخی تاریکی، تەنانەت زۆر جار شاعیرانی دیوەخانی پادشا میرەکانیش، زمانی میللەتی چەوساوە و دەنگی نارەزایی کۆمەڵو رەخنەی توند و توونی هۆشیارانی گەل بوون، لە زۆرداری و سیستێمی رزیوو بۆگەن و لە چەوساندنەوە و رووتاندنەوە و پێ شێل کردنی راستی...

کە ئەمانەمان هەموو زانی و زانیشمان مەحوی هەم باوکی خەلیفەی شێخ عوسمانی تەوێڵەی جێ نشینی مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری و هەم خۆیشی خەلیفەی شێخ «بهاءالدّین»ی کوڕی شێخ عوسمان بووە و هەم لە خۆیشیدا سەرەڕای بەهرەی شاعیریەتەکەی خاوەنی نەفسێکی یاخی و شۆڕشگێڕو دەروونێکی سەرکەش بووە و لە سلێمانیشدا ژیاوە، کە مەیدانی ئەو هەموو ناکۆکی و زۆرانبازییەی نێوان حەق و ناحەق و زوڵم و داد بووە، کە پێشان پەنجەیەکمان بۆ راکێشا...

بەڵێ کە هەموو ئەمەمان زانی و چاوێکیشمان بە دیوانەکەیدا گێڕا، لە جۆری بیر و باوەڕو باری دەروونی دەگەین و هەرچەندیش یەکە یەکەی «بۆنە»کانی وتنی شیعرەکانیمان بۆ روون نەبوەتەوە، تێکڕا دەزانین دەڵێ چی و لە چی دەدوێ...

دیوانی مەحوی پڕە لە پلار لە ناحەز و نەیار.[1] ناحەز و نەیاری مەحویش هیچیان

---

(١) دیوانەکەی مەحوی پڕە لە بەڵگە بۆ ئەم قسەیەمان. بۆ نموونە:
بۆ دوکانی موشتەریگر حەول ئەدا، کاڵافرۆش
دینی وا دێنێتە قیمەت خواجە ئەعزایی بکا
[بەیتی چوارەم، پارچەی شەشەم، پیتی «ئەلف»]

❊❊

یاخود:
ریشێکی پان و تووکی بنا گوێ، درێژو لوول    سۆفی لە دینی لادە بە دیمەن لە جوو دەکا
[بەیتی سێهەم، پارچەی نۆهەم]

❊❊

☞

یاخود:

بە پێچی خوارو خێچ ئیما دەکا پیری تەریقەت: بێ

حەقیقەت پیرە زاهید پیرە، گوم کردوو تەریق ئەمما

[بەیتی چوارەم، پارچەی یازدەهەم]

❋❋

یاخود:

واعیز، لە من بڵێ بە نەزەر تەعنە بەس بدا    دینی بتانە دینی من، ئەو مەزهەبی زەهەب

[بەیتی پێنجەم، پارچەی سێهەم، پیتی «بێ»]

❋❋

یاخود:

واعیزم پرسی: یەکێ شۆخانە جوابی دامەوە:

وەعزی چی؟! سەر لنگە دەستارێ کرەی دەستاری هات

شێخ و تورڕەی مێزەر و نەقڵ و نوقوولی هیچو پووچ

من بە تورڕەی یار ئەسیرم ئەو بە کۆڵێ تورڕەهات

[بەیتی حەوتەم و هەشتەم، پارچەی یەکەم، پیتی «تێ»]

❋❋

یاخود:

فەزیلەی ئەسڵ و فەسڵ ئینسانی پێ نابێ بە ساحێب فەزل

کە تۆ کۆسەی، بە تۆ چی مامە ریشی باب و باپیرت!

[بەیتی شەشەم، پارچەی چوارەم]

❋❋

یاخود:

بە داوە وەعزی و، خۆشی بە تاوە «یا حافظ»!    لە هەڵقولانە کە لیکی دەم و لچی «واعیظ»

[بەیتی یەکەم، پارچەی یەکەم، پیتی «ظێ»]

❋❋

☜

☞

یاخود:

«شەط»ێ ئاوی کە زاهید بۆ «وضو»یەك کردووە زایع

فەقیرە، هەر بە بایەك ئەو هەموو رەنجەی بووە زایع

[بەیتی یەکەم، پارچەی یەکەم، پیتی «عەین»]

**

یاخود:

لا لەغاوەی واعیز ئەمڕۆ مەوج ئەدا، دەم پڕ لە کەف

ریشی قیرووسیا، کتێبی وەعزەکەی بوو بەرتەرەف

[بەیتی یەکەم، پارچەی یەکەم، پیتی «فێ»]

**

یاخود:

دەخاتە فکری ئەهلی مەعریفەت شێوەی جەجاڵ «الحق»

دەبینی بەعزە ئەشخاسێ بە دوویا خەرگەلەی مەخلووق

[بەیتی سێهەم، پارچەی دووهەم، پیتی «قاف»]

**

یاخود:

کە شێخ واعیز و سۆفی بە جەننەت بەن گەدوگیپاڵ

دەبێ ئەمسالی ئێمە بۆ جەهەننەم بەن، سڕو سیپاڵ

[بەیتی یەکەم، پارچەی یەکەم، پیتی «لام»]

**

یاخود:

خەڵق ئەوا مەجبووری دوو خۆ خستنی خەڵقن بە جان

من بە دڵ مەنفوورمە، روتبەی جەجاڵم بۆ چیە!

[بەیتی شەشەم، پارچەی چواردەهەم، پیتی «هێ»]

**

☜

☞

یاخود:

قسەگەر عیقدی گەوهەر بێ، غەرەز دەیکا بە خەر موهرە

چ تــەئسیرێ لە وەعــزتدایــە؟ واعــیز، وا پــڕ ئــەغرازی

[بەیتی شەشەم، پارچەی شەشەم، پیتی «یێ»]

❊❊

یاخود:

بە غەیبەت کردنی ئەم بێ نەوایە تووشی خەجڵەت دێ

بـڵێ واعـیز بـەس ئـەم مـێرووولە بـخوا، وازی لێ بـێنـێ

[بەیتی پێنجەم، پارچەی نۆهەم]

❊❊

یاخود:

بە تاقە فەخری کیسرا، هـەر خـەوەڕنـەق فـەخری نـوعمانە

دەنێ هیممەت وەهایە هەر لەگەڵ کوچك و کەڵەك دەدوێ

[بەیتی شەشەم، پارچەی دەهەم]

❊❊

یاخود:

شێخـێ هـەمەوەندێکـی دەدا پـەند و نـەسیحەت

ئەو قوڕ بەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەزیحەت

خۆش هاتە جواب و وتی: تۆ حەقتە، فەقەت مـن

قــوتتاعی تــەریقم، نــەکــو قــوتتاعی تـەریقەت

[چوار خشتەکی ژمارە ١١]

❊❊

یاخود:

چوو ئەو فیرعەونە حیزە بۆ جەهەننەم قوڕ بەسەر هامان

دەبێ ئەسبابی زووتر چوونە خـزمەت ئـەو بـدا سـامان

☜

وا دیار نیە شتێکی شەخسی لەگەڵیان بووبێ. ناحەز و نەیارەکانی لەوانە بوون کە بار بوون بەسەر شانی کۆمەڵەوە و وەك زەروو خوێنی ئەم خەڵکەیان مژیوە و چەوساندوویاننەتەوە.

دیوانی مەحوی پڕە لە تانووت دان لە شێخ و سۆفی و زاهید و واعیز... کە دەشزانین مەحوی خۆی یەکێك بووە لە بەرەی شێخ و سۆفی و زاهید و واعیز؛ تێ دەگەین دیارە مەبەستی هەرگیز تانووت دان نەبووە لە شێخیەتی و سۆفیەتی و زوهد و وەعز کردن؛ بەڵکوو بەپێی داب و نەریتی شاعیرە کلاسیکە یاخییەکان کە لە شەخسی شێخیەتی و زوهد و وەعزی درۆزنانەی شێخ و زاهید و واعیزە درۆزنەکاندا رەخنەیان لە رەهبەرانی کردار و گوفتار جیاوازی کۆمەڵ گرتووە و بەدناویان کردوون. ئەمیش دێ سەر و گوێلاکی ئەو دز و جەردە ئایینیانەی ناو کۆمەڵ دەکوتێتەوە، کە دەشتوانین هەر بە ناو بڵێین کێن و لەگەڵ چەپەڵی کردار و دەروونیشیاندا شێخیەتی و سۆفیەتی و دەروێشی و بە دیمەن دەستبەرداری دنیا بوون و رێگای چاکە پیشاندانیان کردبوو بە پیشەی خۆیان.

راستەکەی ئەمە هەلێکی باش بووە بۆ مەحوی رێك کەوتووە، کەوا توانیویە شێوەی شیعری تەقلیدی بکا بە چەکی دەستی بۆ هێرش بردنە سەر ناحەزەکانی و هێرشەکەی بخاتە قاڵبی نەریتێکی ئەدەبییەوە و لەو رێگایەوە مەیدانی ئەوە لە ناحەزەکانی تەنگ بکاتەوە کە بتوانن بیر لە تۆڵە لێ سەندنەوەی بکەنەوە.

***

---



لەوانە و هەم لە ئەمسالی ئەوانە یارەبی هەر ئان
جەهەننەم پڕ بکەن، جەننەت تەهی بێ بۆ موسوڵمانان

[چوار خشتەکی ژمارە ٣٠]

**بەڵام، بەداخەوە، ئەم بێزارییەی مەحوی لەوکۆمەڵە ئایین بە پەردەی تاوان و ستەم کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە گەلێ جار بە نرخێکی ئەوەندە قورس کەوتووەتە سەری لەوانە بووە بیگەیەنێتە لێواری خوێن و مەرگ، هەرچەند بە هەندێ بەڵگە و نیشانەشدا دەردەکەوێ کەوا گەیشتوویشەتە رادەی ئەوە مەحوی لە ساختەچیەتی و ناڕاستی کۆمەڵ بگاو[1] بەڵکوو هەندێ جاریش بیگەیەنێتە ئاستی بێزار بوونێکی خەست لە جیهان و لە خەڵك و[2] دەربڕینی نارەزایی لە باری چەوتی کۆمەڵ و[3] دژایەتی کردنی**

---

(١) بۆ نموونە، وەك:

غەیری ئەمەکە سوێندی درۆی پێ بخۆن و بەس    قوربانی ناوی، ناوی لە ناوا نەما خودا

[بەیتی شەشەم، پارچەی یەکەم، پیتی «ئەلف»]

**

یاخود:

ئەهلی فەزڵ ئارام و رووناکی نە شەو ئەسڵا نە رۆژ    بۆ نیە و نابێ، کە ئەمڕۆ رۆژی نائەهلانە رۆژ

[چوار خشتەکی ژمارە ٢٠]

(٢) بۆ نموونە، وەك:

عەهد و وەفایە سوخرەیی بەد عەهدیو جەفا    هەر ما بە دادی ئەهلی وەفادا بگا خودا

هەر ئەوکەسە کە خەیری دوعای خێری دیوە لێم    دائیم دوعامە شەڕڕی لە من لابدا خودا

[بەیتی سێهەم و چوارەم، پارچەی یەکەم، پیتی «ئەلف»]

**

یاخود:

تشویش حال من تو ز تخلیط من بفهم    ز اهل زمانه بس کە رسد بر دلم جفا

[بەیتی هەشتەم، پارچەی چوارەم]

**

یاخود:

تەڵەبی رەحم و مرووەت لە دڵی ئەهلی زەمان    تەڵەبی ئاوی حەیاتە لە سەرابستانا

[بەیتی دووهەم، پارچەی دوازدەهەم]

**

☜



هەروەها سەیری پارچەی سێهەمی پیتی «زێ» بکە

**

یاخود:

ئەمڕۆ لەکن زەمانە هونەر بۆتە قەشمەری شێری ژیانی بۆ چیە، مەیموونیە گەرەك
فیترەت بڵند و پایە بڵندم نەدی، بە گوێشر گەردوون ئەوەندە دوونە کە هەر دوونیە گەرەك
[بەیتی سێهەم و چوارەم، پارچەی چوارەم]

(٣) بۆ نموونە، وەك:

قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە، دەبینی مەنسوور بە سەری دارەوە، «ذاالنّون»ە لە بن زیندانا
[بەیتی سێهەم، پارچەی دوازدەهەم، پیتی «ئەلف»]

**

یاخود:

کەم بوو وەك ئەو دەمە، سیدق ئەم دەمە، هەم کەم بووە قات
فەرەحی نەك بە دوا بێ، غەم و هەم هەم بووە قات
[بەیتی یەکەم، پارچەی دووهەم، پیتی «تێ»]

**

یاخود:

ئەم عەسرە، عەسر و وەقتە لەبۆ فاجیرێ لە هیچ دینی نەکا ویقایە، حەیا نەیگرێ لە هیچ
[بەیتی یەکەم، پارچەی دووهەم، پیتی «چیم»]

ئەگەر ئەم ئەهلی دنیایە، وەکوو هەن رێ خەنە جەننەت
دەنائەت زوو دەکا ئەو دونیە لەم دنیایە دنیاتر
[بەیتی حەوتەم، پارچەی سێهەم، پیتی «رێ»]

**

یاخود:

ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا، تاقە رۆژێ، گەر
بە قەرنێ من ئەوەندە ئەهلی خودا بم دەبمە پێغەمبەر

☞

[بەیتی یەکەم، پارچەی پێنجەم]

**

یاخود:

نائەهلی ئەم ئەهالییە مەعلوومی من کە بوو

شوکری خودا، خودا بەس، ئومێدم نەما بەکەس

[بەیتی سێهەم، پارچەی دووهەم، پیتی «سین»]

**

یاخود:

نامەرد ئەوەندە موعتەبەرە لەم زەمانەدا

مەرد ئیعتیباری کەم بووە، مەردی خودا خوسووس

[بەیتی حەوتەم، پارچەی یەکەم، پیتی «سین»]

**

یاخود:

دەنی تەبعی بە جارێ عالەمی داگرت ئەوا «مەحوی»

درەنگە ئیلتیجا بە بەر دەری عالی جەنابێ زوو

[بەیتی پێنجەم، پارچەی دووهەم، پیتی «واو»]

**

یاخود:

لە سایەی دەوری چەرخی سوفلە پەروەر لەك بە لەك دەدوێ

سەگی ئاواتە خوازی ئێسکی وشتر لە شەك دەدوێ

دەبینم شێری شێر ئەفگەن دەڵەك کەوڵی دەکا، دەبیەم

بە کۆڵێ کلکەوە رێوی لەگەڵ کەوڵی دەڵەك، دەدوێ

دەبینی بایەزیدە، وەك یەزیدێکی دەبینن خەڵق

بەبێ پەردە شەیاتینی لە ئەحواڵی مەلەك دەدوێ

[بەیتی یەکەم و دووهەم و سێهەم، پارچەی دەهەم]

☜

## چینی پارەدار و[1] بەرهەڵستی کردنی ستەمکاران و[2] جاروباریش پەنجەی بخاتە

☞

دیمەنێکی تری ئەم لایەنەی هەست و سروشتی مەحوی، لەو گیانی شانازی بە خۆوە کردن و عیزەتی نەفس و گلەیی لە قەدری هونەرمەند لەناو کۆمەڵگایەدا دەردەکەوێ کە لە گەلێ لای دیوانەکەیدا دەری بڕیوە، وەك ئەوە کە دەڵێ:

وتی: مێوەی بەهەشتە شیعری «مەحوی» خــودا نــەبڕی لە بــاغم داری بــەردار

[بەیتی حەوتەم، پارچەی یەکەم، پیتی «ڕێ»]

❊❊

یا دەڵێ:

بێ منەت رزقێکە غەم، بمرم لە برسان، ئەو دەخۆم

تەفرە ناخۆم و تەڵەب ناکەم لە دنیا قووتی رۆح

[بەیتی چوارەم، پارچەی یەکەم، پیتی «حێ»]

❊❊

یا دەڵێ:

«مەحویا» بازێکی تۆ قودس ئاشیان بوونە بوومی شوومی ئەم وێرانە بۆچ!

[بەیتی یازدەهەم، پارچەی یەکەم، پیتی «چیم»]

❊❊

یا دەڵێ:

کێ قەدری شیعری ئێمە دەزانێ، بەری دەکا هەر ساحێبە لەبەرکەری کالایی بێ رەواج

[بەیتی شەشەم، پارچەی یەکەم، پیتی «جیم»]

(١) بۆ نموونە، وەك:

یا ماری سەر خەزێنە! بترسە کە گەژدومێ بەو نووکە چزوە پڕ بە دەمت کا لە ژەهری مار

[بەیتی سێهەم، پارچەی دووهەم، تیپی «ڕێ»]

❊❊

یاخود:

ئەربابی غینا ئەوەندە غەڕڕە بە زەڕن بێ بۆنی بەهارو دیتنی جۆ دەزەڕن

ئەمیانە مەقامو بەستەیان ناشکورییە یەعنی دەوەڕن ئەگەر دەمێ بێ نەزەڕن

☜

---

☞
[چوار خشتەکی ژمارە ٣٣]

**

یاخود:

ئەم پارە پەرستانە لە خۆیان کە دەچن زوو    دەخلّی نە پەلی دێوە، نە بای باڵی پەری بوو
عاقڵن و فەقەت فێ لەگەڵ دیتنی پارەن    ماهی نەوی ئەم قەومە هیلالی قەمەری بوو

[چوار خشتەکی ژمارە ٣٧]

(٢) بۆ نموونە، وەك:

ئەی ئەو کەسەی کە مەستی غورووری بە هاتی کار
بە و دەستی زۆرە بدڕە پەڕۆیەك لە کاری «چار»
هەرچەندە خەرتەلی، لە پڕێ چەرخی پەنجە باز
دەتکا بە بازی پەنجەیی «میقادۆ»یی شکار

[بەیتی یەکەم و دووهەم، پارچەی دووهەم، پیتی «ڕێ»]

**

یاخود:

زاڵمی دڵ ڕەقی روو گرژی موسوڵمان ئازار
هەر بە ئیزایە کە ڕەنگی بگەڕێتە روخسار
بەرد ئەگەر سەر نەشکێنێ بە چی روو ڕەنگین کا؟
کە لە پێ هەڵچەقێ ئەوسا روخی گوڵناریيە خار

[چوار خشتەکی ژمارە ١٤]

**

یاخود:

ڕەشێ، بۆ کوشتنی یەك روو ڕەشی بەدەستەوە بوو
بە دزیەوە وتی: فتوا دە، روخسەتم فەرموو
وتم: کە دەردەکەوێ زوو کە ئەم غەزا کەرە تۆی
بە دەستی سەوز و سپی بوونەوەی جەمال و روو

[چوار خشتەکی ژمارە ٣٨]

سەر بۆگەنی سیستێمی حوکمداری‌و[1] بە چاوی سووك تەماشای رژێمی کۆمەڵایەتی پێ بکاو[2] بانگەوازی حەق پەرستی و[3] تێکۆشان و بەردەوام بوونی لەسەر خەبات

---

(١)بۆ نموونە، وەك:

لە عاریف عامییەك پرسی هەواڵی مەسلەخ و قەسساب

بە ئەنگوشتی شەهادەی کرد ئیشارەی مەحکەمە و نائیب

[بەیتی پێنجەم، پارچەی شەشەم، پیتی «بێ»]

**

یاخود:

لەبەر داری حەدا من بم، ئەتۆ مەست     دە قازی حەق بڵێ تۆ، «حەق» چ بەردار

[بەیتی چوارەم، پارچەی یەکەم، پیتی «ڕێ»]

(٢)بۆ نموونە، وەك:

ئەغڵەبەی تەکیەو دەرگاهی بیلادی رۆمم...     پشکنی، دی: چەلەبی هەر جەڵەبی بوو، دەدە دەد

[بەیتی سێهەم، پارچەی دووهەم، پیتی «دال»]

**

یاخود:

موئەززین بەزمی شەو وەك مورغی بێ وادە دەشێوێنێ

هەموو وەختی لە ئێمە کردووە بەم قوقوە زایع

[بەیتی شەشەم، پارچەی یەکەم، پیتی «عەین»]

**

یاخود:

دەرچوو لە حەددی غایە عورووجی دەجاجیلە     یا ڕەببی تۆ بکەی کە بکا عیسەیەك نزوول

[بەیتی شەشەم، پارچەی سێهەم، پیتی «لام»]

(٣)بۆ نموونە، وەك:

هەتا حەق ناسیرە، هەر حەقمە مەنزوور     وەکوو مەنسوور ئەگەر بمکەن بە دارا

[بەیتی سێهەم، پارچەی سێهەم، پیتی «ئەلف»]

**

**پێ بەرزکاتەوە و[1] کارێکی وای لێ بکات بیهێنێتە سەر ئەو باوەڕە کە ئەبێ بنیادەم هاوبەشی دەرد و مەینەتی خەڵك بێ و[2] خزمەتیان بکا.**

---

☞

یا خود:

لە حەق بێژی بووە بەحری «أنا الحق» هەر قەسیدێکم

لەباتی جائیزە واجب گەڕا قەتڵم بکەن واجیب

[بەیتی شەشەم، پارچەی شەشەم، پیتی «بێ»]

**

یاخود:

بە حەق هەر حەق، بە ناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژێ بووم

وەکوو مەنسوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم

[بەیتی چوارەم، پارچەی هەشتەم، پیتی «میم»]،

(١) بۆ نموونە، وەك:

| | |
|---|---|
| لە ئولکەی عیشقەدا بێ چوونە سەر دار | بە ئاسانی مەزانە بوونە سەردار |
| هەیە گەر عیشقی سەرداری لە سەرتا | بکە مەشقێ لەوانەی چوونە سەردار |

[بەیتی یەکەم و دووهەم، پارچەی یەکەم، پیتی «ڕێ»]

**

یاخود:

موحەققەق هەرکەسێ مەسلەکیە حەقق و حەقیە مەنزوور

سلووکی چوونە سەردارە، تەریقەی پیریە مەنسوور

[بەیتی یەکەم، پارچەی چوارەم]

**

یاخود:

بە پیری مەرگەوە فرسەخ بە فرسەخ ڕۆیون مەردان

ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە بڵح و نامەردە

[بەیتی دووهەم، پارچەی چوارەم، پیتی «هێ»]

(٢) بۆ نموونە، وەك: ☜

**بەڵێ لەگەڵ هەموو ئەمەشدا نەیگەیاندە رادەی ئەوە کە تێ بگا ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە و دوژمنی راستەقینەی گەلەکەی و هۆی کلۆڵی و پاشکەوتوویی کۆمەڵو رزیوی و گەندەڵی سیستێمی کۆمەڵایەتی بناسێتەوە. بۆیە هۆشیارییەکەی تادوایی هەروا بە نیوە و ناتەواو مایەوە و ئەوەی بەسەردا تێپەڕی کەوا رژێمی فەرمانڕەوای وڵات و دەسەڵاتدارانی شارەکەی خۆی کە ئەو بەدەستیانەوە دەیناڵاند و [1] تەنانەت چەند جاریش هاتە سەر ئەوە کە سلێمانییان بۆ بەجێ بهێڵێ، [2] لە یەك سەرچاوە ئاو دەخۆنەوە و لە راستیدا هەموویان پارێزگاری یەك جۆرە بەرژەوەندین. بەڵکوو لەوانەیە بنیادەم بێتە سەر ئەو باوەڕە کەوا مەحوی لای وابووبێ دەتوانرێ لە رێگای ئەوانەوە بەربەرەکانێی ئەمان بکرێت.**

**ئەگەر وا نەبوایە و ئەم هەموو متمانەیەی بە راستی و دروستی و خاوێنی ئەوان نەبوایە، نەدەهات بە شان و باڵی سەرکەوتنی سوڵتان «عبدالحمید»دا هەڵ بدا، کە بەسەرگەلی خەباتکەری یۆناندا زاڵ بوو بوو؛ [3] لە کاتێکا کە کوردەکەی خۆی کە لە هەندێ شوێنی دیوانەکەیدا شانازی پێوە دەکا، لە هیچ روویەکی ژیانەوە لە سایەی**

---

☞

نووری عومری سەرف ئەکا بۆ کەشفی تاریکی لە خەڵق

وەك چرا هەرکەس بە شۆخی مەجلیس ئارایی بکا

[بەیتی دووهەم، پارچەی شەشەم، پیتی «ئەلف»]

**

یاخود:

عەجیبم دێ لە عەقڵی ئەو کەسە وا تێ دەگا مەردە

کەچی وەك خان و خانم دائیما دڵخۆش و بێ دەردە

[بەیتی یەکەم، پارچەی چوارەم، پیتی «هێ»]

(١)بەشێکی زۆری ئەو بەیتانەی لە پەراوێزی یەکەمدا نووسیماننەوە، بەڵگەی ئەم راستیەشن.

(٢)سەیری پارچە شیعری سێهەمی پیتی «زێ» بکە کە لە پەراوێزی سێهەمدا ئیشارەتمان بۆ کرد.

(٣)سەیری پارچەی شیعری پێنجەمی پیتی «نوون» بکە.

حوکمی عوسمانی و سوڵتان «عبدالحمید»دا لە یۆنانییەکان بەختەوەرتر نەبووە. یا نەدەهات چوار خشتەکی بۆ شایەکی ستەمکاری وەك حەمە عەلی شای قاجاری بنووسێ،[1] کە هەموو مێژوونووسان دەڵێن ئێران بە درێژایی مێژووی خۆی مەگەر بە دەگمەن ستەمکارێکی لەو کابرایە بەد رەزاتر و بەد فەساڵتری بە خۆیەوە دیبێ.

راستەکەی لە مەیدانی کوردایەتیشدا، کوردایەتییەکەی مەحوی ئەوەی لەباردا نیە شان لە شانی کوردایەتی یەکێکی وەك نالی و بەڵکوو سالمیش بدا، کە هیچ نەبێ لەبەر دواکەوتنی سەردەمی ئەم و دەرکەوتنی راستی پتر بۆی، دەبوو ئەگەر لەوان پێشیش نەکەوتایە، هیچ نەبێ بگاتە رادە و پلەیان... جووتە چوار خشتەکییەکەشی کە هەستی کوردایەتی خۆی تیایاندا دەربڕیوە،[2] تەنها دەسەچیڵەیەکن لە ئاگری بەتینی کوردایەتی و هەستی نەتەوە پەرستی نالی وەرگیراون.

بە تێکڕای دیوانی مەحوی پارچە شیعرێکی وای تیا نیە کە چ لە مەیدانی ناسینەوەی دوژمنانی گەلی کورد و چ لە مەیدانی گیانی کوردایەتیدا بە قولەپێی «قوربانی تۆزی رێگەتم...»ەکەی نالیدا بگاتەوە. هەروەها ئەوەش کە هاتووە قەسیدەیەکی «بوردە» ئاسای بە کوردی بۆ موسوڵمانانی کورد وتووە، لە رادەیەکی کەمدا نەبێ ناتوانێ پاڵ بە هەستی نەتەوەیی کوردانەوە بنێ و بیبزوێنێ. بەڵام لەگەڵ ئەم رەخنانەشدا دەبێ هەر دان بەوەدا بنێین کەوا مەحویش کەم تا بێشێ هەستێکی نەبە کامی بیری کوردایەتی بووە و ئەمە رووپەکی گەشی ترە لە ژیانی مەحویدا.

لەبارەی شیعرە ئایینییەکانیشیەوە دەبێ ئەوە بڵێین کەوا جیاوازییەکی گەورە لە نێوان جۆری هەستی ئایینی مەحوی و کەسێکی وەك نالیدا هەیە. ئەوەتە لەکاتێکدا کە نالی قەسیدە ئایینییەکانی پڕن لە هەستی بە سۆزی دەروونی کوردێکی ئایین پەروەر و هونەرمەند؛ مەحوی هاتووە رێزی لە باسی ئەو موعجیزانە گرتووە[3] کە زۆریان

---

(١) سەیری چوار خشتەکی پێنجەمی بەشی فارسی بکە.

(٢) سەیری چوار خشتەکی ژمارە ٣٢و ژمارە ٤٠ بکە.

(٣) سەیری «قەسیدەی بەحری نوور» بکە.

تەنانەت بە پێودانی ئایین خۆیشی ساغ نەبوونەتەوە و لە زیادەڕەوی بەولاوە نین. سەرەڕای ئەوەکە باس کردنیشیان، هیچ دەورێکی ئیجابی لە مەیدانی پێش خستنی بیر و هەستی کۆمەڵەدا نابینێ.

راستەکەی کە هەر لەبارەی ئایینەوە تەماشا دەکەین، وا دەبێ هەستێکی قەدەرییانەی پاشکەوتوویش لە بیری مەحویدا بەدی دەکەین کە ئینکاری دەوری هەموو «هۆ»یەك دەکا لە ژیاندا و ئینسان دەکا بە پووشکەیەك بە دەم بای قەدەرەوە.[1]

لە سەردەمی مەحویدا هەستێکی موسوڵمانەتی، وەك شێوەیەکی بەربەرەکانێی ئەمپریالیزم، جیهانی موسوڵمانانی گرتبووەوە و کۆمەڵێ لە رۆشنبیرانی ئیسلام بەو رێگایەدا دەچوون. سەرچاوەی ئەم هەستە لە سەرێکەوە سەودای خەبات لەدژی ئەمپریالیزمی تازەهاتوو و سەرێکیشی لە هاندانی سوڵتان «عبدالحمید»ەوە بوو، کە ئاڵای «پان ئیسلامیزم»ی بەرز کردبووەوە.[2] ئەم هەستە تێکڕا هەستێکی پێشکەوتن خوازانە بووە، چونکە یەکێك بووە لە رێبازەکانی خەبات بۆ پاراستنی سەربەخۆیی وڵاتە ئیسلامەکان لە هێرش و دەست درێژی ئەمپریالیزم، کە چ لە رووی سوپایی و چ لە رووی ئابورییەوە رووی کردبووە وڵاتە موسوڵمانەکان. مەحوی ئەم هەستەی بەئاشکرا تیا دیارە و لەم مەیدانەدا لە رۆشنبیرە موسوڵمانەکانی سەردەمی خۆی دوا نەکەوتووە.

نەك تەنها ئەمەندە، بەڵکوو دەتوانین بڵێین مەحوی تێکڕا لە کاروباری سیاسەتی دەوڵەتان بێ ئاگا نەبووە، دەنگ و باسی جیهانی بیستووەو[3] بەرابەر بە رووداوەکانی

---

(١) سەیری پارچە شیعری ژمارە ٢ی پیتی «ڕێ» بکە.

(٢) دیسانەوە سەیری سەرچاوەی پەراوێزی پێشوو بکە.

(٣) بۆ نموونە، وەك:

ئەهلی عیبرەت ماوەگەر، بێ سەیری «ناسر شا» بکات

دوو لە دوو سێ کەم شەهی کرد و «کش»ێکی رێ نەهات

هاتی وا سەیری نەهاتی کەن کە سەد تیپان سوار

پاسەوانی بوون، لەناو بەستا پیادێ کردی مات

[چوار خشتەکی ژمارە ١٤]

رۆژ، هەڵوێستی بووە.[١] بەڵام ئەم هەڵوێستەی، وەك کەمێك لەمە و پێش باسمان کرد، هەڵوێستی موسوڵمانێکی باوەڕ بە خەلافەتی ئیسلامی بوو، بووە.

***

لە رووی کۆمەڵاتییەوە بۆ ئەم شوێنە ئەمەندە لێکدانەوە بە بەس دەزانم. لە رووی هونەریشەوە بە پێویستی دەزانم بڵێم بەپێچەوانەی ئەوەوە کە مامۆستا «علاءالدّین» سەججادی دەیڵێ:[٢] مەحوی شاعیرێك نەبووە زۆر لە خۆی بکا بۆ شیعر وتن. شیعری کوردی مەحوی هیچ نیشانەیەکی ئەوەی پێوە نیەکەوا پەکی لەسەر کەرەستە و دار و پەردووی شیعر کەوتبێ، یاکون و کەلەبەری شیعری بە وشەی لەسەر زمان قورس و لەسەر گوێ گران پڕ کردبێتەوە. تەنانەت لە بەحرە عەرووزییە گرانەکانیشدا کە تەکنیك و دارشتنیان هەروا بە ئاسانی نایەت بەدەستەوە، شیعری مەحوی رەسایی و رەوانییەکەی خۆی هەرگیز ون ناکا.

من لام وایە بنەڕەتی ئەم گلەیییەی مامۆستا، گرانی واتاو نا ئاسانی تێگەیشتنی هەندێ شیعری مەحوی بێ، وەك خۆیشی ئەوە دەردبڕێ و گلەیی لەوە دەکا کە بۆچی مەحوی شیعری وای زۆرە خەڵك بە ئاسانی لێی حاڵی نابن. لەوانەیە گلەیی وا لە شاعیری ئەم چەرخ و سەردەمە رەوا بێ، بەڵام کردنی لە شاعیرێکی وەك مەحوی بە هیچ کلۆجێ دروست نیە. سەنگ‌و ترازووی شیعری رەسەن لە سەردەمی مەحویشدا هێشتا هەر ئەوە بووە خەڵك بە زەحمەت لێی حاڵی بین و پتر لە مەعنایەك هەڵبگرێ. تەنانەت «خەڵك»ەکەش ئەو رۆژە ئەو خەڵکە نەبووە کە ئێمە ئەمڕۆ لە وشەکەوە تێی دەگەین. خەڵکی شیعر بۆ نووسراو لەو سەردەمەدا چینی سەرەوەی کۆمەڵ بووە، کە

---

(١) بۆ نموونە، وەك:

هوجوومی «هیندو»ی خەت سەر «فەرەنگستان»ی روخساری

بە حەشرێ بوو، وەکوو ئەو حەشرە «میقادۆ» بە «چار»ی کرد

[بەیتی سێهەم، پارچەی یەکەم، پیتی «دال»]

(٢) سەیری وتارەکەی مامۆستا «علاءالدّین» سەججادی بکە کە لە [پاشبەندی] ئەم دیوانەدا نووسیومانەتەوە، لە چوار چێوەی بابەتی «لەبارەی مەحوییەوە نووسیویانە»دا.

بریتی بووە لە مەلاو فەقێو هەندێ شێخ و بازرگان و دەرەبەگی ڕۆشنبیر؛ یان بە واتەیەکی ڕاستتر خوێندەوار و ڕەشە خەڵکەکەش لە یادی کەسدا نەبوون. کەس شیعری بۆ ئەوان نەدەوت، مەگەر هەندێ شاعیری میللی کە شیعرەکانیان لەبەر دەکرا و لە گوێ ئاگری شەوانی زستانی مزگەوت و ماڵان و چاخانەکاندا بە بەزم و ئاوازەوە دەخوێنرایەوە و دڵی دڵدارانی دەکولاندەوە و تینی زاتی دەخستە دەروونی لاوچاکانی ئازا و خوێن گەرم.

من بەش بە حاڵی خۆم گلەییم لە شیعرە فارسییەکانی مەحوی هەیە، هەرچەند مامۆستایان شێخ موحەممەدی مەحوی و کاکەی فەللاح دەیگێڕنەوە گوایە مامۆستا گۆران زۆر ڕای لێیان بووە و بە شیعری باڵا دەستی زانیون. جارێ تێکڕا بیری ئەم شیعرە فارسییانە دووبارەکردنەوەی بیری شیعرەکوردییەکانینی. زیاد لەوەش لەبارەی زمانەوە هەست بە قورسی و لاوازییەکی زۆر دەکرێ تیایاندا. سەرەڕای بەکار هێنانی زۆری وشەی قامووسی وایش کە لە جیهانی ئەدەبی فارسی نەك ئەمڕۆ بەڵکوو سەردەمی مەحوی خۆیشیدا بە وشەی مردوو و لە کارکەوتوو دادەنرێن.

بە پێچەوانەی ئەوەیشەوە کە مامۆستا کاکەی فەللاح دەیڵێ،[1] مەحوی بە هیچ جۆرێ لە ڕیزی پێشەوەی کەسێکی وەك نالییەوە نەبووە. نەك هەر مەحوی، بەڵکوو کەس لە نالی تێ نەپەڕاندووە. ئەو قوتابخانە شیعرییەی نالی لە ئەدەبی کورددا دایهێنا، چڵە پۆپەکەی تەنها هەر خۆی بوو. هیچکام لەوانەی لەپاش ئەو هاتن نەگەیشتنەوە بەودا. هەموویان ماوەیەك لە شوێنی خۆیاندا هاتن و چوون و دوایی قوتابخانەکە تێکڕا ـ وەك قوتابخانەیەکی خوێن گەرم ـ دوایی هات و شوێنی خۆی بۆ قوتابخانەیەکی نوێ چۆڵ کرد کە ئەوەبوو گۆران داینا...

بەڵام لەگەڵ ئەم سەرنجانەشدا کە من دەرم بڕین، تازە مەحوی لەوە دەرچووە کەس بتوانێ بە یەکێ لە چڵە پۆپەکانی شیعری کلاسیکی کوردی دانەنێ. لەناو ئەوانەدا کە

---

(١) سەیری وتارەکەی مامۆستا کاکەی فەللاح بکە کە لە [پاشبەندی] ئەم دیوانەدا نووسیومانەتەوە لە چوار چێوەی بابەتی «لەبارەی مەحوییەوە نووسیویانە»دا.

ڕێچکەی نالییان گرت و ئەو ئەرکەیان بەجێ گەیاند کە داهێنانی قوتابخانەی شیعری نالی لە ئەدەبی کورددا لە ئەستۆی خۆیی گرت، سالم و کوردی و مەحوی و شێخ ڕەزا ئەو چوار کەسەن کە لە پێشی هەموانەوە دەوەستن.

من ئەو کەسە نەبووم کە بە خۆمدا ڕابپەرمووم بە وردی لە تەکنیکی شیعری مەحوی و خاسیەتە هونەرییەکانی بکۆڵمەوە، یا لەگەڵ شاعیرانی سەردەم و بەر لە خۆیدا لە کورد و لە فارس بەراوردێکی ڕەخنەگرانەی بکەم. بۆیە ئەم ئەرکە هەروا زەق لە پێشی ڕەخنەگرانی ئەدەبی کورددا دەمێنێتەوە. بێ گومان بەجێ هێنانیشی بەندە بەوەوە کۆمەڵە ڕەخنەگرێکی ئەدەبی وامان بۆ پەیدا ببێ شارەزای خاسیەتەکانی ڕەوانبێژی عەرەب و کولتووری ئیسلام و هونەری عەرووز و ئەدەبی کلاسیکی کورد و ڕێو شوێنی ڕەخنەگری نوێ بن. دەسا با بە چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژەوە ئەم باسەمان ببڕینەوە و ئیتر خوێندەوارینە فەرموونە سەر سفرە و خوانی ئاوەدان و دەوڵەمەندی شیعرەکانی مەحوی هونەرمەند.

**موحەممەدی مەلا کەریم**

-١-

لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خودا
داوێنی باخودا بگرە، بەردە ناخودا[1]

بێ کەس منم، کەسێ لە زوبانم بگا نیە
هەمدەم خودا نەناسن و دەم پڕ لە یا خودا[2]

عەهد و وەفایە سوخرەیی بەد عەهدی‌و جەفا
هەر ما بە دادی ئەهلی وەفادا بگا خودا[3]

---

-١-

(١) باخودا: ئەوەی لەگەڵ خودا بێ. ناخودا: کەشتیەوان.

واتە: بۆ ئەوەی خوا لە شەڕی ئەم جیهانە رزگارت بکا کە وەك دەریای ئاشووب و هەرا وایە، چارت تەنها ئەوەیە دەسە و دامێنی ئەو کەسە ببی کە بەڕاستی هەموو شتێکی بەدەستە، کە خوا خۆیەتی و گوێ بەوانە نەدەی کە بە دیمەن چارەساز و کارسازن، وەك کەشتیەوان لەناو کەشتیدا بەسەر دەریاوە، چونکە راستەکەی ئەوانە هیچیان بە دەست نیە.

ئەم بەیتە ئیستیعارەیەکی موسەڕەحەی تێدایە، ئەوەتە دنیای تێدا شوبهێنراوە بە بەحر و ناوی پێ‌شوبهێنراوەکە هێنراوە و نیشانەیەکی وایش لە ئارادایە وەك «باخودا» بێ، کە پەیوەندی بە شوبهێنراوەکەوە هەیە، هەرچەند «ناخودا»یش هەیەکە پەیوەندی بە پێ شوبهێنراوەکەوە هەیە، لە نێوان «باخودا» و «ناخودا»یشدا جیناسی لاحیق هەیە، سەرەڕای تیباقی بە دیمەنیان لە مەعنادا.

(٢) واتە: لەم دەریای دنیایەدا کەشتی رۆژگار ئەوەندەی دوور خستوومەتەوە، گەیشتوومەتە شوێنێ کەس شك نابەم تیادا و کەسێك نیە لە زمانم حاڵی ببێ‌و لە دەردم بگاو بە فریامەوە بێت. هەرچیم لەگەڵە بە دەم و دیمەن هەر «یاخودا... یاخودا...»یانە و لە خوا دەپاڕێنەوە، کەچی لەڕاستیشدا لە کۆمەڵێکی خوا نەناس بەولاوە نین.

وشە ئاراییەکی جوان لەم بەیتەدا لە نێوان «بێ کەس» و «کەسێ» و «خودا» و «یا خودا»دا هەیە.

(٣) واتە: بێ وەفایی ئەوەندە پەرەی سەندووە، عەهد و وەفا بووە بە گاڵتەجاڕی ئەو و وەفاداران دادو بێدادیانە و لە خودا دەپاڕێنەوە کە لە چنگی بێ وەفایی رزگاریان بکا... کار گەییوەتە رادەیەك مەگەر خوا هیچی تر نەکا هەر بە دەم هاوار و دادی ئەوانەوە بچێ...

☜

هەر ئەو کەسە کە خەیری دوعای خێری دیـوە لێم
دائـیم دوعـامە شـەڕی لە مـن لابـدا خـودا (٤)

لوتفێ بە حاڵی مـن کـە، وتـم، ئـەو وتـی بـە قـار:
تۆ شێخی بـا خـوداوو ئـەمن شـۆخـی نـاخودا (٥)

غەیری ئەمە کە سوێندی درۆی پێ بخۆن و بـەس
قـوربانی نـاوی، نـاوی لە نـاوا نـەما خـودا (٦)

---



لە «عەهد» و «وەفا» و «بەد عەهدی» و «جەفا»دا لەف‌ونەشری رێك و پێك هەیە، سێهەم بەرابەر بە یەکەم و چوارەم بەرابەر بە دووهەمە.

(٤) واتە: بێ وەفایی و چاکە لەبەر چاو نەبوون بە جۆرێ تەنیوەتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەش کە بەهۆی دوعای خێری منەوە خێر هاتووەتە رێیان، بە جـۆرێ کـەوتوونەتە خـراپـە کـردن لەگەڵم، هەمیشە لە خوا دەپاڕێمەوە کە شەڕیانم لێ لابدا، چ جای ئەوەی بە تەمای چاکە و وەفایان بم.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئەو واتە مەشهوورە کە دەڵێ: «إِتَّقِ شَرَّ مَنْ أَحْسَنْتَ إِلَيْهِ» واتە: خۆت لە خراپەی ئەو کەسانە بپارێزە کە چاکەت لەگەڵ کردوون.

(٥) قار: قین.

واتە: بە یارم وت میهرەبانییەکم لەگەڵ بکە چونکە من عاشقی تۆم و دەرمانی دەردم لای تۆیە. لە وەڵاما وتی: تۆ پیرێکی خوا پەرست و من جوانێکی ژیان پەرستم. ئیتر چۆن دەکەوینە یەك؟ یان: لە وەڵاما وتی: هەرچەند تۆ بە دیمەن شێخی، بەڵام شێخێکی «خود ئا»ی، واتـە: لەگەڵ خۆ هاتوو و خۆ پەرستیت. منیش یارێکی عەیاری کەشتی رانم، کـەشتی رانـیش بـێ وەرگرتنی کرێی خۆی کەس سوار ناکا. ئەو کرێیەش کە من وەری دەگرم بەرامبەر بە میهرەبانی و سوار کردن، بریتیە لە خاوێنی دڵ‌و دەروون.

(٦) واتە: خوا ـ بە قوربانی ناوی بم ـ ناوی هەر بۆ ئەوە لەناوا ماوە کـە سـوێندی درۆی پـێ بخۆن و کەس بۆ لەوە زیاتر ئیشی پێ نیە.

تا زوڵمەتی وجـوودە تـەریکی لە نـووری عـیشق
سێبەر نەما هەتاوە، کە «مـەحوی» نـەما، خـودا (٧)

-٢-

بـۆ گـوم بـووانـی چـۆڵی مـەحەبەتیەتی، خـودا
تـەبشیری «وَالسَّـلامُ عَـلىٰ تـابِعِ الْـهُدىٰ» (١)

مـوستەغنییە لە مـەننی سـەفینە و سـەفینەوان
هەرکەس کە ئیشی هەر بە خودا بێ، نە نـاخودا (٢)

دڵ بۆیە خۆشـی دێ لە نـەخۆشـی بـە پـڕ بـە دڵ
بیمارە چاوی یـار و خـۆشـی دێ لە دەرد و دا (٣)

---

(٧) تەریك: تەنها، دوور.

واتە: تا خۆتت مەبەست بێ و بۆ خۆت بڕوانی، لە تاریکستانی خۆ پەرستیدا دەمێنی. تا لەو تاریکستانەشدا بمێنی، لە تیشکی خۆشەویستی خوا دوور دەبی. کەواتە واز لە خۆ پەرستی بێنە، چونکە کە دەستت لە خۆت هەڵگرت سێبەری بوونت نامێنێ لەگەڵتاو هـەتاوی خـوا ناسینت لێ دەکەوێ. کە خۆیشت لە ئاگری عیشقی خوادا سووتاند ئەوکاتە هەر ئەو لە ئارادا دەمێنێ و خۆییت «مەحو» دەبێتەوە.

-٢-

(١) تەبشیر: مژدە راگەیاندن.

واتە: خواکە دەفەرموێ: ﴿وَ السَّلامُ عَلىٰ مَنِ اتَّبَعَ الْهُدىٰ﴾ کە یەعنی: ئەوانەی رێ ون ناکەن لە سزای رۆژی قیامەت پارێزراو دەبن؛ مەبەستی لەو کەسانەیە کە لە بیابانی خـۆشـەویستی خوادا رێگەیان ون کردووە و سەری خۆیان هەڵگرتووە. مەبەستی ئەوەیە بڵێ رێ بـە دێـی کردنی راستەقینە بریتیە لە رێ ون کردن بە بیابانی بە دەرەتانی خۆشەویستی خوادا.

(٢) موستەغنی: بێ ئیحتیاج. مەن: منەت. سەفینە: کەشتی.

واتە: ئەوەی لە دەریای دەرد و بەڵای دنیادا پشتی بـە خـوا قـایم بـێ، مـنەتی کـەشتی و کەشتییەوان هەڵناگرێ.

(٣) بیمار: نەخۆش، نەرم.

به خودا قەسەم لەگەڵ دڵی خاڵی لە سۆزی عیشق
تەکراری حەرفە بەس دەمی پڕ یا خودا خودا(٤)

گونجایشی جەلالی خەیاڵی ئەوم لە دڵ
جێ بوونەوەی سەمایە، لە یەك دانە کونجوو دا(٥)

لەو ڕۆژەوە جودا بووە لێم ئەو پەریوەشە
ڕۆژم ڕەشە، شوعوور و دڵم لێ بووە جودا(٦)

بەس کاری دڵ توێنەوە «مەحوی» لە پێشتە
«لا یَحْسَبِ الْأُنَاسِيْ أَنْ یُتْرَکُوا سُدیً»(٧)

---



واتە: دڵداری ڕاستەقینە ئەوکەسەیە لە هەموو شتێکا چاو لە یار بکاو ئەو چی بوێ ئەمیش ئەوەی بوێ. جا بۆیەش دڵ هەمیشە حەزی لە نەخۆشییە، چونکە چاوی یار بیمارە و حەزی لە دەردەدار کردنی دڵدارانە. مەبەست لە چاوی بیمار چاوی نەرم و ناسکە. کەواتە شیعرەکە وردەکارییەکی جوانی تێدایە کە ئەوەتە مادەم چاوی یار بیمارە ـ هەرچەندیش مەبەست لەم بیمارییە دەردەداری نیە ـ دۆستان حەز لە بیماری ڕاستەقینە دەکەن.

(٤) واتە: ئەگەر دڵ پڕ نەبێ لە سۆزی عیشق و خۆشەویستی خوا، ناو هێنانی ڕووتی هیچ دادێ نادا و ئینسان هەرچەند ناوی خوا بێنێ، لەوە زیاتری نەکردووە کە ئەلف و بێی دووبارە کردووەتەوە. مەبەست لە «ئەلف» و «بێ» ئەو تیپانەیە ناوی خوایان لێ پێك هاتووە.

(٥) گونجایش: گونجان. جەلال: شکۆ. کونجوو: کونجی.

واتە: جێ بوونەوەی گەورەیی و شکۆی یادی دۆست لە دڵما، ئەوەندە زەحمەتە، وەك ئەوەتە ئاسمان بەو گەورەییە کە هەیە لە دەنکە کونجییەکدا جێی ببێتەوە! کە دیارە چەند بچووکە.

(٦) پەریوەش: وەك پەری، پەری ئاسا. «وەش» وشەیەکی فارسییە بە مەعنا «وەک».

واتە: بەرچاو ڕوونی و هەست کردن و دڵداریم بەندە بەوەوە کە لەگەڵ یار بم. بۆیە لەو ڕۆژەوە کە ئەوم لێ جوێ بووەتەوە، ڕۆژی ڕووناکم بووە بە شەوی تاریك و هەستم نەماوە و دڵم لێ جوێ بووەتەوە.

(٧) بەس: زۆر، گەلێ.

-٣-

بـەجێ نـایێ، دەبـێ روو کـەینە سـارا
حـەقی ئـادابـی مـەجنوونی لە شـارا (١)

کـە چـەرخ ئـەسکەندەری دی دەردەدارە
وتی: ئـەم هـەم بـووە هـەم دەردی دارا (٢)

هەتا حەق ناسیرە، هەر حـەقمە مـەنزوور
وەکوو مەنسوور ئەگەر بـمکەن بـە دارا (٣)

---



واتە: مەحویا! گەلێ کاری قورس و زەحمەتی وات لە پێشە، لەبەر گرانییان لەوانەیە دڵت بتوێننەوە و بیکەن بە ئاو. کـەواتـە ئـادەمیزاد نـابێ وا بـزانـێ بـەرەڵڵا دەکـرێ و هـەرگیز لێی ناپرسرێتەوە.

-٣-

(١) سارا: «صحرا»، دەشت و بیابان. ئاداب: داب و نەریت.

واتە: ئەوەی بیەوێ وەك مەجنوونی لەیلا گرفتاری دەردی عیشق بێ، دەبێ روو بکـاتە دەشت و بیابان، چونکە ئەوە لە ئاوەدانیدا ناکرێ.

(٢) ئەسکەندەر: ئەسکەندەری کوڕی فیلیپی مەقدۆنیایی، ئەوە بـوو بـە لەشکـرێکـی چـل هەزار کەسییەوە رووی کردە رۆژهەڵات و لە « ٣٣١ی پ-ز»دا لای هەولێری ئێستادا داریۆشی شای ئێرانی بەزاند و دەوڵەتی هەخامەنشی رووخاند و ئاگری بەردایە کـۆشك و تـەلارە پـڕ شکۆکانی شاهەنشاکانی ئێران. دارا: داریۆشی سێهەم، دوا پادشای بنەماڵەی هەخامەنشی.

واتە: کە چەرخی زەمانە ئەسکەندەری دی گرفتاری دەرد بووە، وتی وا ئەمیش چووە پاڵ دارا کە ئەم خۆی بەزاندی و تەخت و تاجی لێ سەند. مەبەست لەوەیە دنیا بۆ کەس نامێنێ و کەس خۆی لێ نەگۆڕێ.

(٣) حەق: خـوا. مـەنزوور: مـەبەست. مـەنسوور: حـوسەینی کـوڕی مـەنسووری حـەللاج، یەکێك بووە لە خوا ناسەکانی سەدەی سێهەمی کۆچی. هەندێکیش بە پیاوێکی جادووگەر و فێڵبازیان داوەتە قەڵەم. لە حاڵەتی جەزبە و سۆز لێ هاتندا دەستی دەکرد بە «أَنَا الْحَقّ» وتن.

نــەگــەیمە ئـەو جـوانـە و گـەیمە پـیری
مــەدەد یــا پــیری پــیرانــی بـوخارا (٤)

لەبــەر زار و نـەزاری بـوومە وەك پـووش
دە ئـــــەمجا رابـــــوێرە مـــن بـــە زارا (٥)

مەگەر تۆ عەرزی حاڵم کـەی لە کـن یـار
قــەڵەم، ســـاغی قسـە: مـن نـیمە یـارا (٦)

---



مەلاکان قسەکانییان بە پێچەوانەی شەرع دانا، لەبەر ئـەوە بـە گـرتنیان دا. هـەشت سـاڵی لە بەندیخانەدا بردە سەر. لە سەردەمی «المقتدر بالله»ی عەباسیدا لە زیندان هێنایانە دەرەوە و هەزار داریان لێ دا، ئەوجا هەردوو دەست و هەردوو پێیان بڕییەوە و پاشان لاشەشیان ئاگر تێ بەردا. بەڵام لەناو خەڵکدا وا مەشهوورە کەوا لە سێدارەیان داوە.

واتە: تا خوا یارمەتی دەرم بێ، هەر حەق دەڵێم؛ با وەك مەنسووری حەللاجیش لەسـەر «حەق» وتن هەڵمواسن و لە سێ دارەم بدەن.

(٤)مەدەد: یارمەتی، وشەیەکە بۆ داوای یارمەتی بەکار دێ. بوخارا: شـارێکـە لە کـۆمـاری ئۆزبەکستانی سۆڤیەتی. پیری پیرانی بوخارا: «بهاءالدّین محمد» کوڕی ئەحمەدی فارووقی کە بە «شاهی نەقشبەند» نـاوبانگی دەرکـردووە، لە ٧٩١ی ـ ك (١٣٨٩ی ـ ز)دا کـۆچـی دوایـی کردووە. گۆڕی لە بوخارایە، تەریقەتی نەقشبەندی بە ناوی ئەوەوە ناوی دەرکردووە.

واتە: پیر بووم و نەگەیشتم بە پیرێکی دەستگیر کە بمخاتە سەر ڕێگەی ڕاست... دەسا شاهی نەقشبەند فریام کەوە یارمەتیم بدە...

(٥)زار و نەزاری: لەڕو لاوازی، دوو وشەی فارسین. زار: دەم.

واتە: لەبەر دووری تۆ لەڕو لاواز بووم. لە لەڕو لاوازیشدا وەك پووش زەرد و باریك بووم. سا با جارێك بە دەمتدا بێم و ناوم بهێنی.

لە نێوان هەردوو «زار»دا جیناسی تەواوو لە نێوان «زار» و «نەزار»دا جیناسی ناتەواو هەیە.

(٦)یارا: توانا.

واتە: ئەی قەڵەم! من خۆم ناتوانم، مەگەر تۆ حاڵم لای یار باس بکەیت و حاڵی دەردمی بۆ بنووسی و داوای لێ بکەی جارێ ناوم بهێنێ.

لە نێوان «یار» و «یارا»دا جیناسی ناتەواو هەیە.

لەڕم دی زاهــید ئــەم زســتانە، زانــیم
کــــلك نــادا بــە زرپــنگی بــەهارا[٧]

وەرە دەســتێ بــە خــوونم کـە نـیگارین
خــوێنــی مـن حـەڵاڵت بـێ، نـیگارا![٨]

زوو ئەو شۆخە لە عاشق وەردەچـەرخـێ
لەگەڵ کەس، چەرخە ئەو، ناکا مـودارا[٩]

موژەی خوێنێ دەکا هەر لەحزە، سـەیرە!
ئەمەندە گوڵ لە بن یـەك نـووکە خـارا[١٠]

---

(٧) زرپنگ: گیای زوو ڕەس.

هەرچەند بە دیمەن وشەی «زاهید» واتە کەسێ دەستی لە دنیا داشۆردبێ، لای مەحوی کینایەیە لە کەسێکی دیاری لەوانەی لەناو خەڵکی سەردەمدا بە خوا ناس و دنیا نەویست بەناوبانگ بوون، بەڵام ئەم بەو چاوە بۆ ئەوکەسەی نەڕوانیوە. هەروەها «سۆفی» و «شێخ» و «واعیز»یش. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەماندا بە پێویستی نازانین ئەو ناوانە بهێنین. ئەوەی لای ئێمە مەبەستە تەنها ئەوەیە کە مەحوی کەسێك بووە بە هەموو هێز و توندییەك بەرهەڵستی ئەوەی کردووە کەسانێکی تایبەتی لە ژێر پەردەی پیرۆزی دیندا، دنیا پەرستی بکەن و ماڵی دنیا کۆ بکەنەوە...

(٨) خوون: خوێن. نیگارین: وێناوی، ڕەنگین. نیگار: یاری وەك وێنە جوان.

واتە: ئەی یاری وەك نیگار جوان، خوێنم حەڵاڵت بێ، وەرە دەستت بە خوێنم ڕەنگاوی بکە.

(٩) چەرخ: نەگونجاو و وەرگەڕاو.

واتە: ئەو شۆخە زۆر زوو لە دڵدارانی خۆی پەشیمان دەبێتەوە و پشتیان تێ دەکا... یارێکی نەگونجاوە، لەگەڵ کەس نایکرێ.

(١٠) لەحزە: تاو. خار: دڕك.

واتە: هەر تاوێ بە تیری برژانگی یەکێ دەکوژێ و هەر برژانکێکی تیری کوشتنی دڵدارێکە. سەیرە لە بن هەر نووکە دڕکێکدا ئەوەندە گوڵ بێ.

مەبەست لە گوڵ دڵۆپی خوێنی ڕژاوی دڵدارە کوژراوەکانە.

که شك بەم «مەحویا» هەر شەربەتی مەرگ
لەسـەر ئـەرزا نـیه ئـاوی گـەوارا [١١]

- ٤ -

«یـار از وفـا گـذشت بـر ایـن کُشـتەی جـفا
شـد مشـهدم ز مـقدم او روضـەی صـفا» [١]

«چـون در قـفاش دل شـدەگـانش نـمیفُتند
کـاکـل کـمند جـان و دل افگـنده بـر قـفا» [٢]

کوردی، زوبانی ئەسڵمە گەر تەرکی کەم بە کول...
بۆ فارسی، بە کـوللی ئـەمن دەبـمه بـێ وەفـا [٣]

---

(١١) ئاوی گەوارا: ئەو ئاوەی بە ئاسانی قووت بدرێ.

واتە: مادەم من هەر شەربەتی مەرگم دەسگیر ببێ، رووی زەوی، بەش بە حاڵی من، ئاوی گەوارای وەك تیا نەبێ وایە.

- ٤ -

ئەم پارچە شیعرە لە دیوانە چاپ کراوەکەی مەحویدا نیە.

(١) واتە: یار لە رووی وەفا دارییەوە بە سەر ئەم کوشتەی بێ مەیلی خۆیەدا تێپەڕی. بە هۆی ئەو تێپەڕینەیەوە کە دەمێ بوو چاوەڕوانی بووم و لەبەر نەبوونی شەهید بوو بووم، جێگای شەهید بوونەکەم کە بە خوێنی خۆم رازابووەوە و بوو بوو بە گوڵزار، بوو بە باخچەی خۆشی و رابواردن...

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکی تردا بەم جۆرەیە:

«بیت الحزن شد از قدمش روضةُ الصّفا»

(٢) واتە: مادەم یار کاکۆڵی خۆی کردووە بە کەمەندی گیانی دڵداران و دڵیانی داوە بە کۆڵیا، ئیتر چۆن دۆستە دڵ رۆیشتووەکانی ـ بە دوای دڵە رۆیشتووەکانیاندا ـ نەکەونە دوای، یا چۆن دڵیان لە دوایەوە نەکەوێ، کە یەکە یەکە لە کۆڵی دادەکەون...

(٣) بە کول: بە تەواوی. بە کوللی: بە یەکجاری.

دووری مەبینە تۆ لە کەریمی بەها نەجۆ
هەرچی کە کوردە پاکی ببەخشێ بە «بُوالوَفا»(٤)

عەفوم کە «یا عَفُو» بە حەق جاهی ئەو شەهە
ئایەی عولووی جاهی ئەوە ئایەتی «عَفا»(٥)

مەحموودی «فِی السَّما»یە، حەبیبی خودایە ئەو
مەقبوولی بارەگاه، ئەوە موختار و موستەفا(٦)

---



مەحوی بەم بەیتە بەڵگە بۆ بەردەوام نەبوون لەسەر بە فارسی وتنی ئەم پارچە شیعرەی دێنێتەوە. لە هەمان کاتیشدا بەیتەکە نیشانەیەکی ئاشکرای هەستی کوردایەتی مەحوی و شانازی کردنیەتی بە زوبان و کەلەپووری میللی نەتەوەکەی.

(٤) بەها نەجۆ: ئەوەی داوای نرخ ناکا. «بُوالوَفا»: مەبەست پێغەمبەرە (د.خ). دووریش نیە ئیشارەتێکی تێدا بێ بۆ «أبُوالوَفا»ی کوڕی شێخی «سراج الدّین»ی تەوێڵە کە مەحوی خۆی خەلیفەی شێخی «سراج الدّین» بووە، لەبەر ئەوە کە کوردە و یەکێکە لە خاسانی خوا.

واتە: پێویستە شیعر بە کوردیش بڵێم و کوردی شوورەیی نیە و کورد ئەگەر گوناهباریش بن، دوور نیە خوای بێ بریتی -بەخشندە- هەموویان ببەخشێ بە پێغەمبەر چونکە ئوممەتی ئەون، یا بە شێخ «أبُوالوَفا» لەبەر ئەوە کە کوردە و یەکێکە لە ئەولیا.

لە نێوان «بەکول» و «بەکوللی»دا جیناسی ناقیس هەیە.

(٥) ئایە: نیشانە. عولوو: [«عُلُوّ»]، بەرزی. ئایەتی «عَفا»: ئایەتی: ﴿عَفَا اللّٰهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ﴾ واتە: خوا لێت خۆش بێ، بۆ ڕێگەت دان، کە باسی تاقمێ لە دوو ڕووەکانی سەردەمی پێغەمبەر دەکا داوایان لە پێغەمبەر کردبوو ڕێیان بدا لەگەڵی نەڕۆن بۆ غەزا؛ چونکە گوایا پێیان ناکرێ بڕۆن و دەستیان گیراوە، خوایش بەو ئایەتە و بە ریزە ئایەتێکی تر پەردەی لە روو هەڵماڵیون و دەری خستووە کەوا لەبەر دەس گیراوی و سەرقاڵی نیە ناڕۆن بۆ غەزا، بەڵکوو هەر لە بنەڕەتا باوەڕیان بە خوا نیە.

واتە: ئەی خوای بەخشندە، لەبەر خاتری پایە و شان و شکۆی ئەو پێغەمبەرە کە ئایەتی: ﴿عَفَا اللّٰهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ﴾ نیشانەی بڵندی پایەیەتی، بمبەخشە و لێم ببوورە.

(٦) واتە: ئەو پێغەمبەرەی کەوا لە ناو مەلائیکەتانی ئاسماندا بە «مەحموود» ناوبانگی

«صَــــلّٰى عَــــلَيْهِ إِلٰيــــهُنا مَــــا يَــلِيقُ بِــهِ
مَــعَ صَــحْبِهِ وَ آلِــهِ وَ الأَهْــلِ ذِى الصَّــفٰا» (٧)

«تشـویش حـال مـن، تـو ز تـخلیط مـن بـفهم
ز اهــل زمــانه بس کـه رسـد بـر دلم جـفا» (٨)

«گــفتا بُــتم: وفــا طـلب از مـن تـو «مـحویا»
در عمر خـود شـنیده‌ای از عـمر اگـر وفـا» (٩)



دەرکردووە و خۆشەویستی خوایە و پەسەندی بارەگای ئەوە و هەڵبژاردە و پوختەی ئادەمیزادە.
مەبەست لەوە کە پێغەمبەر لە ناو مەلائیکەتانی ئاسماندا بە «مەحموود» مەشهوورە، ئیشارەت کردنە بۆ ئایەتی: ﴿وَ مُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بِعْدِي اسْمُهُ أَحْمَد﴾ کە بە زوبانی حەزرەتی عیساوە دەیگێڕێتەوە کە بە خەڵکەکەی وتووە موژدەی هاتنی پێغەمبەرێکتان دەدەمێ کە لەپاش خۆم دێ و ناوی ئەحمەدە. ئەحمەد و مەحموودیش هەردوکیان لە یەك ریشە دروست کراون.
(٧) واتە: ئەوەندەی شایانیەتی، خوای ئێمە رەحمەت بەسەر خۆی و هاورێیان و خزم و کەس‌وکارە موسوڵمانەکانی و بەسەر خێزانی پاکیدا برێژێ.
(٨) واتە: بەوەدا بزانە حاڵم تێك چووە، کەوا دەبینی شیعری فارسی و کوردی و عەرەبیم تێکەڵی یەك کردووە؛ یان قسەی تێکەڵ و پێکەڵ دەکەم، ئەوەش لەوەوەیە کە مەینەتێکی زۆرم لەسەر دەستی ئەهلی ئەم زەمانەدا چەشتووە و دەردێکی زۆر بەسەر دڵمدا هاتووە.
نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەسنووسێکدا بەم جۆرەیە:
«ز اخلاط بس که من رسدم بر جگر جفا»
(٩) واتە: دۆستەکەم، کە وەك بت دەیپەرستم، پێی وتم: ئەگەر بە عومری خۆت بیستوومە عومر وەفای بۆ کەس بووبێ، تۆیش داوای وەفا لە من بکە. مەبەستی دۆست ئەوەیە کە خۆی وەك عومری دڵدار وایە.

-٥-

ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵڕەنگت لە گوڵ چ بکا؟!
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ، بولبول لە چڵ چبکا؟![1]

کە هەڵگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە
نەچێتە سەر تەریقەی حەزرەتی پەروانە، دڵ، چبکا؟![2]

بە ئاهم گەر رەقیبانت بسووتێن ئەی گوڵی رەعنا
مەڕەنجە، تۆ خودا شوعلە لە ئاقاری چقڵ چبکا؟![3]

---

-٥-

(١) مەحوی لەم بەیتەدا لەلایەکەوە دڵی شوبهاندووە بە هەنگو رووی یاری شوبهاندووە بە گوڵو ماچی لێوی یاری شوبهاندووە بە مژینی شیلەی گوڵو دەڵێ: هەنگی دڵم بێ مژینی شیلەی ماچی لێوت گوڵی رووتی بۆ چیە؟! لە لایەکیکەشەوە دڵی شوبهاندووە بە بولبول و باڵای یاری شوبهاندووە بە چڵی دار گوڵو رووی یاری شوبهاندووەتەوە بەگوڵو دەڵێ: کە تۆ رووی خۆت داپۆشیبێو بولبولی دڵم رووی وەك گوڵت نەبینێ، چی دەسگیر دەبێ بەسەر چڵی باڵاتەوە بنیشێتەوە!.

(٢) تەریقە: تەریقەت، رێوشوێنی خواپەرستی لای ئەهلی تەسەووف.

واتە: کە لە نووری بەرەکەتی ئەو ئاسۆ خۆش و فراوانەوە کە بۆ سەرخۆش پەیدا دەبێ، چرای جوانی دۆست داگیرساو دڵ بە خۆشەویستی راستەقینەی خۆی گەیشت کە ئازادی و سەربەستییە لە کۆت و زنجیری ئەم جیهانە پڕ لە پێوەندە، ئیتر دڵ چی بۆ دەمێنێتەوە لەوە زیاتر کە بچێتە سەر رێو شوێنی پەروانە و خۆی لەپێناوی ئەو ژیانە خۆشەدا بسووتێنێ!.

(٣) رەعنا: جوان و باڵا رێك و بەرز. ئاقار: ئاست، سنوور.

مەحوی لەم بەیتەدا بەدکاری شوبهاندووە بە دڕك و باڵای یار بە گوڵو ئاه و هەناسەی گەرمی خۆی بە بڵێسەی ئاگر و دەڵێ: ئازیزا لێم مەڕەنجێ ئەگەر بەدکاری بەینمان کە وەك دڕك وان بە دەوری گوڵی رووتاو رێیان لێ گرتووم، بە هەناسەی گەرم و ئاه و نزوولەی من ئاگریان تێ بەر ببێ، چونکە ئاگر کە گەیشتە دڕك و پووش، گڕی تێ بەر دەداو چارێکی تری لەوە بەولاوە نیە.

**هــەتا مــاوە دەبــێ ئــەشکی نــەدامــەت داوەرێنــێ چــاو**
**عەرەق ریتن نەبێ، شەخسی لە کاری خۆ خەجڵ چبکا؟! (٤)**

**ســـەفەر جـــائیز نـــیە، بـا بـۆ حـەرەم بـێ، لەو بـەروبوومە**
**فەقەت مەجزووبی زنجیری نـەسیبی ئـاو و گـڵ چبکـا؟! (٥)**

**فــەڵەك هــەرگا کــەسێکـی هـەڵبـڕی، وەقـتی هـیلاکـەتیە**
**کە سەر بۆ گەیینە پەت بێ، پێ لە کورسی و ئەسکەمل چبکا؟! (٦)**

---

(٤) نەدامەت: پەشیمانی. ریتن: رشتن. لەگەڵ «ریتاڵ» و «ریخ»ی کوردی و «ریخت»ی فارسی یەك ریشەیان هەیە. مەعنایشیان لە بناغەدا هەر یەکە.

واتە: ئەو چاوەی جارێ بۆ تۆی روانیبێ، ئەوەندە خۆی لە ئاستی تۆ بە بێ قابیلەت دێتە پێش چاو، شەرمەزار و خەجاڵەت دەبێ و دەبێ تا ماوە فرمێسکی پەشیمانی داوەرێنێ، چونکە بنیادەمی خەجاڵەت و لە کاری خۆ پەشیمان، لە ئارەقی پەشیمانی رشتن بەولاوە چارەیەك شك نابا.

بەکار هێنانی وشەی «ریتن» لەباتی «رشتن» نیشانەیەکی باڵا دەستی مەحوییە لە کوردی زانیندا.

(٥) بووم: وڵات، جێ. مەجزووب: لە عەرەبیدا واتە: راکێشراو. لە ئیستیلاحی ئەهلی تەسەووفیشدا حاڵەتی جۆرە بێ ئاگاییەکە بەسەر سۆفیدا دێ و دەکەوێتە سۆز کردنێکی بە کوڵ.

واتە: ئاو و گڵ بنیادەم لە خاك و بوومی تۆ هەڵ نەکەنێ، بۆی رەوا نیە بەجێت بهێڵێ، با بۆ حەرەمی مەککەیش بێ.

(٦) واتە: گەردوون کە یەکێکی بەرز کردەوە، ئەوە بۆ ئەوەی بەرز کردووەتەوە کە بیدا بە زەویداو هەر بەرز کردنەوەیەکی بە دیمەن نیشانەی دانەواندنێکی راستەقینەیە و ئەو بەرز کردنەوە بە دیمەنە وەك ئەوە وایە کە پێی بنیادەم بنرێتە سەر کورسی و ئەسکەمل، بۆ ئەوەی بیکەن بە دارا؛ چۆن ئەو پێ نانە سەر کورسی و ئەسکەملە بۆ ئەوەیە کە مل بکرێ بە پەتەوە، ئەمیش بۆ دانەواندنی راستەقینەیە.

ئەم بەیتە یەکێکە لە بە ناخا چوونە فەلسەفییەکانی «مەحوی».

لە عوششاق و رەقیب ئەو شـۆخـە چـاوی لوتـفی وەرگـێڕا
کە ئاسك ئادەمی یا سەگ ببینێ، غـەیری سـڵ چبکـا؟![٧]

چ حاجەت نەرگسی مەستت بکەم وەسفی بـە مـەخمووری
کە چاوێ سورمە کێشراوی خودایی بێ، لە کـل چبکـا؟![٨]

لە هەر جێیەك هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵروخان «مەحوی»
ئەگەر عەقڵی بـبێ، لەو جـێگـە ئـاونگی عـەقڵ چبکـا؟![٩]

-٦-

تێگەیی و شیوەنیە ئـەمڕۆ، دا سـبەی شـایی بکـا
پێگەیوو دەروێشە، دا سوبحەی شەهەنشایی بکا[١]

---

(٧) مەحوی لەم بـەیتەدا یـاری بـە ئـاسك و دڵدارانـی بـە ئـادەمیزاد و بـەدکاری بـە سـەگ شوبهاندووە، کەواتە بەیتەکە لەف و نەشری شێواوی تیایە.

(٨) نەرگس: کینایەیە لە چاو. مەخموور: شەراب لێداو، سەرخۆش.

مەبەستی مەحوی ئەوەیە بڵێ: چاوی یار هەر لە خواییەوە مەستە، پێویست بەوە ناکا بڵێین شەرابی خواردووەتەوە، وەك چۆن چاوێ لە خۆیدا رەش بێ پێویـست بە کلە تێ کردن ناکا.

(٩) مەحوی لەم بەیتە ناسکەیدا عیشقی شوبهاندووە بە رۆژو عەقڵی شوبهاندووە بە ئاونگی شەو کە لەسەر رووی گیاو گوڵ دەنیشێ.

واتە: وەك چۆن کە رۆژ بووەوە ئاونگ بەسەر گیاو گوڵەوە نامێنێ، کە عیشقیش پەیدا بوو عەقڵ ون دەبێ.

لە هەموویش ناسکتر ئەوەیە مەحوی عەقڵی بە ئادەمزادێکی تێگـەیشتوو دانـاوە، بـۆیـە وتوویە: ئەگەر ئاونگی عەقڵ عەقڵی بیێ...

-٦-

(١) دا: تا.

مەبەست لەوەیە بەختەوەری ئەو دنیا بەندە بە رەنجکێشان و ئازار چەشتنی ئـەم دنـیاوە، هەرچەند دەشگونجی تێکرا مەبەست هەر لەم دنیا بێ.

نووری عومری سەرف ئەکا بۆ کەشفی تاریکی لە خەڵق
وەك چرا هەرکەس بە شۆخی مەجلیس ئارایی بکا [٢]

ئەر لە دنیا چاکەیێ سادر بوو، تەفرەی پێ نەخۆی
رووسپی هەر روو رەشە گەر بێ سەد ئازایی بکا [٣]

بۆ دوکانی موشتەریگر حەول ئەدا کاڵا فرۆش
دینی وا دێنێتە قیمەت خواجە ئەعزایی بکا [٤]

---

(٢) کەشف: لادان. مەجلیس ئارایی: کۆڕ رازاندنەوە.

مەحوی لەم بەیتەدا فیعلی «ئەکا»ی بە «دە» دەست پێ نەکردووە، وەك هەموو جارێ وا دەکا، چونکە پێویستی راگرتنی ئاوازی بەیتەکە وای دەوێ «سەرف ئەکا» بە «سەرفەکا» بخوێنرێتەوە. ئەم دیاردەیە لە گەلێ شوێنی تریشدا لەبەر ناچاری دووبارە دەبێتەوە.

واتە: ئەوەی بە جوانی کۆڕی ژیان برازێنێتەوە، وەك چرا رووناکی ژیانی خۆی بەخت دەکا بۆ ئەوەی تاریکایی لە بەرچاوی خەڵك لابداو رێگای ژینی راستەقینەیان بۆ روون بکاتەوە.

(٣) رووسپی: ئافرەتی خۆ فرۆش.

واتە: دنیا وەك ئافرەتی خۆ فرۆش وایە، هەر تاوێ بە بەری کەسێکەوەیە. بۆیە وەك چۆن چاوەڕوانی داوێن پاکی لە ئافرەتی خۆ فرۆش ناکرێ، چاوەڕوانی چاکەش لە دنیا ناکرێ، جا ئەگەر بە رێکەوت هەڵکەوت جارێك چاکەیەك لە دنیا وەشایەوە باوەڕی پێ مەکەن.

لە نێوان «رووسپی» و «روو رەش»دا تیباق هەیە. لە ئەپاڵی روو سپی دانی «ئازایی»یشدا وردەکارییەکی ناسك هەیە، دیارە بیر لێی بێ ئاگا نابێ.

(٤) خواجە: جوولەکە. لێرەدا کینایەیە لە کەسێك ریشێکی زلی وەك ریشی جوولەکەی هێشتبێتەوە بۆ هەڵفریواندنی خەڵك.

واتە: کابرای ریش پان کە بیەوێ ببێ بە «ئەندامی ئەنجومەن»، لێی مەگرن و گلەیی لێ مەکەن... لە رێگای ئەو ئەندامەتییەوە دەیەوێ دەسمایەکەی دەستی کە ئایینەکەیەتی بخاتە مەزاتی ئەوانەی لێی دەکڕن و نرخی زۆرتری پێ پەیدا بکا؛ وەك چۆن بازرگانیش بەدوای دوکانی وادا دەگەڕێ لەسەر رێی کڕیار بێ و خەڵك زۆر رووی تێ بکەن و کەل و پەلی زۆری بۆ تیا بفرۆشرێ.

☞

**رەم دەکا حەتتا لە میهر و مەهـ جنوون ئادابی عیشق**
**سێبەری لێ بارە هەرکەس مەیلی تـەنهایی بکـا (٥)**

---

☞

دەشگونجێ «موشتەریگر» بە «موشتەری گەر» بخوێنرێتەوە و مەعناکەی وای لێبێتەوە: ئەگەر کاڵافرۆش بۆ دووکانێ هەوڵ بدا کە دووکانی کڕیار بـێ واتـە رووی تـێبکـا، لەجـێی خۆیایەتی، چونکە تەنانەت مەلای وەك جوولەکـە ریش پـانیش بـەش بـە حـاڵی خـۆی لەو رێگایەوە دەیەوێ نرخی زۆرتری بەرابەر بە ئایینفرۆشی دەسگیر بێ کە ببێ بە «ئەندامـی ئەنجومەن» و قسـەی رەوا بێ و کاری خەڵکی بکەوێتە لا.

هەرچەند لای ئێمە روون نیە ئەم «ئەنجومەن»ەی مەحوی قسەی لێدەکا چ ئەنجومەنێکە و بابەتی بەیتەکە کێیە، بەڵام دیارە لەو سەردەمەدا ئەنجومەنی وا هەبووە ئەندامەکانی مەلای گەورە گەورە بوون و ئەو مەلایانە لە دەوڵەتەوە زۆر نزیك بوون و پایەکەیان مەترسی ئەوەی لێکراوە ببێ بەهۆی فەوتانی ئایینیان لەپێناوی سوودی دنیا و دەوڵەتدا.

بەیتەکە رەخنەیەکی کاریگەرە، لەو پـیاوە ئـایینییانەی پشت لە رێگـەی راسـتی خـۆیـان هەڵدەکەن بۆ دنیا و، نیشانەیەکی تری دەست داشۆردنی مەحوییە لەم دنیایەی کە لەم رێگـا چەپەڵانەوە دەسگیر ببێ.

پتری کاریگەری رەخنەکەی مەحوی لەوەوە دێ کە ریشی پـانی ئـەو جـۆرە مـەلایانەی شوبهاندووە بە ریشی جوولەکە و، دیارە دنیاپەرستییشیانی شوبهاندووە بە تەماعی جوولەکە بۆ پارە خڕکردنەوە و، دام و دەزگا ئایینییە لەبەر چاوەکانیشیانی شوبهاندووە بە دووکانێکـی جوولەکە کە کەوتبێتە سەر رێی رێبواران...

(٥) رەم: هەڵاتن. میهر: خۆر. مەهـ: مانگ.

واتە: ئەوەی بەهۆی عیشقەوە رەوشتی شێتی گرتبێ، تەنانەت لە مانگ و خۆریش رادەکا... ئینسانی عاشق حەزی لە تەنهاییە تا بە تەنها راز و نیازی دڵی خۆی لێك بداتەوە. ئەوەش کە حەزی لە تەنهایی بێ، سێبەری خۆیشی لێ دەبێ بە بار.

وردەکارییەکی جوان لەم بەیتەدا هەیە، چونکە لەلایەکەوە سێبەر نیشانەی ئاوەدانـییە و عاشقی شێتیش دەشت و چۆڵی دەوێ تا لە ئاوەدانی هەڵ بێ. لەلایەکیکەشەوە مەشهوورە شێت تەنانت لە سێبەری خۆی دەترسێ.

☜

**مــادەری گــێتـی لە شـیری بـڕیـەوە، دەبـڕێتـەوە**
**فائیدەی چی شەخسی لێ کەوتوو بەدادایی بکا! (٦)**

**با حەقیشی بێ، لەبۆ «مەنسوور» «أَنَا الْحَقْ» حەق نیە**
**شێتییە، مەجنوون ئەگەر بێ نازی لەیـلایی بکـا (٧)**

**زوشت و ناشیرینە پیر، ئـەمما چ شـیرینە ئـەگـەر**
**چاوی خوونباری نەدامەت ریشی خورمایی بکا (٨)**

---



لە چەند نوسخەیەکیشدا لەجیاتی «جنوون ئاداب» نووسراوە: «جنوون ئاباد». بەپێی ئەم نوسخانە مەعنای ڕستەکە وای لێ دێتەوە: ئەوەی شێتی عیشق دڵی ئاوەدان کردبێتەوە.

(٦) مادەر: دایك. بەدادایی: بەد ئادایی، بەد ئەدایی، بێ ئوسووڵی.

واتە: کە دنیا پشتی لە کەسێ هەڵکرد و لە شیری بڕییەوە، ئیتر دەبڕێتەوە و هـیچی تـێدا نامێنێ. کەواتە بنیادەمی لێ کەوتوو شەڕی چی دەفرۆشێ و بۆ واز ناهێنێ و دەیەوێ مـەمکی دنیای هەرگیز لە دەم نەبڕێ و لەم ڕێگایەدا خەریکی کاری نائوسووڵ و نابەجێیە!

(٧) واتە: مەنسووری حەللاج هەرچەند حەقیشی بووبێ، نەدەبوو ئەوەندە پێی لێ هەڵبڕێ و خۆی لێ بگۆڕێ و بڵێ «أَنَا الحَق»، چونکە مەجنوون هەرگیز ناگاتە پایەیەك نازی لەیلایی بکاو ئەگەر شتی وا بکا بە شێتی دەدرێتە قەڵەم بۆی.

(٨) زوشت: ناشیرین. خوونبار: پڕ لە خوێن، فرمێسکی خوێنین. خورمایی: سوور.

واتە: پیر ناشیرینە، بەڵام ئەگەر بێتو بیر لە رابـوردووی خـۆی بکـاتەوە و بـە فـرمێسکـی سووری پەشیمانی ریشی خۆی سوور بکا زۆر جوانە، چونکە بـنیادەمی ڕاسـتەقینە ئـەوەیە هەمیشە چاو بە رابوردووی خۆیدا بگێڕێتەوە و لە کردەوە خراپەکانی پەشیمان ببێتەوە.

جاران باو بوو پیرەکان ریشیان دەگرتە خەنە، وەك ئێستا بۆیەی رەش لەسەریان دەدەن یا شانەی رەش کەرەوەی پیادا دەهێنن... جا مـەحویش دەڵێ: لەجـیاتی ئـەوەی خـەنە بگـرنە ریشتان و راستی خۆتان لەبیر بـەرنەوە و بـە درۆ خـۆتـان مـناڵ بکـەنەوە، چـاتر ئـەوەیە بـە فرمێسکی خوێنینی پەشیمانی لە کردەوەی بەدی رابوردووتان، سووری بکەن.

دڵ لە ئیدارکی حەقیقەت بێبەشە بێ داغی عیشق
«مەحویا» دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا[٩]

-٧-

مژدێکی چەندە خۆشە رەقیبی ملی شکا
عەیبی فەقەت ئەوەندەیە یارم دڵی شکا[١]

دای ئیزنی هەرچی دیدە غەزالە لە گەردی رێی
بێچارە کل فرۆشە، رەواجی کلی شکا[٢]

---

(٩) ئیدراك: تێ گەیشتن. بینایی بکا: بڕوانێ.

-٧-

(١) واتە: موژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ گرۆی دڵداران، کەوا بەدکاری بەینی ئەوان و یار ملی شکاند و رۆیی. ئەگەر ئەم مل شکانەی بەدکار عەیبێکی هەبێ هەر ئەوەیە کەوا یار دڵی شکاوە و خەفەتبار بووە، چونکە کەسێك لای رۆیشتووە کە پەیوەندێکی پێوە بووە وەکوو بەدکارەکە بێ.

لە لایەکەی کەشەوە مەبەست لە (دڵشکان) ئەوەتە یار دڵڕەقییەکەی جاران ئارەزووی ئازاردانی دڵدارانی نەماوە و رێگای داون چاویان پێبکەوی و بە تۆزی بەرپێی چاویان بڕێژن، وەك لە بەیتی دووهەمدا دەیڵێ...

(٢) واتە: پاش ئەوەی بەدکاری نێوان یار و دڵداران رۆیی و رێگای هاتوچوو بۆ یار کرایەوە، یار بە تۆزی رێگای خۆی چاوی هەموو دڵدارانی چاولەڕێی رشت و چاوی جوان کردن و بەوە ئیتر بازاڕی ئەو نازدارانەش نەما کە چاویان وەك چاوی ئاسك جوانە، چونکە تۆزی بەرپێی ئەم، چاوی دڵدارانی لە چاوی ئەوان رەشتر و جوانتر کرد. هەی قوڕ بەسەر کل فرۆش، کە ئیتر پاش زۆر بوونی تۆزی رێی یار، کەس ناچێ کلی لێ بکڕێ و کلەکەی ئەویش بێ رەواج کەوت و کەڵکی پێوە نەما.

دەشگونجێ مەعنای نیوە بەیتی یەکەم بەم جۆرە بێ کەوا: یار رێی هەموو چاو جوانانی دا بێن گەردی رێگای هەڵگرن و بیبەن بیکەنە چاویان و چاوی پێ بڕێژن... بەپێی ئەم مەعنایە

☜

تۆ چــوویە بــاغ و پشــتی شکــا، حــەقیە، بــاغەوان
بــازاڕی گـــوڵ شکــاوە، دڵی بـــولبولی شکـــا (٣)

خەندەی لەب و عەبیری خەتی تۆ بــوو وەك مــناڵ
تــۆوی تکــا کــە غــونچە، وەنــەوشە مــلی شکــا (٤)

رووتێ لە سەیری پۆشتەیەك بــوو چ خــۆشــی وت:
سەیری هەیە فەرەس کە پــەرۆشــی جــلی شکــا (٥)

---



زیادەڕەوییەکە لەوەدا دەبێ کەوا یار ئەوەندە جوانە تەنانەت ئەوانەش کە چاویان وەك چاوی ئاسك رەشە، تۆزی رێگای ئەویان دەوێ چاوی پێ بڕێژن و پێی جوان بکەن.

(٣) واتە: کە باخەوان بەهۆی رۆیشتنی تۆوە بۆ نـاوباخ، پشـتی بشـکـێ، حـەقیەتی، چـونکە بەهۆی رۆیشتنەکەی تۆوە بۆ ناوباخ بازاڕی گوڵەکـانی شکـاوە لەبـەر ئـەوە کـە گـوڵ نـیە لە بەرابەری تۆدا ئیددیعای جوانی و بۆن خۆشی بکاو بولبولیش دڵیان شکـاوە، چـونکە تـازە بەهۆی بێ بایەخ بوونی چڵ و گوڵەکانەوە جێگەیەك نەماوە لەسەری بنیشنەوە و بۆی بجریوێنن.

(٤) عەبیر: بۆنی خۆش.

واتە: وەك چۆن مناڵێکی نەوسن کە خواردەمەنییەك ببینێ حەزی لێ بکا بەڵام دەسگیری نەبێ، دەڵێن تۆوی دەتکێ و وەك چۆن ئەگەر ساوا شتی بۆن خۆشی لێ نزیك بکەنەوە دەڵێن بە بۆن دەکەوێ، خونچەیش بۆ زەردەخەنەی لێوی تۆ بوو ئەوەندە گریا پشکووت و دەمـی کرایەوە و بوو بە گوڵ و سیس بوو و تۆوی داوەرییە زەوی... بە هۆی بۆنی خۆشی خـەت و خاڵی تۆیشەوە بوو وەنەوشە بە بۆن کەوت و ملی شکا. مەبەست لە مل شکـانی وەنـەوشە ئەوەتە کە هەمیشە لار دەبێتەوە و قنج ڕاناوەستێ.

«تیباق»ێکی ناسك لە نـێوان «خـەندەی لەب» و «گـریانی غـونچە»دا هـەیە کـە لە «تـۆو تکان»ەکەیەوە دیاری دەدا.

(٥) فەرەس: ماین. پەرۆشی: ئارەزووی بەتین.

واتە: کابرایەکی بەهرەمەندی هەژار و بێ دەسەڵات سەیری کابرایەکی پۆشتە و پەرداخی نەفامی کرد و بەراوردی حاڵی خۆی لەگەڵ حاڵی ئەو کرد، کەوا دنیا بەم جـۆرەیـە ئـینسانی بەهرەمەند و بە قابیلەتی تێدا لاتە و بنیادەمی نەفام و نەزانیش داراو دەوڵەمەندە و لە ئەنجامی ☜

غــونچە دەمــی لە بــاسی دەمـی تـۆوەدا، سـەبا
مشــتێکـی دا لە دەمـی، دەم قسـەی زلی شکـا (٦)

یەعقووب وەش کە «مەحوی»یە، چاوێشەداری هیجر
چاوی بـە گـەردی راهـی بـەشیرت گـلی شکـا (٧)

---



ئەو بەراوردەدا قسەیەکی جوانی کرد، وتی مادەم پۆشاکی جوان و باش بۆ کەسانی وەك ئەم کابرایە بێ، شتی چاکە ماینی رەسەن بە رەسەنی خۆی بنازێو زینی جوانی نەوێ.

هەرچەند مەحوی خۆی لە بەیتەکەدا ئەوەی نەوەتووە، بەڵام لە بەراورد کردنی رووت و پۆشتەکەوە بە یەك و لە باس کردنی ماینی بێ زینەوە دیارە ویستوویەتی کابرا پۆشتەکـەش بشوبهێنێ بە گوێرێژی کورتان لێ کراو.

(٦) واتە: خونچە دەیویست باسی دەمی بۆن خۆشی تۆ بکاو چاو لە تۆ بکاو خۆی وەك تۆ بە جوان و بۆن خۆش بداتە قەڵەم. بای بەیان مشتەکۆڵەیەکی دا بە دەمـیداو دەمـی قسـەی زل کردنی شکاند و کردی بە گوڵ...

مەبەستی مەحوی ئەوەیە بڵێ: پشکووتنی خونچە و بە گوڵ بوونی، هـی ئـەوەیە نـیازی لاسایی کردنەوەی تۆی بووە، بای بەیان مشتەکۆڵەیەکی داوە بە دەمیداو پشکواندوویەتی و دیارە ئەنجامەکەشی ئەوەیە پاش چەند رۆژ سیس ببێ و بوەرێ و هەر تۆ بمێنیتەوە لە مەیدانا...

(٧) یەعقووب: حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەر کە لەتاو دووری یووسفی کوڕی چاوی کـوێر بوو و کە کراسەکەی یووسفیان بۆ هێنا، هێنـای بـە چـاویداو چـاوی رۆشـن بـووەوە. وەش: پاشگرێکە لە زمانی فارسیدا بە مەعنا وەك و ئاسا. بەشیر: ئەوەی موژدە دێنێ.

واتە: مەحوی لەتاو دەردی دووری تۆ تووشی چاوێشە بووە، وەك یـەعقووب کـە لەتـاو دووری یووسفی کوڕی کوێر بووبوو. بەڵام وا بە تۆزی رێگات کە موژدەی هاتنتی بۆ هێناگلی چاوی شکا، وەك چۆن یەعقووب کە کراسەکەی یووسفیان بۆ هـێنـاو مـوژدەی سـەلامەتی ئەویان پێ گەیاند چاوی چاك بووەوە.

وشەی «بەشیر» ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ﴾ واتە: کاتێ کە موژدە هێنەر هاتە لای یەعقووب... تاد، کە کارەساتی بـردن و خسـتنە چـاڵو فـرۆشـتنی حـەزرەتی یـووسف دەگێڕێتەوە...

-٨-

گــەردی ڕێی هـەستاوە جـێ داوا دەکـا
بەختە! مـاڵی چـاوی کـێ ئـاوا دەکـا![1]

وەردەگێڕێ ڕوو کە سوجدەی بەر دەبەم
هەی دەڵێ: کەی نـوێژی ڕۆژاوا دەکـا[2]

چاوە، جێی ئەو شۆخە بێ، وتم و وتـی:
ئەم مەلا شـێخـە قسـەی بـێجـا دەکـا[3]

---

-٨-

(١) واتە: یار هەستاوە کەوتووەتە ڕێ و تۆزی ڕێگای بەرز بووەتەوە، جێی دەوێ لێی بنیشێ. دەسا ئەی بەخت! ئاخۆ یار روو بکاتە کێ و جەواهیر سورمەی تۆزی بەری پێی لە چاوی کێ بنیشێ و ماڵی چاوی کێ ئاوەدان بکاتەوە...

دەشگونجێ «بەختە ماڵی» بە وشەیەکی مورەککەبە دابنرێ و بە مەعنای ماڵی بەختیار بێ. واتە: ئاخۆ ئەو تۆزە ماڵی بەختیاری چاوی کێ ئاوەدان بکاتەوە و لێی بنیشێ و بیکا بە ماوای خۆی!

(٢) واتە: کە چاوم بە ناوچاوی یار دەکەوێ سوجدەی بۆ دەبەم. کەچی ئەو ئەوەندە لێم لالووتە رووم لێ وەردەگێڕێ و بەو روو وەرگێڕانە ئەوەندە خەفەتبارم دەکا بەرچاوم تاریك دەبێ، یا قژی رەشی دەردەکەوێ و دنیا دەبێ بە تاریکە شەو، کەچی گاڵتەشم پێ دەکا، دەڵێ سەیری ئەم کابرایە کەن کەوا نوێژی ڕۆژاوای دوا خستووە بۆ ئێستا کە دنیا بە تەواوی تاریك بووە و ئێستا نوێژی مەغریب دەکا کە دەبوو زووتر بیکردایە. مەبەست لە نوێژەکە سوجدە بردنەکەیە کە ئەو بردیە بەر رووی یار.

(٣) واتە: وتم هەر چاوم شك دەبەم بۆ ئەوە بشێ ببێ بە جێی ئەو شۆخە. کەچی ئەو وتی: سەیری ئەم مەلا شێخە بکەن قسەی چەند بێجاو ناشیرین دەکا، کە دەبوو وا نەبوایە، چونکە هەم مەلایشە و هەم شێخیشە... من چۆن رازی دەبم بەوە کە لەناو چاوی ئەودا جێ بگرم... من جێی بەرزتر و شایانترم دەوێ.

دەشگونجێ مەعنای نیوە بەیتی یەکەم وابێ کەوا: بە چاوم وت: یاخوا بەختت یار بێ و ببی بە جێگەی یار. بەم مەعنایە بەیتەکە پەیوەندییەکی بە بەیتی یەکەمەوە دەبێ کە وای گەیاند یار کەوتووەتە ڕێ و تۆزی بەر پێی دەرکەوتووە.

لەنێوان (جێی... بێ) و (بێ جا)دا جۆرە تیباقێکی جوان هەیە.

**کوشتەی ئەو چاوەم لە جەمعی کوشتەگان**
**خەنجەری موژگانی، من «مِنها» دەکـا (٤)**

**دا بـە یـەکـبارە بـە بـادا عـومری خـەڵق**
**دێ بە بـا کـاکـۆڵەکـەی تـا تـا دەکـا (٥)**

**چاوەکەی بەیدەستی مـەستیشە، کـەچی**
**هەر بـە لەحـزێ فـیتنەیێ بـەرپا دەکـا (٦)**

**ئەو کە دڵ دوو قـەد دەکـا شـیری بـرۆی**
**ئیکە خەنجەر بۆ بـەقەد خـۆیـا دەکـا! (٧)**

---

(٤)کوشتەگان: کوژراوان. موژگان: برژانگ. «مِنها»: ئیستیسنا، جوێ کردنەوە.

واتە: لە ریزی کوژراوانی عیشقی چاوی یـاردا مـنیش یـەکـێکـم لەو کـوژراوانـە. کـەچی خەنجەری برژانگی چاوی یار بەرابەر بە من نابزوێ، واتە چاوی یار تۆزێ بۆم ناڕوانێ و بەو بۆ نەڕوانین و بەکار نەهێنانی برژانگانە من لە ریزی کوژراوەکان جیا دەکاتەوە.

(٥) دا: تا. یەکبارە: بە یەکجاری. تا تا: تاڵ تاڵ.

واتە: یار دێ تاڵ تاڵی مووی قژ و زوڵفی دەدا بە با، تا بە تـەماشای ئـەو دیـمەنە جـوانـە عومری خەڵك بدا بە با. یا لەبەر ئەوەکە دڵی عاشقان بەسراوە بە مووی قژو زوڵفی ئەوەوە، کە ئەو موانە تاڵ تاڵ کران دڵی عاشقەکان دادەکەوێ و عومریان دەدرێ بە با و دەمرن.

لە نێوان «با» و «تا تا»دا لەو رووەوە کە دوو پیتی «ئەلف» و «بێ»ن، تەناسوب و بەو پێیە کە «بادان» و «تاڵ تاڵ کردن» دژی یەکن تیباق هەیە. لە نێوان «دا» و هەردوو «با» و «تا»کانی «تا تا»یشدا جیناسی لاحیق هەیە.

(٦) بەیدەست: دەستەمۆ. لەحز: لاچاو.

واتە: چاوی دەستەمۆی یار مەستیشە. بۆیە دەبوو هیچ دەسەڵاتی نەبوایـە و هـیچی پـێ نەکرایە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە تەنها لاکردنەوەیەکی ئاژاوەیەکی گەورە دەنێتەوە.

(٧) ئیکە: ئیتر.

واتە: یار کە بە شیری برۆی دڵی دڵداران دەکا بە دوو کەرتەوە، ئیتر خەنجەری بۆچیە و بۆچی دەیکا بە قەدی خۆیدا!.

زامـــی دڵ وێران و مـــاڵ ئـــاوا تـــەبیب
مـــاڵی وێرانـــم کـــە مـــاڵ ئـاوا دەکـا [٨]

تورکی چاوی مەستی «مەحوی» موژدە بێ
وا کـــەبابی جـــەرگ و دڵ داوا دەکـــا [٩]

-٩-

وەك بولبول ئـەو دڵە بـە گـوڵی روو کـە روو دەکـا
پـــەروانـــەیە زیـــارەتی شـەمع ئـارەزوو دەکـا [١]

من وەسڵی ئەو بەرابەری جەننەت دەگرم و ئـەو...
دۆزەخ بە ئاهی سینەیی مـن روو بـە روو دەکـا [٢]

---

(٨)واتە: من زامی دڵم وێرانە و پزیشکەکەیشم کە یارمە بۆ خۆی ماڵ ئاوەدانـە و خـەفەتی هیچی نیە و مەبەستی نیە من چیم بەسەر دێ. بۆیە ئەوەتە مـاڵ ئـاوا دەکـاو دەڕواو بـەجێم دێڵێ... ئەی ماڵ وێران خۆم.

(٩)تورکی چاوی: چاوی تورکی... لە ئەدەبی کۆندا کینایەیە لە چاوی جوان، چونکە چاوی تورکان زۆر جوانە.

واتە: مەحویا! موژدە بێ وا چاوی جوانی یار داوای کەبابی جەرگ و دڵ دەکا بۆ مـەزەی شەرابی مەستی خۆی، ئیتر بەوە زامی دڵت تیمار دەبی و دەردی دەروونت چار دەکرێ.

-٩-

(١)واتە: دڵ کە وەك بولبول بە ناڵە و سۆزەوە روو دەکاتە گوڵی رووی یار، لەبەر ئەوەیە کە رووی یار وەك مۆم وایە و ئەمیش وەك پەروانە و دەیەوێ بە دەوریا بگەڕێ تا دەسووتێ.

(٢)واتە: من ئەوەندە بە پەرۆشم بۆ گەیشتن بەو، دەڵێم ئەگەر پێی بگەم ئیتر بەهەشتم ناوێ. کەچی ئەو ئەوەندە بێ وەفایە، ئەوەندە خۆیم لێ دوور دەگرێ ئاهی سینەم وەك دۆزەخ تاو بسێنێ و هەناسەی گەرمی سینەم لێ دەکا بە ئاگری دۆزەخ.

ریشــێکــی پــان و تــووکی بــنا گــوێ درێژو لوول
سۆفی لە دیـنی لادە بـە دیـمەن لە جـوو دەکـا(٣)

گەر عاشقی لە خوونی جگـەر قـوم دە، دەم مـەدە
مەی خوارە، خام کارە هـەتا هـاو و هـوو دەکـا(٤)

دنــیا بـــە حـیلە مـەیلی بـە ئـەبنای ئـەگـەر بـبێ
ئـەم «دایـە رێزبـار»ە بـە فـرزەندی شـوو دەکـا(٥)

---

(٣) مەحوی لەم بەیتەدا، وەك لە زۆر بەیتی تریشیدا، ئـاوڕ دەداتـەوە بـەلای ئـەو بـە دیـمەن ئەهلی مەعناو بەڕاستی بێ ناوکانەدا کەوا لەبەر ئەوەی خۆیان لە بەهەشتی دڵداری راستەقینە بێ بەشن، چاو لێگەری و دیمەن کارییەکەیان هیچ دادیان ناداو راستییەکەیان ناگۆڕێ. پێیان دەڵێ: ئەمانە دیمەنیان نیشانەی دەروونیانە. بە ریشی پان و تووکی درێژو لوولی بـنا گـوێیـانا ـدوور لە دینەکەیان ـ لە جوولەکە دەچن. بۆیە دیمەن کارییەکەیان نایانگەیەنێتە مـەبەست و ئەنجامێکیان لێوە دەسگیر نابێ.

(٤) دەم: هەناسە. مەی خوار: مەی خۆر. خام کار: ساویلکە و نەزان و تازەکار.

مەحوی لەم بەیتەدا زۆر قووڵ پێ دادەگرێ و بە دەریای عیشقدا رۆ دەچێ. دەیەوێ عاشق نەك تەنها بە بە زام و دەردی خۆی رازی بێ و بەس، بەڵکـوو دەبـێ نـاڵە و هـاواریشـی لێوە نەیەت. دەڵێ: تۆ ئەگەر عاشقی راستەقینەی قوم بدە لە خوێنی جگەری خۆت و بیخۆرەوە و هەناسە مەدە تا تەواوی دەکەیت و ناڵەت لێ نەیەت، چونکە مـەستی راسـتەقینە کـەسێکـە ئەوەندە سەرخۆش بێ لە هۆشی خۆی بچێ، ئەگینا بە نەفام و ساویلکە دادەنرێ.

(٥) ئەبنا: «اَبناء»، کوڕان. دایە رێزبار: دایە رێزوار، ناوی ئافرەتێکـە لە فـۆلکـلۆر و مـێژووی تاقمی ئایینی «کاکەیی» یا «ئەهلی حەق»دا، وەك «سوڵتانی ساق = سوڵتان ئیسحاق» و «سـەید برا» و «بـاوە یـادگار» جـێگـایەکـی تـایبەتی هـەیە. لەنـاو مـوسوڵمـانانی ئـەو نـاوچانەدا کـە کاکەییەکانیان تیا دەژین. وا مەشهوورە وەختی خۆی خێڵی کاکەیی تـەفرو تـوونا کـراون و کەسیان لێ دەرنەچووە، ئافرەتێکی دووگیان نەبێ کە ناوی «دایە رێزوار» بـووە، لە شـوێنـی ئاوایی «هاوار»ی ئێستادا خۆی پەنا دەدا تا مناڵەکەی لێ دەبێتـەوە. مـناڵەکـەی کـوڕ دەبـێ، بەخێوی دەکاو پێی دەگەیەنێ. کە گەورە دەبێ خۆی شووی پێ دەکاو وەچەیان لێ دەکەوێتەوە

☞

ئەشکەوتی بایەکە دەمی واعیز کە دێتە وەعز
وەقتی سکووتی نەقشی سمێڵی لە قوو دەکا (٦)

دا عەکسی جیلوە دەرنەکەوێ، نەك لە چاکییە
ئەو شۆخە چاکی سینەیی «مەحوی» رفوو دەکا (٧)

---



و دیسانەوە خێڵەکەیان زیندوو دبێتەوە. هەر چۆن بێ، راست و درۆیی ئەم رازە لای ئێمە ئاشکرا نیە. زۆریش رێی تێ دەچێ دەست هەڵبەست بێ و لە ئەنجامی ناکۆکی بیری کاکەییەکان و موسوڵمانە سوننییەکاندا دروست کرابێ!. کاکەییش تاقمێکن لە تاقمەکانی موسوڵمانان، لە کوردستانی عێراقدا لە ناوچەی تاوغ «داقووق» و لە دێی «هاوار»ی سەر بە «هەڵەبجە» دەژین.

واتە: هەرگیز بە دنیا پشت ئەستوور مەبە و دەست لە دڵداری خۆت هەڵ مەگرە، چونکە ئەگەر جاروباریش وا رێ بکەوێ دنیا لا بە لای ئینساندا بکاتەوە، لاکردنەوەکەی بە فڕو فێڵ دەبێ و لاکردنەوەیەکی ناپەسەند و نادروست دەبێ، وەك شوو کردنەکەی «دایە رێزوار» بە کوڕەکەی.

بێ (ن): دەبوو، بەڵام بەپێی ئەم نوسخەیە شەرت و جەزاکە ناکەونە یەك.

(٦) واعیز: ئامۆژگاریکەر. وەعز: ئامۆژگاری. سکووت: بێدەنگی. قوو: پەلەوەرێکە مل و گەردنێکی درێژی هەیە و مەلەوانی دەکا؛ پەڕێکی نەرم و جوانی رەش و سپی هەیە نانیشێتە سەر یەك.

واتە: گوێ مەدەرە پەند و ئامۆژگاری واعیزی زۆر بڵێ... قسەکانی چونکە لە باوەڕو دڵو دەروونێکی پاکەوە دەرناچن، کەڵکی هیچیان پێوە نیە و کە دەم دەکاتەوە بۆ پەند دادانی خەڵك ئەوەندە زۆر دەدوێ، دەمی دەڵێی ئەشکەوتی پڕ لە بایە و کە بێدەنگیش دەبێ دەم و سمێڵی لە سەرو کەللەی تەیری قوو دەکا.

(٧) دا: تا، بۆ ئەوەی. چاك «ی دووهەم»: لەت، توێ توێ. رفوو: پینە.

واتە: لە چاکی خۆی نیە یار کە دێت سینەی لەت کراوم دەدوورێتەوە. بۆیەی دەدوورێتەوە چونکە وێنەی خۆیی تیایە و ئەگەر نەیدوورێتەوە وێنەکەی دەردەکەوێ و ناشیەوێ دەرکەوێ.

-١٠-

دەوری هەر چاوێكـی ئـەمڕۆ داوە سـەد فـەوجی بـەلا
دین و دڵ یەغما دەكەن، چاری كەن ئەی شێخ و مەلا (١)

وەسیەتی مەجنوونە: هەركەس دەردی دنیا عـارە بـۆی
خۆ بكا وەك من بـە دەردی عـیشقی یـارێ مـوبتەلا (٢)

كــۆتـری دڵ، چـەنگولی بـازی قـەزا یـەعنی مـوژەی
دی، بە زوڵفی چوو پـەنا بـا، كـەوتە نـێو داوی بـەڵا (٣)

---

-١٠-

ئەم پارچە شیعرە، چ لە دەستنووسەكانی بەردەستماندا و چ لە نوسخە چاپەكـەشدا، بـەپێی ریزی تیپەكانی ئەلف و بێ بۆ «لامەلفەلا» دانراوە كە لەپێش «ی»وە دێ. دیارە مەحویش، وەك شاعیرەكانی تری سەردەم و پێش خۆی ویستوویە بۆ هەر پیتێك پارچە شیعرێكی هەبێ. بەڵام لەبەر ئەوەكە لە راستیدا پیتێك نیە ناوی «لامەلفەلا» بێ، ئێمە گێڕامانەوە جێگای راستەقینەی خۆی لە پیتی «ئەلف»دا كە ئێرەیە.

مەحوی ئەم پارچە شیعرەی بەبۆنـەی كـۆچـی دوایـی سـەردەستەی شـاعیرانـی عـیشق دۆستی كورد «مەولەوی»یەوە وتووە.

(١) یەغما: تاڵان.

واتە: چاوەكانی یار ئەوەندە فیتنە گێڕو ئاشووباوین، هەر یەكێكیان سەد فەوج بەڵای بـە دەوردایە، دین و دڵی دڵداران بە تاڵان دەبـەن، دەسـا شـێخ و مـەلاینە خـۆتـان و غـیرەتتان، چارەیەكی بۆ بدۆزنەوە.

(٢) واتە: مەجنوون كە سەردەستەی عاشقانە رای سپاردووە كەوا كێ دەردی دنیای پێ عارە و نایەوێ گرفتاری ببێ و بكەوێتە داویەوە، با وەك ئەو رێگـای عـیشق بگـرێتـە بـەر و خـۆی گرفتاری دەردی عیشقی یارێك بكا، چـونكە تـەنها لە رێگـای دڵداریـیەوە بـنیادەم ئـازادی راستەقینەی خۆی دەستێنێتەوە و لە داوی دنیاو دنیاپەرستی دەرباز دەبێ.

عارە بۆی (ن): بارە لێی.

(٣) چەنگول: چنگ.

**وەقتی نوێژی سەر جەنازەی بۆ شەهیدی عیشق دۆست**
**مـەوج ئـەدا ئـەم ئـاسمانانە لە دەنگـی «اَلصَّـلا»(٤)**

**تا نەبووری تۆ لە سـەر، ڕێ نـاخەیە مـەیدانـی عـیشق**
**سـەر لە پـێشـی پـێ دەبـێ لەم ڕێگـە دانـێی «اَوَّلا»(٥)**

**تـورکی مـن کـوشتارخـانەی عـاشقانی دی، وتـی:**
**مـن «بـرنجی بر یـزید»، ئـێرە «ایکـنجی کـربلا»(٦)**

**«مەحوی» ئەمشەو ئەو پەری شێوەی لە خەو دیبێ، دەبێ**
**بۆیە ئـەمڕۆ «مـەولەوی» کـەوتۆتـە حـاڵی حـەلوەلا(٧)**

---



واتە: کۆتری بەسە زمانی دڵ، چنگی بازی قەزاو قەدەری دی کە برژانگی یارە، لە ترسا چوو پەنای بە زوڵفی برد خۆی تیا حەشار بدا، کەچی لەوێش کەوتە داوی بەڵای زوڵفیەوە.

(٤) اَلصَّلا: «اَلصَّلاة»، وەرن بۆ نوێژ.

واتە: لە کاتی نوێژی شەهیدی عیشق دۆستدا کە مەولەوییە، ئەم ئاسمانانە هەموو دەنگ دەدەنەوە لە بانگەوازی بانگ کردنی فریشتەکان بۆ کردنی نوێژی جەنازە.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بەو حەدیسە کە دەگێڕێتەوە: جارێکیان یەکێ لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) شەهید کرابوو، پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: نـوێژی لەسـەر مـەکـەن چونکە شەهید لەلایەن فریشتەکانی ئاسمانەوە نوێژی لەسەر دەکرێ.

(٥) واتە: ئەو کەسەی ڕێگای دڵداری بگرێتە بەر، دەبێ دەسبەرداری گیانی خۆی ببێ... دەبێ بەرلەوەی هەنگاو هەڵبێنێتەوە دەست لە گیانی خۆی داشوا! چونکە ئـەم ڕێگـایە بـە «سەر» تەی دەکرێ نەك بە «پێ»...

(٦) واتە: کە یار کوشتارخانەی دڵدارەکانی خۆیی دی، وتی: مـن یـەزیدی یـەکـەمم و ئـەم شوێنەش کەربەلای دووهەمە.

ئـەم بـەیتە ئیشارەتە بـۆ کـارەساتی کـوشتنی حـوسەینی کـوڕی عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب و هاوڕێکانی لە دەشتی کەربەلا، لەسەر دەستی لەشکری یەزیدی کوڕی موعاویەدا.

(٧) واتە: مەحویا، ڕەنگ بێ ئەمشەو «مەولەوی» عەنبەر خاتوونی پەری شێوەی یار و ژن و

-١١-

**دەم و زارێ تیا مابێتەوە رەنگاری ریق ئەمما**
**پیاڵێکی عەقیقە، پڕ لە بادێکی عەقیق ئەمما**[(١)]

---

☞

خۆشەویستی خۆی لە خەودا دیبێ، وا ئەمڕۆ کەوتووەتە حاڵی حەلوەلاو خەریکە دەمرێ «و مرد»، تا بڕوا خۆی پێ بگەیەنێ و لە رێگای عیشقیدا شەهید ببێ.

دەشگونجێ مەعنای بەیتەکە وا لێ بدەینەوە بڵێین واتە: دەبێ ئەمشەو مەحوی یاری پەری شێوەی خۆیی لە خەودا دیبێ، بۆیە ئەمڕۆ وەك دەروێشی تاقمی «مەولەوی» کە یەکێکن لە تاقمەکانی ئەهلی تەسەووف حاڵی لێ‌هاتووە و کەوتووەتە حەلوەلا کردن. ئەم مەعنایە تەنها لە حاڵێکدا دەست دەدا کە پەیوەندی بەیتەکەمان بە تێکڕای پارچە شیعرەکەوە مەبەست نەبێ.

رستەی «ئەمڕۆ مەولەوی کەوتۆتە حاڵی حەلوەلا» لە نیوەی دووهەمی ئەم بەیتەدا، بە حورووفی ئەبجەد و بەپێی شێوەی نووسینی فارسی ئامێزی جارانی کوردی، واتە بەم جۆرە: «امر و مولوی کوتوتە حالی حلولا» دەکاتە ١٣٠٠، کە ئەوەش بە ساڵی کۆچی، ساڵی کۆچی دوایی مەولەوییە کە بەرابەری «١٨٨٢-١٨٨٣ی-ز»یە.

-١١-

(١) ریق: تف. بادێکی: بادەیەکی. عەقیق: جۆرە مووروویەکە لە هەموو رەنگێکی هەیە، بەڵام گرانبەهاتریان سوورە. بە کوردی پێی دەڵێن: ئاقیق.

واتە: دەمی هەر دڵدارێ رەنگاری تەڕایی دەمی یاری تیا مابێتەوە، وەك پیاڵەیەکی لە ئاقیق دروستکراو وایە کە شەرابێکی سووری ئاقیق رەنگی تیا بێ.

رووی ئەم شوبهاندنە ئەوەیە تەڕایی ناودەمی یار ئەوەندە خۆش و سەرخۆشکەرە، لەگەڵ ماچ و مژینی دەمدا بچێتە ناو دەمی هەر دڵدارێکەوە، لەبەر ئەوە کە لە دەمی یارەوە هاتووە، دەمی دڵدارەکەش دەکا بە پیاڵەیەکی شەراب کە لە ئاقیق دروست کرابێ و پڕبێ لە شەرابی ئاقیق رەنگ.

«ئەمما»ی یەکەم لە داڕشتنەوەی بەیتەکەدا بە پەخشان دەبێ بە سەرەتای رستە و «ئەمما»ی دووهەمیش دەکەوێتە پێش «پڕ لە بادێکی...»یەوە.

**لە پڕ ئەو چاوە هەڵدەبڕێت و جەرگی عـالەمێ دەبـڕێ**
**نیە، هەر بەرقە غەمزەی دڵ شکافی، بێ بەریق ئەمما** (٢)

**لە فیرقەی خاکسـارانـی مـەحەبەت بـفکرە یـەك یـەك**
**بە دیمەن یەك نەفەر، دامەن بە لێوی سەد فەریق ئەمما** (٣)

**بە پێچی خواروخێچ ئـیما دەکـا پـیری تـەریقەت: بـێ**
**حەقیقەت پیرە زاهید پیرە، گوم کردوو تەریق ئـەمما** (٤)

---

(٢) بەرق: برووسکەی ئاسمان. غەمزە: چاو هەڵتەکاندن. دڵ شکاف: دڵ لەتکەر. بـەریق: تیشك.

واتە: یار لە پڕ چاو هەڵدەبڕێ و بە تیری نیگای جگەری کۆمەڵی دڵداران لەت دەکا. لەمەوە دەردەکەوێ کەوا سەرنجی دڵ لەتکەری یار برووسکەی ئـاسمان نـەبێ چـی‌تر نـیە، هـەر ئەوەندەیە وەك ئەو تیشك ناداتەوە.

(٣) خاکسار: ئەوەی لەناو خاك و خۆڵدا بتلێتەوە و خۆی خۆڵاوی بکا. فەریق: تاقم، کۆمەڵە.

واتە: بە دڵ بیر لە کۆمەڵی ئەو دڵدارانە بکەرەوە کـەوا لە خـاك و خـۆڵی خـۆشـەویستیدا دەتلێنەوە. ئەمانە هەرکامیان بگری بە دیمەن تاقە کەسێکە، بەڵام داوێنیان بە لێوی سەد پیاوی گەورە یا سەد تاقمە خەڵکەوەیە. مەبەستی لەوەیە هەرکامیان بگری پایەی ئەوەندە بڵندە چەند کەس بە لێو داوێنی ماچ دەکا.

(٤) ئیما: ئیشارەت. تەریقەت: ڕێگای سۆفییان بۆ خواناسی. تەریق: ڕێگا.

واتە: پیری تەریقەت کە بە دیمەن خۆی بە خواناس دەخـاتە بـەرچـاو، وەك ئـافرەتێکـی ناشیرین کە بیەوێ بە شەدەی لار دڵی دڵداران فریو بدا ئیشارەتمان بۆ دەکاو بانگمان دەکـا بۆلای خۆی کەوا بچین تەریقەت لەسەر دەستیدا وەربگرین. بەڵێ، ڕاستە ئەم پـیرە زاهـیدە پیرە، بەڵام پیری تەریقەت نیە، تەریق و ڕێگای تەریقەتی ون کردووە. بۆیە دیمەنەکەشی کە خۆی بە زاهید و دەست لە دنیا داشۆردوو پیشان دەدا نەیکردووە بە زاهید و دەست لە دنیا داشۆردووی ڕاستەقینە، وەك چۆن ئافرەتێکی پیری ناشیرین شەدەیەکی لار بنێتە سـەری و ئیشارەت بۆ خەڵك بکا، بەو شەدەی لار و ئیشارەت کردنەی نابێ بە شۆخێکی نازدار.

ئەم بەیتە یەکێکە لە شابەیتەکانی مەحوی و پتر لە یەك تەشبیە و ئیستیعارە و وردەکاری ☜

## چــەرا کـــردن لە بـــاغی حـوسنیا، مـەنزووریە چـاوم
## کــە دەگـــرێ ریشـی... لە بـەحرایـە غـەریق ئـەمما(٥)

☞

تێدایە. خواستنی پێچی خوار کە مایەی نازداری و ئـافرەتانی شـۆخـە، بـۆ سـەر و مـێزەری شێخێك کە بۆ ئەو دەبێ بە جنێوو سەرەڕای ئەوە هاو جووت کردنیشی لەگەڵ «خێچ» کە بە یەکجاری بەدناوی دەکا... هەروەها رووت کردنەوەی پیری تەریقەت لە هەموو مـایەیەکـی شکۆی کە تەریقەتەکەیەتی و هێشتنەوەی تەنها سیفەتی پیری بۆی کە دەیکا بە قەوارەیەکی بێ تواناو دەسەڵات...

شوبهاندنی شێخیش بە پـیرە ژنـێکـی عـەیاری خـۆ بـە سـاختە جـوان کـردوو، کـە هـەموو مەبەستێکی هەر فریو دانی خەڵك بێ... ئەمانە هەموو نیشانەی بڵندی ئەم بەیتە و قووڵ ئەو توانجەن کە مەحوی دەیگرێتە ئەو کەرتە شێخە. لە هەمان کاتیشدا نیشانەی ئاگری هـەرگیز خامۆش نەبووی شۆڕشی ناو دەروونی مەحوین لە رووی ئەوانەدا کە لە ژێر پەردەی ئایینەوە بازرگانییان بە راستییەوە کردووە.

خوالێ خۆش‌بوو، مەلا ئەسعەدی مەحوی نیوەی دووهەمی ئەم بەیتەی بەم جۆرە راست کردووەتەوە:

حەقیقەت پیرە زاهید، پیرەکەم کردی تەریق ئەمما

واتە: تەریقی کردەوە.

(٥) چەرا کردن: لەوەڕاندن. مەنزوور: مەبەست. غەریق: خنکاو.

نوسخەی ئەم پارچە شیعرە بە خەتی مەحوی خۆی نەماوە. لەوانەیە هـەر خـۆیشـی بـە دەسەنقەست جێگەی وشە نادیارەکەی نیوە بەیتی دووهەمی بە بۆشی هێشتبێتەوە. لە نوسخە دەسنووسەکـەی رەحـمەتی شـێخ عـومەری کـوڕی مـەحوی و بـاوکی شـێخ مـوحەممەدی کۆکەرەوەی شیعرەکان و لە دەسنووسەکانی‌تریشدا ئەو جێگایە هەروا چۆڵە، بەڵام هەرچۆن بێ مەعنای تێکڕایی بەیتەکە دیارە.

واتە: چاوم ئامانجێکی بەرزی هەیە کە ئەوەتە لە باغی جوانـی یـار بـلەوەڕێ، بـەڵام کـە دەست بە ریشی...ەوە دەگرێو دەیەوێ لەو رێگایەوە بگاتە ئامانجی خۆی، لەبەر ئەوەیە کە ناچارە وەك لەناو ئاو دامابێ و خەریك بێ بخنکێ. مەسەلەیەکی مەشهووریش هەیە کە ئەڵێ: «اَلغَرِيقُ يَتَشَبَّثُ بِكلِّ حَشِيشٍ» واتە: ئەوەی خەریك بێ بخنکێ هەر پل‌و پووشێکی دەسگیر ببێ ☜

دەمێ بوو یار و هەمدەم بوو لەگەڵ دڵ سەبر و هۆش ئاخر
لەبەر بێتابی، ئەو تەشریفی برد و بێ رەفـیق ئـەمما [٦]

بـڵاوەی کـرد و رۆیـی کـۆمـەڵەی یـاران و ئـەهلی دڵ
لە شوومی بەختە «مەحوی» ماوە، بێ یار و رەفیق ئەمما [٧]

ـ ١٢ ـ

بوومە خاکی سەری رێی، پـێیـەکـی تـا پـێمـا نـا
وتی: سەد دەفعە بخۆ ئەی حـەریکەی بـێ مـانا [١]

تەڵەبـی رەحـم و مـرووەت لە دڵی ئـەهلی زەمـان
تــــەڵەبــی ئــاوی حــەیاتە لە ســـەرابســـتانا [٢]

---



دەستی پێوە دەگرێ، ئەگینا ریشی.... شایانی ئەوە نیە کەس دەستی پێوە بگرێ و لە پووشێك زیاتر بۆ مرۆی لە ئاوداگیر خواردوو کەڵکی نیە.

(٦) واتە: ماوەیەك بوو دڵم هاودەمی سەبرکردن و ئارامی و لە هۆشی خۆ نەچوون بوو و بە هۆی ئەو هاودەمەوە دەیتوانی کەمێك ئۆقرە بگرێ. وا ئەو هاودەمەشی سرەوتی نەماو رۆیی و باری کرد و دڵیش بێ هاودەم مایەوە.

(٧) واتە: کۆمەڵی یاران و خاوەن دڵان هەموو مردن. منیش کە ماوم و نەرۆیشتووم، مانەکەم نیشانەی کڵۆڵی و بەدبەختیمە، ئەگینا ئەگەر بەختیار دەبووم وەك ئەوان دەرۆیشتم.

ـ ١٢ ـ

(١) واتە: تا بە تەواوی خۆم لە بەردەستی یاردا زەلیل نەکرد لایەکی لێ نەکردمەوە و تا نەبووم بە خاکی بەری پێی و لەسەر رێیدا نەکەوتم پێیەکی پیا نەنام... ئەوسا کە بەسەرمدا هات و کوتامیەوە گوتی: دە بخۆ، دەی ئەوە دەردت بێ ئەی بزێوی جم و جوولْ کەری نەفام... مەبەستی لە کەمتەرخەمی دۆست و گوێ نەدانیەتی بەو هەموو دەردانەی کە تووشی دڵدار دێن لە پێناوی ئەودا.

(٢) سەرابستان: وڵاتی سەراب، ئەو شوێنەی لە دوورەوە وا دێتە پێش چاو کەوا ئاوی تێدا بێ،

قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە ـ دەبینی مەنسوور
بە سەری دارەوە ـ «ذوالنّون»ە لە بن زیندانا (٣)

لە قسێکی لەبی پشکووتووە شۆری دوو جیهان
قسەیەك سەد لەکی مانا لە لکی دامانا (٤)

قەسەمی گوێی بە چاوی بەچە دا پیری موغان
کە لەمەولا نەبیێ وەعز و قسەی مەولانا (٥)

---



کەچی کە دەگەیتە لای، دەردەکەوێ کەوا بەردە ڕێژە تیشکی خۆر لێی دەداو دەبریسکێتەوە.

واتە: وەك چۆن ئاوی عادەتی خواردنەوە، چ جایێ ئاوی ژیان، لە سەرابستاندا دەست ناکەوێ، داوای بەزەیی و تەمای پیاوەتیش لە ئەهلی ئەم چەرخە بووە بە خەیاڵێکی بەتاڵو هیوایەکی بێ بنەڕەت.

(٣) مەنسوور: مەنسووری حەللاج کە لەسەر ئیددیعای «أَنَا الحَق» کردن، کردیان بە دارا. «ذَاالنّون»: حەزرەتی یۆنس کە ماسییەکی گەورە قووتی داو حەوت ڕۆژ لەناو سکیدا مایەوە، تا پاشان بە خواستی خوا لە قەراغ ئاوێکدا هەڵی هێنایەوە.

واتە: پیاوێ پیاو بێ نەماوە لەسەر زەویداو دنیای دوون جێگەی مرۆی مەردو بە هیممەتی تێدا نابێتەوە. بۆیە وا مەنسووری حەللاج دەکرێ بە داراو پێی لە زەوی دەبڕێ‌و یۆنسی پێغەمبەر دەکەوێتە زیندانی سکی ماسی بنی دەریاوە وکەسیان لەسەر ڕووی زەوی ناژین...

(٤) شۆر: هەراو جەنجاڵ. لەك: سەد هەزار، وشەیەکی هیندییە. لك: چمك. دامان: داوێن.

واتە: شۆر و جەنجاڵی هەردوو دنیا لە گفتێکی لێوی ئەوەوە پەیدا دەبێ‌و هەر قسەیەکی سەد هەزار مەعنا لە چمکی داوێنەیدا شاردراوەتەوە.

(٥) بەچە: بەچکەی پیری موغان. لە ئەدەبی کۆندا ڕەمزی یارە. پیری موغان: پیری سەرگەورەی موغەکان. موغ پێشەوای ئایینیی زەردەشتییانە. مەولانا: لە زمانی عەرەبدا واتە گەورەمان. بە پیری تەریقەت دەوترێ. دووریش نیە ئیشارەت بێ بۆ «مەولانا خالیدی نەقشبەندی».

واتە: پیری موغان گوێچکەی سوێند دام بە چاوی بەچکە موغ، کە لەمەولا پەند و ئامووژگاری پیری تەریقەت نەبیسێ‌و قسەی ئەوی بە گوێدا نەچێ‌و هەر لە مەیخانەدا بەسەر بەرێ.

تۆوی سەر خستووە بن خاکە، سەرئەفرازیی بەر
هەر لە ڕێگەی تەڵەبا بوو سەری دانا، دانا[٦]

وتم: ئەو خاڵە چ بوو هەر کەرەتێکت دەرخست
وتی: داغێ بوو بە جەرگو دڵی «مەحوی»ما نا[٧]

-١٣-

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا
کە خۆ دەرخەی وەکوو خۆر، دڵ وەکوو شەونم لە خۆ بڕوا[١]

---



لە نێوان «بەچە» و «موغ» و «گوێ» و «چاو»دا تەناسوبێکی جوان و لە نێوان «موغ» و «مەولانا»یشدا جۆرە تیباقێکی ناسك هەیە.

گوێمی (ن): خۆمی. لەمەولا (ن): ئیتر گوێ.

(٦) بەر: مێوە، بەرهەم. دانا «ی دووهەم»: ژیر.

واتە: ئەو بەرهەمەی هەڵچووبێ‌و چووبێ بە ئاسماندا، هی ئەو تۆوەیە کە سەری خۆی خستبێتە بنی خاکەوە. پیاوی ژیریش ئەوکەسەیە لە پێناوی دەسکەوتی دوارۆژدا سەری خۆی دادەنێ‌و دەینێتە ناو خاك...

مەبەستی ئەوەیە ئەوەی زۆرتر سەربەرزی مەبەست بێ زیاتر خۆی دەکا بە قوربانی، چونکە تا زیاتر لە خۆت ببووری، پتر بە ئامانج دەگەی، وەك چۆن تۆو هەرچەند باشتر لە خاکدا بشارڕێتەوە باشتر سەوز دەبێ‌و لە ئەنجامدا بەری چاکتر دەدا.

لە نێوان هەردوو «دانا»دا «جیناس»ێکی تەواوی جوان هەیە.

(٧) داغ: داخ.

مەبەستی ئەوەیە: کە ئێستا ئەو خاڵە بە ڕووی یارەوە دەرناکەوێ، لەبەر ئەوەیە بووە بە داخێك و نراوە بە دڵ‌و جەرگی مەحویداو لەوێ سەقامگیر بووە.

-١٣-

(١) واتە: ئەو ڕۆژەی کە دڵم دەتوێتەوە بۆ تۆ، باوەڕ دەکەی کەوا هەرکاتێ تۆ ڕووی وەك ڕۆژ



که ڕۆحم تێ‌گەیی تۆ حەز بە دەرچوونی دەکەی، دەرچوو
دەبـێ عـاشق کـە دی بـێزارە یـاری، بـێ بـڕۆ بـڕوا (٢)

وتـم: بـا لەم دەر و لەم کـۆیـەدا ئـانێ سکـوونەت کـەم
وتی: عاشق دەبێ هەر دەربەدەر بـێ، کـۆ بـە کـۆ بـڕوا (٣)

رەقیبت دەرکە، ئەم بەردەرکە پاکە پیس ئەکا، فـەرمووی:
کـە بـەم بـەرقاپییە لازم سـەگـێکـی وایـە بـۆ بـڕوا! (٤)

وتـی: «مـەحوی» مـن و تـۆ ئـافتاب و سـایە تـیمسالین
جەنابی من کـە دەرکـەوتم، دەبـێ تـەشریفی تـۆ بـڕوا (٥)

---



جوانی خۆت دەرخست دڵم وەك شەونم کە لەبەر خۆردا خۆی ڕاناگرێ، لە خۆیەوە دەڕواو لەناو دەچێ.

لە نێوان هەردوو «خۆ» و هەردوو «بڕوا»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٢) بێ بڕۆ: بێ ئەوەی پێی بڵێن بڕۆ، واتە: هەر لە خۆیەوە تێ‌بگا.

(٣) کۆ: شا ڕێ. ئان: تاو. سکوونەت: ئارام گرتن.

(٤) مەحوی لەم بەیتەشدا، نەك وەك هەموو جارێ کە سەرەتای فیعلی موزاریع بە «دە» دەست پێ‌دەکا لەجیاتی «ئە»، فیعلی «ئەکا»ی لە ڕستەی «پیس ئەکا»دا بە «ئـە» دەست پـێ کردووە، چونکە سەنگی بەیتەکە پێویستی دەکا «ئە»کە قووت بدرێ‌و ڕستەکە بە «پیسەکا» بخوێنرێتەوە.

(٥) سایە: سێبەر. تیمسال: وێنە، وەك.

واتە: یار پێی وتم: من و تۆ وەك خۆر و سێبەر واین. بۆیە کە جەنابی من دەرکەوت دەبێ تۆ بار بکەی و بڕۆی...

- ١٤ -

کەی لە کن ئەحمەق دەبێ حاجەتی دانا رەوا؟!
قەت دەکرێ چەرمەکەر یا بە عەبا یا کەوا؟![١]

بەخششی دنیا مەخۆ، یەعنی بە نانێکی جۆ
خۆ مەکەرە بەر منەت پیرە ژنی نانەوا[٢]

ئێستە کە دەستت دەگا پێ بسووە بۆ نەجات
حەیفە لە دنیا بڕۆی کامی دڵت نارەوا[٣]

گریە: دەجۆشێ لەوێ، ئاهە: دبێ نەسرەوێ
نەمدی وەك ئیقلیمی عیشق جێگە بە ئاب و هەوا[٤]

- ١٤ -

(١) حاجەت: ئیحتیاجی، ئیش و کار و پێویستی. رەوا: رۆیشتوو و جێبەجێ بوو.

واتە: پەنا بردنە بەر مرۆی نەفام و بێ وێڵ بۆ جێبەجێ کردنی کاری ئینسانی هۆشیار، وەك ئەوە وایە چەرمەکەر بکرێ بە عابا، یا بە کەوا، کە دیارە بۆ شتی وا دەست نادا. مەبەستی ئەوەیە کەوا بنیادەمی نەفام کاری باش نارەوێنێ و پێی جێبەجێ ناکرێ.

(٢) واتە: دنیا وەك پیرە ژنێکی نانەواو بەخششی دنیا وەك نانێکی جۆ وایە. نە پیرە ژنەکە شایانی ئەوەیە و نە نانە جۆکە ئەوەندە دەهێنێ کەس منەتی هەڵبگرێ.

(٣) واتە: ئیستا کە هەیت و دەژیت، ڕێگای رزگاری ئەو دنیا بگرە بەر و ئەوەندە پیا بڕۆ تا پێت دەسوێ، چونکە حەیفە ئەم دنیا بەجێ بێڵی و ئارەزووی دڵت شتێکی ناشایان بێ، کە ژیانی تەنیا ئەم دنیایەیە. یا مەبەستی دڵت کە ژینی بەختیاری ئەو دنیایە، بۆت نەچووبێتە سەر.

لە کۆکردنەوەی «دەست» و «پێ» و بەراورد پێ کردنی «ڕۆیشتن» و «نەڕۆیشتن»دا کە لە «بڕۆی» و «نارەوا»وە دەردەکەون. وشە ئاراییەکی ناسك هەیە.

(٤) واتە: وڵاتم نەدیوە وەك وڵاتی دڵداری خاوەن «ئاو» و «هەوا» بێ. گریان لەوێ لە خۆیەوە دێتە جۆش و هەناسە هەڵکیشان سرەوت و ئارامی نیە.

لە دەسنووسەکانی بەردەستماندا رستەی «گریە دەجۆشێ» بە «گریە و جۆشی» نووسراوە. لەبەر ئەوەکە مەعنایەکی ئەوتۆی نەدەبەخشی بە هەڵەمان زانی و بەم جۆرەمان راست کردەوە.

دیــنتم ئــیمانە خــۆ، کــوفرە نــەگـەینم بـە تـۆ
قوڕ بە سەرم، دینە: چـوو، کـافرییە: بـوو ئـەوا (٥)

ئــاگــری داغــی دڵم پــەنبەیە، ســاغت دەویٚ
نــیمە وەکــوو چـاوی یـار تـاقەتی نـازی دەوا (٦)

کێیـە دەڵیٚ بـیٚ نـەوا کـەس نـیە «مـەحوی» نـەبیٚ
بــیٚت و لە هـەر بـن مـوویٚدا ببیٚ سـەد نـەوا (٧)

---

(٥)واتە: ئیمان و موسوڵمانێتی من بەوەیە چاوم بە تۆ بکەویٚ و کافر بوونیشم بەوەیە بە پیٚ گەیشتنت شاد نەبم. دەسا هەی قوڕ بەسەر خۆم. وا بیٚ دین بووم چونکە دیتنتم بۆ نەبوو و کافر بووم.

لە هەردوو وشەی «دین»دا تەوریە هەیە کە هەم بۆ مەعنای ئایین و هەم بۆ مەعنای بینین دەست دەداو جاری یەکەم بۆ مەعنای یەکەم و جاری دووهەم بۆ مەعنای دووهـەم بـەکـار هێنراوە.

(٦)پەنبە: پەموو. دەوا: دەرمان.

واتە: راستت دەویٚ ئاگری داخی دڵم زۆر بیٚ نرخە لام، چونکە سروشتی دڵم وەك هی چاوی یار وایە، وەك چۆن ئەو دەرمانی چاوی بیماری خۆی ناکا، منیش نامەویٚ دڵی داخدارم بخەمە بەر نازی دەرمان و دوکتۆر.

مەبەست لە دەرمان و دکتۆر چاوی یار و نازی چاوی یار خۆیەتی. مەبەست لە بـیماری چاوی یاریش نازدارییەتی، چونکە لە ئەدەبی کۆندا بە چاوی یـاران دەڵێن بـیمار. مـەعنا لیٚ دانەوەی «پەنبە»ش بە بیٚ نرخ، لەوەوەیە کە لە کوردیدا مەشهوورە کەسیٚ گویٚ بە قسەیەك نەدا دەڵیٚ ئەم قسەیە لای من پەمووە یا پەشمە.

(٧)نەوا: ئاوازە.

واتە: کێیە دەڵیٚ لە مەحوی بەولاوە کەس نیە لە جیهانی دڵداریدا بیٚ نان و خوان بیٚ، با بیٚ گویٚ بگریٚ لە بنی هەر موویەکی لەشمەوە سەد ئاوازی عیشق ببیسیٚ. مەحوی لەم بەیتەدا هەر موویەکی خۆی شوبهاندووە بە ژێیەکی ئالەتی مۆسیقا.

- ١٥ -

ئــەی جــەمالت نــووری دیــدەی ئـەنبیا
شامی تـورڕەت سـوبحی عـیدی ئـەولیا[١]

ئــەو بــەرو بــوومە جــەنابی تــۆ تــیای
بــەردی بـۆ مـە دورڕە، گـەردی تـووتیا[٢]

ئــاوی خــزرە خــاکــی ئــەو بــەرقاپییە
دڕکی ئەو بـەردەرکە گـوڵ، پـووشی گـیا[٣]

---

- ١٥ -

مەحوی ئەم پارچە شیعرەی لە سەنا خوانی پێغەمبەردا (د.خ) وتووە.

(١) شام: ئێوارە. تورڕە: دەستە مووی ئەملاو ئەولای ناوچاوان. عید: جەژن.

واتە: ئەی ئەو پێغەمبەرەی کە بینایی چاوانی پێغەمبەران لە جوانی تۆوەیە و دەستە مووی وەك شەو رەشی ئەملاو ئەولای ناوچاوانت وەك بەرە بـەیانی رۆژی جـەژنی پیاوانـی خـوا رووناك و پیرۆزە...

(٢) مە: ئێمە. تووتیا: کلە.

واتە: ئەو وڵاتەی تۆی تیا دەژیت، بەهۆی بوونی تۆوە تیادا ئەوەندە پیرۆز بووە، بەردی بۆ ئێمە بووە بە دورڕو گەردی بووە بە کلە، دەبێ بەردی بکەینە مل و گەردی بە چاودا بێنین.

وشە ئاراییەکی جوان لەم بەیتەدا لە نێوان «بەرو بوومە» و «بەردی بـۆ مـە» و «تـۆ تـیا»و «تووتیا»دا هەیە.

تۆ تیای: لە چەند نوسخەیەکدا بە «تۆی تیای» نووسراوەتەوە.

(٣) ئاوی خزر: ئەو ئاوەی خدری زیندە گەیشتە سەری و لێی خواردەوە و بوو بەهۆی ژیانی هەمیشەیی بۆی.

واتە: بەردەرگای ئەو لە بەردەرگای کەس ناچێ. خاکی نەك هەر لە جێگای ئاودایە، بەڵکوو لە جێگای ئاوی حەیاتیشدایە... دڕکی وەك گوڵ ناسك و بۆن خۆشە... پووشی لە جـێگـای گیای تەڕدایە.

ئـــــافتابی گــرتەوە، وەك كـــاسە، چـــەرخ
سـوالّی لەو روخسـارە بـوو زەرڕێ زیـا[٤]

ئەهلی رەحم و فەزلّی تۆ، «مەحوی» دەخیل
ســەد كـەوا نـائەهلە، رەحـمت بـێ پیـا[٥]

-١٦-

كـە ئـەمری فـەرموو ئـەو شـاهە بـە «إِقْـرَأْ»
ئەگـەر فـەرمانی قـەتڵە كـێ دەڵێ نـە ء؟![١]

---

(٤) ئافتاب: خۆر. چەرخ: گەردوون. زەرڕێ: زەڕرەیەك، تۆسقاڵێك. زیا [«ضیا»]: رۆشنی.

واتە: گەردوون قورسی رۆژی وەك كاسە لار كـردووەتەوە سـوالّی تـۆسـقاڵێ رۆشـنی لە رووی تۆ دەكا بچێتە ناوی.

دەشگونجێ «زەرڕێ» بە «زەڕڕی» بخوێنرێتەوە وەك لە هەندێ نوسخەدا وا نـووسراوە. واتە: زێڕی رووناكی. واتە: ئەو رووناكییەی كە وەك زێڕ وایە یا گرانبەهایە.

(٥) واتـە: تـۆ پیاوێكـی گـەورە و خـاوەن بـەزەییت. دەسـم دامـێنت، مـەحوی هـەرچـەند ناشایانیشە و بۆ ئەوە ناشێ بەزەییت پیا بێتەوە، رەحمێكی هەر پێ بكە.

-١٦-

(١) واتە: كە ئەو شاهی دولبەرانە فەرمانی دا بە دڵدارەكانی كەوا دەفتەری عیشق بخوێننەوە و خەریكی دەرسی عیشق ببن، كەسیان ناتوانێ لە ئاست ئەو فەرمانە ملپێچی بكا. هەرچەند ئەو فەرمانی خوێندنەوەی دەفتەری عیشقە ئەنجامەكەی كوژرانی عاشقەكەش بێ.

شاهە (ن): شۆخە.

دەشگونجێ وشەی «إِقْرَأْ» ئیشارەت بێ بۆ ئایەتی: ﴿إِقْرَأْ كِتَابَكَ، كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً﴾ كە خوا لە رۆژی قیامەتدا نامەی كـرداری هـەركەس دەداتـە دەسـتی خـۆی و پـێی دەفەرموێ: خۆی نامەی خۆی بخوێنێتەوە بزانێ لە جیهاندا چـی كـردووە. مـەبەست لێرەدا ئەوە بێ كە یار نامەی چارەنووسی هەر دڵدارێك دەداتە دەستی خـۆی و پـێی دەڵێ نـامەی خۆی بخوێنێتەوە. جا ئەگەر دڵدارێك چارەنووسی كوژرانیش بێ نكوولی لێ ناكاو ملی بـۆ كەچ دەكا.

قسـەی مـایەی خـرۆشـی «نَشْأَتَـیْن»ە
دوو عالەم نەشئە جۆشـا، لەبـیە مـەنشەء [٢]

بـە یـادی قـامەتی مـاوم بـە پـێوە
«عَـلىٰ مٰـا مِـثْلَهٰا مُـوسىٰ تَـوَكَّأْ» [٣]

بـە هـیجرانـم دەوت «سُـوءَ العَـذٰاب»ە
«فَـلَمّا ذُقْـتُهُ قَـدْ كـانَ أَسْـوَأْ» [٤]

بـە سـۆزی عـیشقە بـوونە «ذی‌كـمال»ت
«إِذِ الأَنْـوارُ مِـنْ ذِي النّـارِ تَـنْشَأْ» [٥]

---

(٢)«نَشْأَتَیْن»، نەشئەتەین: لە بنچینەدا بە هاتنە دنیاو زیندوو بوونەوە دەڵێن، لێرەدا مەبەست لێی مردن و ژیانە. نەشئە جۆشا: ئەوەی نەشئە و ژیان سەر بکا لێیەوە.

واتە: ژیان و مردنی دڵداران بەسراوە بە فەرمانی ئەوەوە و هەردوو جیهانی مەرگ‌و ژین بەندی گفتێکی لێوی ئەون.

(٣)واتە: وەك چۆن مووسای پێغەمبەر پاڵی دەدا بە عاساکەیەوە و دەوەستا، منیش پاڵم داوە بە یادی باڵای قنجی یارەوە و بەو یادە دەژیم.

یاخود واتە: وەك چۆن عاساکەی حەزرەتی مووسا موعجیزەی دەستی بوو، یادی باڵای یاریش بۆ من بووە بە مایەی موعجیزە و من بە یادی ئەوەوە دەژیم، ئەگینا خۆم لە خـۆمـدا یارای ژیانم نەماوە.

بەیتەکە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿ وَمٰا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يٰا مُوسىٰ؟ قٰالَ هِيَ عَصٰايَ أَتَوَكَّؤُا عَلَيْهٰا وَ أَهُشُّ بِهٰا عَلىٰ غَنَمِي وَ لِيَ فِيهٰا مَآرِبُ أُخْرىٰ ﴾ (سوورەتی «طه» ئایەتی ١٧ و ١٨) واتە: خوا بە مووسای فەرموو: ئەوە چیە بە دەستی راستتەوە؟ وتی: عاساکەمە پاڵی دەدەمە سەرو پێی دەخورێم لە مەڕەکانم و مەبەستی تریشم پێی هەیە.

(٤)واتە: دووری دۆستم بە سزایەکی سـەختی وەك سـزای دۆزەخ دەهـاتە پـێش چـاو. کـە چەشتم، دیم لەو خراپترە.

(٥)واتە: بەهۆی ئاگری عـیشقەوەیە هـەر پـیاوێکـی پـێ‌گـەیشتوو پـێ‌گـەیشتووە، چـونکە پێ‌گەیشتن رووناکیە و رووناکیش لە شتێکەوە پەیدا دەبێ کە مادەی ئاگری تیا بێ و عیشقیش ئاگرە.

وتی: ڕاکێشە مل «مەحوی»، سەرەت هـات
«بِسَـــلِّ السَّـــيفِ أَوْمِـي لِي: تَـهَيَّأ»(٦)

شەرەف هەر عـیلمە، نـابینی کـە ئـەشرەف
موشەڕڕەف بوو بە ئەمر ئەووەڵ بە ﴿إِقْرَأْ﴾!(٧)

---

(٦) واتە: یار، بە لادانی کێلانی پەچە لە ڕووی شیری برۆی، ئیشارەتی بۆ کردم کەوا ئامادە بم بۆ کوشتن، چونکە سەرەم هاتووە.

(٧) واتە: شەرەف و سەربەرزی هەمووی بە زانستی عیشق و خۆشەویستی خـوایـە. نـابینی یەکەم فەرمان کە خوا بۆ پێغەمبەری گەورەی نارد ئەوەبوو فەرمووی: ﴿إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ...﴾ (سوورەتی «علق» ئایەتی ١). واتە: بـخوێنـە بـە بـەرەکـەتی نـاوی ئـەو خـوایـە کـە ئادەمیزادی دروست کردووە.

-١-

بـۆ شـەوی هـیجر ئـەو مـەهە وەك ئـافتاب
جیسمی وەك رۆحی، گڵی کردە حیجاب[١]

بەو جـەمالە عـیشق و، بـەو جـاهە حـەسەد
هەم دڵی من، هـەم دڵی دوشـمن کـەباب[٢]

---

-١-

شێخ موحەممەدی مەحوی لە نوسخە دەستنووسەکەی خۆیدا لەسەر ئەم پارچە شیعرەی نووسیوە کەوا لە موسەووەدە دەسخەتەکانی شاعیر خۆیدا دۆزراوەتەوە و لەوێش هەروەك لێرەدا تەنها شەش بەیتە و ئەو بەیتەی کە دەبێ ناوی «مەحوی» تێدابێ لە موسەووەدەکەدا نەبووە.[*]

بەیتی سێهەم و چوارەمی ئەم پارچە شێعرە لە نوسخە لەچاپدراوەکەدا وەك چوارینەیەك لە چاپ دراون.

(١) حیجاب: پەردەی نێوان.

واتە: ئەو یارە وەك مانگ جوان و نازدارە. بۆ ئەوەی شەوی دووری دابهێنێ، هات لەشی وەك گیان ناسکی خۆی خستە ناو پەردەی خۆڵەوە و چووە قەبر، وەك چۆن رۆژ کە ئاوا دەبێ کێوو شاخەکان دەبن بە پەردە لەنێوان ئەوو جیهاندا. لەوە دەچێ مەحوی ئەم پارچە شیعرەی لە لاواندنەوە و پیا هەڵدانی یەکێکدا وتبێ.

(٢) واتە: دڵی من لە خۆشەویستی جوانی ئەو یارەداو، دڵی دوژمن لەبەر بەخیلی بردن بە پایەی بڵندی، هەردوو برژاون و بوون بە کەباب.

---

(*) شێخ موحەممەد، کە وەختی خۆی لەگەڵ مامۆستا گۆران و کاکەی فەلاحدا خەریکی راست کردنەوە و هێنانە سەر رێنووسی نوێی شیعرەکان بووە، بە زوبانی مامۆستا گۆرانیەوە دەگێڕێتەوە کەوا: مەرج نیە غەزەل هەر تاك بێ. رێیش دەکەوێ کەوا جووتیش بێ و ناوی شاعیریشی تێدا نەبێ.

بـــا وجـــوودی لێوی شـــەککـــەرباری تـــۆ
بێ وجـــوودە نـــەشئە بـــەخشینی شـــەراب(٣)

بـــەیتی زاتـــی تـــۆ لە دیـــوانـــی وجـــوود
مۆری حەقکردە بـە نـوقتەی ئـینتیخاب(٤)

بـــێ حـــیسابە گـــەر گـــوناه، بـــاکـــم چـــیە!
حـــەزرەتی ئـــەو شـــافیعە ڕۆژی حـــیساب(٥)

بەر شـــەفاعەی ئـــەو شـــەفیعەم خـــەی خـــودا
خۆشم و ئەحباب و ئەهل و داك و بـــاب(٦)

---

(٣) با: لەگەڵ، وشەیەکی فارسییە. شەککەربار: ئەوەی ئەوەندە شیرین بێ وەك شەکری گرتبێ و باری شەکری بە کۆڵەوە بێ. نەشئە بەخشین: سەرخۆش کردن.

واتە: مادەم لێوی شیرینی تۆ لە ئارادا بێ، سەرخۆش کردنی مەی بە هیچ دانانرێ.

(٤) بەیت: تاقە شیعر، خانوو. دیوان: دیوانی شیعر؛ دیواخان.

واتە: تۆ لە دیوانی شیعری گێتیدا وەك تاقە بەیتێکی هەڵبژاردە، یا لە خانووبەرە و دیواخانی گێتیدا وەك ژوورێکی هەڵبژاردە وەهای کە مۆری خوا کردی بـووبێ بـە نـوختەی نیشانەی هەڵبژاردەیی بۆی. داڕشتنەوەی بەیتەکە بە پەخشان بەم جۆرەی لێ دەکا: «بەیتی زاتی تۆ لە دیوانی وجوودا، مۆری حەق بە نوقتەی ئینتیخاب، کردە».

(٥) بێ حیسابە گەر گوناه: ئەگەر گوناهیشم ئەوەندە زۆر بێ لە ژمارە بەدەر بێ.

(٦) شەفاعە: شەفاعەت، تکاکاری. شەفیع: تکاکار، مەبەست پێغەمبەرە (د.خ). لەوانەشە ئەو کەسە بێ کە ئەم پارچە شیعرە لە لاواندنەوەی ئەودا وتراوە، ئەگەر یەکێك بووبێ لە خاسانی خوا.

-٢-

مـــــاهی مـــــن ڕۆژێ لە ڕوو لادا نـــیقاب
شەو مەگەر هـەڵبــێ لە شـەرمان ئـافتاب[١]

لێوی هـــەر هـــاتە قسـه، ڕۆحـــم چـــووه
بۆ سـوئالی ئـەو، بـەڵێ ڕۆحـه جـەواب[٢]

ئـــــەزیەتم کـــەمتر دەدا، دا ڕۆژی حـــەشر
زۆری ڕانەگرن لەگــەڵ مـن بـۆ حـیساب[٣]

---

-٢-

ئەم پارچە شیعرەش لە موسەوودەی دەسنووسەکانی مەحوی خۆیدا دۆزراوەتەوە و نە لە نوسخە دەسنووسەکانی‌تردا و نە لە نوسخە لە چاپ دراوەکەدا نیە. ئەمیش هەر لە ناتەواو دەچێ.

(١) نیقاب: سەرپۆش. ئافتاب: خۆر.

واتە: یارەکەی من مانگە، بەڵام مانگێکی وایە ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان پەردە لە ڕووی خۆی هەڵماڵێ، تیشکی خۆر بێ‌بایەخ دەکاو ئیتر خۆر لە شەرمان مەگەر هەر بە شەو هەڵبێ کە کەس نەیبینێ!.

کردنی شەو بەکـاتی هـەڵهـاتنی خـۆر بـۆئـەوەی شـەو چـونکە تـاریکە کـەس نـایبینێ، زیادەڕەوییەکی ناسکی تیایە، ئەگەر ئەوە ڕچاو کەین کە خۆر هەڵهات شەو بێ‌و ڕۆژ بێ دنیا ڕوون دەکاتەوە و کەس نەبینین لە مەیدانا نامێنێ.

لە نێوان «ماه» و «ئافتاب» و «شەو» و «ڕۆژ»دا هەم تەناسوب» و هەم تیباق هەیە.

(٢) واتە: کە لێوی یار جووڵایەوە و هاتە دەنگ، من دەس‌بـەجێ گـیانم دەردەچـێ‌و ڕادەکـا بۆلای ئەو، چونکە لە وەڵامی قسەی ئەودا، مەگەر هەر ئەوەم پێ‌بکرێ گیان بدەم بەدەستەوە.

(٣) واتە: یار لەبەر ئەوە نیە کە خۆشی دەوێم و دڵم ڕادەگرێ، بۆیە لە دنیادا ئازارم کەم دەدا. بەڵکوو لەبەر ئەوەیە ئەوەندە مەبەستیەتی لێم دوور بێ، دەترسێ ئەگەر لەم دنیادا ئازارم بدا، لەو دنیا بیخەنە بەر لێ‌پرسینەوە و زۆر لەگەڵمی ڕاگرن کە ناشیەوێ لەگەڵمی ڕاگرن.

لە پاک‌نووس نەکراوەکەی دەسخەتی مەحوی خۆیدا ئەم بەیتە بەم جۆرەش نووسراوە کە لەجیاتی «دا» «نەك» و لەجیاتی «ڕانەگرن» «ڕابگرن» بێ.

رامــە حــەتتا بـۆ سـەگـێکـی وەك رەقـیب
ئــەو جـــەنابە هــەر لە مـنیە ئـیجتیناب(٤)

-٣-

زللەی موعەللیم، ئەو گوڵی روومەتیە خستە تـەب
﴿تَبَّتْ يَدٰا أَبِي لَهَبٍ﴾ی بـێ ئـەدەب ﴿وَ تَبَّ﴾(١)

ئـــازاری دام و هـەرکەسە کـردی لە گـردی خـۆی
هــێزمکـەشی جـەهەنمە ﴿حَـمّالَةَ الْـحَطَب﴾(٢)

---

(٤) رام: دەسەمۆ. ئیجتیناب: خۆ دوورگرتن.
لە نێوان «جەناب» و «ئیجتیناب»دا وشە ئاراییەکی ناسك هەیە.

-٣-

(١) تەب: تاو، سوور بوونەوە.

مەحوی لەم بەیتەدا مامۆستایەکی شوبهاندووە بە ئەبوولەهەب و ئەو دوعای شەڕەی لێ کردووەکە خوا لە قورئاندا لە ئەبوولەهەبی کردووەکە فەرموویەتی: ﴿تَبَّتْ يَدٰا أَبِي لَهَبٍ وَ تَبَّ﴾ واتە: یاخوا دەستەکانی ئەبوولەهەب وشك بن و وشکیش بوون. هـۆی ئـەو شـوبهاندن و دوعای شەڕ کردنەش ئەوە بووە، وەك چۆن ئەبوولەهەب دەسـتی خـۆی بـەکـارهێناوە بـۆ دەس‌درێژی بۆ سەر پێغەمبەر (د.خ)، ئەو مامۆستایەش شەقازللەی لە بناگوێی قوتابییەکـی ناسکی جوانکیلە داوە.

واتە: زللەی مامۆستا گوڵی روومەتی ئەو قوتابییەی سوور کـردەوە، یـاخوا دەسـتەکـانی وشك بن کە دەوری دەستی ئەبوولەهەبی بێ ئەدەبیان دیووە.

(٢) گرد: دەوروپشت. هێزمکەش: ئەوەی دار دەگوێزێتەوە.

واتە: یار ئازاری دڵی دام و بە فیتنەی ناحەز خراپەی لەگەڵ کردم. ئەوانەی کە یار لە دەوری خۆی خڕی کردوونەتەوە و دڵی داونێ هەموو فیتنە و قسەبەرن و خراپەی منی لا دەڵێن. ئەمانە خۆش‌کەری ئاگری دۆزەخن و داری بۆ دێنن، وەك سەعدی شیرازی دەڵێ:

میان دو کس جنگ چـون آتش است    سـخن‌چین بـدبخت هـیزم‌کش است

زاهـیـد، خـــودا لەنـــاوی بـەرێ، نـاوی عـاشقان
بۆچی دەبا ئەوەندە، خـودایـا، بـە بـێ ئـەدەب![٣]

دڵ هەر بـە داغـی عـیشقە ئـەگـەر ئـیمتیازی بـێ
وەك نوقتەی ئینتیخابە لەسەر شیعری مونتەخەب[٤]

واعـــیز، لە مـــن بـــڵێ بـەنەزەر تـەعنە بـەس بـدا
دینی بـتانە دیـنی مـن، ئـەو مـەزهەبی زەهـەب[٥]

هـــەر رۆژە مـــردنێکـــیە بـژیێ بـــە رۆحـــی وا
دەستی کەوێ بە گرتنەوەی دەسـتی بـۆ تـەڵەب[٦]

---



واتە: شەڕ لەنێوان دوو کەسدا وەك ئاگر وایە و ئەوەش کە قسە لەنێوان ئەو دوو کـەسەدا دێنێ و دەبا وەك ئەوەیە دار بێنێ بۆ ئەو ئاگرە.

وشـەی ﴿حَمَالَةَ الحَطَب﴾یش وەك ﴿تَـبَّتْ یَـدا﴾ی بـەیتی پـێشوو لە سـوورەتی «تَبَّت» وەرگیراوە کە خوا لەبارەی ژنەکەی ئەبوولەهەبەوە دەفەرموێ: ﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَب﴾ واتە: ژنەکەی ئەبوولەهەب کە دار دەگوێزێتەوە.

(٣) مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٤) واتە: بە زاهید بڵێ بۆچی قەدری عیشقی لا نیە و ناوی عـاشقان ئـەوەندە بـە سـووك و بێ‌قەدر دەبا... بۆ نازانێ کەوا دڵ ئەگەر شتێك هەبێ جیای بکاتەوە لە ئەندامانی‌تری لەش و هەڵاوێردەییەکی بداتێ، ئەوەتە کە داخی عیشقی پێوە بێ، وەك شیعری هەڵبژاردەکە خاڵێکی سووری لەسەر دادەنرێ بۆ جیاکردنەوەی لە شیعری‌تر. بۆیە ئەگەر دڵ بە داخی عیشق مۆر نەکرابێ، پارچە گۆشتێکی هیچ و بێ‌بایەخە و شتێکی لە ئەندامەکانی‌تری لەش جیا نیە.

(٥) دین «ی یەکەم»: ئایین. دین «ی دووهەم»: بینین. زەهەب: زێڕ.

واتە: بە واعیز بڵێ با بەس بە چاو تانەم لێ بدا. من بەس نـیە ئـایینم بـریتیە لە پـەرستنی نازدارانی جوان... خۆ ئەو پەرستیاری زێڕو دنیایە و بەدوای ماڵی دنیادا وێڵە کە چڵکی دەستە.

جیناسی تەواو لە نێوان هەردوو «دین» و وشە ئاراییەکی نـاسك لەنـێوان «مـەزهەب» و «زەهەب»دا هەیە.

(٦) تەڵەب: داوا، سواڵ.

**بـــابی وتـــی بـــە هـــامە: غـەزەب ئـەو بـڵێسـەیە**
**بەربۆتە رۆحی بابت و بەر عومری «بوولەهەب»** (٧)

**هــەم دەمکــوژێت و دیـن و دڵیشـم دەبـا، دەڵێ:**
**من «مَنْ قَـتَل»، ئـەمیشە قـەتیلم، «لِـيَ السَّـلَب»** (٨)

**«مەحوی»ی وت و زوبـانی جـوابـم نـەبوو، گـەرا**
**لێوی لە لێوم، ئــەو دەمـە رۆحـم گـەیشتە لەب** (٩)



واتە: من بڵێم چی بەو، بە ناو زاهیدی لە راستیدا دنیاپەرستە، ئەو ژیانەی ئەو ئەژیێ بـە رۆحێکی واوە کە بەهۆی دەست پان کردنەوەوە لەم و لەو بۆ شت، دەستی کـەوێ، ئـەگـەر هەستی بکردایە هەر رۆژێکی ژیانی خۆی بە مردنێك دادەنا.

بژیێ (ن): ژینی.

(٧) هامە: دەڵێن کوڕی شەیتانە.

واتە: شەیتان بە هامەی کوڕی وت تووڕەیی ئەو بڵێسە ئاگرەیە کە گیانی باوکتی سووتاند و کافری کرد و عومری ئەبولەهەبی دا بە با.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بە مەسەلەی تووڕە بوونی شەیتان و رازی نەبوونی بە سوجدە بردن بۆ حەزرەتی ئادەم کە سەرەنجام کێشایەوە بۆ ئەوە لە بەهەشت دەریکەن.

لە رستەی «بابی وتی بە هامە»دا ئیشارەتێکیش بۆ «باب» و «بهاء الله»ی لەمەڕ بەهائییەکان کراوە، هەرچەند مەعنایەکی ئەوتۆیش نابەخشێ. هەروەها لە «ئەو بڵێسەیە»دا کە بە رێنووسی کۆن لەگەڵ «ابلیس» یەکی دەگرتەوە ئیشارەتێکی واتا نەبەخشیتر هەیە.

(٨) واتە: یار منی کردووە بـە کـافری جـەنگی، وەك چـۆن لە حـەدیسی پـێغـەمبەردا (د.خ) دەفەرموێت: «مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُه» واتە: هەرکەس کافرێکـی لە جـەنگدا کـوشت، کـەل و پەلەکەی بۆ ئەوە، ئەمیش دەیەوێ بشمکوژێ و دین و دڵیشم بە تاڵان بەرێ.

(٩) لەب: لێو.

واتە: یار ناومی بە زوباندا هات، بەڵام من نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە. هەرکە لێوم لە لێوی گەڕاو ویستم شتێ بڵێم گورج گیانم گەیشتە سەر لێوم و مردم.

- ٤ -

بە یادی ئەو لەبە، ئەی شۆخی روومەت رۆژی مەه غەبغەب
لەبالەب ما لە نالەم سینە، هەروەك کۆتری لەبلەب [١]

لە وەقتێکا کە رۆحم گەییە سەر لەب، رۆحی من بە فدات
دەبێتە رۆحی تازە، ئەو لەبەم گەر بێنیە سەر لەب [٢]

بەجێیە چونکە ئەو هەستا قیامەت جیٚبەجیٚ هەستا
لە چەرخ ئەمشەو، وەکوو ئەشکم لە دیدە، داوەری کەوکەب [٣]

ئەگەر واعیز دوسەد تەعنە بدا، تەعنێکی لیٚ نادەم
ئەگەرچی موستەحەققی لەعنە، با بۆ رافزی بیٚ سەب [٤]

---

- ٤ -

ئەم پارچە شیعرەش لە دیوانە چاپ کراوەکەدا نیە.

(١) غەبغەب: گۆشتی ژێر چەناکە. لەبالەب: لێوان لێو، پڕ. لەبلەب: گمەگمکەر.

واتە: ئازیز لەبەر بیرلیٚ کردنەوەی لێوی تۆ سینگم وەك کۆتری گمەگمکەر پڕە لە ناڵە.

(٢) واتە: لەکاتی گیان دەرچوونمدا کە گیانم دەگاتە سەر لێوم، ئەگەر لێوت بنێیتە سەر لێوم، زیندوو دەبمەوە و گیانێکی تازەم دەکریٚ بەبەردا.

(٣) چەرخ: ئاسمان. کەوکەب: ئەستێرە.

واتە: شتێکی بەجێیە لەبەر رۆیشتنی یار قیامەت دابیٚو ئاسمان ئەستێرەکانی لیٚ داکەونە خوارەوە، وەك چۆن دانەی فرمێسك لە چاوەکانی من دادەوەرێن.

(٤) تەعن: تانە. لەعن: لەعنەت. رافزی: ئەوانەی لە لادان لە ریٚو شوێنی ئەهلی سونتەتدا لە سنوور لادەدەن و بە هیچی رازی نین. سەب: جنێودان.

واتە: با من وەك حەزرەتی عائیشەی حەرەمی پێغەمبەر بم کە رافزییەکان بوختانی بەدەمەوە دەکەن و جنێوی دەدەنیٚو واعیزیش وەك رافزی بیٚ. هەرچەند ئەو بەگوێرەی شەرع شایانی لەعنەت لیٚ کردنیش بیٚ، من هیچی پیٚ ناڵێم با جنێودان هەر بەشی ئەو بیٚ.

**حەزەر لەم حەشری بێ وادەی لە قەبر هەڵساندنی مردوو**
**بەسەر قەبری شەهیدانا بە شۆخی لنگ ئەدەی مەرکەب [٥]**

**شەوی ریحلەت پدەر ـ رۆحی مورەووەح ـ وەسیەتی فەرموو:**
**مەحەبەت مەزهەبت بێ، نووری چاوم، مەیکەشی مەشرەب [٦]**

**دوو ئەسپە مەنزڵت پێ تەی دەکەن تا سەرحەدی مردن**
**بە دیققەت «مەحویا» تێفکرە، شەو شەبدێزە، رۆژ ئەشهەب [٧]**

---

(٥) حەزەر: ئاگاداربە. مەرکەب: وڵاخ.

ئەم بەیتەش پەیوەندی بە بەیتی پێشوەوە هەیە، دەڵێ: بەدگۆ چابوکانە وڵاخی بە خراپە ناوبردن بەسەر گۆڕی شەهیدانی دڵداریدا تاو دەدا. با ئاگای لە خۆی بێ لەم حەشری ناوادەی لە گۆڕ هەڵساندنی مردوانە. لەناو خەڵکدا مەشهوورە کە ناوی مردوو بە خراپ بەرن، ئەو لە گۆڕەکەیدا گوێی دەزرنگێتەوە و وا دەزانێ رۆژی حەشر بەرپا بووە.

لەم بەیتەشدا فیعلی «ئەدەی» بە «ئە» دەست پێکراوە، چونکە ئاوازی بەیتەکە وا پێویست دەکا کە لەگەڵ وشەی «لنگ»دا لێك بئاڵێنرێن و بخوێنرێتەوە «لنگەدەی».

هەڵساندنی (ن): هەڵساندنەت. دەگونجێ «هەڵساندنی»یش نەبێ و «هەڵساندنەی» بێ.

(٦) ریحلەت: کۆچی دوایی. پدەر: باوك. رۆحی مورەووەح: گیانی شاد بێ. مەزهەب: رێبازی رێ. مەیکەشی: شەراب دەرخواردی خەڵك دان. مەشرەب: رەوشت. ئاوەخۆرگە.

واتە: باوکم، بە رەحمەت بێ لە شەوی کۆچی دواییدا وەسیەتی بۆ کردم کەوا هەمیشە رێگای خۆشەویستی بگرمە بەر و شەرابی دڵداری دەرخواردی خەڵك بدەم، یا لەسەر چاوەی شەرابی خۆشەویستی خۆم تێراو بکەم.

(٧) دوو ئەسپە: بە دوو ئەسپ، کینایەیە لە پەلەکردن. شەبدێز: وەك شەو رەش، ناوی ئەسپەکەی خوسرەوی پەروێزیش بووە. ئەشهەب: شێ.

واتە: فریشتەی کاربەدەستی جێبەجێ کردنی چارەنووسی ئادەمیزاد بە پەلە رێگای ژیانت پێ دەبڕن تا دەتگەیەننە سنووری مەرگ. باش لەمە وردبەرەوە، ئەم رێگا بەپەلە پێ تەیکردنە دوو ئەسپی تێدا بەکار دەهێنرێ: ئەسپی شەوکە بووە بە «شەودێز» و ئەسپی رۆژکە ئەسپێکی «شێ»یە.

دەشگونجێ بەیتەکە وا مەعنا لێ بدەینەوە کەوا ئادەمیزاد دوو ئەسپی هەیە رێگای ژیانی بەرە و مەرگ پێ تەیدەکەن: ئەسپی شەوکە «شەودێز»یەتی و ئەسپی رۆژکە ئەسپی «شێ»یەتی.

-٥-

که تۆ غایب له بەرچاوم دەبی، چم بێ له تۆ غایب
قیامت حازری بەرچاومە، خۆمم له خۆ غایب[(١)]

خیتابت هەر عیتابە، ئەو لەبە بێتە قسە، هەرکەس
موخاتەبتە، دەکا دەردەم زوبانی گفتوگۆ غایب[(٢)]

له خوێن و خاکەدا «کۆکەن» وتی مەقسوودی «خوسرەو» بوو
ببینن ماجەرا، تەبلیغی کەن شاهید لەبۆ غایب[(٣)]

شوکر تۆ له فکرم ناچی، ئەگەرچی من له فکرت چووم
له من غایب نەبی تۆ، بەسمە، با من بم له تۆ غایب

---

-٥-

(١) چم: چیم. قیام: راست بوونەوە.

واتە: چی بێ له تۆ نهێنی بێ، که تۆ له بەرچاوم ون دەبی، من راست بوونەوەکەی تۆم هەر لەبەرچاودایە و لێم ون نابێ، بەڵام خۆم له خۆم بێ ئاگام و له هۆشی خۆم دەچم.

دەشگونجێ «قیامت» بە «قیامەت» بخوێنرێتەوە، واتە: ئەوەندەم پێ نارەحەت دەبێ رۆژی قیامەتم دێتە پێش چاو و له هۆشی خۆم دەچم.

(٢) خیتاب: گفتوگۆ. عیتاب: لۆمە و سەرزەنشت. دەردەم: دەس بەجێ، یاخود لەناو دەمدا.

واتە: قسەت هەر سەرزەنشت کردن و بەسەردا هاتنە. لەگەڵ هەرکەسیش بێیتە قسە دەستبەجێ زمانی دەشکێ و زمانی گفتوگۆ لەناو دەمیدا ون دەبێ.

(٣) کۆکەن: فەرهادی کۆکەن، دڵداری شیرینی ئەرمەن. خوسرەو: خوسرەوی پەروێز. شاهید: حازر.

واتە: فەرهاد کە لەناو خاك و خۆێندا دەتلایەوە، وتی مەبەستی خوسرە و ئەوەبوو خەڵك ئەو کارەساتە ببینن کە بەسەر مندا هات و ئەوەی دیویانە بیگێڕنەوە و ئەوەی نەیدیوە ببیسێ لەوەی دیویە، بۆیە وای پێ کردم.

دەزانێ ڕۆژە ئەو، من شەو، کەچی پێشم دەڵێ: «مەحوی»
«حضوری گر همی خواهی، مشو «حافظ» از او غایب» (٤)

-٦-

دەپرسی: بۆچی من دەرکەوتم و دڵ بوو لە تۆ غایب؟
کە وەختێ ڕۆژ هەڵات، ئەڵبەت دەبێ شەونم لە خۆ غایب (١)

چ یارایە، بە بێ ئیمایی ئەبرۆ سەیری ئەو چاوە
حەرامە مەیکەشی لەم مەیکەدە بێ ڕوخسەتی حاجیب (٢)

دەپرسن: کیمیا؟ خدمەت بە مەرد، ئەمما بە ئیخلاسی
وەگەرنا، کەم لە «بووبەکر»ی نەبوو خدمەت «ئەبووتالیب» (٣)

---

(٤) واتە: یار دەزانێ خۆی ڕۆژە و من شەوم و دیارە شەو و ڕۆژیش هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە. کەچی پێشم دەڵێ ئەگەر دەتەوێ هەمیشە لای یار بی دەبێ هەرگیز خۆتی لێ ون نەکەی.
نیوە فارسییەکەی ئەم بەیتە لە «حافیز»ی شیرازی وەرگیراوە.

-٦-

(١) واتە: لێم دەپرسی بۆچی هەر کە من دەرکەوتم دڵت لات نەما؟ دەڵێم چونکە تۆ وەك ڕۆژ وایت و دڵی منیش وەك شەونم وایە. دیاریشە کە ڕۆژ هەڵات شەونم لەخۆیەوە دەفەوتێ.
(٢) یارا: وێران. توانا. ئیما: «ایماء»، ئیشارەت. مەیکەدە: مەیخانە. حاجیب: دەرگاوان.
واتە: کێ دەوێرێ سەیری چاوی یار بکا مادەم ئەو بە بڕۆی ئیشارەت نەکا کەوا ڕازییە تەماشای چاوی بکەن... کێ دەتوانێ بە شەرابی چاوی یار مەست ببێ تا دەرگاوانی ئەو مەیخانەیە -کە برۆیەتی- ڕێگا نەدا!.
(٣) واتە: دەپرسن دەڵێن: کیمیا چیە؟ منیش دەڵێم کیمیا خزمەت کردنی مەردانی خوایە، بەڵام بە دڵسۆزی و دڵی پاکەوە، چونکە ئەگەر وا نەبێ خزمەتەکە کەڵکی نامێنێ. نابینی ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەریش (د.خ) کەمتر لە ئەبووبەکر خزمەتی نەکرد بە پێغەمبەر، بەڵام چونکە هینەکەی ئەو لە ئیسلامەتییەوە نەبوو، لەبەر خزمایەتی بوو، ڕزگاری نەکرد لە ئاگری دۆزەخ، وەك چۆن کیمیاگەریش هیچی لە کیمیاگەرییەکەی دەسگیر نابێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە

بەناو ئێمەش ریجالین و ریجالی «هُمْ رِجالٌ» هەم
بەفەجری ناو دەبەن سەد حەیف، ئەگەر سادیق، ئەگەر کازیب (٤)

لە عاریف عامییەك پرسی هەواڵی مەسلەخ و قەسساب
بە ئەنگوشتی شەهادەی کرد ئیشارەی مەحکەمە و نائیب (٥)

---



ئەبوو زۆری لێ دەسگیر بوایە. بۆیەش دەسگیری نابێ چونکە لەبەر تەماع ناتوانێ دڵسۆزانە خەریکی بێ، وەك سەعدی شیرازی دەڵێ:

کیمیاگر به غصه مرده و رنج

هێنانی ناوی کیمیا لەم بەیتەدا لەوەوەیە، جاران مەشهوور بوو ئەوەی کیمیا بزانێ ئاسن دەکا بە زێڕ. بۆیەش لە مەسەلەی کوردیدا دەڵێ «کیمیای ناگاتێ».

(٤) ریجال: پیاوان. فەجر: بەیان. فەجری سادیق: بەیانی راستەقینە کە بەیەکجاری رۆژ دەبێتەوە. فەجری کازیب: بەیانییە درۆزنە کە کەناری ئاسمان رۆشن دەبێتەوە و دیسانەوە تاریك دەبێتەوە.

واتە: ئێمەش پێمان دەڵێن پیاو و ئەو پیاوانەش کە خوا لە ئایەتی: ﴿رِجالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجارَةٌ وَ لا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللّهِ وَ إِقامِ الصَّلاةِ وَ إِيتاءِ الزَّكاةِ، يَخافُونَ يَوْماً تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالأَبْصارُ﴾دا باسی کردوون، (سوورەی «نور» ئایەتی ٣٧) پێیان دەڵێن پیاو. بەیانی راستەقینە و بەیانییە درۆزنەش هەردوکیان پێیان دەڵێن بەیانی.

مەعنای ئایەتەکە ئەوەیە: لە مزگەوتەکانی خواداکۆمەڵە پیاوێکی وا هەن بازرگانی و کڕین و فرۆشتن ناوی خوایان لەبیر ناباتەوە و پەکی نوێژ کردن و زەکات دانیان ناخا. لەو رۆژە دەترسن کە چاو و دڵی تیا ئەبڵەق دەبێ.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخە لە چاپ دراوەکەدا بەم جۆرەیە:

بەناو ئێمەش ریجالین و «رِجالٌ هُم» ریجالن هەم.

(٥) عامی: ئۆمی، یەکێك لەم رەشە خەڵکە. مەسلەخ: جێگای گروونی حەیوانی سەربڕاو.

واتە: کابرایەکی نەخوێندەوار لە خواناسێکی پرسی قەساب کێیە و قەسابخانە کەوتووەتە کوێوە؟. ئەویش بە پەنجەی شایەتیمانی ئیشارەتی بۆ کرد بۆ دادگاو داد بەدەستی دادگا، واتە حوکمەکانی دادگاو داد بەدەستی دادگا ئەوەندە نادروستن، دادگاکە بووە بە قەسابخانە و داد



له حەق بێژی بووه بەحری «أَنَا الحق» هەر قەسیدێکم
لەباتی جائیزە، واجب گەڕا قەتڵم بکەن واجیب(٦)

دڵە عەرشی خودا «مەحوی» خەجاڵەت به لەبەر غەفڵەت
که بۆته بوتکەدەی بێ بەڕهەمەن یا دەیری بێ ڕاهیب(٧)

---



بەدەستەکەیش بووه به قەساب بۆ سەربڕین و گرووی پێستی ڕەش و ڕووت و هەژاران.
مەحوی که دەڵێ «به ئەنگوشتی شەهادەی»... تاد... مەبەستی ئەوەیە وەڵامەکەی ئەوەندەی شایەتیمان لا ڕاستە...

ئیشارەی (ن): ئیشارەت.

(٦) قەسیدێکم: قەسیدەیەکم. جائیزە: خەڵات.

واتە: ئەوەندە قسەی ڕاستم کردووە، هەر قەسیدەیەکم وەك دەریای «أَنَا الحَق» وتنی لێ هاتووە که بوو بەهۆی بەکوشت دانی مەنسووری حەللاج. لەبەر ئەوە پێویست بووە بمکوژن و وەك مەنسوور بمکەن به داراو ئەوە خەڵاتی ڕاست بێژیم بێ.

ئەم بەیتەش نیشانەی ئەوەیە که مەحوی بە قووڵی له سروشتی سیستێمی سەردەم گەیشتووە و زانیویەتی ئەوانەی وتنی ڕاستیان بۆ خۆیان کردووە به پیشە، پاداشیان هەر ئازار و سزاو کوشتن دەبێ.

ئەم بەیتە مۆری تاوانبار کردنە مەحوی ناوبەتی بە ناوچاوی ڕژێمی حوکمڕانی سەردەمی خۆیدا که تەنانەت دادگاو داد بەدەستەکانی به قەسابخانەی خەڵکی ڕەش و ڕووت دادنێ. جا ئیتر دەبێ دەزگای پۆلیس و بەندیخانەی چۆن بووبن.

قەسیدێکم (ن): قسەی دەیکەم.

(٧) غەفڵەت: بێ ئاگایی. بوتکەدە: بتخانە. بەڕهەمەن: بەرەهمەن، پێشەوای ئایینی پێڕەوی بەراهمایی که یەکێکە له ئایینەکانی هیندوستان. دەیر: کلیسا. ڕاهیب: ڕەبەن.

واتە: دڵی موسوڵمان عەرشی خودایە، حەیف نیە تۆ ئەوەندە له خوا بێ ئاگا بی دڵت وەك بتخانەی بێ بەرەهمەن و کلیسای بێ ڕەبەنی لێ هاتبێ!.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ حەدیسی: «قَلْبُ الْمُؤْمِنِ عَرْشُ الرَّحْمٰنِ» واتە: دڵی موسوڵمان عەرشی خودایە.





نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرە نووسراوەتەوە:

دڵەی عەرشی خودا، «مەحوی» خەجاڵەت بێ لەبەر غەفڵەت

هەرچەند بەم جۆرەش دەست دەدا، بەڵام لەگەڵ نیوەی دووهەمی بەیتەکە ناگونجێ، مەگەر «بۆتە»ش «بوویتە» بێ.

-١-

دڵ لەسەر خۆچـوونی پـەیدەرپەی دەلیـلی یـارە هـات
عەقڵ و هۆش ئەی دڵ بکە حازر، لەپێشـە کـارە هـات[١]

ون بـــووە لەو رۆژەوە لێوی حـــەیات ئـــەفزاتـــی دی
وا دەبێ شەرم و حەیا، ئەی ئـافەرین، ئـاوی حـەیات[٢]

بـۆ وەفـاکــردن بــە وەعــدەی هــاتنی بـمرە، وتـی:
کــەس نــیە ئـیختاری کـا وا هـاتووە وادەی وەفـات[٣]

---

-١-

(١) واتە: ئەمە کە دڵ هەر تاو نە تاوێ لەسەر خۆی دەچێ، نیشانەی ئەوەیە یار بەڕێوەیە دێت و دڵیش لە خۆشیدا ئاگای لە خۆی نامێنێ، بەڵام هاتنی یار وا دەگەیەنێ کە دڵ ئەرکی گەورە و کاری زۆری دەکەوێتە بەر، بۆیە پێویستە عەقڵ و هۆشی خۆی ئامادە بکاو هەموو کاتێ لەسەر خۆی نەچێ، تا ئەو ئەرك و کارانە بەجێ بێنێ.

لەپێشە: رەحمەتی مەلا ئەسعەدی مەحوی نووسیویە بە «لەپێشی» دەخوێنرێتەوە، واتە: کاری لەپێشە. شتی وا لە شێوەی فارسی ئامێزی کوردی نووسینی جاراندا هەیە.

(٢) حەیات ئەفزا: ژیان بەخش. ئەفزا، خۆی لە بنچینەدا بە مەعنا زیادکەرە، لێرەدا مـەعنای بەخشندە دەگەیەنێ.

واتە: ئافەرین لە ئاوی حەیات، شەرم و حەیا ئەوەیە ئـەو هـەیەتی. لەو رۆژەوە کـە لێوی ژیانبەخشی تۆی دیوە، قەدری راستەقینەی خۆی فامیوە و زانیویە لە مەیدانی لێوی تۆدا هیچ نیە، بۆیە خۆی ون کردووە.

لەم بەیتەدا «ئاوی حەیات» هـەم پـەیوەندی بـە «ون بـووە» و هـەم پـەیوەندی بـە «ئـەی ئافەرین»ەوە هەیە، واتە: ئاوی حەیات ون بووە و ئافەرین لە ئاوی حەیات کەوا ون بووە...

(٣) ئیختار: ئاگادارکردن.

واتە: یار گفتی دابوو بە دڵ کەوا هەرکاتێ کەوتە گیانەڵا، ئەو دێتە سەری. بۆیە بە دڵم وت: بمرە با یار لەسەر گفتەکەی خـۆی بـێتـە سـەرت. دڵیش لە وەڵامـدا وتـی: ئـاخر کـەس نـیە ئاگاداری کا کەوا وادەی کۆچی دوایی کردنی منە، یا کەس نیە ئاگاداری کاو پێی بڵێ کەوا ئەوا

تۆ کە دەرکەوتی، مەپرسە چی بەسەر دێ جان و دڵ
حاڵەتی شەونم تەماشاکە بە وەقتی ڕۆژهەڵات[٤]

گەر لە تۆ دنیا بەری بوو، قەوم و خوێشت لێ بەرین
گەر بەراتی بوو، هەموو عالەم بووە باب و برات[٥]

«اَلْحَذَرْ» لەم چەرخی کەچبازە، بە ڕوو چەرخاندنێك
چەندە سوڵتان و شەهی کرد و دەکا بێ دەست و مات[٦]

---



دڵی فلانەکەس دەمرێ‌و وادەی وەفا کردنی تۆیە، ئازیز بە گفتەکەت کەوا بچیتە سەری. مەبەست لە نەبوونی کەس ئەوەبێ کەوا دنیا پیاوەتی تیا نیە، یا کەس ناتوانێ بچێ بەلایا چونکە هەرکەس نزیکی بکەوێتەوە خۆی گیرۆدەی دەبێ...

(٤) واتە: ئازیز تۆ وەك خۆر وایت و گیان و دڵیش وەك شەونم وان، چۆن هەرکە خۆر هەڵات شەونم دەبێ بە هەڵم و دەچێ بە هەوادا، کە تۆیش دەرکەوتی گیان و دڵ بەوجۆرە دەتوێنەوە.

رستەی «وەقتی ڕۆژهەڵات» دەتوانرێ بە «وەقتێ ڕۆژ هەڵات»یش بخوێنرێتەوە.

شەونم (ن): شەبنم.

(٥) واتە: ئەم دنیا دنیای سوود و مەسڵەحەت پەرستییە و لە ئاستی ئەم ڕاستییەدا خزمایەتی و کەسایەتی زۆر نزیکیش دەورێکی ئەوتۆ نابینێ. بۆیە ئەگەر دنیا لێت دوور بێ‌و خاوەنی دارایی نەبی، کەس‌وکاریش هەموو لێت تەوەللا دەبن، خۆ ئەگەر دنیا بەراتی خۆیت بەسەردا برێژێ‌و دەسەڵاتدار بی ئەم خەڵکە هەموو بە بێگانە و خوێشەوە دەبن بە باوك و برات.

لە نێوان «بەرات» و «برات»دا وشە ئاراییەکی جوان هەیە.

باب و (ن): مامو.

(٦) «اَلحَذَر»: وریا بە. کەچباز: ئەوەی کردەوەی لار و نابەجی بێ. مات: دەتوانرێ بە «مات»ی کوردیش و بە «مات»ی عەرەبیش بخوێنرێتەوە و فاعیلەکەی بگەڕێتەوە بۆ «سوڵتان» و «شەه».

ڕوو (ن): ڕوخ. ڕوخ: ڕوو.

**واعـــیزم پـــرسی، یـــەکـێ شـۆخـانە جـوابـی دامـەوە:**
**وەعزی چی؟! سەر لنگە دەستاڕێ کرەی دەستاڕی هات(٧)**

**شێخ و توڕڕەی مێزەر و نـەقل و نـوقوولی هـیچ و پـووچ**
**من بە توڕەڕەی یار ئەسیرم، ئەو بە کۆڵێ تـوڕڕەهـات(٨)**

**عــەنبەری ســـارا وتــم زوڵفـــی، نـــەباتی مــیسری لێو**
**زوڵفـــی ئـــاڵۆزا، وتـــی لێوی کـــە نـاوی مـن نـەبات(٩)**

---

(٧) شۆخانە: بە لاقرتییەوە، بۆ گاڵتە و خۆشی. دەستاڕ: دەست هاڕ، ئامێرێکی ناوماڵی لادێی کوردەوارییە لە دوو بەردی خڕی ئەستوور دروست دەبێ هەردوو رووەکەیان، بەتایبەتی رووی ناوەوەیان، نەقارییەکی باش کراوە، بەردی بنەوەیان مێخێك کراوە بە ناوەڕاستەکەیدا، بەردی سەرەوەشیان کونێك لە ناوەڕاستەکەیدایە دەکرێ بە مێخەکەی بەردەکەی بنەوە و دەسکێکیشی هەیە، گەنم و شتی وا دەکرێ بە کونەکەی لای مێخەکەیدابە دەسکەکەی دەسووڕێنرێتەوە، گەنمەکە دەهاڕێ، بەڵام دیارە ئەوەندە بەهێز نیە وەك ئاش بیکا بە ئارد. بۆ ئەو مەبەستەش نەکراوە وا ورد بیهاڕێ. کرە: دەنگی دەستاڕ. لێك کردنەوەی برنج و توێکڵەکەی کە هێشتا چەڵتووکە. دەنگێ کە وەك وشەی «کرە» بێتە گوێ.

واتە: هەواڵی واعیزی ئامۆژگاریکەرم لە کەسێك پرسی، وەڵامێکی خۆشی بە توێکڵی دامەوە، وتی: کەی ئەوە بە واعیز دادەنرێ، هەرچەند بەدیمەن مەلایە و مێزەری بەسەرەوەیە و ئامۆژگاری خەڵك دەکا، بەڵام مێزەری زلی وەك لنگە دەستاڕ وایە و دەم جووڵان و ئامۆژگاری کردنەکەشی وەك کرەی دەستاڕ لەبەر گوێ قورس و ناخۆشە.

(٨) توڕڕە: مەبەست لێرەدا خڕە، وەك مۆری توڕڕە. نەقل: گێڕانەوەی حەدیس و فەرموودەی زانایان و پیاوچاکان. نوقوول: جەمعی نەقلە.

واتە: شێخ و مێزەری خڕی سەری و ئامۆژگاری کردن و قسەی زانایان و پیاوچاکان گێڕانەوەیم هەموو لەلا هیچ و پووچە، چونکە هیچی لە سەرچاوەی راستییەوە هەڵنەقوڵاوە. راست ئەو خوشەویستییەیە کە لە دڵی مندایە کە منی دیلی زوڵف و مووی ئەملاو لای ناوچاوانی یار کردووە، نەك ئەو توڕڕەهات و شتی هیچ و پووچ و ئاوەکییانەی کە بوون بە بار و چوونەتە کۆڵی ئەو...

(٩) عەنبەری سارا: گیایەکی بۆن خۆشە. عەنبەر بە مایەیەکی بۆن خۆشیش دەڵێن لەناو

**ئـەو نـەهاتن: دەردە، داغـی ئـەو نـەهاتن: دەردەهـا**
**کەس بە دەردی من نەچێ، وەك من نەبێ تووشی نەهات** (١٠)

**جـوان و شـیرینە ئـەگـەر دنـیا، لە روودا مـیهرەبان**
**وەردی خارە، شەهدی زەهری مارە، عەهدی بێ سەبات** (١١)

**گەر بتی ئێمـەت نـەدیوە، بـۆچـی دوێنـێ دەتـپەرست؟!**
**ئەی بوڕەهمەن، تۆ لەلات ئەمڕۆکەچی وەك لاکە «لات»** (١٢)

---

☞

سکی یا ریخۆڵەی جۆرە ماسییەکی دەردەهێنن.

واتە: زوڵفی یارم لە بۆن خۆشیدا شوبهاند بە عەنبەری ساراو لێویشیم لە شیرینیدا شوبهاند بە نەباتی میسر. زوڵفی لەداخا ئاڵۆزاو ئێستا کە زوڵفی یار لوول و ئاڵوزە، لەوەوەیە. لێویشـی خەبەری بۆ ناردم وتی پێی بڵێن هەرگیز ناوی منی بە دەما نەیەت، من گەلێ لەوە زیاترم کە ئەو نێم بدوێ و بمشوبهێنێ بە نەبات و شتی وا. من وەك هیچ شتێ نیم و هیچ ناگاتە پلە و رادەی من...

لە نێوان هەردوو «نەبات»دا جیناسی تەواو هەیە.

(١٠) دەردەها: چەند دەرد. نەهات: نەگبەتی، فیعلی «نەهاتن».

واتە: دەردی من تاقە دەردێك نیە. نەهاتنی یار ئەوە دەردێك، خەمی نەهاتنەکـەشی کـە هەمیشە دووبارە دەبێتەوە، ئەوە چەند دەردیتر. سا خوایە کەس وەك منی لێ نەیێ و تووشی دەردی من نەبێ و نەگبەتی نەیەتە رێ کە هەمیشە هەر «یار نەهات» بەسەر زمانیەوە بێ.

لە وشەی «نەهات»دا «تەوریە»یەکی جوان هەیە.

(١١) میهرەبان: دڵ پڕ لە خۆشەویستی. وەرد: گوڵ. خـار: دڕك. شـەهد: هـەنگوێن. عـەهد: پەیمان. سەبات: راگیر بوون.

مەبەستی لەوەیە بە دیمەنی دنیا هەڵنەخەڵەتێن.

(١٢) لاك: لاکە تۆپیو، یا لاکە گۆشت. لات: بتێکی ناوداری سەردەمی پێش هاتنی ئیسلامی عەرەبەکانە.

بە بۆچوونی ئێمە مەحوی بەم بەیتە پلار دەگرێتە ئەوکەسانەی هەر رێگایەك بگرنەبەر بۆ

☜

چـــاویان، ئـــەم ئـــەهلی دنـــیایە، ئـــەوەندە بـــرسییە
پادشاکـانی بـە دەمـدا یـەك سـەری یـەكـتر دەبـات(١٣)

ئابڕوو یەکجاری چوونی غونچە، یـەك دەم خـەندە بـوو
گەر حەیات ئەی دڵ دەوێ، شیوەن کە «مٰا دٰامَ الحَیٰاة»(١٤)

بەر خودایە و بەس، لە شەیتانی شەقی، «مەحوی» پـەناه
پەس لە غەدری شەیتەنەت‌پیشە مەبە بەر کەس شکات(١٥)

---



سوودی تایبەتی خۆیانی دەگرنەبەر وکە ئەو سوودە لە ئارادا نەما پاشگەز دەبنەوە و دەست لە رابوردووی خۆیان دادەشۆرن و هەزار بیانوو بۆ هەڵوێستی پێشوویان دەهێـنـنەوە. مـەحوی دەڵێ: ئەی بوڕەهمەنی لەڕاستی لاداو تۆ ئەگەر بتی ئیمەت نەدیوە و ئەوە دەکەی بە بیانووی پشت تێ‌هەڵکردنی، ئەی پێمان ناڵێی دوێنێ چۆنت دەپەرست، کـەچی ئـەمڕۆ وا بـەجۆرێ پاشگەز بوویتەوە بتێکی بەناوبانگی وەك «لات»ت لا بووە بە لاکە تۆپیو، یـا بـووە بـە لاکـە گۆشت، کە تەنها بۆ خواردنی و کراندنەوەی ئێسکەکانی دەتەوێ.

(١٣) مەبەستی مەحوی ئەوەیە بڵێ: ئەگەر پادشایانی جیهان ئەوەندە چاو برسی بـن، یـەك سەری یەك بە دەمدا بەرن کەسەر لەبەر گەورەیی بەدەمدا نابرێ، دەبێ هەژاران بەو هـەموو هەژاری و ناچاری و موحتاجییەوە لە چ‌حاڵێکدا بن و چی بکەن!.

لە کۆکردنەوەی «چاو» و «دەم» و «سەر»دا تەناسوبێکی ناسك هەیە.

(١٤) دەم خەندە: پێکەنینی تەنها بە دەم، واتە لە ناخەوە نا.

مەحوی لەم بەیتەدا وردە کارییەکی ناسکی کردووە، هـاتووە پشکـووتنی خـونچەی کـە پاشانیش دەکێشێتەوە بۆ سیس بوون و ژاکان و وەرینی پەڕەکانی گوڵ‌و فەوتانیان، داناوە بـە ئابڕوو چوون و فەوتان‌و، تەڕایی رووی پەڕەی گوڵی داناوە بە «ئابڕوو»، دەڵێ: خونچە هـەر بەوە ئابڕووی چوو و بوو بە گوڵ‌و سیس بوو و تەڕایی لەگەڵاکانیدا نەما، کە تاقە جارێك دەمی کردەوە و زەردە خەنەیەکی سەرزارەکی کرد کە پشکووتنەکەیەتی؛ بۆیە تۆیش ئەی دڵ ئەگەر حەیات ببێ‌و نەتەوێ ئابڕووت بچێ تا ماوی دەگریت...

(١٥) شەقی: بەدبەخت. پەس: وشەیەکی فارسییە بە مەعنای: کەواتە. شەیتەنەت: شەیتانییەتی.

-٢-

**کەم بوو وەك ئەو دەمە، سیدق ئەم دەمە هەم کەم بووە قات**
**فەرەحی نەك بە دوا بێ، غەم و هەم هەم بووە قات[١]**

---

☞

واتە: پەنا لە دەست شەیتانی لەعین هەر بۆلای خودا دەبرێ، هەرکەسیش کردەوەی بەد بێ وەك شەیتان وایە، کەواتە ئەگەر یەکێ لەوانە ناهەقییەکی لەگەڵ کردی، لای کەس شکاتی لێ مەکە و حەواڵەی خوای کە، چونکە هەر خوا خۆی لە عۆدەی شەیتان و شەیتان پیشەکان دێ.

ئەم بەیتە نیشانەی یەکێکە لەو ناڕەحەتییانەی کەسانێکی ناحەزی بەدەسەڵات بەسەر مەحوییاندا هێناوە و مەحویش دەیانداتە دەستی خوا کە تاڵاوی شیاوی خۆیان بکا بە لووتیاندا.

-٢-

لە هەموو نوسخە دەسنووسەکانداو هەروەها لە نوسخە چاپییەکەشدا ئەم پارچە شیعرە، لەگەڵ پارچە شیعرێکی تر کە دوا وشەی هەموو بەیتەکانی «قەت»ە خراونەتە پیتی «تێ»وە. دیارە «مەحوی» خۆیشی هەر وای کردووە و وای ویستووە، چونکە ویستوویەتی هەموو پیتەکانی ئەلف و بێ پڕ کاتەوە، وەك چۆن پارچەیەکیشی بۆ «لامەلفەلا» تەرخان کردبوو و ئێمە خستمانە بەر پیتی ئەلف. لەبەر ئەوە کە وشەی «قات» هەرچەند لە بنچینەدا لە «قەحت»ی عەرەبییەوە هاتووە، کەس بەم شێوەیە بە عەرەبی دانانێ، ئەم پارچە شیعرەمان هێنایە ئێرە و لەجێی خۆیدا لە پیتی «تێ»دا دامان نا، بەڵام ئەوی «قەت»مان لەوێ هێشتەوە چونکە وشەی «قەت» هەرچەند لە کوردیدا بە «قەت» دەخوێنرێتەوە، دەسکارییەکی وای نەکراوە دیمەنەکەی بگۆڕێ.

(١) واتە: لەم سەردەمەدا، وەك دەمی یار دیار نیە، هەروەها راستیش قات بووە. لەبەر ئەوەش کە لەپاش خەم و ناخۆشی خۆشی پەیدا دەبێ، وەك خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾ واتە لەگەڵ ناڕەحەتیدا رەحەتی هەیە، خەم و ناخۆشیش قات بووە، نەوەك پێویست بێ لەوەپاش خۆشی بە دوادا بێ.

مەبەست لە دیار نەبوونی دەمی یار یا دەبێ بچووکی بێ کە واتە ئەوەندە بچووکە وەك دیار نەبێ وایە، یا دەبێ بێ لوتفی و قسە نەکردن بێ.

☜

مـەسەلی عـەهد و وەفـا وەك مـەسەلی عـەنقایە
پیاوەتی باسی لە کن کەس مەکە، ئادەم بووە قات(٢)

لە هەموو جـێ لە چ کـەس بـێنـی مـرووەت نـایێ
کەرەم و سیدق و وەفا ئێستە لە عالەم بووە قات(٣)

بە دوو بەیتێ غەم و دەردی دڵ ئەگەر بێنمە عـەرز
کەسی وا عەرزی کرێ خۆ نیە، مەحرەم بووە قات(٤)

بە هەموو دەم لە سەدەد باس و قسەی ئەو دەمە دام
کە دەمێ باسی بکەم، کەس نیە، هەمدەم بووە قات(٥)

بــە حـەددێ بـێ ئـەدەبی بـاوە، لەمـەولا سـەییاد
پەکی راوی بکەوێ کەلبی موعەللەم بووە قـات(٦)

---



لە نێوان هەردوو «دەم» و هەردوو «هەم»دا «جیناسی تەواو» و لە نێوان «دەم» و «هـەم» و «کەم» «غەم»دا «جیناسی لاحیق» هەیە.

(٢) عەنقا: باڵدارێکی وەهمییە. ئادەم: بنیادەم.

واتە: وەفاو پەیمان راگرتن وەك عەنقای لێ هاتووە، دەنگی هەیە و رەنگی نـیە. پـیاویش نەماوە پیاوەتی لێ بوەشێتەوە، بۆیە باسی پیاوەتی لای کەس مەکە.

(٣) بێن: بۆن. بێنی (ن): بۆنی. وەفا (ن): سەفا.

(٤) عەرز: لێکدانەوە و باس کردن.

مەبەستی لەوەیە دنیا وای لێ هاتووە بنیادەم لە هەموو لایێ خۆی بە نامۆ دەزانێ و کەسێ نیە شەریکی خەمی بێ و پێی مەحرەم بێ.

(٥) واتە: بە هەموو هۆیەکی لێکدانەوە و تێگەیاندن دەمەوێ تاوێ باسی دەمی یار بکـەم، کەچی کەس نیە گوێم بۆ شل بکاو هاودەم قات بووە.

لە کۆکردنەوەی ئەم چوار «دەم»ەدا وشە ئارایی و «جیناس»ێکی ناسك هەیە.

(٦) سەییاد: راوچی. کەلبی موعەللەم: سەگی تەعلیم دادراو.

حەقی وت ئەو کەسە: نابەم ئیکە ناوی «مەحوی»
کەسی وا زیکری ئەوانەی کە لەکن کەم، بووە قات[٧]

-٣-

خزر ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات
من لە خاکی دەری جانانەمە هەر چاوی حەیات[١]

مەردنێکی لەبەر ئەو قاپییەدا مەردانە
بە خودا چاترە ئەمڕۆ لە گلاراوی حەیات[٢]

---

☜

واتە: بێ ئەدەبی بە رادەیەك پەرەی سەندووە، تەنانەت حەیواناتیشی گرتووەتەوە. بۆیە ئەگەر راوچیش پێویستی بە سەگی تەعلیم دادراو بێ بۆ راو دەستی ناکەوێ، چونکە سەگەکانیش لەبەر بێ ئەدەبی تەعلیم دانادرێن.

دەشگونجێ مەبەستی ئەوە بێ: بنیادەمی وەك سەگ ئەوەندە زۆر بووە کەس نەماوە تەعلیمی سەگ دابداو سەگ فێرکردن فەرامۆش کراوە.

هەروەها دەشگونجێ مەعنای بەیتەکە وا لێ بدرێتەوە: کەوا بێ ئەدەبی بە جۆرێ بڵاو بووەتەوە. خەڵکەکەی هەموو کردووە بە سەگو لەوەش بەولاوە کردوونی بە سەگێکی وا قابیلی تەعلیم دادان نەبن، بۆیە ئەگەر راوچی پەکی لەسەر سەگی تەعلیم دادراو بکەوێ دەستی ناکەوێ، چونکە سەگەکان لەوە دەرچوون کە قابیلی تەعلیم دادان بن.

(٧) واتە: ئەوەی وتی جارێکی‌تر ناوی «مەحوی» نابەم چونکە کەسی وا نەماوە ناوی ئەو جۆرە کەسانەی لا بەرم، حەقی بوو و قسەیەکی راستی کرد.

-٣-

(١) واتە: ئەگەر خدری زیندە چاوی تەمای ژیانی هەمیشەی بڕیبێتە «ئاوی حەیات» و بە تەما بووبێ لە رێگای خواردنەوەی ئەو ئاوەوە ژیانی هەمیشە بۆ خۆی مسۆگەر بکا، ئەوا من وا ناکەم... من خۆڵی بەردەرگای یاران دەخۆم، بۆ ئەوەی بژیم و چاوی تەمای ژیانی هەمیشەم ئەو خۆڵەیە، یا من هەوڵم هەر بۆ گەیشتن بە یارە و لە ژیانمدا هەر ئەوەم دەوێ.

(٢) ئەم بەیتە لە حوکمی بەڵگەدایە بۆ بەیتی پێشوو، واتە: من بۆیە چاوەڕوانی ژیان لەوە

☞

**تەنکە توێژێکی کشاوە بـە رووا قـولزومی مـەوت**
**وەك حەبابێ بە هەوا بـەندە نـرا نـاوی حـەیات** (٣)

**ئـەگـەر ئـازادەگـییەك بـێ لە عـەدەمدا بـۆمـان**
**چی هەیە غەیری بە پێچی پەلەپەل داوی حەیات** (٤)

---



دەکەم کە لەناو خۆڵی بەردەرگای یاراندا بکەوم و لەو خۆڵە بخۆم، چونکە تەنانەت مردنێکی مەردانە لەناو ئەو خۆڵەدا لە ژیانی ناخۆش و دانەمەزراو وەك گلاراو کردنی ئەمڕۆ چاترە...

(٣) قولزووم: دەریای سوور. مـەبەست تـێکـڕای دەریـایە. حـەباب: بـڵقـی سـەر ئـاو، ئـەو قوڵتەیەی کاتی هەڵدانی شتێ بۆ ناو ئاو پەیدا دەبێ.

واتە: مەرگ وەك دەریایەکی گەورە و قووڵ وایە، توێژێکی تەنکی بەسەردا کشاوە وەك ئەو بڵقەی بەسەر ئاوەوە پەیدا دەبێ؛ ئەو توێژە ناونراوە ژیان. جا بێ بەراوردێکی ژیان و مردن بە یەك بکە و بزانە چۆن مردن بڕانەوەی نیە و ژیان بە فوویەك دادەمرێتەوە.

مەبەستی مەحوی گەیاندنی مەفهوومێکی فەلسەفییە، کەوا گوایـە لەم جـیهانەدا مـەرگ و نەبوونی ئەسڵە و ژیان و بوون ناپایەدارە.

(٤) ئازادەگی: سەربەستی.

ئەم بەیتە لە حوکمی بەڵگە هێنانەوەدایە بـۆ بـەیتی پـێشـوو، دەڵێ: نـەبوون، هـیچ نـەبێ سەربەستییەکی بۆ بنیادەم تیایە، لەم هەموو کۆت و زنجیرە جۆر بەجۆرە ماددی و رۆحییانەی بە خۆیانەوەیان بەستووەتەوە. بەڵام ژیان چـیە، لە داوێکـی بـە پـەلەپەل پـێچ دراو زیـاتر کـە سەرەڕای ئەوەش کە داوە، لەبەر بە پەل پەل پێچ درانەکەی ئاڵۆزاوە و بووە بە گرێ کـوێرە و ئەوەندە سەری هەیە مرۆی هەرگیز لێ رزگار نابێ.

ئەم بەیتە جۆرە دەربڕینێکی قـووڵی هـەستی بـێزاریـیە لەلایـەن مـەحوییەوە لەو هـەموو داوانەی مرۆیان لە ژیاندا پێ بەستراوەتەوە و لە هەموو جۆرە ئازادییەکی راستەقینە بێبەشیان کردووە.

دووریش نیە مەحوی مەبەستی لە «بۆمان» ئەم مەعنایە نەبێ کە ئێمە دامانێ، بەڵکە «بـۆ مان» بێ، واتە «بۆ ژیان». ئەگەر وابێ ئەوا بۆچوونەکەی زۆر قووڵتر دەبێ، واتە تەنها لە جیهانی «نەبوون»دا لەوانەیە «بوون» جۆرە سەربەستییەکی دەسگیر ببێ...

بۆمان (ن): وێمان.

دەم لە دەم نـــانی رەقـــیبانی چ بـــێمـــروەتییە
تێکەڵی ئـاوی دەبـاخانە دەکـا ئـاوی حـەیات[٥]

بە و هەموو تاڵییەوە شەربەتی مەرگ، ئەهلی حـەیا
خۆش گەواراترە بۆی ئێستە لە شەکراوی حەیات[٦]

ئیزنی چوونە چەمەنی وەسـڵی سـپێرا بـە رەقـیب
«مەحویا» بمرە کە مردن بووە مـیراوی حـەیات[٧]

---

(٥) دەبا خانە: دەباغخانە.

مەحوی لەم بەیتەدا «دەم لە دەم نان»ی کە بەمەعنا «لەگەڵدا کەوتنە قسە و شەڕە دەم»ە، بە مەعنا حەرفییەکەی مەعنا لێ داوەتەوە، واتە: کە یار قسە لەگەڵ بەدکارەکانی دەکا کە بۆ ئەوە ناشێن دەم بنێتە دەمیان و قسەیان لەگەڵ بکا، وەك ئەوە وایە دەمی نابێتـە نـاو دەمـیان و کـە دەمیشی نایە ناو دەمیان، وەك ئەوە وایە ئاوی حەیات کە تفی دەمی ئەوە لەگەڵ ئاوی پیسی دەباغخانە کە تفی دەمی بەدکارانە تێکەڵ بکات، ئەمەش کارێکی ئێجگار بێمروەتانەیە.

(٦) گەوارا: قووت چوو.

واتە: ژیان ئەوەندە ناخۆش بووە، شەربەتی مـەرگ بـەو هـەموو تـاڵییەوە کـە هـەیە لای بنیادەمی بە حەیا لە شەکراوی ژیان باشتر قوت دەچێ.

ئەمەش دەنگی ناڕەزایی دەبڕینێکی تری مەحوییە لە باری ناخۆشی ژیانی کۆمـەڵایـەتی سەردەم، کە خۆشی بۆ کەسێ تیا نەبووە قەدر و حەیای خۆ راگیر بکا.

(٧) چەمەن: چیمەن، سەوزایی.

واتە: مادەم رێگای گەیشتن بە یار و چوونە ناو باخچەی پێ گەیشتنی بە دەست بەدکار بێ، مردن خۆشترە، چونکە چاوەڕوانی هیچ جۆرە خـۆشـییەك لە ژیـان نـاکـرێ، مـادەم کـلیلی دەرگاکەی بە دەست مەرگەوە بێ و مەرگ میراوی کانیاو و جۆگەی ژین بێ.

لەم پارچە شیعرەدا ئەم بەیتە چلە پۆپەی شانازی کردنی مەحوییە بە سەربەرزی خۆی و بە خۆ شل نەکردنیەوە لەبەر باری نالەباری ژیاندا کە کاروباری داوەتە دەستی کەسانی ناکەس و ناشایستە و دەبوو مەحوی ناچار بوایە سەر بۆ ئەو جۆرە کەسانە شۆڕ بکا.

بەکار هێنانی «سپێرا» لەباتی «سپێررا» بەڵگەیەکی زمانەوانییە لە مەحوییەوە بـۆ دروست بوونی سووك کردنی فیعل کاتێ کە دوو پیتی هاوچەشنی تیا کۆ ببێتەوە و بەکار هێنانیان پێکەوە لەسەر زمان قورس بێ.

- ٤ -

خەلاسی بوونی قەت نـاوێ ئـەسیری زوڵفـی زنـجیرت
لەبەر تیرت، مەلەك بێ، هەڵفڕینی نـەبووە نـەخچیرت [١]

مـوژەت قـوللابی گـیرا، زوڵفـی دڵگـیرت کـەمەند ئـاسا
مەحاڵە بەرگرێ یـا بـەربێ کـەس کـەوتە بـەر گـیرت [٢]

لەناوا باسی تۆبەی تۆ بوو ئـەمڕۆ ئـەی سـتەمگەر شـۆخ
بخە ئەم تۆبـە پـاشی کـوشتنی مـن، تـۆ بـی‌یو پـیرت [٣]

بە دەنگی ناڵەوەم هات، ئـەو دەمـە ڕۆح هـاتە سـەر لێوم
بڵێ: ئەی ناڵە، ئاخر ئێستە مـن چ بکـەم لە تـەئسیرت [٤]

---

- ٤ -

(١) مەلەك: مەلائیکە، فریشتە. نەخچیر: نێچیر.

واتە: دیلی کەمەندی زوڵفـی تـۆ هـەرگیز نـایەوێ رزگـار بـبێ و نـێچیری راوت ئـەگـەر فریشتەش بێ هەرگیز لەبەر تیری تۆ هەڵنافڕێ‌و دەیەوێ بەو تـیرە بـپێکـرێ، چـونکە دڵدار دەیەوێ هەمیشە لە یارەکەیەوە نزیك بێ.

(٢) گیرا: بگیر. کەمەند ئاسا: وەك کەمەند.

واتە: برژانگت وەك قولاپێکی شت پیا هەڵواسین وایە کە هەرگیز شتی لێ بەرنەبێتەوە و زوڵفی دڵگیریشت وەك کەمەند وایە. ئەوی کەوتە داوی برژانگ‌و زوڵفتەوە مـەحاڵە بـتوانـێ خوێ بپارێزێ یا خۆی دەرباز بکا.

ئەم بەیتە «لەف و نەشری مورەتەب»ی تێدایە، «بەرگرێ» بۆ «قـوللاب» و «بـەربێ» بـۆ «زوڵف» دەگەڕێتەوە.

(٣) واتە: نازدارە ستەمکارەکەم! ئەمڕۆ باسی تۆبەی تۆ لە ئارادا بوو کەوا دەست لە ئازاردانی دڵدارانت هەڵدەگری. دەستم دامێنت بیکە بە خـاتری ئـەو پیرەی تـۆبـەی لەسـەر دەسـتدا دادەدەی جارێ تۆبە مەکە تا من بە تەواوی دەکوژی و کەمەندکێشی خۆتم دەکەی. تۆبەکەت بخەرە پاش کوشتنی من.

(٤) واتە: یار بەدەم ناڵەمەوە نەهات تا گیانم گەیشتە سەر لێوم و کەوتمە گیانەڵا... جا تـوخوا من کەوا ئێستا گیانم دەردەچێ، دەبێ تازە چ کەڵکێ لە کەڵك بەخشینی ناڵەکەم وەربگرم!.

**لە چینی پەرچەما نووری جەبینی دی، وتی زاهید:**
**کە سووتا دامی تەزویرم بە نووری دامی تەنویرت** (٥)

**فەزیلەی ئەسڵو فەسڵ ئینسانی پێ نابێ بە ساحیب فەزڵ**
**کە تۆ کۆسەی، بە تۆ چی مامە ریشی باب و باپیرت!** (٦)

**لە خاکی پاکی ئەو بەردەرکەدا گەوزا رەقیب، ئامان**
**دەریکە، حەیفە گوور ئاسن خەسارەت دا لە ئیکسیرت** (٧)

---

(٥) جەبین: ناوچاو، تەوێڵ. دام: داو.

واتە: زاهیدی ساختەکار کە لەژێر چینی پەرچەمی یاردا نووری ناوچاوانی دی، دنیا روون دەکاتەوە هاواری لێ هەڵسا، وتی وا داوی ساختە و فرۆفێڵم بە تیشکی ناوچاوانت سووتا کە کردووتە بە داو بۆ گیرۆدە کردنی ئەوانەی رێی فرۆفێڵ دەگرنەبەر.

سووتا (ن): پچڕا. نووری (ن): زۆری.

(٦) ئەسڵ و فەسڵ: باو باپیر.

واتە: کەس بەوە گەورە نابێ کە باب و باپیری پیاو بووبن و گەورە بووبن، وەك چۆن کەسێ خۆی کۆسە بێ بەوە نابێ بە خاوەن ریش کەوا ئەوان خاوەن ریش بووبن. مەبەستی لەوەیە کە گەورەیی راستەقینە ئەوەیە بنیادەم خۆی گەورە و پیاو بێ نەك بە گەورەیی و پیاوەتی کەسیتر بنازێ.

وەك ئاگاداران دووبادی دەکەنەوە مەبەستی مەحوی لە «کۆسە» کەسێکی تایبەتیە لەو پیاو ماقووڵانەی سلێمانی کە لە باب و باپیریانەوە رێو شوێنێکی گەورەیان بۆ بەجێ مابوو و پەیوەندییان لەگەڵ مەحوی باش نەبوو...

(٧) گوور ئاسن: ئاسنە کوتە و ژەنگ هەڵاوردوو و خڵتەی بەر کوورەی ئاسنگەر. ئیکسیر: کیمیاگەرانی کۆن بە مایەیەکیان وتووە، مایەی بێ نرخی پێ کراوە بە مایەی بەنرخ وەك جیوە بە زیوو مس بە زێڕ. کە مایەی وا هێشتا نەدۆزراوەتەوە.

واتە: بەدکار لە خاکی بەردەرگای ماڵی یاردا گەوزا، دەستم دامێنت ئازیز، بەدکار وەك ئاسنە کوتە و خاکی بەردەرگای تۆیش وەك ئیکسیر وایە، حەیفە ئیکسیرێکی وا گرانبەها بدرێ لە ئاسنە کوتەیەکی وا ناچیز و بێبایەخ... دەسا دەریکە و دووری خەرەوە با ئەو سەربەرزییەی دەسگیر نەبێ.

لەبـەر بـاری مـەحەبەت ئـاسمان و ئـەرز ئـەناڵێنـن
چیە ئـەم دەعـوییەت زاهـید، جـلی لێ بـارە گـاپیرت[٨]

شوکر «مەحوی» کەوا موددێکە نـاوی چـووبووە نـیسیان
لە زومـرەی وەعـدی کـوشتن‌هاتوانـا هـاتەوە بـیرت[٩]

-٥-

«جگر ز زخم تـو مـعمور و دل ز غـم شـاداست»
ئەمەندە بابەتی عـەیشی نـەداوە بـۆ شـا دەست[١]

---

(٨) دەعوی: ئیددیعا.

واتە: زاهید! گاپیری نەفسی تۆ ئەوەندە لێ نەهاتوو و بار نەبەرە جلەکانی خۆی لێ بووە بە تەوق و کاری خۆی پێ بەڕێوە نابرێ. چیە وا ئێستا هاتووی ئیددیعای هەڵگرتنی باری قورسی عیشقی خودا دەکەی کە ئەرکێکی ئەوەندە قورسە زەوی و ئاسمان پێیان هەڵنەگیراوە.

مەحوی لەم بەیتەدا ئیشارەتی بۆ ئایەتی: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمٰوٰاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا، وَ أَشْفَقْنَ مِنْهَا، وَ حَمَلَهَا الْإِنْسَانُ، إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ کردووە کە واتە: ئێمە ئەرکی لێ‌پرسینەوەمان خستە ئەستۆی ئاسمان و زەوی و شاخەکان. کەسیان هەڵیان نەگرت و ترسان، ئادەمیزاد هەڵی‌گرت، ئەو خراپی کرد لەگەڵ خۆی و سوودی خۆی نەدەزانی.

ئـایەتەکـەشی بـەپێی رێ‌و شـوێنـی ئـەهلی تـەسەووف مـەعنا لێ‌داوەتـەوە، چـونکە لە تەفسیرەکاندا ئەمانەت بە ئەرکی لێ‌پرسینەوە مەعنای لێ دراوەتەوە، بەڵام بەپێی واتای بەیتەکە خۆشەویستی خواو عیشقی راستەقینەیە...

(٩) واتە: دەمێ بوو ناوی مەحوی لەبیر چووبووەوە، لە سایەی خواوە وا لە ریزی ئەوانەدا کە وادەی کوشتنیان هاتووە، کەوتەوە یادت...

-٥-

ئەم پارچە شیعرە لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) واتە: جگەرم بە زامی تیری تۆ ئاوەدان بووەتەوە، هەرکوێی دەڕوانی جێ نـووکی تـیری تۆی پێوەیە. دڵیشم بەهۆی خەفەتی بێ‌ڕەحمی تۆوە شادمانە، چونکە ئەگەر تۆ بیر کردنەوەت

له سـینه جـۆششـی نـاڵـینه، چـاوه پـڕ ئـەسرین
«ز یُـمن جـور تـو اقـلیم درد آبـاد است»(٢)

قـوڕێ بکـەم بـه سـەرا یـا بـه دادڕیـنی بـەرۆك
حەقی مەحەببەت ئەداکەم، بدەی خودایا دەست(٣)

غەنیمەته، به دەم و دەسـتی بگـره دامـەنی دۆست
له دەستی خۆتی مەده، داویـه خـودا تـا دەست(٤)

---



له دڵی من مەبەست نەبوایه خەفەتت بۆ فەراهەم نەدەکرد. کەواته ئەمه ئەوپەڕی بەختەوەرییه و هەرگیز ئەمەنده بابەتی خۆشی بۆ پادشایش هەڵنەکەوتووه.

نیوه فارسییەکەی ئەم بـەیته و بـەیتی پـاشەوەی هـی «حـافیز»ی شـیرازیـن. ئـەم جـۆره دەسکاری کردنەی شیعر پێی دەڵێن «تَشطِیر»، واته: نیوه نیوه کردن.

(٢) واته: گوێ له سینه دەگری دەبینی وا ناڵەی تێدا هـاتووەته جـۆش... سـەیری چـاویش دەکەی دەبینی وا پڕ بووه له فرمێسك. لەخوا بەزیاد بێ له بەرەکەتی ستەمی تۆوه وڵاتی دڵ ئاوەدان بووەتەوه.

ناسکی ئەم بەیته لەوەدایه وڵات به ستەم وێران دەبێ، کەچی ستەمی یار ئەوەنده به پیت و بەرەکەته بووه بەهۆی تەقینی کانیاوی چاو و به مایەی بەزم و گۆرانی و مۆسیقا وتنی ناو سینه که ئەوەش نیشانەی ئاوەدانییه.

(٣) واته: بنیادەم دەبێ بەوەفا بێ و سوپاسی چاکەی له بەرچاو بێ... سا خوایه دەستم بدەی له خۆشی ئەم هەموو ناز و نیعمەتەدا حەقی خۆشەویستی بەجێ بێنم و قوڕێ بکەم بەسەر خۆمداو بەرۆکی خۆم له خۆشییاندا دادڕم.

(٤) غەنیمەت: تاڵان. دامەن: داوێن.

واته: ئەمه که ئێسته بۆت هەڵکەوتووه یارت لێوه نزیکه خەریکی ستەمکارییه لەگەڵت، تاڵانه هاتووەته بەر دەستت، تا خوا دەست و دەسەڵاتی داوی له دەستی خۆتی مەده و داوێنی یار به دەم و دەست بگره.

وتم: نیازمە بەر پێتی خەم سەرم، فەرمووی
بە ناز و عیشوە: شەهی بۆ گەدا کە نادا دەست (٥)

لە پێ حەرامە زڕەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق
ببی بە شێر و مەگەر هەڵگری لە دنیا دەست (٦)

هیلاکی دەستی حەنایيتە، کوشتە بێ دەمی تێغ
ئەمن شکاریی پابەستە و ئەتۆ با دەست (٧)

بە دەستی غونچە دەمێ، دەستی دا کە بەیعەت بۆم
چ ئارەزوومە لە «عیسا» دەم و لە «مووسا» دەست (٨)

---

(٥)عیشوە: ناز. شەهی: پادشایەتی.

مەبەستی لەوەیە سەر خستنە بەر پێی یار لە حوکمی پادشایەتیدایە و بۆ گەدا نالوێ...

بەرپێتی خەم (ن): بەرپێت بخەم.

(٦)واتە: زنجیری عیشق ناکرێتە پێی هەموو کەس و هەموو کەس شایانی خەڵاتی وا پیرۆز نیە. بۆ ئەوەی ئەم زنجیرە بکرێتە پێت و لە پێتدا زڕەی بێ، پێویستە ببی بە شێر و ئەوەندە ئازا بی بتوانی دەست لە دنیا هەڵبگری.

دەش‌توانرێ «لە پێ» بە «لە پێی» بخوێنرێتەوە. لەم حاڵەدا پێویستە «ببی» و «هەڵگری»یش بە «ببێ» و «هەڵگرێ» بخوێنرێنەوە.

(٧)حەنایی: خەنەیی، سوور. شکار: نێچیر. پابەستە: پێ بەستراو.

واتە: من بە دەستی وەك خەنە تێ‌گیراو سووری تۆ کوژراوم و ئەو سوورییە بەدەستتەوە خەنە نیە، خوێنی منە. من بێ بەکارهێنانی دەمی تێغ کوژراوم... منی نێچیری پێ بەستراو دەبێ لە ئاست تۆی بەدەست و دەسەڵاتداردا چیم پێ بکرێ!.

(٨)غونچە دەم: ئەوەی دەمی ئەوەندە بچووك بێ وەك خونچەی نەپشکووتوو وابێ. بەیعەت: بە پێشەوای خۆ پەسەند کردن.

واتە: من کە بۆم رێ‌کەوێ دەستی بەیعەت پێ‌کردن بخەمە دەستی نازدارێکی خونچە دەمەوە، ئیتر چ ئارەزوویەکم هەیە لە هەناسەی مردوو زیندووکەرەوەی عیساو لە دەستی سپی مووساکە وەك چرا تیشکی دەدایەوە!.

**به دەستی دوودەکەون ئەهلی، ئـەر لە پـیّ کـەوتن**
**بــەسم نــەدیوە لە دنـیا، هـەتاکـو بـڕوا دەست** (٩)

**بلّیّ بە ئەهلی حەسەد «مەحویا» وەکـوو «حـافیز»:**
**«قبول خـاطر و لُـطف سـخن خـداداد است»** (١٠)

---



لە دیوانە دەستنووسەکەی شێخ عومەری کوڕی شاعیردا، هەروەهالە نوسخەیەکی تریشدا، لە نێوان ئەم بەیتە و بەیتی داهاتوودا جێگەی بەیتێك بە سپیەتی هێلّراوەتەوە. زیاتر لەوە دەچیّ نیشانەی ئەوە بیّ ئەم پارچەیە بەیتێکی ناتەواو بیّ. غەزەلیش زیاتر تاقە. ئەمەش بەلّگەیەکی تری ناتەواوی بەیتێکە لەم شوێنەدا.

(٩)فەوتانی بەیتێك لە پێش ئەم بەیتەوە ڕێگای ئەوەی لیّ گرتووین بزانین مەبەستی مەحوی بە وردی لەم بەیتە چیە و باسی کیّ دەکا. بۆیە دەبیّ بلّێین کەوا دەست دەدا باسی دلّدارانی راستەقینە بکاو بلّیّ ئەمانە تا پێیان هەبیّ ڕادەکەن بە دوای یارداو کـە لە پـیّ کـەوتن لەسـەر دەست دەڕۆن بەرێدا بۆلای و دوای دەکەون، چونکە لە جیهانی دلّداریدا تـا دەست بـڕواو دەسەلّات هەبیّ «بەس» نیە و ناوتریّ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾واتە: چەندتان لە تواناداو بیّ خۆتان لە خوا بپارێزن و بیّ فەرمانی مـەکـەن.هـەروا دەستیش دەدا مەبەستی لە ئەهلی دنیا بیّو بلّیّ: دنیا پەرست بە هیچ تێر ناخوا، ئەگەر لە پێیش کـەوت بـە دەست بۆی دەکەوێتە چنگەکریّ... من هەرگیز «بەس» و قەناعەتم لە دنیادا نەدیوە و کەس بە هیچ داناکەویّو مەگەر گلّ چاوی برسی ئادەمیزاد تێر بکا.

بە دەستی دوو دەکەون (ن): بە دەست دووی دەکەون. ئەر (ن): گەر.

(١٠)واتە: مەحوی، تۆیش وەك حافیزی شیرازی، بلّیّ بەوانەی بەخیلیت پیّ دەبەن لەبەر ئەوەکە شیعرەکانت لای خەلّك پەسەند و جوانن و قسەت ناسکە، بلّیّ: ئەم بەهرەیە خوا پێی بەخشیوم و لە کەسەوە نیە و ئێوەش لە داخا هەر لە ورگی خۆتان بدەن!.

-٦-

نەوەك هەر چاوی مەستە، خۆشی هەر مەست
بەلادا دێ، کە دێ، وەك تورکی سەرمەست(١)

لە حەجلەی ناز و ئیعزازی بە سەد ناز
خودا تۆ حافیزی بی، هاتەدەر مەست(٢)

بە دوویا شێخ و سۆفی مەستی عیشقی
لە ڕێیا کەوتوون مەستە لەسەر مەست(٣)

نیگاهی مەستی تا مەستانی ڕێ دا
نەما لەو جێگە ڕێگەی کەس لەبەر مەست(٤)

بنازم بەو پیاڵەی چاوی مەستە
بە یەك پرشنگی عالەم سەربەسەر مەست(٥)

---

-٦-

ئەم پارچە شیعرە لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) تورك: لە ئەدەبیاتی کۆندا کینایەیە لە یاری شۆخ و جوان.

لە نێوان «دێ»ی «بەلادا دێ» و «دێ»ی «کە دێ»دا جیناس و وشە ئاراییەکی جوان هەیە.

(٢) حەجلە: شوێنی تایبەتی یەکەم شەوی بووك و زاوا. ئیعزاز: قەدر لێ گرتن. مەست: بە حاڵی سەرخۆشییەوە.

(٣) مەستە لەسەر مەست: هەموو لاڵ و پاڵ بە سەر خۆشی بەسەر یەکدا کەوتوون.

(٤) نیگاه: چاو.

واتە: هەر کە چاوی مەستی ڕێگای سەرخۆشەکانی عیشقی خۆی دا لە دەوری کۆببنەوە، سەرخۆشی تەماشای ئەوەندە لێ کۆبووەوە، ئەو دەوروبەرە جێگەی کەسی تیا نەما.

(٥) یەك پرشنگی (ن): پرشنگێکی.

لەبـــەر حـــوکمی نـــیگایا قـــاتە هـــوشیار
هەتا چاوی بکـا بـڕ، مـەستە، هـەر مـەست

وتـــــی: ســـەیری دەرو دەشـــتم نـــەماوە
لە چاوم مەوج ئەدا، پڕ دەشت و دەر مەست (٦)

بەجوز مەی نـاوی ئـەم نـاوە بـە چـی بـەم
بە نەشئەی ئەو بەشەر هەم «بُوالبَشَر» مەست (٧)

دەنـــاسیَ بـادەکـەی، مـەقسوودی حـەشرە
دەڵێ: «مەحوی» بنوو تۆ تا سەحەر مەست (٨)

## -٧-

خەرامی ناز ئەگەر هـێنـایە لەنـجە سـەروی مـەوزوونت
وەکوو لەیلا، لەسەر ڕێ پرسشیَ کە حاڵی مەجنوونت (١)

---

(٦) واتە: یار وتی وەك چۆن کەسیَ چاوی پڕ بووبیَ لە فرمێسك هیچی پیَ نابینریَ، منیش چاوم شەپۆل دەدا لە مەستانی نیگام و دەشت و دەری پڕ کردووە و هیچم پیَ نابینریَ.

(٧) جوز: بێجگە. ناو: ناز. «بُوالبَشَر»: باوکی ئادەمیزاد، حەزرەتی ئادەم.

واتە: بێجگە لە مەی چ ناوێکی‌تر هـەیە بینێم لەم نـازەی یـار، کـەوا ئـادەمیزاد و بـاوکی ئادەمیزادیشی بە نەشەی خۆی مەست کردووە.

بەجوز (ن): مەگەر.

(٨) واتە: یار ئەم بادەی نیگای خۆیە دەناسیَ کەوا مەبەستی کۆکردنەوەی سەرخۆشـانیەتی لە دەوری خۆی و ڕۆژی حەشریش ڕۆژی کۆکردنەوەی خەڵکە لە سەحرای مەحشەردا، بۆیە پێم دەڵیَ مەحوی تا ڕۆژی حەشر هەر سەرخۆشی نیگام بەو، بە سەرخۆشی بنوو تا ئەو ڕۆژە کە هەموو جیهانم لە دەور کۆ دەبێتەوە.

-٧-

(١) خەرام: کردەوەیەك کە لە ڕووی نازەوە بیَ، کینایەیە لە ڕۆیشتنی بەناز. مـەوزوون: ڕێك. ☜

دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ
وەگەرنا، غەم نیە بمرم لە حەسرەت لێوی مەیگوونت(٢)

خەرامت چوویە باغ و سەروی بەر بادی خەجاڵەت دا
گوڵی هەروەك درك ئاڵاونە داوێنی واژوونت(٣)

کەمەندی زوڵفی وەك ئەبرێشمی خاوی نیگارێکت
لە دڵ ئاڵا، خەیاڵی خاوە، دڵ لەو داوە بەربوونت(٤)

---



پرسش: پرسیار.

واتە: ئەگەر رەوتی نازدارانە باڵای وەك سەرو رێك و بەرزتی هێنایە لەنجە و لار و وەك لەیلاکەوتیتە رێ، لەسەر رێوە پرسیارێکیش لە حاڵی منی وەك مەجنوون عەوداڵ بووی خۆت بکە.

(٢) مەیگوون: وەك مەی، سوور.

واتە: خەفەتی ئەوەم نیە لەتاو دەردی دووری لێوی سوورت بمرم، ترسی ئەوەم هەیە تۆزی خوێنی وشك بووەوەم لە شووشەی گەردنت بنیشێ و لەکەداری بکا، بۆیە نامەوێ بەو دەردی دوورییە بمکوژی. مەبەست لە تۆزی خوێنی وشك بووەوە، ئۆباڵی تاوانی کوشتنەکەیە.

(٣) واژوون: سەرەوخوار کراوە.

واتە: شنەی لەنجە و لاری تۆ چووە ناو باخ و داری سەروی دایە بەر بای خەجاڵەت کە بەراوردی خۆی لەگەڵی کرد. گوڵانی ناو باخیش بە جۆرێ گیرۆدەی بوون وەك درك لە داوێنی هەڵەوگەڕاوی ئاڵان. مەبەست ئەوەیە کە سەروی رێك و بەرز لە چاو باڵای یاردا نانوێنێ و گوڵاڵەی جوانی ناو باخ لە ئاست بۆنی خۆشی داوێنیدا نمووی نیە.

(٤) واتە: کە کەمەندی زوڵفی وەك ئاورێشمی خاوی یارێکت لە دڵ ئاڵا، ئیتر خەیاڵی خاوە تا ماوی لە داوی ئەو کەمەندە رزگار ببی.

نیگارێکت (ن): نیگارینت. بەپێی ئەم نوسخەیە مەعنای بەیتەکە بەم جۆرە دەبێ: دڵ بووە بە داوی زوڵفی وەك رەنگاورەنگ جوانی وەك ئاورێشم خاوتەوە. خەیاڵی خاوە ئیتر جارێکی تر لەو داوە بەر ببێ.

لە نێوان هەردوو «خاو»دا جیناس و وشە ئاراییەکی ناسك هەیە.

حـــەیاتی تـازە دێتـە بـەرم و رۆحـم دەردەچـێ، وەرنـا
سەداینێکی نیە وەك مەوجی گەوهەر هـاتن و چـوونت[٥]

لە هەر شیعرێ لە دیوانت دەجۆشێ نەشئەیێ «مـەحوی»
سەداینێکی لە یەکتر جـوێ دەدا هـەر تـاری قـانوونت[٦]

لە چەند و چوونی دنیادا بە زایع چوونی عـومرم چـەندا!
خودایا بەس بە زایع چم، بە حەققی زاتی بێچوونت![٧]

-٨-

بە دەم مەوجی خوێنی ئەشکەوەم، بڕوانە چـۆنـم بـۆت!
دەروونم کەیلی زووخی دەرد و غەم، بڕوانە چۆنم بۆت![١]

---

(٥) واتە: بەوەدا بە هاتن و چوونت دەزانم کە دێیت زیندوو دەبمەوە و کـە دەڕۆی دەمـرم، ئەگینا خۆ هـاتوچـۆت دەنگـی نـایەت، وەك شـەپۆلی تیشکی گـەوهەری شـەوچراغ کـە دەردەکەوێ دنیا روون دەکاتەوە و کە دەڕوا دنیا تاریك دەبێتەوە.

مەوجی (ن): ئاوی.

(٦) تار: ژێ. قانوون: ئامێرێکی مۆسیقایە.

واتە: شیعری مەحوی ئەوەندە بەتام و خوێیە، نەك هەر پارچەیەکی، بەڵکـوو هـەر تـاقە بەیتێکی تامێکی تایبەتی هەیە و لە خۆشیدا لە ئاوازی مۆسیقا دەچێ، لەگوێداکە هەر ژێیەکی دەنگێکی جیا لە دەنگی ژێکانی تری بدا.

(٧) بێچوون: بێهاوتا.

واتە: با بەسی بێ بەزایە چوونی عومرم لە ئاڵو وێڵی دنیادا، خوایە تۆ بی و زاتی بێهاوتای خۆت بگەرە فریام با لەمە زیاتر بەزایە نەچم.

-٨-

(١) واتە: بەراوردێ لە نێوان بـێڕەحـمی خـۆت و دڵسـووزی مـندا بکـە، لەتـاو دەردی تـۆ کەوتوومەتە سەر لافاوی خوێناوی فرمێسکم و دەروونم پڕە لە زووخی غەم و مەینەتی تۆو هێشتاش هەر دەسبەردارت نابم.

ڕەقیبی سەگ حەزی بوو، کوشتمت، سەیری کە چۆنی بۆم
دوعا بۆ دەست و تێغت من دەکەم، بڕوانە چۆنم بۆت![٢]

بە غەدداری نەوەك ناوت بەرن، بەمئەنجنی، قەت من
شکاتی جەوری تۆ بەر کەس دەبەم؟ بڕوانە چۆنم بۆت![٣]

هەناسەی ئاگرینم بردەوە بەر، تا دەروونم سووت
بە ناڵە تا دڵت سەخڵەت نەدەم، بڕوانە چۆنم بۆت![٤]

بیانوو بگرە، شێوەی خۆت بشێوێنە بە من کوشتن
وەها چاوی بەدت لێ لادەدەم، بڕوانە چۆنم بۆت![٥]

بە ئاوی گریە هەردەم ناوی چاوم ششتووە، نەك جێت
بە خوێن ئاغوشتە بێ، تۆ، چاوەکەم، بڕوانە چۆنم بۆت![٦]

---

(٢) واتە: سەیری خۆت بکە و سەیری منیش بکە. بەدکار ئارەزووی لەوەیە من لە نێواندا نەمێنم، تۆیش لەسەر ئارەزووی ئەو دەمکوژی، کەچی منیش لەجیاتی گلەیی و دوعای شەڕ لێ کردن دوعا بۆ دەست و تێغت دەکەم.

(٣) واتە: ئەنجن ئەنجنیشم بکەی شکات لەدەست تۆ نابەمە بەر کەس، نەوەك خەڵك پێت بڵێن غەددار و ستەمکارە. جا سەیر کە من بۆ تۆ چۆنم.

(٤) واتە: بۆ ئەوەی بە ناڵە ناڵ دڵت ئازار نەدەم، هەناسەی گەرمی خۆمم بردەوە ناو سینگم و هەناسەم هەڵنەکێشا تا دڵم سووتا.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە چەند نوسخەیەکی تردا بەم جۆرەیە:

هەناسەی ئاگری بەرداومە بەر تاوی دەروونم سووت

(٥) واتە: شێوەت زۆر جوانە، ترسی ئەوەم هەیە چاوی پیس کارت تێ بکا، لەبەر ئەوە شێوەی خۆت بشێوێنە و بیگۆڕە و ڕووی خۆت ترش بکە و من بکوژە تا کەس وا نەزانێ شێوەت جوانە و چاوت بدا.

(٦) گریە: گریان. ئاغوشتە: تێکەڵ.

واتە: چاوەکانم پڕن لە خوێناوی جگەرم و جێگای تۆش ناوی چاومە. جا بۆئەوەی جێگاکەی تۆ خوێناو نەبێ، هەردەم بە فرمێسك دای دەشۆم.

غەمی خۆشی نیە «مەحوی» لە دڵیـا، هـەر غـەمی تـۆیـە
لە عیشقتدا دەکەم غەم بۆ بەغەم، بڕوانە چۆنـم بـۆت! (٧)

-٩-

ئـــیتتیفاقی ئـــافتاب ئـــانێ مـــوقابیل بـــوو بـــە رووت
ئـــافەتێکـــی دی نـــەما تـــابی، بـــوەستێ رووبـــەڕووت (١)

دیـــارە خـــۆ پـــەروانـــە هـەر سـووتانە ئـەسڵی مـوددەعای
بۆیە ئێمەش عاشقین، ئەی شەخسی ئاتەش خوو، بە خووت (٢)

---

(٧) بەغەم: بەخێو.

واتە: مەحوی لەم جیهانەدا نەك خەمی کەسێك یا شتێك، تەنانەت خەمی خۆیشی لە دڵدا نیە، هەر خەمی تۆی لە دڵدایە. لە پێناوی عیشقی تۆدا خەمت بـۆ بـەخێو دەکـاو بـۆئـەوەی هەمیشە بەرابەر بە خۆشەویستیت بە وەفا بێ و خەمت بۆ بخوا، هەر خەمت بۆ بەخێو دەکا.

وا دیارە وشەی «بۆ» لە نیوەی دووهەمی ئەم بەیتەدا «بۆت» بووبێ و سووك کرابێتەوە یا بە هەڵەی نووسینەوە فەوتابێ، چونکە «ت» کە لە زاراوەی سلێمـانیدا بـە دەنگێکـی تـایبەتی دەخوێنرێتەوە و لەوانەیە نووسەرێ کە تازە دەس بداتە نووسینی کوردی هەستێکی ئەوتۆی پێ نەکا. دەشگونجی تێکڕای نیوە بەیتەکە بەم جۆرە بخوێنرێتەوە:

لە عیشقتدا دەکەم غەم بوو بەغەم؟ بڕوانە چۆنم بۆت!

-٩-

(١) ئیتتیفاقێ: بە رێکەوت. ئافتاب: خۆر. ئانێ: کاتێك. تاب: تین.

واتە: بە رێکەوت جارێکیان رۆژ تاوێك لەگەڵ رووت رووبەڕوو بوو؛ دەردێکی وای بەسەر هات توانای نەما لە بەرابەرتدا خۆی راگرێ.

لە «تاب»دا لەتافەت هەیە. لە نێوان «بەڕووت» و «ڕووبـەڕووت»یشـدا جـیناسی نـاتەواو هەیە.

ئیتتیفاقی (ن): ئیتتیفاقەن «اِتّفاقاً». بوەستێ (ن): بمێنێ.

(٢) موددەعا: مەبەست، داخوازی. ئاتەش خوو: خوو ئاگرین، توند و تووڕە.

**ئەم فیزاعەت بەدوەوە، حەقتە کە ناپرسی چیە**
**تۆ یەکێ، دائیم هەزارێکی وەکوو من دوو بە دووت(٣)**

**ئەی مەحەببەت! ئاگرێکی هێندە خۆش و دڵنشین**
**ئەو کەسەی سووتووتە، هەر ئەو هەوڵ ئەدا بۆ سوو بە سووت(٤)**

**ئەم شەرارەی فیرقەتە مەخلووقی وا کردە کەباب**
**مالیکی دۆزەخ دڵی بەم عالەمی ناسووتە، سووت(٥)**

---

☞

واتە: پەروانە کە عاشقی چرا دەبێ مەبەستی ئەوەیە بسووتێ، هەر بۆیەش ئێمە عاشقی خووی تۆ بووین کە ئازاردانی دڵدارانە تا ئازارمان بدەی.

شەخسی (ن): شەمعی.

(٣) فیزاع: هاوار و دەنگە دەنگ. دووبەدوو: دوابەدوا.

واتە: ناهەقت ناگرم کە هەواڵی دڵدارەکانت ناپرسی، تۆیێ کە هەزارانی وەك منت بەدواوە بێ و تۆیش هەر تەنها خۆت بی، هەر ئەوەندە پێت دەکرێ لا بەلای ئێمەدا بکەیتەوە و سزامان بدەی.

دەشگونجێ مەعنای «دوو بە دووت» وا لێ بدرێتەوە کەوا ئەم هەموو خەڵکە گشتیان لە ئاست تۆدا بە دووهەمت دادەنرێن.

(٤) دڵنشین: لە دڵدا جێ گرتوو. سووتوو: سووتاو. سوو بە سوو: دووبارە سووتاو، یاخود ئەملاو ئەولا.

واتە: ئەی خۆشەویستی! تۆ ئاگرێکی ئەوەندە خۆش و لە دڵدا جێ گرتووی، هەرکەس جارێك پێت سووتا خوا خوایەتی جارێکی تریش پێت بسووتێ، یان کون بە کون بە دواتا دەگەڕێ تا جارێکی تریش پێت بسووتێ.

وەسف کردنی خۆشەویستی بە «دڵنشین» وەسف کردنێکی ناسکە، چونکە خۆشەویستی هەم دڵگیرە و هەم لە دڵیشدایە...

(٥) شەرارە: پزیسك. مالیك: دەرگاوانی دۆزەخ. ناسووت: مرۆڤایەتی.

واتە: ئاگری دووری لە یار خەڵکی بە جۆرێ کردووە بە کەباب، تەنانەت دڵ رەقێکی بێ بەزەیی وەك مالیکی دەرگاوانی دۆزەخیش دڵی بۆ ئەم ئادەمیزادانە سووتا.

☜

سوبحی مەحشەر بوو، وتت: سوبحەی زووە وادەی ویسال
عالەمی کوشت ئینتیزاری هاتی وادەی زوو بە زووت[(٦)]

بۆ لە باسی زوڵفیا «مەحوی» نەبێتە مووشکاف
رۆح و دڵیە «مُدَّةَ العُمر»ی ئەسیری موو بە مووت[(٧)]

- ١٠ -

دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجێکی یاقووت
نیشانە و مۆری چی؟ خەتێکی زمڕووت[(١)]

---

☞

لە نێوان «ناسووت» و «سووت»دا جۆرە جیناسێکی ناقیس هەیە.

عالەمی (ن): عالەمەی.

(٦) واتە: ئەو سبەینێیە کە داتنابوو بە کاتی پێ‌گەیشتنت و دەتوت زۆر نزیکە و ها ئەوەندەت زانی هات، بوو بە رۆژی حەشر و دەرکەوت بەم زوانە پێی ناگەین... خەڵکیش کە ئەوەندەیان چاوەڕوانی کرد وادەکە هەر نەهاتە پێشەوە، هەموو لە تاو ناخۆشی چاوەڕوانی مردن.

(٧) مووشکاف: کەسێ ئەوەندە ورد و زیرەك بێ وەك لەوانەبێ موو بقلیشێنێ و لەتی کاو بیکا بە دوو کەرتەوە.

واتە: مەحوی حەقیەتی لە باسی زوڵفی یاردا ژیر و ورد بێ، چونکە بە درێژایی ژیانی، رۆح و دڵی دیلی تاڵ تاڵی مووی زوڵفی یار بووە و لەگەڵ یادیا رای‌بواردووە.

- ١٠ -

ئەم پارچە شیعرە لە دیوانە چاپکراوەکەدا بڵاو نەکراوەتەوە.

(١) دورج: سندووقێکی بچکۆلانەیە ژنان گەوهەر و شتی گرانبەهای خۆیانی تێ دەخەن.

واتە: دەمت دەم نیە!، سندووقێکی یاقووتیيە پڕە لە دانەی دوڕ کە ددانەکانتن، ئەو نیشانەیش کە بەو سندووقەوەیە خەتێکی وەك زمڕووت شینە کە گەنەتووکی تازە دەرهاتووی سەرلێوتە.

بــە گــريانم، وەكـوو گـوڵ، پـێكـەنى يـار
لە باغى من بە بارش غـونچە پشكـووت (٢)

قــوبووڵم كــەى ئـەگـەر، لوتـفێكـى زۆرە
بە كەمتر هـيندوێكـى خـاڵى هـيندووت (٣)

شـــوكر هـــەر مـــامەوە بـــۆ يـــادگارى
بە كارى زەخمەكەى شمشێرى ئەبرووت (٤)

لە غـەمزەى چـاوت ئـەبرۆ داگـرە و بـەس
مەكە بۆ قەتڵى عـاشق رەنـجە، بـازووت (٥)

نـەخۆشـى عـيشقى لێوت وەسـيەتى كـرد:
بـــتاشن دارى عـــوننابى بـــە تـــابووت (٦)

---

(٢) بارش: باران بارين.

واتە: يارى وەك گوڵ نازدار و جوانم بە گريانى من پێكەنى. ژيـانى مـن وەك بـاغ وايـە و گوڵەكەى يارەكەمە و بارانى ئاودانى فرمێسكى چاوەكانمە؛ بە داوەرينى ئەو بارانە گوڵەكەى من كە يارەكەمە پشكووت و پشكووتنەكەى ئەوەبوو دەمى كرايەوە كە پێكەنى.

(٣) هيندوو: خولامى رەش، كينايەيە لە ناچيزى. خاڵى هيندوو: خاڵى وەك هيندى رەش.

واتە: ئەگەر وەرمگرى بە كەمترين بەندەى خاڵى رەشت، لوتفێكى زۆرم لەگەڵ دەكەى.

(٤) واتە: خوا شوكر بە كارى شمشێرى برۆت نەمردم و مامەوە بۆ يادگارى.

(٥) رەنجە: ئازار چەشتوو.

واتە: كە ويستت يەكێ لە دڵدارەكانت بكوژى، پێويست بەوە ناكا ئازارى شـان و قـۆڵى خۆت بدەى و شمشێرى بۆ دابهێنيتەوە، تەنها بە چاو ئيشارەتێكى بۆ بكە و برۆيەكى لێ داگرە دەس بەجێ گيرۆدە دەبێ و دەكوژرێ.

(٦) چونكە دارى عونناب سوورە و لە رەنگا پەيوەندييەكى لەگەڵ لێوى يار هەيە.

مــنی بــەم حــاڵو قـاڵە دی کـە دەیـوت:
کــتێبێکـی غـەریبم دیـوە، پەڕپـووت[٧]

بـــە نـــیلە بـــێ نـــەباتی مــیسری لێوت
جلم. سوبحم، هەموو هەر شامە بێ ڕووت[٨]

لە نـــاڵەی گـــەرمی دڵ بــاکت نــەبوو تـۆ
بە ئاهی سەردی «مەحوی» من دڵم سووت[٩]

## -١١-

دڵدۆزە تـــیری ئـــاهی فـــەقیرانـــی رووت و قـــووت
بـــۆ کـــوشتنە هـــەمیشە کـــە ئامادە شـیری رووت[١]

---

(٧) حاڵو قاڵ: جۆر. غەریب: سەیر.

واتە: چونکە ئەوەندە سەرگوزەشتە و کارەساتی عیشقم لایە، لە کتێبێکی کۆنی شڕ دەچم.

(٨) واتە: بێ لێوی وەك نەباتی میسر شیرینی تۆ عازیەتی بارم و جل و بەرگم وەك ئاوی نیل شینە. بێ شەوقی روخساریشت بەیانیم وەك ئێوارە تاریکە.

وردەکاری مەحوی لەم بەیتەدا زۆر جوان دیارەکە «نیل» و «میسر» و «نەبات»ی لەلایەکەوە و «شام» و «بێرووت = بێ ڕۆت»ی بە یەکەوە کۆ کردووەتەوە کە کۆمەڵێ «تەوریە» و «ئیستیعارە»یان تێدایە.

(٩) واتە: ئازیز، ئەی یاری بێ بەزەیی، تۆ باکت نەبوو لە ناڵەی گەرمی دڵی «مەحوی»، کەچی من بە هەناسەی ساردی ئەو دڵم سووتا.

-١١-

ئەم پارچە شیعرەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) دڵدۆز: ئەوەی کار بکاتە دڵو ئازاری بداو خوێناوی بکا. لە مەیدانی دڵداری و کاری تیری برژانگو غەمزەی چاو و شتی وادا بەکار دەهێنرێو لە غەیری ئەو شوێنانەشدا بە مەجاز.

واتە: تیری ئاهی فەقیران و هەژاران دڵ دەسمێ، چونکە ئاهی ئەوان وەك شمشێری لە

☞

**مــەحفووزی تــۆ کــە روو لە خـــودا بـی لە دێوو دەد**
**بۆ حیرزی تۆ، دەبـێتـە زریێ نـەسجی عـەنکەبووت(٢)**

**دڵ زیـــندووە بـە عـیشق و بـژی تـۆ لە مـەرگ ئـەمین**
**بـــەم دەردە بـمرە، تــا بـبیە «حَــيٍّ لَا يَــمُوت»(٣)**

**گــەر ســەنگی کــۆهســارە، بــووە لەعــلی تــابدار**
**هەرکەس بە جەبری سەبر و حەیا خوێنی بوو بە قووت(٤)**

---



کێلان دەرهێنراو وایە و شمشێریش کە لە کێلان رووت کرا بۆ بریندارکـردنە. یـان مـادەم تـۆ شیری رووی خۆت وەك برۆت بێ ئامادەت کـردبێ بـۆ کـوشتنی عـاشقانی هـەژار، دەبـێ ترسیشت لە ئاه و نزوولەیان ببێ، چونکە ئاه و نزوولەی ستەم لێ کراوان گرانە.

(٢) دێو: بوویەکی خەیاڵییە بە دیمەن وەك ئـادەمیزاد وایـە، بـەڵام زۆر بـەهێز و نـاشیرین و بەسامە، دەڵێن گوایە شاخ و کلکیشی هەیە!. دەد: جانەوەری دورنـدەی وەك شـێر و پـڵنگ. حیرز: پارێزراوی. زریێ: کراسی ئاسنین. نەسجی عەنکبووت: تەنراوی جاڵجاڵۆکە.

واتە: تۆ ئەگەر روو لە خودا بی، لە هەموو دێوو جانەوەرێك دەپارێزرێی و تەنانەت شتی بێ هێزی وەك تەنراوی جاڵجاڵۆکەت بۆ دەبێ بە کراسی ئاسنین بۆ ئەوەی بتپارێزێ.

(٣) واتە: ئەوەی دڵی پڕ بێ لە عیشق هەرگیز نامرێ و ئەوەی بە دەردی عیشق بمرێ هەرگیز بە مردوو دانانرێ.

مەبەستی ئەوەیە کە مردن و ژیان ئەوە نین خەڵك تـێیـان گـەیشتوون. مـردنی راسـتەقینە ئەوەیە دڵی ئادەمیزاد شتێکی تیا نەبێ گرەویدەی بووبێ و کەسێکیش کە بۆ مەبەستێکی بەرز و پیرۆز بژی، با لە پێناویشیدا بمرێ بە مردوو نادرێتە قەڵەم.

(٤) سەنگ: بەرد. کۆهسار: ناوچەی شاخاوی. لەعل: بەردێکی گرانبەهایە. تابدار: خـاوەن پرشنگ. جەبر: زۆر.

واتە: ئەوەی لەژێر باری خۆڕاگرتن و ترسی خوادا خوێنی دڵی خۆی خواردەوە، ئەگەر بەردی سەر شاخانیش بێ دەبێ بە لەعلی پرشنگدار.

بوو بە (ن): کردە.

**یا ڕەب لە دۆزەخ ئوممەتی «ئەحمەد» بدەی نەجات**
**کەم بێ چیە لە کوورەیی وا باوەشێ بزووت(٥)**

**دەیوت: قیامەت ئەلبەتە ڕوومت نیشان ئەدەم**
**ڕوو دەرخە، تاکوو ڕۆژی قیامەت هەلێ لە ڕووت(٦)**

**بەر پێی ئەوم، بە مێزەرەوە، سەر کە نا، وتی:**
**«مەحوی» تەمایە بمخەڵەتێنێ بە تووری پووت(٧)**

---

(٥) بزووت: سووتەمەنی.

واتە: گوناهبارانی ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) لەچاو هەموو ئەهلی دۆزەخدا لە باوەشێ سووتەمەنی زیاتر نین و تەنووری دۆزەخیش بە نەبوونی ئەو باوەشە سووتەمەنییە سارد نابێتەوە و پەکی ناکەوێ.

(٦) هەلێ: هەڵبێ.

واتە: یار وتی: ڕۆژی قیامەت ڕوومت پیشان دەدەم. منیش دەڵێم ئێستا ڕووت دەرخە، بۆ ئەوەی هەر لە ئێستاوە ڕۆژی قیامەت پەیدا بێ. مەبەستی لەوەیە بە دەرکەوتنی ڕووی، ئەم خەڵکە هەموو لە عیشقی ڕوویدا دەمرن، وەك چۆن لە ڕۆژی قیامەتدا هەرچی زیندووە هەموو بە جارێ دەمرن. دووریش نیە مەبەستی لە «هەلێ» هەڵاتنی بە مەعنا ڕاکردن بێ، واتە: بە دەرکەوتنی ڕووت ڕۆژی قیامەت بایەخی نامێنێو ڕادەکا. ئەم مەعنا هەرچەند زیادەڕەوییەکی قورسی تێدایە بە ئاسانی قووت ناچێ، بەڵام زۆر ناسك و وردە.

تاکو (ن): تاکی.

لەم بەیتەشدا ڕستەی «نیشان ئەدەم» یەکێکە لەو شوێنانەی لەبەر ناچاری سەرەتای فیعلیان تیا بە «ئە» دەست پێ کراوە نەك بە «دە».

(٧) پووت: پووچەڵ.

واتە: کە سەرم بە مێزەرەوە نایە پەرپێی یار و کردم بە قوربانی، وتی مەحوی دەیەوێ بە سەلکە تووڕێکی پووچەڵ هەڵم خەڵەتێنێ.

- ١٢ -

خـــودا بـــیدا، لە هـــێلێکـــی دەدا، ســـەیری هـەیە رێکـەوت
وەنەوزم دا، نیگارم هاتە خەو، ئـەمشەو خـەوم پـێ کـەوت [١]

بـــە لەیـــلاوە وەرە بـــەر قـاپی ئـەم لەیـلایە ئـەی مـەجنوون
شەهێکە سەد سـەری فـەرهاد و شـیرینی لە بـەرپێ کـەوت [٢]

وتم: ئـاوێکـی رەحـمەت، گـەییە رۆحـم ئـاگـری فـیرقەت
وتی: لەم دۆزەخە زەحمەت کە دەر بێ هەرکەسی تێ کەوت [٣]

لەگـەڵ دڵ چـووم و بـێ دڵ دێمـەوە، ئـەم گـەوهەرە یـارەب
لەوێ کەوت و بەجێ ما، یا لە رێدا کەوت و بێ‌جێ کـەوت [٤]

نـــیگاهی گـــرتە غـــەیر و مـــن دڵم لەت بـــوو، تـەماشا کـەن
خەدەنگی گرتە کێ، شەقڤنی لە کوێ، زەربی بەر کێ کەوت [٥]

---

- ١٢ -

(١) واتە: رێکەوت سەیری هەیە، ئەمشەو وەنەوزێکم دا دەس‌بەجێ یاری وەك نیگار جوانم هاتە خەوم. خەوی ئەمشەوم پێ کەوت، وەك خەوی شەوەکانی‌ترم نەبوو. راستە ئەگەر خوا ئارەزووی لێ بێ لە هێڵێك دەیدا بە جووتیار، هێڵێك زەوی هەڵدەگێڕێتەوە لەپڕ گەنجینەیەك دێتە بەر ئێرەق و گاسنەکەی. منیش وەنەوزێکم دا یارم هاتە خەوم.

(٢) واتە: ئەی مەجنوون نە لەیلای تۆو نە هیچ یارێکی‌تر لەچاو یارەکەی مندا نانوێنن، تۆ بە لەیلاکەی خۆتەوە وەرە بۆ بەردەرگای لەیلاکەی من و بڕوانە شاهێکی وایە سەد فـەرهاد و شیرین لەبەر پێیدا کەوتوون.

(٣) واتە: داوام لە یار کرد بەزەییەکی پیاما بێتەوە فێنکییەك بدا بە دڵم، ئـاگـری دووری بـۆ ناردم و وتی: ئەوەی بکەوێتە دۆزەخی عیشقەوە هەرگیز دەربازبوونی نابێ لێی.

(٤) واتە: کە چووم بۆ لای یار دڵم لەگەڵم بوو؛ کە گەڕامەوە لەگەڵم نەبوو. جا سەرسام و دوو دڵ ماوم نازانم ئاخۆ دڵم لای یار بەجێ‌ماو رێ‌و جێی شایانی خۆی دەسگیر بوو، یاخود لە رێدا لێم کەوتووە و بێ رێ‌و جێ ماوەتەوە و نە لای خۆمی بە نسیب بوو نە لای یار.

(٥) نیگاهـ: تەماشا، تیری چاو. خەدەنگ: تیر. شەقڤن: شەقەی باڵ. زەرب: لێدان.

لەســـەر شـانی کـەسانی دی جـەنازەی مـن، وتـی: چـا بـوو
ئەم ئیفتادەش لە غەم رسگاری بوو بۆ خۆی و سەر پیّ کەوت (٦)

بە جیلوەی ئەو، وەکوو شەونم، فڕی هەر عەقڵ و هۆشـیّ بـوو
کە سێبەر مەحوە لەو جێیە هـەتاوی لەحـزەیەك لیّ کـەوت (٧)

---

☞

واتە: یار تیری چاوی بە یەکێکی‌ترەوە نا، کەچی من لە جێی خۆمـدا پێکـرام و کـەوتم. سەیری یار کەن چۆن کوشندەیەکە!، تیر دەگرێتە کیّ و شەقەی باڵی لە کوێوە دیّ و زرمە لە کیّ هەڵدەستێنیّ!.

(٦) چا: چاك. ئیفتادە: پەك کەوتوو، یا لەبەر منالّی یا لەبەر پیری. رسگار: رستگار، رزگار.

مەحوی لەم بەیتەدا عومقێکی فەلسەفی دەدا بە مەسەلەی ژیان و مردن و قۆناغی ژیان بە قۆناغی منالّی ئادەمیزاد دادەنیّ و مەرگیش بە پێگەیشتن و سەرەتای ژیانی راستەقینە. دەڵیّ: یار تەرمەکەمی بەسەرشانی خەڵکەوە دی، وتی چاك بوو ئەم لیّ کەوتووە بیّ دەسەڵاتەش لە خەم رزگار بوو و کەوتە سەر پیّ و ئیتر دەتوانیّ بۆ خۆی بڕوا بەڕێوە. بەپێی ئەم مەعنایە قۆناغی ژیانی ئادەمیزاد لە جیهاندا شوبهێنراوە بە قـۆنـاغی قـنگەنشینە و گـاگـۆڵکـیّ کـردنی مـناڵ و هەڵگرتنی بەسەر شانی خەڵکەوە بۆ سەرقەبران کە خەڵکەکە بە پیّ دەڕۆن، شوبهێنراوە بـە سەرپیّ کەوتن و پیّ گرتن.

دەشگونجیّ مەعناکەی هەروا سادە بیّ و مەبەست لە ئیفتادە پیر بیّ و لەسەر پیّ کەوتنیش ئەوەبیّ کە بەسەر شانی خەڵکەوە هەڵدەگیریّ بۆ سەرقەبران، بەڵام بەم پێیە بەیتەکە بەیتێکی بیّ‌تام و چێژو دوور لە هەموو هونەرمەندییەکی لیّ دەردەچیّ.

رسگار (ن): رزگار.

(٧) جیلوە: دەرکەوتن.

واتە: یار وەك خۆر وایە و عەقڵ و هۆش لە ئاست بوونی ئەودا وەك شەونم و وەك سێبەر وایە لەبەر خۆردا، چۆن هەرکە خۆر هەڵهات ئیتر گورج شەونم هەموو دەبیّ بە هەڵم و دەچیّ بە ئاسمانداو سێبەر نامێنیّ لەناوا، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەویشدا کەس تۆسقاڵیّ ئەقڵ و هۆشی لا نامێنیّ.

جێیە (ن): لەم رێیە. لەحزەیەك (ن): لەمحەیەك.

-١٣-

وەکوو رۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەرکەوت
لەمێوە ئەشك و ئاهی ئێمە سەر کەوت(١)

کە ئەو لێوو ددانەم دی، بە جارێ
لە بەرچاوم هەموو لەعل و گوهەر کەوت(٢)

وەنەوزێکم شەوێ دا، گەییە سەرم و
وتی: هەستە، هەتاوت وا لەسەر کەوت(٣)

لە کێ یارەب خەبەر پرسی بکەم من
کە هەرکەس بۆ خەبەر چوو، بێ‌خەبەر کەوت(٤)

---

-١٣-

ئەم پارچە شیعرەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە، تەنها بەیتی یەکەم و دووهەمی نەبێ کە وەك چوار خشتەکییەك نووسراونەتەوە.

(١) لەمێوە: لێرەوە.

واتە: کە یاری وەك مانگ جوانی من لە دوورەوە دیاری دا، فرمێسکی بەخوڕو ئاهی بەسۆزم لێرەوە لەبەر زۆری ئارەزووی دیدار جۆشیان سەند، وەك چۆن کە رۆژ بدا لە زەوی تەڕ هەڵمی لێ هەڵدەستێنێ و شەونمی پێوە ناهێڵێ.

(٢) واتە: کە لێوی وەك لەعل سووری یار و ددانی وەك گەوهەریم دی، ئەوەندەم لا جوان بوون وام زانی هەرچی لەعل و گەوهەری دنیا هەیە هەموویم بەجارێ کەوتۆتە پێش چاو؛ یا لەبەر جوانی ئەمان هەموویم بەجارێ لەبەرچاو بێزرا.

(٣) واتە: شەوێکیان وەنەوزێکم داو تۆزێ خەوم لێ‌کەوت، یار هاتە سەرم و هەڵی‌ساندم و وتی: هەستە خۆر هاتەسەرت و هەتاو لێی دایت. مەبەستی لە خۆر و هەتاوەکە خۆیەتی.

(٤) واتە: هەرکەس کەوتە داوی عیشقی یار سەری نەهێنایە دواوە. ئیتر خوایە دەبێ من هەواڵی یار لە کێ بپرسم!؟.

دڵم وەك شـێری بـێشـەی شـوعلە گـرتوو
لە سـینەی پـڕ لە سـۆزم دەربـەدەر کـەوت (٥)

بـە تـیر ئـەمڕۆ دڕی وا هـەرچـی پـێش هـات
خودا پێداوە هـەرکەس بـەر نـەزەر کـەوت (٦)

لەسـەر خـۆ چـوو بـەدەم گـریانەوە دڵ
گەڕەك پڕ بـوو کـە ئـەم مـنداڵە دەرکـەوت (٧)

لە رۆژئـاواوە ئـیمشەو بـێ نـیقابە
مەهی من، ماهی عـالەم بـێ مـەفەڕ کـەوت (٨)

بـە خـۆڕایـی ئـەوەندەم نـاڵە کـێشـا
لە سـینەمدا پسـا، مـا، بـێ ئـەسەر کـەوت (٩)

---

(٥)واتە: سینەی پڕ لە سۆزم وەك دارستانی ئاگر گرتوو وایە، چۆن کە دارستان ئاگری گرت چی شێر و دوڕندەی‌تری تیابێ هەموو دەردەچن، بەوجۆرە دڵی منیش لە سینەم دەرچووە.

(٦)واتە: هەرکەس هاتە پێشەوە، یار بە تیری چاوی پارچە پارچەی کرد. کەواتـە هـەرکەس بەر تیری چاوی کەوتبێ خوا پێداو بووە.

(٧)واتـە: دڵی مـنداڵم ئـەوەندە گـریاو هـاواری کـرد بـەدەم گـریانەوە لەسـەر خـۆی چـوو. گەڕەکیش لەتاو دەنگی گریانی ئەم منداڵە پڕ بوو لە هەراو زەناکە کەوتە ناوکۆڵانەکان.

پڕ (ن): کەڕ.

(٨)مەفەڕ: جێگایەك کە ئادەمیزاد هەڵێ بڕواتە ئەوێ.

واتە: مانگی من کە یارەکەمە ئەمشەو لە رۆژاواوە بەبێ پەچە دەرکەوت و هات، هەرکە ئەو دەرکەوت و هات، مانگی ئاسمان کە لە رۆژهەڵاتەوە هەڵ هاتبوو، لە شەرمانا رای‌کـرد، جـێ نەبوو خۆی تیا بشارێتەوە و نەیدەزانی بۆکوێ هەڵبێ.

(٩)واتە: ئەوندە هەناسەی بێ‌سوودم هەڵکێشا، هەناسە لە سینەمدا تـاساو پـرزەم لێ بـڕا، توانای ئەوەم نەما هەناسەی‌تر هەڵکێشم و نیشانەی هەناسەم بەدەرەوە نەما.

بـــرۆی ئـــەو شـــۆخـــە ئـــەمرۆ تـــێغـــی کـــێشـــا
نەجاتی دا بە رەحمەت هەرچی بەرکەوت[١٠]

بـــە پـــیر ئـــەو رۆژەوە «مـــەحوی» ئـــەوەندە...
بەسەر چوو بوو، وەکوو شەونم لە سەرکەوت[١١]

- ١٤ -

بـە کـەس نـابێ بـتی مـن ئـاشنا قـەت
غەزالەی بـەڕ نـیە رامـی وەفـا قـەت[١]

مەحاڵە بێتو ئـەو پـێ سـەر سـەرم نـێ
بـە تـاجی پـادشا نـاگـا گـەدا قـەت[٢]

---

(١٠) واتە: ئەمڕۆ برۆی یار وەك شیر لە رووی عاشقانیدا هەڵکێشرا. هەرکەس پێوە بوو بەختی بوو، بە رەحمەتی خوا چوو.

(١١) واتە: مەحوی لەجیاتی پێ، ئەوەندە بە سەر بە پیری ئەو رۆژەوە چوو کە بەر تێغی یار بکەوێ تیایدا، سەری نەما. وەك شەونم کە رۆژ هەڵدێ بە سەر بـە پـیرییەوە دەچـێ و لەنـاو دەچێ.

مەحوی لەم بەیتەدا «ڕۆژ»ی بە «تەوریە» بەکار هێناوە و دوو مەعنای لێ ویستووە.

- ١٤ -

(١) قەت: قەت، هەرگیز.

واتە: یارەکەی من هەرگیز نابێ بە هاودەمی کەس، چـونکە وەك ئـاسکی بـیابان وایـە و ئاسکی بیابانیش دەستەمۆی وەفا نابێ و بۆ کەس ناگیرێ.

(٢) بێتو: روو بدا، چونکە ئەگەر «بێت و» بوایە کە لە ریشـەی «هـاتن» بـێ، زەمـیری «ئـەو» دەکەوتە پێشی؛ نەك وەك ئیستا کەوتووەتە دوای.

مەبەستی لەوەیە پێی یار وەك تاجی شایی و سەری خۆیشی سەری گەدایە و مەحاڵیشە تاجی شایی بنرێتە سەر سەری گەدا.

وتم: چ بکەم لەبۆ وەسڵت؟ وتی: کەس
بە کەس نەیوتووە عیلمی کیمیا قەت[٣]

چ ئیستیغنا، چ وەحشی تەبعی‌یێکە
نەپرسی تۆ هەواڵی ئاشنا قەت؟![٤]

لە یادت دەرنەچم بەس، پەس هەوەستە
لە دەرحەقما مەکە غەیری جەفا قەت[٥]

هەموو بیسمیلیە، هەر من نیمە بیسمیل
نەبوو کاریٚ بکا هەر بۆ خودا، قەت[٦]

هەموو فەخری کە داغ و دەردە عاشق
مەبەن، ریسواییە، ناوی دەوا قەت[٧]

---

(٣)واتە: بە من گەیشتن وەك فێربوونی «کیمیا» وایە و کەسیش کیمیا فێری کەس ناکا. جاران وا مەشهوور بوو. کیمیازان ئاسن دەکا بە زێڕو جیوە بە زیو... بۆیەش دەیانوت: فلانە کار کیمیای ناگاتیٚ، واتە ئەوەندە بە بەرهەمە.

(٤)ئیستیغنا: موحتاج نەبوون بە خەڵك. وەحشی تەبعی: کێوییەتی و دەسەمۆ نەبوون.

(٥)پەس: ئیتر.

واتە: ئارەزووی خۆتە، هەرچیم لیٚ دەکەی بیکە، حەز دەکەی هەمیشە هەر ئازارم بدە. من تەنها ئەوەندەم بەسە کە لە یادت دەرنەچم، ئیتر با بۆ ئازاردانیش بمخەیتەوە یادی خۆت.

(٦)بیسمیل: ناوی خوا هێنان لە کاتی سەربڕینی قوربانیدا. لە عەرەبیدا «بَسْمَلة». واتە: وتی: «بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيم».

واتە: هەموو دڵداران بیسمیللایان لیٚ کراوو یارەکانیان سەریان بڕین و بە موورادی خۆیانیان گەیاندن، من نەبیٚ یارێك شك نابەم سەرم ببڕیٚ و کەسێك نیە بۆ خوا کارێکی وام لەگەڵ بکا.

(٧)فەخر: شانازی.

واتە: هەموو شانازییەکی عاشق داخ و دەردەکەیەتی. کەواتە خەڵکینە، شوورەیی و ریسواییە ناوی دەرمانی لا بهێنن و ئەو مایەی شان و شکۆیەی لیٚ بسێنن.

**وتم: بێ باکە بۆ خوونڕێزی، ئـەبرۆت**
**وتی: تێغ ئەز بڕش ناکا حـەیا قـەت(٨)**

**وتـــی: «مـەحوی» هـەناسەی ئـاگـرینە**
**بە دەم مـن نـازکم، نـاوم نـەبا قـەت(٩)**

---

(٨) ئەز «از»: لە. وشەیەکی فارسییە. بڕش: بڕشت، بڕین.

واتە: بە یارم وت برۆت سڵ ناکاتەوە لە خوێن رشتن. ئەویش لە وەڵامدا وتی: برۆم تێغە و تێغیش شەرمی لێ نایێ لە بڕشت...

خوونڕێزی (ن): خوێن رێژی.

(٩) واتە: یار وتی: هەناسەی مەحوی گەرمە و منیش ناسکم. دەسا با ناوم نەهێنێ بە دەمیدا نەوەك بسووتێم.

-١-

بـــۆ پـــارە حـەیفە خـۆ دەکـەیە پـوولی نـاڕەواج
بۆ پارویێکی نان ئـەسەفە روو دەکـەی بـە سـاج[١]

ڕێی دا لە قـاپییا بـمرم، پـێشی سـەر سـەرم
نا، وا گەدا دەبێ بە خوداوەندی تـەخت و تـاج[٢]

بـۆ زەبـتی مـولکـی دڵ بـەسە لەو لێوە یـەك قسـە
شاهم، بە سەوقی لەشکری غـەمزە چ ئـیحتیاج[٣]

با بـێنـە سـەیری گـەردن و سـینەی نـیگاری مـن
نەیدیوە هـەرکەسێ بـتی زیـوو سـەنەم لە عـاج[٤]

---

-١-

(١) مەحوی لەم بەیتەدا وەستاییەکی تەواوی دەربڕیوە، کە داناوە ئـەوەی بـەدوای پـارەدا بگەڕێ دەبێ بە پارەیەکی بێڕەواج و ئەوەی هەر هەوڵی نانی بێ شـەرمەزار دەبـێو رووی لەناوکۆمەڵدا وەك ساج رەش دەبێ.

(٢) خوداوەند: خاوەن.

مەبەستی ئەوەیە پاشایەتی راستەقینە بەوە دەبێ بنیادەم لەبەر دەرگـای دۆسـتدا بـمرێو دۆست پێ بەسەر سەریدا بنێ، واتە: بەختیاری بەڕاست ئەوەیە بنیادەم لەپێناوی خـواسـتی پیرۆزی خۆیدا هەموو کلۆڵی و کوێرەوەرییەکی بێتە رێ. یاخود واتە: بـەردەرگای مـاڵی یـار تەختی پادشاییە و پێشی تاجی سەرە.

دەبێ (ن): دەکەم.

(٣) واتە: ئازیز تۆ شاه و فەرمانڕەوای دڵی منی. وڵاتی دڵ بە تەنها وتەیەك لەو دوو لێوتەوە سەرت بۆ دادەنەوێنێو پێویست ناکا بۆ ئەم مەبەستە لەشکری ئیشارەی چاوانت بخەیتە رێ. مەبەستی مەحوی ئەوەیە ئەوە بگەیەنێ کەوا لە جیهانی دڵو دڵداریدا ئیشـارەتێکـی چـاو لە هەزار قسەکاریگەرترە.

(٤) عاج: ئێسقانی فیل.

مەبەستی مەحوی ئەوەیە بڵێ: گەردنی یار وەك گەردنی پەیکەری لە زیو دروست کراوو تەختی سینەی وەك تەختی سینەی پەیکەری لە ئێسقانی فیل تاشراو وایە.

کــەی دڵ دەســێنــرێ لە بــتێ ســەندبێتــی ئــەو
لێوی لە میسر و زوڵفی لە چینی خــەراج و بــاج (٥)

کێ قەدری شیعری ئـێمـە دەزانـێ، بـەری دەکـا
هەر ســاحێبــە لەبــەرکەری کــاڵایـی بــێ رەواج (٦)

«مــەحوی» عــەبەس بــە دیـدەیی بـیمار مـائیلە
نــاگــیرێ ئــاشنایی لەگــەڵ مـەستی نـامیزاج (٧)

---

(٥) واتە: چۆن دەتوانین دڵی یارێ بستێنین بۆ خۆمان کە ئەوەندە شۆخ و نازار بێ، لێوی لە شیرینیدا خەراجی لە میسر سەندبێ کە بەناوبانگە بە شەکر و نەبات هێنانە بەرهەم و زوڵفی لە بۆن خۆشیدا باجی لە چین سەندبێ کە دەنگ‌وباسی موشکی بۆن خۆشی خەتاو خوتەنی دنیای گرتووەتەوە. یاخود چۆن دەتوانین دڵمان لە یارێکی وا بستێنینەوە.

کەی (ن): قەت.

(٦) واتە: کەس قەدری شیعری ئێمە نازانێ، ئەگەر قەدریان بزانیایە لەبەریان دەکرد و دەماودەم دەیانگێڕایەوە. بۆیە هەر لە دڵی خۆماندا دەمێنێتەوە، چونکە کاڵای بێ رەواج کەس نیکڕێ و دەبێ هەر خاوەنەکەی خۆی بیپۆشێ و لەبەری بکا.

ئەم بەیتەی مەحوی گلەییەکی بەسۆزە لە کۆمەڵێکی پاشکەوتوو کە «گۆران» واتەنی قەدری هونەرمەند لای «وەکوو عەکسی قەمەر وایە لەناو ئاوێکی لیخندا!».

لەم بەیتەدا وردەکارییەکی ناسك هەیە لە بەکارهێنانی «لەبەرکردن»دا بۆ دوو مەعنای جیاجیا.

(٧) عەبەس: بێهوودە.

واتە: مەحوی لە خۆڕایی بەتەمای ئاشنایەتی گرتنە لەگەڵ چاوی بیمار و مەستی یار. کێ دیویە بنیادەم دۆستایەتی لەگەڵ مەستێکی نەخۆشدا بگرێ؟ مەستی نەخۆش کەی ئاگاو توانای دوستایەتی گرتنی هەیە!.

-١-

تــۆ نــەبینن، نــووری ئــەم چــاوانــە بــۆچ!
بۆ نــیساری تــۆ نــەبێ، ئــەم جــانە بــۆچ![١]

جـــیلوەی ئـــەو حـــوسنە نـیە گـــەر کـارگەر
بـــۆ جـــەمادیش، ئـاینە حــەیرانــە بــۆچ![٢]

دڵ لە ســـــینەم هـــیجرەتی کـــرد و وتـــی:
بوونە، عومرێ فەرشی ئـاتەشخانە بـۆچ![٣]

چـــۆڵی دی ســـینەم لە دڵ، بـــۆ ســـووتنی
ئەمری دا، شـێری نـەبێ ئـەم لانـە بـۆچ![٤]

---

-١-

(١) نیسـار: بەقوربان کردن. جان: گیان.

واتە: چاوم ئەگەر تۆ نەبینێ، کوێر بێ چاکترە. گیانیشم ئەگەر بەقوربانی تۆ نەبێ دەرچێ چاکترە.

(٢) جیلوە: دەرکەوتن. جەماد: ئەوەی نەش و نوما ناکا. ئـاینە: ئـاوێنـە. حـەیران: سـەرسام؛ مەبەست لە شێتە.

واتە: ئەگەر دایاریدانی جوانی یار کار لە جەماداتیشدا ناکا، بۆچی ئاوێنە کە یەکێکە لە جەمادات شێت بووە. مەبەستی ئەوەیە بڵێ ئەو ئاوێنانەی شێوە ئەشێوێنن، بۆیەی ئەشێوێنن چونکە یار سەیری خۆی تێدا کردوون و ئەوانیش کە جوانی یاریان لەخۆیاندا دیوە شێت بوون.

(٣) ئاتەشخانە: ماڵی ئاگر، تەنوور.

واتە: سینەم لەبەر هەناسەی گەرم و بەسۆزم وەك تەنووری گەرمی لێ هاتووە. بۆیـە دڵ خۆی پێ ڕانەگیراو دەرچوو. وتی: بۆچی من بەدرێژایی عومرم بیم بە فەرشی ڕاخراوی نـاو تەنوور و هەمیشە هەر بسووتێم، یا بۆ وەك ڕایەخ لەناو ئاتەشگادا بکەوم، خۆ من ئاگرپەرست نیم، ڕاکەم چاترە.

(٤) واتە: کە دڵ لە سینەم باری کرد و یار سینەمی بە چۆڵی دی، فەرمانی دا ئاگری تێبەردەن و وتی: ئەم لانەیە بۆچی بمێنێ مادەم شێرەکەی تیا نەماوە و لان بەبێ شێر بەکەڵکی چی دێ.

**خوێنی جەرگ‌وکونجی عوزلەت بەسمە بەش**
**بەر منەت بوونی مـەی و مـەیخانە بـۆچ!**[٥]

**ســائیلی ئــەو بــەردەرەم، وتــم و وتــی:**
**تۆ گەدای، ئـەم نـەخوەتی شـاهانە بـۆچ!**[٦]

**هەر بە تیری غەمزە کـوشتن، نـەك بـە شـیر**
**حەیفە، خوون ئالوودە ئەو دامـانە، بـۆچ!**[٧]

**زاهید ئەو زوڵفـەی لەسـەر روو دی، وتـی:**
**کوفری وا روو پۆشی ئـەم ئـیمانە بـۆچ!**[٨]

---

(٥) بەرمنەت بوون: منەت هەڵگرتن.

واتە: لەجیاتی ئەوەی کونجی مەیخانە بگرم، کونجێکی چۆڵی‌تر دەگرم بۆ خۆم و لە هەموو کەس دوور دەکەمەوەو، لەجیاتی خـواردنـەوەی مـەیش خـوێنـی سـووری جگـەری خـۆم دەخۆمەوە و منەتی هیچ مەیگێڕو هیچ مەیخانەچییەك هەڵناگرم.

(٦) سائیل: دەرۆزەکەر. بەردەر: بەردەرگا. نەخوەت: فیز و خۆ لێ بایی بوون.

واتە: سواڵکەری بەردەرگای یار پایەیەکی ئەوەندە بڵندە مەگەر بۆ پادشاهان دەست بدا. بۆیە هەرکەسێ ئیددیعای ئەوە بکا کە سواڵکەری بەردەرگای یـارە، فـیز و شـان و شکـۆی پادشایەتی بۆ خۆی ئیددیعا کردووە، ئەوەش بۆ هەموو لات و گەدایەك نالوێ.

(٧) خوون‌ئالوودە: خوێناوی.

واتە: کوشتنی راستەقینە کە داوێنی پێ لە خوێنەوە بتلێ، کوشتنە بە تیری چاو. بۆیە حەیفە یار بە تیری چاو ئیشارەتی نازدارانەی، دڵداران بکوژێ و داوێنی خۆی بە خوێنیان رەنگ بکا، باشتر ئەوەیە بە شیر بیانکوژێ کە هیچ نیشانەیەکی کوشتنەکە دەرناکەوێ.

ئەم بەیتە، بەم مەعنایە زیادەڕەوییەکی ورد و ناسکی تێدا پەیدا دەبێ.

(٨) مەبەستی لە شوبهاندنی رووی یارە بە ئیمان لە رۆشنیداو زوڵفی بە کـوفر لە تـاریکی و رەشیدا، کە زوڵفیشی دێ بەسەر روویدا.

هەر بە حەسرەت، نەك بە زەربەت، کوشتمی
دا نـــەڵێن ئـەم قـەتڵی بـێ‌تـاوانـە بـۆچ!(٩)

تــاقە خــانێکــە لەســەر ڕێی ئــاخیرەت
زادی ڕێ هـەڵنـاگـری لەم خـانە بـۆچ!(١٠)

«مــەحویا» بــازێکـی تـۆ، قـودس ئـاشیان
بوونە بوومی شوومی ئـەم وێرانـە بـۆچ!(١١)

-٢-

ئەم عەسرە، عەسر و وەقتە لەبـۆ فـاجیرێ لە هـیچ
دیـــنی نـەکـا ویـقایە، حـەیا نـەیگرێ لە هـیچ(١)

---

(٩) حەسرەت: داخ. زەربەت: لێدان بە تیر و شیر.
(١٠) زاد: توێشوو.
جاران کە هاتوو چوو لەنێوان شاراندا بـە وڵاخ بـوو، لە هـەر مـەنزڵێکـدا خـانێك هـەبوو کاروانی باریان تێدا دەخست و تێیدا دەحەسانەوە و توێشووی قۆناغێکی‌تری ڕێیان لە نان و ئاو تێدا هەڵدەگرت بۆ ئەوەی لەڕێدا پەکیان نەکەوێ... مەحویش هاتووە ژیانی شوبهاندووە بە سەفەرێك و دوایی هاتنی سەفەرەکەی داناوە بە مەرگ‌و مەبەستی بۆ ڕۆیشتنی داناوە بەو دنیا. دەڵێ: ئادەمیزاد ڕێبوارە و دوا مەنزڵی لەو دنیایە و ئەم دنیایە وەك خانێك وایە لە ڕێگایدا کە سەرەتاکەی لە هاتنە دنیاوە دەستی پێ کردووە. حەیفە ئادەمیزاد بۆئەوەی بە ساغی و ڕەحەتی بگاتە جێ، لەم سەفەرە درێژەیدا توێشوو هەڵنەگرێ کە بریتیە لە کردەوەی چاکە لە ژیانیدا.
(١١) قودس ئاشیان: ئەو باڵدارەی هێلانەی بە شوێنێکی بەرز و پیرۆزەوە بێ. بووم: بایەقوش.
واتە: مەحوی! تۆ بازێکی هێلانەیەکی پیرۆزت هەیە کە جیهانی مەردانی خوایە، سوودی چیە ببی بە بایەقوشی نەگبەتی خانە وێرانی دنیاو کردەوەی چاکت نەبێ.
بوونە (ن): بوویە.

-٢-

(١) فاجیر: خراپکار، ئەوەی خەریکی فیسق و فوجوور بێ. ویقایە: پاراستن.

دنـــیا بـــه کـــامی هـــیچکەسانە هـــەمیشە دەم
هـــیچ ئـەڵبـەتە بـە هـیچ دەمـێ نـابڕێ لە هـیچ (٢)

دنیا کـە هـیچە، جـوملە دەزانـن، کـەچی چ کـەس
مەردانە بـۆ خـودا نـیە دەس هـەڵگـرێ لە هـیچ (٣)

تـــا ســـەر نـەبۆتـە گـۆ، دە لە دنـیا دە تـۆ شـەقێ
هەر ئەم شـەقە بـەکـارە کـەوا هـەڵدرێ لە هـیچ (٤)

ماچی دەمی لە کەڵکەڵەمـا بـوو، چ خـۆشـی وت:
قرم، ئەی ئەسیری واهیمە، خۆش ناکرێ لە هیچ (٥)

---



واتە: ئەم چەرخە چەرخی ئەو خراپکارانەیە کە دینی خۆیان لە هیچ خراپەیەك ناپارێزن و شەرم لە هیچ کردەوەیەکی بەد نایانگێڕێتەوە.

(٢) کام: ئارەزوو. هیچکەسان: ئەو کەسانەی کە هیچو پووچن. هەمیشە دەم: هەمووکاتێ.

واتە: دنیا هەمیشە بە ئارەزووی ئەو کەسانەیە کە هیچو پووچن. ئەمەش شتێکی بەجێیە، چونکە هەمیشە شتی هیچو پووچ بۆ کەسانی هیچو پووچە.

(٣) واتە: هەمووکەس دەزانێ دنیا هیچو پووچە، کەچی کەسیش نیە مەردانە بۆ خوا دەست لە شتێ هەڵگرێ لەم دنیا هیچو پووچەدا.

(٤) گۆ: توپێکی دارینە لە یارییەکی تایبەتیدا بەگۆچانێك لێی دەدەن. دە «ی یەکەم»: دەسا. دە «ی دووهەم»: بدە.

واتە: تا نەمردوویت و سەرت نەبووەتە گۆ و نەکەوتووەتە بەر شەقی ئەجەل، زووکـە تـۆ جێی ئەو دنیای خۆت خۆشکە و شەقێ لە دنیا بدە. هەر ئـەو شـەقە هـەیە کـەڵکێکـی لێ وەربگیرێ.

(٥) کەڵکەڵە: خەیاڵ. قرم: مرق، مرخ.

واتە: بە تەمای ماچێکی دەمی یار بووم. وتی: هەی دوای خەیاڵ کەوتوو! من دەمم کوا تا تۆ ماچی کەی؟ مرخ چۆن لە شتی نەبوو خۆش دەکرێ!.

دەم نادیار و نازی قسەی پڕ بە دەشت و شار
دنیایەك ئاوی زیندەگیو دەرخریٚ لە هیچ[٦]

مەجنوونە: شاهی عیشق و بیابانی بارەگا
ئاهی، دەکا هەمیشە بە پا چادریٚ لە هیچ[٧]

دیققەت کە، غەیری روشتەیی جان و میانی یار
روشتەم نەدیوە «مەحوی» ئەمن، بادریٚ لە هیچ[٨]

چاوی کەویٚ کە بەم غەزەلەم دورِ شناسی شیعر
کیٚ بیٚ دەڵیٚ ئەمەندە گوهەر وەرگریٚ لە هیچ[٩]

---

(٦) واتە: یار دەمی دیار نیە، کەچی نازی قسەی دنیای پڕ کردووە. بەڕاستی سەیرە پڕی دەریایەك ئاوی ژیان لە هیچ دەرچێ. مەبەستی لە ئاوی ژیان قسەکانیەتی.

(٧) واتە: شێتی عیشقی دولبەر وەکوو پادشا وایە و ئەو بیابانەش کە پیادا دەسووڕێتەوە بارەگاکەیەتی. هەرکاتێکیش بیەوێ بە هەناسەیەکی سارد چادرێ لە هیچ بەرپا دەکا.مەبەستی ئەوەیە رووی ئاسمان دەگرێو دەیکا بە سێبەر بۆ خۆی.

بیابانی (ن): بیابانە.

(٨) روشتە: بادراو. میان: ناوقەد.

واتە: گیانی من لەتاو دەردی عیشق وەك نەبوو وایە. ناوقەدی یاریش لەبەر باریکی هەروەکوو نەبوو وایە. گیانی منیش لە ناوقەدی یار ئاڵاوە و گرەویدەی بووە. من غەیری ئەو دوو شتە نەبووە هیچ شتێکم نەدیوە نەبن و لە یەکیش ئاڵابن.

(٩) واتە: من لەتاو دەردی عیشق وەك هیچم لیٚهاتووە، کەچی شیعری وا ورد و ناسك و جوانیش دەڵێم. دورِناسی شیعر کە چاوی بەم شیعرانەم بکەوێ سەری سڕ دەمێنێو دەڵێ کێ بێ ئەمەندە گەوهەر لە هیچ وەربگرێ.

ئەمەندە (ن): ئەوەندە.

-١-

ساقی، ئەی مایەی تەرەب لەب، پەرچەمت رەیحانی رووح
نیم خەندێ کە لە غونچە، دەرخە سەرچاوەی سەبووح [١]

پــــرسشێ کـــا حـــاڵی زاری ئــێمـــە، زاری کـــردەوە
لەو ددانـــانە کـــە دەدرەوشـــایەوە نـــەجمی فـــوتووح [٢]

لێوی دەرخست و بە ناسیح لێوە لەرزەی خست ئـەگـەر
بێ تـەبەسسوم کـا دەبـێتـە ئـافەتی تـەوبەی نـەسووح [٣]

---

-١-

(١) نیم خەند: نیمچە پێکەنین، زەردەخەنە. سەبووح: مەی.

واتە: ئەی ئەو یارەی کە لێو جووڵاندن و گفتوگۆو پێکەنینت مایەی خۆشی و شادمانی دڵانە و زوڵفت لە بۆن خۆشیدا وەك رێحان وایە بۆ گیان، خونچەی لێوت بە نیمچە زەردەخەنەیەك بپشکوێنە با ناوی دەمت دەرکەوێ کە سەرچاوەی تەراپیی وەك مـەی سـەرخـۆشکـەری دڵدارانتە، یاخود قسەیەك بکە... تاد.

(٢) زاری «ی یەکەم»: ناڕەحەت. زار «ی دووهەم»: دەم. نەجمی فوتووح: ئەستێرەی بەخت.

واتە: دەمی کردەوە ویستی پرسیارێك لە حاڵی ناڕەحەتی ئێمە بکا. بەو دەم کردنەوەیەی، ئەستێرەی بەخت لە ددانە درەوشاوەکانی دەرکەوت. یان: بەو دەم کردنەوەیەی ئەو ددانانەی دەرخست کە ئەستێرەی بەختیان لێ دەدرەوشایەوە.

لە نێوان هەردوو «زار»دا جیناسی تەواو هەیە.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرەیە:

حاڵی زاری ئێمە پرسینی بوو زاری کردەوە

لە نوسخەیەکی کەشدا بەم جۆرەیە:

حاڵی زاری ئێمە پرسین بۆ بە زاری کردەوە

(٣) تەوبەی نەسووح: ئەو پەشیمان بوونەوەیەیە لە گوناهکە ئیتر هەرگیز نەشکێنرێ.

واتە: یار هەر بە دەرکەوتنی لێوی، لێوە لەرزەی بەوانە خست کە ئامۆژگاری خەڵك دەکەن شوێن پەیڕەوی دڵداری نەکەون. خۆ ئەگەر بێتو زەردەخەنەیەك لە رووياندا بکات، دەبێ بە ئافەتی تەوبەی نەسووح و تۆبەکەیان پێ دەشکێنێ و بە تەواوی لە دین دەریان دەکا.

بێ منەت رزقێکە غەم، بمرم لەبرسان، ئەو دەخۆم
تەفرە ناخۆم و تەڵەب ناکەم لە دنیا قووتی رووح (٤)

«اَلْحَذَرْ» «مەحوی» لە نەوحەی بێ گوناهان «اَلْحَذَرْ»
ئاوی چاوی بوو جیهانی دا بە قڕ تۆفانی نووح (٥)

-٢-

کە تێغت دڵ دەکا دوو قەد، دەدا تەبشیری «قَدْ أفْلَح»
دەنووسێتن لە سەفحەی سینە تەفسیری «أَلَمْ نَشرَح» (١)

---

٤) واتە: خەم رۆزییەکی بێ منەتە، بەزۆری لای خۆم هەیە. ئەگەر لە برسانیشدا مردووم هەر ئەو دەخۆم و داوای قووتی گیان لە دنیا ناکەم.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرەیە:

غەم زەخیرەی خۆمە، زوو بمرم لەبرسان، ئەو دەخۆم

٥) نەوحە: گریان و ناڵە.

واتە: هاوار و کڕووزانەوەی ستەم لێکراوانی بێ گوناه، ئەنجام بۆ ستەمکاران خراپ دەبێ، بۆیە پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن، کافرەکانی سەردەمی نووحیش گوێیان بە هاوار و «نەوحە»ی نەداو بەزەییان بە کڕووزانەوە و گریانیا نەهات، تا ئەوەبوو فرمێسکی چاوی بوو بەهۆی ئەو تۆفانە گەورەیە کە خوا هەڵیساند و غەزەبی لە ستەمکاران پێ گرت...

مەحوی ویستوویە لەم بەیتەدا جیناسێکی لەفزی و تەناسوبێکی مەعنەوی لە نێوان «نەوحە» و «نووح»دا دروست بکا.

-٢-

(١) واتە: کە تێغی برۆت لەکاتی تەماشاکردنمدا دڵم لەت دەکا، موژدەی رزگار بوونم دەداتێ. ئەو خەتەی کە بەسەر سینگمیا دەهێنێ، مەعنای ئایەتی: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾م بۆ لێک دەداتەوە کە واتە: ئایا سینگمان لەت نەکردی؟

تەفسیر کەرەوەکانی قورئان لە مەعنای ئەم ئایەتەدا دوو رای جیایان هەیە، یەکێکیان ئەوەیە: گوایە پێغەمبەر (د.خ) لە منداڵیدا بە فەرمانی خوا سینگی لە غەیبەوە لەت کراوە و

**ئەگەر ئەو شۆخە ساقی بەزمە، باڵقڵ قازیو موفتیش**
**دەبێ بینە قەدەح وەرگر لەگەڵ فەتوی «وَ لا یَقْدَحْ»(٢)**

**ئەسیرت وەقتی کوشتن شادەمەرگن، ناگەنە کوشتن**
**لە خۆشی خۆشییا رۆحی فڕیوە تا چووە مەزبەح(٣)**

**رەقیب ئەو دامەنەی دی سەوزە، وەك گا لرفی بۆ هێنا**
**نەبوو حاڵی لە لەفزی عەیبە عەیبە، تا وتم: وەح وەح(٤)**

---

☞

پارچەیەکی رەشی لێ دەرهێنراوە و ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ. ئەویکەشیان ئەوەیە: کە سینگ لەتکردن کینایەیە لە رێگا بۆ روون کردنەوە و شارەزاکردن لە رێگای راست. مەحویش، مەبەستەکەی خۆی لەم مەعنایە وەرگرتووە.

هەروەك ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ﴾ ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿أَلَمْ نَشْرَح لَكَ صَدْرَكَ﴾ کە باسمان لێ کرد، ﴿قَدْ أَفْلَحَ﴾ یش ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ..﴾ ...تاد لەو وەرگیراوە، بەڵام لێرەدا پەیوەندییەکی ئەوتۆ لە نێوان بابەتەکە و ئایەتە لێ وەرگیراوەکەدا نیە.

دەدا (ن): دەکا. دەنووسێتن (ن): دەنووسێ خەت.

(٢) واتە: مادەم یار دەوری مەیگێر ببینێ، دیارە مەی حەڵاڵ دەبێو باڵقڵ قازی و موفتیش کە فتوای شەرعیان لە دەستدایە دەبێ پیاڵەی مەی لە دەستی وەربگرن و فتوای ﴿وَ لا یَقْدَحْ﴾یش بدەن، واتە: مەی خواردنەوە زیانی نیە.

(٣) شادەمەرگ: ئەوەی لە خۆشییاندا بگاتە رادەی مردن. مەزبەح: جێگای سەربڕین.

واتە: دیلەکانت کە فەرمانی کوشتنیان دەدەی یا کە دەیانبەی بیانکوژی، بەرلەوەی بگەنە بەردەستی جەللاد، لە خۆشییاندا شادەمەرگ دەبن و گیانیان دەردەچێ، یا بەرلەوەی گیانیان بە هۆی سەربڕینەوە بگاتە قورقوڕاگەیان، لە خۆشییاندا دەفڕێو لە لەشیان دەچێتە دەرەوە.

ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لە نوسخەیەکدا لە جێگای یەکتردان.

(٤) دامەن: داوێن. لرف: شاڵاو، هەڵپە.

واتە: بەدکار کە داوێنی سەوزی یاری دی، وەك گا شاڵاوی بۆ هێنا. هەرچەند پێم گوت شوورەییە وامەکە، تێنەگەیشت. ناچار بووم بەو زمانە لەگەڵی دوام کە لێی حاڵی دەبێو «وەحەم» لێ کردا!.

بـــووه هـــــەم قـــــافیەی لێوت زوبـــانم، ئـــیتتیفاقاتە
دەبێ عاجز نەبی، وا هاتووە، ئەو ئەملەح، ئەم ئەفسەح[(٥)]

بە خەندەی لەب دەداتن موژدە «لا تَحْزَنْ» بە مەحزوونان
دەمی تێغی برۆی ئیفشا دەکا تەهدیدی «لا تَفْرَحْ»[(٦)]

دڵی «مەحوی» لە سینەی تەنگیا هەر ما بە دڵ تەنگی
بە جاهی مووسەوی بۆ مەش وەکوو بۆ ئەو بوو «رَبِّ اشْرَحْ»[(٧)]

---

(٥) واتە: وا ڕێکەوتووە زوبانی من ئەفسەحە و لێوی تۆ ئەملەحە و لەمەوە هەردوو بوون بە هاوسەنگ و قافیەی یەك. بۆیە نابێ زویر بی کە زوبانی من هەمیشە بە تەمای لستنەوەی لێوی تۆیە.

(٦) ئیفشا: دەرخستن. تەهدید: هەڕەشە.

واتە: لەلایەکەوە بە زەردەخەنەی لێو موژدە دەدا بە دڵدارە خەفەتبارەکانی کەوا خەم نەخۆن و پێیان دەڵێ کەوا سەرەنجام هەر پێی دەگەن. کەچی لەولاشەوە بە دەمی تێغی برۆی هەڕەشەیان لێ دەکاو دەڵێ دڵی خۆتان بەوە خۆش مەکەن کە پێم بگەن، پێم ناگەن.

(٧) مەش: ئێمەیش. مووسەوی: حەزرەتی مووسا.

واتە: دڵی مەحوی بە خەفەتباری لە سینەیدا ماوەتەوە، خوایە بۆ خاتری حەزرەتی مووسا کە دوعای ﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي﴾ [واتە: خوایە سینەم بکەرەوە و تێم گەیەنە] ت لەو گیراکرد، هەمان دوعا لە ئێمەش گیرا کە و سینگمان بکەرەوە با دڵمان دەرچێ و لەم بەندیخانە تەنگ و تاریکە رزگاری ببێ.

-١-

بە سورمە بۆیە دولبەر خەنجەری موژگانی دا پەرداخ
دڵی هەڵناگرێ ببیێ لە کوشتە دەنگی ئۆف و ئاخ [١]

بە تیرێ کوشتمی، هەڵیاوەسیم، سووتاندمی، رۆیی
دوعا بۆ حیفزی کەن، کێ دیویە جانانە وا گوستاخ [٢]

گوڵو لالەی کەژو کۆ، کۆهکەن دێنێتەوە فکرم
کە خوونی ناحەقی ئەو مەوج ئەدا ئێستەش لە کێوو شاخ [٣]

لەبەر قاپی خەراباتا، کە یارەب دایمە ئاوا بێ
مەگەر خاکێ بەسەردا کەم، بکەم گاهێ دەماغێ چاخ [٤]

---

-١-

(١)مەشهوورە ئەوەی کلەی دەرخوارد بدرێ دەنگی دەکەوێ. جا لەسەر ئەمە مەحوی دەڵێ: بۆیە یار خەنجەری برژانگەکانی خۆی رەشتووە، تا هەرکەسی پێ بریندار کرد دەنگیشی بکەوێو دەنگی دەرنەیەت، چونکە تاقەتی ئەوەی نیە گوێی لە دەنگی گریان و ناڵە و هاواری کوژراوانی دەستی خۆی بێ.

(٢)گوستاخ: نەترس و بێ پەروا.

واتە: یارێ ئەمە کاری بێ دەبێ دوعای ئەوەی بۆ بکرێ خوا لە چاوی بەد بیپارێزێ، ئەگینا تووش دەبێ.

لە نوسخەیەکدا لەجیاتی «هەڵیاوەسیم» «هەم خستمی»یە. لە چەند نوسخەیەکیشدا بەم جۆرەیە: «خستمی هەم کوشتمی».

(٣)کۆهکەن: فەرهادی دڵداری شیرین.

واتە: کە گوڵو لالەی شاخەکان دەبینم، فەرهادم دەکەوێتەوە یاد کە خوێنی خۆی بە کێوی بێستوونەوە رشت و ئێستاش هەرچی گوڵێکی سوور دەروێ لە خوێنی ئەوە.

خوونی (ن): خوێنی.

(٤)خەرابات: مەیخانە. گاهێ: جاروبار. چاخ: قەڵەو.

-١-

**دڵی سووتا بە حاڵی زاری تیفلی دڵم و چاری کرد**
**سەری زوڵفی لە دەم نا، زەهری ماری پڕ بە زاری کرد[١]**

**بەسەر روخساری زەردا جۆگەڵەی کێشاوە ئەشکی سوور**
**بە یادی سەروی باڵایەك ئەوەندەم شین و زاری کرد[٢]**

**هوجوومی «هیندوو»ی خەت سەر «فەرەنگستان»ی روخساری**
**بە حەشرێ بوو، وەکوو ئەو حەشرە «میقادۆ» بە «چار»ی کرد[٣]**

---

-١-

(١) واتە: یار، لای خۆی بەزەیی بە دڵەی کۆرپەی گرینۆکمدا هاتەوە و ژیری کردەوە، هات سەری زوڵفی لەجیاتی گۆی مەمك نایە دەمی و لەجیاتی شیر ژاری خۆشەویستی تێ دادۆشی. لەو کاتەوە تا ئێستا دڵم بەدەم دەردەوە دەتلێتەوە.

(٢) واتە: ئەوەندە بۆ باڵای وەك سەرو بەرزی یار گریاوم، فرمێسکی خوێنین بەسەر روخساری زەردی خەفەتبارپمدا جۆگەڵەی دروست کردووە.

(٣) میقادۆ: میکادۆ، لەقەبی ئەمپەراتوورەکانی ژاپۆنیانە. چار: قەیسەری رووس.

واتە: زوڵفی وەك هیندی رەشی یار بە چەشنێ هێرشی هێنا بۆ سەر رووی وەك فەرەنگستان سپی و سووری، کارێکی پێ کرد وەك ئەو کارەی لەشکری ژاپۆنیا بە لەشکری رووسی کرد.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ یەکێ لە راپەڕینەکانی هیند لە رووی ئیمپریالیزمی بەریتانیادا کە چەند سەد ساڵ ئەو وڵاتەی داگیر کردبوو. نیوەی دووهەمیشی ئیشارەتە بۆ بەزینی لەشکری رووس لە بەرابەر لەشکری ژاپۆنیادا لە شەڕی ساڵی ١٩٠٥داو نیشانەی ئەوەیە ئەو بەزینە دەنگێکی زۆری لەناو گەلانی رۆژهەڵاتدا داوەتەوە، چونکە یەکەمجار بووە رۆژهەڵاتی دواکەوتوو بەسەر رۆژاوای بەهێز و پێشکەوتوودا زاڵ بێ.

شوبهاندنی رووی یار بە فەرەنگستان لەوەوەیە کە رووی یار سپی و سوورە وەك رووی خەڵکی فەرەنگستان.

وتـوویانه کـه «نـان ئـەو نـانەیە ئـەمڕۆ لەسـەر خـوانـە»
چووە، چوو، پێچووە، کەم عەقڵە هەرکەس باسی پاری کرد[٤]

قسەی زوڵفـی ئـەوەندە تـوولی کـێشـا تـاقەتی چـوو خـۆی
وتی: شەو نـیوە بـوو، نـەبڕایـەوە، کـێ بـاسی مـاری کـرد[٥]

لەبـــۆ ئـــیمدادی گـــریانم، دەروونـــی کـــردمە خـــوێنـــاو
لە چاوم سەیری کەن ئەم حوکمە جەرگ‌و دڵمی جاری کرد[٦]

خـــەتی پشـتی لەبـی دی، بـوومە چـار ئـەبرۆ وتـی، وتـمان
کـــە هـــەرکەس بـــەختیارە ئـــیختیاری چـــار یـاری کـرد[٧]

---

(٤) چووە: ئەوەی تێپەڕیوە و بەسەرچووە. پێ چوو: پێ سواو، کینایەیە لە لەکـەڵك کـەوتوو فەوتاو. دەشگونجێ «بێچوو» بێ واتە ساواو منداڵ‌و کینایە بێ لە کەم عەقڵ.
واتە: ئەوەی بەسەر چوو باسی دەبڕێتەوە و کەڵکی هیچی پێوە نامێنێ. خەریکی ئەمڕۆ بە و «نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە».

لەسەر خوانە: لە دەسنووسی شاعیر خۆیدا نووسراوە «لە خوانایە» و «لەسەر خوانـە»ی کردووە بە نوسخە. ئێمە «لەسەر خوانە»کەمان لە «لە خوانایە» پێ جوانتر بوو، بۆیە ئەومان کرد بە ئەسڵ.
(٥) مەشهوورە سەرگوزەشتەی مار ئەوەندە زۆرە گێڕانەوەی دوایی نایێ. جا بۆیـە مـەحوی ئەم بەیتەدا زوڵفی رەشی درێژی یاری شوبهاندووە بە مار.
(٦) ئیمداد: یارمەتی‌دان. جاری: رۆیشتوو، جێ‌بەجێ بوو.
واتە: ئەوەندە گریام فرمێسك لە چاوانمدا نەما. جا بۆ ئەوە کە فرمێسکم نەبڕێتـەوە، یـار دەروونیشمی کرد بە خوێناو و جەرگ‌و دڵمی لە چاومەوە رەواند.

لە رستەی «ئەم حوکمە جەرگ‌و دڵمی جاری کرد»دا ئیشارەتێکی نـاسکیش بـۆ زاراوەی «حوکمی جاری» هەیە.
(٧) واتە: کە یار قەیتانی باریکی جووتە سمێڵی خۆی دی، وتی: بووم بە خاوەنی چوار برۆ. ئێمەش وتمان: کەواتە بەختیارین وا عاشقی چوار یارین کە هەردوو برۆت و هەردوو سمێڵتن.
«چار یار» لە ئەسڵدا بە چوار یاری پێغەمبەر (د.خ) دەڵێن کە حـەزرەتی «ئـەبووبەکـر» و

بــەیانی هــاتە بــاغ ئــەو مــاهە، ئــەم وا تــێ گــەیی ڕۆژە
لە شەبنەم، گوڵ بـە دامـەن گـەوهەری هـێنـا، نـیساری کـرد(٨)

«ڕەحـــە» بـەو شـێتییە «اَلحَـق» قسـەیەکـی عـاقڵانـەی وت:
مــنم عـــاقڵ لە بـــەرگی عـــاریە خـۆمـم کـە عـاری کـرد(٩)

دڵی بـــێ بـــارە، مـــایەی کـارە، هـەرکەس کـاروباری خـۆی
لە دنـــیادا، مـــوەففەق بـــوو بـە دڵ تـەفویزی بـاری کـرد(١٠)

---



«عومەر» و «عوسمان» و «عەلی»ن (ڕەزای خوایان لێ بێ). مەحوی لێرەدا خواستوویەتی بۆ ئەم مەعنا تازەیە. سەرچاوەی ئیستیعارەکەشی ئەوەیە وەك چۆن خۆشـەویستی ئـەو چـوار یارەی پێغەمبەر (د.خ) مایەی بەختەوەرییە بۆ ئادەمیزادی موسوڵمان، خۆشەویستی ئەم چوار بڕۆیەی یاریش بۆ دڵداران هەر وایە.

(٨) واتە: یـاری ڕوو وەك مـانگ، سـەرلەبەیانی هـاتە نـاو بـاخ. بـاخ وا تـێ گـەیی ڕۆژی لێ هەڵاتووە. بە داوێنە گەوهەری شەونمی لەسەر ڕووی گوڵ هەڵگرت و هێنـای لەبـەر پـێیـدا ڕشتی و کردی بە قوربانی. مەبەستی مەحوی ئەوەیە یار چونکە وەك ڕۆژ جوانە، بە هاتنی بۆ ناوباخ شەونم بەسەر پەڕەی گوڵەوە نەما.

شەبنم (ن): شەونم.

(٩) ڕەحە: شێتێکی ناودار بووە لە سلێمانی، زۆر جار خۆی ڕووت کردووەتەوە و بە ڕووتی سووڕاوەتەوە. عاریە: خواستەمەنی. عاری: ڕووت.

واتە: ڕەحە شێت هەرچەند شیت بوو، بەڕاستی قسەیەکی زۆر عاقڵانەی کرد کە وتی: من عاقڵی ڕاستەقینەم کە خۆم لە جلی خواستەمەنی ڕووت دەکەمەوە. مەبەستی لەوەیە ماڵی دنیا وەك خواستەمەنی وایە و بنیادەم دڵی پێ خۆش نەبێ چاکترە.

لە نێوان «عاریە» و «عاری»دا جیناسی ناقیس هەیە.

(١٠) بێ بار: بێ دەرد و مەینەت. پێچەوانەی ئەوە کە دەڵێن فڵان کەس لەش بەبارە. تەفویز: سپاردن. باری: خودا.

واتە: ئەوەی خوا بۆی بکا لە دنیادا کـاروباری خـۆی بـەو بسـپێرێ، دڵ ئـاسوودە و کـار هەڵسووڕاو دەبێ.

جــونوونی نـەو زوهـووره «مـەحویا» دێوانـەگـی مـەنسوور
کە دێوانەن هەموو مائیل بە بـەرد، ئـەو مـەیلی داری کـرد(١١)

-٢-

چ خـــەیاڵێکــە لیـقا بـێ بـە فـەناچوونی جـەسەد
«تــا پــریشان نشــود کــار بســامان نــرسد»(١)

---

(١١) نەو زوهوور: تازە پەیدابوو. دێوانەگی: شێتی. دێوانە: شێت.

مەشهوورە دەڵێن «الجنون فنون» واتە: شێتی گەلێ جۆری هەیە. مـەحویش دەڵێ: لەنـاو جۆرەکانی شێتیدا شێتییەکەی مەنسووری حەللاج شێتییەکی تازە بابەتە، چـونکە هـەرچـی شێت هەیە هەموو حەزیان لە بەرد خڕ کردنەوەیە و گیرفانیان پڕ دەکەن لە بەرد و دەیگـرنە خەڵك، کەچی مەنسوور حەزی لە دار بوو ئەوەندە «اَنَا الحَق»ی وت تا بردیانە پێی سێدارە و کردیان بە دارا.

-٢-

ئەم پارچە شیعرەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) لیقا: لیقاء، گەیشتن بە خوا.

لای ئەهلی تەسەووف وایە ئینسان تا بە ریازەت کێشان گیانی خۆی پەروەردە نەکاو نەفسی خۆی نەهێنێتە ژێر بار، نابێ بە ئینسانی راستەقینە و بوونی تەواو نابێ. مەحویش بەپێی پێڕەوی ئەهلی تەسەووف دەڕواو دەڵێ: بێ فەوتاندنی لەش و مرانـدنی گـیانی لەشپـەرستی کـەس ناتوانێ گەیشتن بە خواو یەك بوون لەگەڵی بۆ خۆی دابین بکا. وەك شیعرە فارسییەکە دەڵێت: تا شت تەواو لەناو نەچێ و هێزی مانەوەی لێ نەبڕێ ناگاتە ئەنجامەکەی کە پەیدا بوونی وێنەی نوێیەتی.

لیقا (ن): بەقا.

لە دەسنووسە پاکنووس نەکراوەکەی شاعیر خوێشیدا «بەقا» ئەسڵە و «لیقا» نـوسخەیە، بەڵام ئێمە پێچەوانەکەمان لا قوڵتر و گونجاوتر بوو لەگەڵ بەیتەکانی پاشەوە. بەپێی ئەم دوو نوسخەیەش مەعنای بەیتەکە گۆڕانێکـی ئـەوتۆی بـەسەردا نـایەت و وای لێ دێتـەوە: بـێ فەوتاندنی لەش کەس ناتوانێ مانەوەی گیانی خۆی مسۆگەر بکاو ببێ بە ئینسانی راستەقینە...

هەر دڵێ پێوە نەبێ داغ و خەتی جێ دەمی تێغ
دەعویی عیشقی بیێ دەعوییە بێ مۆر و سەنەد(٢)

ئەغلەبەی تەکیەو دەرگاهی بیلادی ڕۆمم
پشکنی، دی: چەلەبی هەر چەڵەبی بوو، دەدە دەد(٣)

خەو ئەزانێ نیە، دەیوت: دە بنوو بێمە خەوت
نێك بەختم بە وەنەوزێ بکە، ئەی بەختە مەدەد!(٤)

---

(٢) دەعوی: دەعوا، ئیددیعا.

واتە: تا جێگەی داخ و برینی تێغی یار بە دڵی دڵدارەوە نەبێ، قسەی بە هیچ دانانرێو بە دڵدار ناژمێررێ، چونکە سەنەد و قەباڵەی مۆر کراوو لێنووسراوی پێ نابێ کە ئەوە بگەیەنێ کەوا دڵدارێکی ڕاستەقینەیە. بەڵگەی دڵداری بریتیە لەو خەتانەی بە تێغی دەستی یار لە دڵی دڵدار دەنووسرێن و لەو مۆری داخانەی کە دەیانێن بە دڵیەوە.

نەبێ (ن): نیە.

(٣) چەلەبی: باش بازرگان و پیاو ماقووڵ. جەڵەبی: شتی هەڕەمە کە چاکی لە خراپی جیا نەکرابێتەوە. دەدە: باپیر و براو خاڵ. وشەیەکی تورکییە. دەد: دڕندە.

واتە: زۆربەی تەکیە و عیبادەتگاکانی وڵاتی ڕۆمم پشکنیوە. بۆم دەرکەوتووە ئەوانەی لەوێ خواپەرستی دەکەن کەسیان بەڕاستی ڕێگای خواپەرستییان نەگرتووەتەبەر. ئەوانەیان لەم مەیدانەدا بە چەلەبی و باش بازرگان ناویان دەرکردووە، بنیادەمی ڕەمەکی و هەڕەمەن و ئەوانەشیان بە خزم و کەس دادەنرێن، جانەوەر و دڕندەن.

هەرچەند نابێ مەعنای ئەم بەیتەی مەحوی بە شێوەیەکی حەرفی لێ بدرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشداو بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ڕاستییە کەوا وڵاتی عوسمانی پڕ بووە لە تەکیە و خانەقاو دەوڵەت خۆی وا پیشان داوە کەوا پارێزگار و خزمەتگوزاری ئایینە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا مەحوی تا چ ڕادەیەك لەو ساختەچییەتی و بازرگانی بە دینەوە کردنەی عوسمانییەکان گەیشتووە.

(٤) نێك بەخت: ئەوەی بەختی چاك بێ. مەدەد: وشەیەکە دەروێش و سۆفییەکان بەکاری دێنن، واتە: یارمەتی، بە مەعنای داوای یارمەتی بەکار دەهێنرێ.

**داغـی کـۆنـه و شـەبەقی تـازە لە سـینەی چـاکـا**
**تێکەڵن، سەیری هەیە پـڕ لە گـوڵ و لالە سـەبەد** (٥)

**غەیری وەحدەت لە وجوودا نیە، کەسرەت وەهمە**
**سادە تەکراری یەکە، مەنشەئی ئەوهامی عـەدەد** (٦)

**چاری هـەر دەرد و غـەمێ کـردنە مـردن، چ بکـا**
**نەیتوانیوە بکـا چـاری غـەم و دەردی حـەسەد** (٧)

---



واتە: یار دەزانێ خەوم لێ ناکەوێ، کەچی دەڵێ بنوو تا بێمە خەوت. دەسا ئەی بەخت، فریام کەوە، بەختەوەرم کە، وەنەوزێ بخەرە چاوم با یار لەسەر گفتەکەی خۆی ناچار ببێ بێتە خەوم.

(٥) شەبەق: کون. چاك: لەت کراو. لالە: گیایەکی بەهارییە گوڵی سوور دەردەکا. سـەبەد: سەبەتە.

مەحوی لەم بەیتەدا داغی کۆنەی دڵی شوبهاندووە بە گوڵ لە زەردیداو شـەبەقی نـوێی سینەی شوبهاندووە بە لالە لە سووریداو سینەی کون کراوی شوبهاندووە بە سەبەتەی گوڵ. پەیوەندی وشەی شەبەقی بە شەبەقی بە مەعنا بەیانیشەوە رچاو کردووە کە کەناری ئاسمان سوور دادەگەڕێ.

(٦) هەندێ لە ئەهلی تەسەووف ئەوەندە لە خواناسین و پشت نـەبەستندا بـە غـەیری ئـەو رۆچوون، هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕە کە غەیری خوا هیچی‌تر نیە. ئەمانە پێیان دەڵێن ئەهلی «وَحدة الوجود». جا مەحویش بەپێی بیروباوەڕی ئەمانە دەڵێ: لە یەکێتی بـەولاوە هـیچ لەم جیهانەدا نیە و زۆری خەیاڵە. ئەی ئادەمیزادی نەفام، ژمارە کە سەرچاوەی خەیاڵ و بە هەڵەدا چوونی تەسەوور کردنی بوونی زۆرییە، لە دووبارە کردنەوەیەکی سادەی «یەك» بەولاوە نیە.

(٧) واتە: مردن دەرمانی هەر دەردێکە کە چاری نەکرێ، بـەڵام چ بکـا نـەیتوانـی و چـاری دەردی خەم و دڵپیسی و بەخیلی پێ بردن بکا!.

ئەمەی مەحوی دەیڵێ پێچەوانەی ئەوەیە کە سەعدی شیرازی دەیڵێ کە دەڵێ:

بمیر تا برهی ای حسود، کین رنجی‌است　　　که از مشقت آن جز به مرگ نتوان رست

واتە: ئەی حەسوود! بمرە، چونکە حەسوودی دەردێکە بە مەرگ نەبێ ناتوانی لە ئەرکی رزگار ببی.

هەرکەسێ چاوی کە بەو جیلوە مونەووەر بووبێ و...
کەسی کەی بێتە نەزەر، دیدەیی پڕ بێ لە رەمەد [(٨)]

«مەحویا» با بەسی بێ شیرکی تەشەبیوس بەم و بەو
بگرە بەس دامەنی تەوحیدی «هُوَ اللّٰهُ أَحَد» [(٩)]

---

(٨) مونەووەر: نوورانی. نەزەر: بەرچاو. رەمەد: چاوئێشە.

واتە: یاخوا هەرکەس چاوی بە دیتنی ناوچاوی یار رووناك بوویێتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ کەسێکی تر بڕوانێ، چاوی پڕ ببێ لە چاوئێشە.

ئەم بەیتەش هەر بۆ پێڕەوی «وحدة الوجود» دەگەڕێتەوە.

(٩) شیرك: هاوبەش بۆ خوا دانان. تەشەبیوس: دەسەودامێن بوون. تەوحید: خوا بە یەك زانین.

واتە: دەسەودامێن بوونی ئەم و ئەو کە کارێکت بۆ راپەڕێنن، جۆرێکە لە هاوبەش بۆ خوا دانان. دەسا با بەسی بێ هاوبەش بۆ خوا دانان بە پاڕانەوە لەم پێغەمبەر و لەو وەلی... داوێنی خوا بە یەك دانان بگرە کە ئایەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ﴾ دەیگەیەنێ و پشت بە تەنها خوا ببەستە و بزانە لەو بەولاوە کەس هیچی پێ ناکرێ.

مەعنای ئەم بەیتەش لە سەرێکەوە پەیوەندی بە پێڕەوی «وحدة الوجود»ەوە هەیە چونکە وا دەگەیەنێ ئەوانەش کە تەشەبیوسیان پێ دەکەی هەر بە پەیوەندییان بە خواوە شتێکیان لە دەست دێ، کەواتە هەمووی دەبێتەوە بە یەك. لە سەرێکی کەشەوە بەپێی مەزهەبی «وەهابی»یەکانە، کە لایان وایە پاڕانەوە لە غەیری خواو چوونە سەر قەبری ئەم و ئەو جۆرە هاوبەش دانانێکە بۆ خواو بە حەرامی دەزانن.

-١-

لە ئولكەی عیشقەدا بێ چوونە سەر دار
بە ئاسانی مەزانە بوونە سەردار[١]

هەیە گەر عیشقی سەرداری لە سەرتا
بكە مەشقێ لەوانەی چوونە سەر دار[٢]

عەسایەك دەستگیری ئێمە نابێ
پڕی ئەم دارە بێ گەر سەر بە سەر دار[٣]

لەبەر داری حەدا من بم، ئەتۆ مەست
دە قازی حەق بڵێ تۆ، «حەق» چ بەردار[٤]

خۆشی فەرموو چ مەجنوون و چ مەنسوور
بەشی عاشق درا هەر بەرد و هەر دار[٥]

---

-١-

(١) ئولكە: وڵات. دار: داری سێدارە.
(٢) واتە: ئەگەر ئارەزووی سەرداریت لە كەللەدایە، لە بەردەستی ئەوانەدا فێر ببە كە چوونە سەر دار و چاو لەوان بكە.
(٣) دار «ی یەكەم»: خانوو.
واتە: ئەگەر ئەم ماڵی دنیایە پڕ بێ لە دار، ئێمە عاسایەكمان لێ دەسگیر نابێ. مەبەستی لەوەیە دنیا داری جۆرە رەوشتێكی دەوێ لە هەموو كەسێ ناوەشێتەوە.
(٤) حەد: ئەو تۆڵەیەی شەرع دایناوە بەرابەر بە مەی خواردنەوە و هەندێ كرداریتری ناشەرعی. ئەم تۆڵەیە لە مەی خواردنەوەدا بریتیە لە چل دار بدرێ لەو كەسەی دەخواتەوە.
واتە: قازی بۆ خوا راست بڵێ، كەی خوابەردارە یار مەست بێ و داری حەد لە من بدرێ!.
لەبەر داری حەدا (ن): لەبەر دارا خودا. بەپێی ئەم نوسخەیە ئەگەر رووی دەم لە خوا بێ، ئەوا بەیتەكە لە شێوەی شیعرە یاخییەكانی عومەری خەییامی لێ دەردەچێ.
(٥) واتە: مەجنوونی لەیلاو مەنسووری حەللاج جوانیان وت كە وتیان: بەشی دڵداران لەم دنیادا ئەوەیە یا وەك مەجنوون بدرێنە بەر بەرد، یا وەك مەنسوور بدرێن لە سێدارە.

ئەوی چوو بـۆ سـوراغـی، بـێ سـوراغـە
خەبەر وایە کـە کـەس نـابێ خـەبەردار [٦]

وتی: مێوەی بەهەشتە شـیعری «مـەحوی»
خـــودا نـــەبڕی لە بـاغم داری بـەردار [٧]

-٢-

ئەی ئەو کەسە کە مەستی غورووری بە هاتی کـارا!
بە و دەستی زۆرە بدڕە پەڕۆیەك لە کاری «چار» [١]

---

(٦) سوراغ: کون، هەواڵ: زانین.

واتە: ئەوەی، لە عیشقی راستەقینەدا، بەدوای خۆشەویستدا بگەڕێ، ئەوە وەك زانـراوە، هیچ ئەنجامێکی دەسگیر نابێ و کەس نازانێ چی بەسەر دێ و لەجیاتی ئەوەی ئەو بدۆزێتەوە خۆی سەری تێدا دەچێ.

(٧) واتە: یەکێك وتی: شیعری مەحوی ئەوەندە جوان و خۆشە وەك مێوەی بەهەشت وایە. سا خوایە داری بەبەری توانای شیعر وتن لە باغی ژینی من نەبڕی، بۆ ئەوەی هەمیشە شیعری جوانی وەك مێوەی بەهەشت خۆش بڵێم.

مێوەی (ن): خوا وەك. نەبڕی: دەگونجێ بە «نەبڕێ»یش بخوێنرێتەوە.

لە وشەکانی «سەردار»دا لەم پارچە شیعرەدا کۆمەڵێ جیناس و وشە ئارایی هەیە.

-٢-

(١) واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت لێ بایی بووە چونکە بەدەسەڵاتـی و کـاروبارت بـاش بـۆ بەڕێوە دەڕوا، پشت ئەستوور مەبە بە دنیاو بەو دەستی دەسەڵاتـەی کـە هـەتە پـەڕۆیـەك لە قەیسەری رووس دادڕە کە بەو هەموو هێز و توانـایەوە کـە هـەیبوو و لە هـەموو شـەڕێکـدا دەوڵەتی عوسمانی دەبەزاند، ژاپۆنیا ئەو کارەی پێ کرد کە پێی کرد.

مەحوی لەم بەیتە و چەند بەیتێکی تری ئەم پارچە شیعرەدا ئیشارەت بۆ شەڕی ١٩٠٥ی رووسیاو ژاپۆنیا دەکا، وەك پێشتر لەسەرمان نووسی.

هەرچەندە خەرتەلی، لە پڕێ چەرخی پەنجەباز
دەتکا بە بازی پەنجەیی «میقادۆ»ی شکار(٢)

یا ماری سەرخەزێنە! بترسە کە گەژدومێ
بە و نووکە چزوە پڕ بە دەمت کا لە ژەهری مار(٣)

زەڕڕە تریشقەیێکە کە کێوێ دەدا بە باد
ئەشباه ئەوەندە زۆرە بە کەس نایەتە شومار(٤)

---

(٢) خەرتەل: داڵە کەرخۆرە. بەهەشتی مەلا ئەسعەدی مەحوی نووسیویە: ناوی باڵدارێکە «دوو برا»یشی پێ دەڵێن و وەك «مشك گره» وایە. پەنجەباز: یاری بە پەنجە کەر. ئەوەی پەنجەی وەك پەنجەی باز بەهێزە کە لە راودا پەلەوەری لەدەست دەرناچێ. شکار: راو.

واتە: هەرچەند ئەوەندەی داڵە کەرخۆرەش، بەش بەحاڵی پەلەوەران، بەهێز بی، بەخۆت نازانی لە پڕێکدا گەردوونی بەهێز کە لە هەموان بەهێزترە دەتکا بە بازی ناودەستی راوکەری خۆی کە بە فەرمانی ئەو بجووڵێتەوە و لە قسەی دەرنەچی، وەك میکادۆی ئەمپەراتۆری ژاپۆنیا وای لە قەیسەری رووس کرد و سەری پێ شۆڕ کرد بۆ خۆی.

دەشگونجێ «باز»ی دووهەم لەگەڵ «ی»کەیدا یەك وشە بن و «بازی» بن بەمەعنا یاری و گاڵتە و مەعنای بەیتەکە وای لێ بێتەوە کە: دەتکا بە شوێنی یاری و گاڵتە پێ کردنی میقادۆی راوچی.

(٣) یا: حەرفی بانگەوازە بە عەرەبی بە مەعنا «ئەی...». گەژدوم: دووپشك.

واتە: ئەی پیاوی دەسەڵاتداری رژد کە وەك ماری سەرگەنجینە پەپکەت بەسەر سامانەکەتدا داوە و خەرجی ناکەی بۆ سوودی گشتی، بترسە لەوە کە دووپشکی مەرگ بە نووکی چزووی خۆی پێتەوە بداو پڕی دەمت بکا لە ژاری مەرگ و بتکوژێ.

دەشگونجێ «یا» بە مەعنا «یان» بێ واتە: حەرفی عەتف بێ و مەعنای بەیتەکە وای لێ بێتەوە: هەرچەند وەك ماری سەرگەنجینەش بی، هەر لەوە بترسە کە... تاد.

(٤) تریشقە: هەورە برووسکە. ئەشباه: لەم جۆرە شتانە. شومار: ژمارە.

واتە: تۆسقاڵێ برووسکە لە ئاسمانەوە بەردەبێتەوە دەدا لە کێوێك و دەیکا بە تۆز و دەیدا بەدەم باوە. لەم چەشنە شتانەش لە دنیادا زۆری تر هەیە و ئینسان دەبێ پەند و ئامۆژگارییان لێ وەربگرێ و بزانێ هەرچەند بەدەسەڵات بێ، لەوانەیە رۆژێ لە رۆژان بەدەسەڵاتترێکی لێ تاین بێ و بیدا بە زەویدا.

پەس «ئـەوروپالی»! بـەس بگـەزن لێو، ئـەمە چـیە
ژاپـۆنـییەك مـوحاسەرە دا چـار دەوری چـار[٥]

چـاری قــەدەر بــزانــە نـیە، چـەندە چـاری وا
بێ چارە ما کە بوو بە دوو پەنجەی قەزا دوچـار[٦]

---

(٥) پەس: کەواتە، وشەیەکی فارسییە. ئەوروپالی: ئەوروپایی، نیسبەتێکی تورکییە. چـار «ی یەکەم»: چوار. چار «ی دووهەم»: قەیسەر.

واتە: کەواتە، هەی تاقمی ئەوروپایی و دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانی ئـەوروپا کـە هـەرگیز بەزینتان بە خۆتانەوە نەدیبوو و واتان دەزانی لە هەرلایەك بن دەبێ هەر ئاغا بن، با هەڕەشە و گوڕەشە بەسی بێ، بیرێ لەوە بکەنەوە چۆن ژاپۆنییەك کە تا دوێنێ کەس بە هیچی نەدەزانی، لە هەر چوار لاوە گەمارۆی چاری رووسیای داو بەزاندی.

وەك پێشانیش باسمان کرد، دیارە ئەم سەرکەوتنەی ژاپۆنیا بەسەر رووسیادا لە شەڕی ۱۹۰۵دا دەنگێکی گەورەی لە رۆژهەڵات و بەتایبەتی لە وڵاتە موسوڵمانەکاندا داوەتەوە کە بـەدەست وڵاتە داگیرکەرەکانی ئەوروپاوە لە زەلالەت و نارەحەتیدا بوون و هەموو بە موژدەی سەرەتای رزگاریيان زانیوە. بەڵام بەداخەوە هەروەك لەم پارچە شیعرەوە دەردەکەوێ، کەم کەس توانیویە پەندی راستی لێ وەربگرێ و بزانێ کەوا ژاپۆنیا بۆ سەرکەوت و رووسیا بـۆ بـەزی. ئـەوەتە مەحوی خۆیشمان مەسەلەکە بەشێوەیەکی چەوت لێك دەداتەوە و تەنانەت دەگاتە ئەوەش کە ئەسبابی ماددی بە هیچ دابنێ و هەموو شتێ بگێڕێتەوە سەر موسەببیب، کە هـەر ئـەو بـیرە چەوتە خۆی ساڵەهای ساڵ یەکێ بوو لە کۆسپە گەورەکانی رێگای وریا بوونەوە و رزگاری گەلانی وڵاتانی رۆژهەڵات...

(٦) چار «ی یەکەم»: چارە. چار «ی دووهەم»: قەیسەر. دوچار: گرفتار و تووش بوو.

واتە: قەدەر لە چارەی قەیسەری نووسیبوو ئەوەی بێتە رێ... لەبەر ئەوەش کە چاری قەدەر ناکرێ، ئەوەبوو قەیسەر کەوتە بەر پلاری قەدەر و زەلیل و پەك کەوتە بوو و هیچی پێ نەکرا!.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرەیە:

بێ چارە ماوە، بوو کە بە پەنجەی قەزا دوچار

ئەم بەیتە پڕە لە جیناس و وشە ئارایی ناسك.

لەم کـــاروباری چـــارە یـــەکـــێ چـــارە گـــرژ ئـــەکـا
وا تێ گـەیشتووە کـە هـەر ئـەسبابە دێ بـەکـار[٧]

پـــڕ «ســـیبریا»، بـــەبێ مـــەدەدی زاتـــی کـــیبریا
ئـــەسبابت ئـــەر هـــەیە، نـیە شـایانی ئـیعتیبار[٨]

هـــەرچـــی هـــەیە مـــوسەببیبە، بـــاقێکـــە فـانییە
بەندەی یەکێ بە، بەس ببەرە عەبدی سەد هەزار[٩]

«مەحوی» چ کەس مەناسە، بـناسە خـوداوو بـەس
زیکری یەکێ کە مارە، مەکە باسی چار و مـار[١٠]

---

(٧) چارە «ی دووهەم»: روو.

واتە: ئەوەی رووی خۆی لەم کارە گرژ دەکات کە بەسەر قەیـــەردا هات، وادەزانێ هەر هۆ لەم دنیایەدا کار دەکاو ئاگای لەوە نیە کە هەموو شتێ بەدەستی خوایە.

(٨) سیبریا: سیبێریا، ناوچەیەکی بەدەرەتانی رووسیایە لە بەری رۆژهەڵات و باکـووریەوەیە. کیبریا: گەورەیی. مەبەست زاتی خوایە.

واتە: ئەگەر خوا یارمەتیت نەدا، پڕ بە وڵاتی پان و بەرینی سیبێریا چەك و جبەخانەت هەبێ هیچ ناهێنێ!.

لە دەسنووسێکی پاکنووس نەکراوی شاعیر خۆیدا، ئەم بەیتە بەم جۆرەش نووسراوە:

سەد سیبریا بەبێ مـەدەدی زاتـی کـیبریا　　　یەك زەڕڕە فائیدەی نەبووە و نایەتن بەکار

(٩) موسەببیب: ئەوەی سەبەب دروست دەکا کە خوایە. فانی: فەوتاو و بێ مایە.

واتە: هەر موسەببیب شتە کە خوایە و لەو بەولاوە کەس هیچ نیە و تۆیش تەنها بـەندەی یەکێ بە کە خوایە و مەبە بە بەندەی سەد هەزار کە سەبەبەکانن کە لە بڕانەوە نایەن.

(١٠) واتە: مەحوی لە خوا بەولاوە کەسی تر مەناسە، تەنها ناوی یەکێ بەرە کە خوایەو، باسی چار و مار مەکە، مەترسی تیایە و مارە پێتەوە دەدا.

مەکە (ن): چیە.

لەم چـــارە پـیسە، مـیللەتی پـاکـی مـوحەممەدی
دەر قەلعە بێ خودا! بە حەققی جاهی هەر دو چار [١١]

-٣-

ئەگەر تـۆ روو بـە خـاڵێکـی لە «لەیـلا» شـۆخ و زێبـاتر
منیش ئاشفتە حاڵێکی لە «قەیس»م شـێت و شـەیداتـر [١]

بە دڵمـە جـوێنـی ئـەو لێوە، لە بـۆسـە نـەشئە بـەخشاتر
لەکـــن تـریاکـییە ئـەڵبـەتتە قـاوە سـەد لە چـا چـاتر [٢]

---

(١١) دەر قەلعە: لەناو قەڵادا، کینایەیە لە پارێزراو.

واتە: خوایە بۆ خاتری هەردوو چوارەکە کە چوار خەلیفەی راشیدین و چوار پێشەوایانی ئایینن، میللەتی پاکی پێغەمبەر (د.خ) لە قەڵای پارێزگاری خۆتدا بپارێزی لەم قەیسەرە پیسەی رووس، یا لەم بەختی رەشە کە ئێستا هاتووەتە رێی. مەبەست لە چوار پێشەوای ئایین ئیمام «ئەبوو حەنیفە» و «شافیعی» و «مالیك» و «ئەحمەدی کوڕی حەنبەل»ە.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرەیە:

یارەب مەسوونی کە بە حەقی چار و چار و چار

لەسەر ئەم نوسخەیە مەبەست لە چار و چار و چار، چوار خـەلیفەی راشـیدین و چـوار کەسی ژێر عابای پێغەمبەر حەزرەتی «عەلی» و «فاتیمە» و «حەسەن» و «حوسەین» و چوار پێشەوای ئایین، یا دوانزە پێشەواکەی نەوەی پێغەمبەرە.

-٣-

(١) روو بە خاڵ: خاڵ بەڕووەوە بوو. ئاشفتە حاڵ: حاڵ شێواو. قەیس: مەجنوونی لەیلا.

واتە: بەرابەر بە رادەی جوانی تۆ، منیش عاشق و دڵدارم.

لە نێوان «خاڵێکی» و «حاڵێکی»دا جیناسی لاحیق هەیە.

(٢) بۆسە: ماچ. نەشئە بەخشا: نەشە گەیێن. تریاکی: تریاك خۆر.

واتە: من چونکە عاشقی بیستنی قسـەیەکم لە لێوی یارەوە، تەنانەت جنێویشیم لا لە ماچ خۆشترە، وەك چۆن تریاکی قاوەی تاڵی لە چای شیرین لا خۆشترە.

لە نێوان «چا» و «چاتر»دا جۆرە جیناسێکی ناقیس هەیە.

لە کۆیا موددەعی دیمی، بە ئیستیهزا وتی: شاهم!
گەدای ئەم کۆیە بم، شاهەنشەهێکم سەد لە شا زیاتر[٣]

لەبەر دەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەرکەس سەری دانا
ئەگەر پەتیارەیەك بوو، بوو لە سەد عەللامە داناتر[٤]

بنازم بەم شەهی مەهـ سەیرە بۆ گەشت و گوزاری شەو
سوارێکە: بوراقی تەوسەنە، جیبریلیە شاتر[٥]

لە دنیا تێپەڕی هەرکەس بە باڵی هیممەت، ئازایە
لە عوقباش ئەو کەسە گەر تێپەڕی، بازێکە ئازاتر[٦]

---

(٣) کۆ: کۆڵان، بەردەرگا. موددەعی: بەربەرەکانێ کەری دڵدار. ئیستیهزا: گاڵتە پێ کردن.

واتە: موددەعی دیمی لەناو کۆڵانی ماڵی یاردا کەوتووم، بە شای زانیم، چونکە لەو شوێنەدا کەوتووم و وتی: من بۆم رێکەوێ ببم بە گەداو سواڵکەر لەم کۆڵانەدا کە ماڵی یاری تێدایە، خۆم بە شاهەنشایەك دەزانم لە سەد شا شاتر بم.

کۆیە (ن): کۆهە.

(٤) واتە: هەرکەس لەبەر دەرگای عیشقدا سەری دانا، هەر بەو سەردانانە لە «زۆر زان»ێك زاناتری لێ دەردەچێ، باوەکوو خۆی لە خۆیدا پەتیارە و خوێڕیش بێ.

(٥) مەهـ سەیر: ئەوەی وەك مانگ بە شەو دەڕوا. بوراق: ئەو ئەسپەی کە پێغەمبەر (د.خ) لە شەوی میعراجدا سواری بوو. تەوسەن: ئەسپی شۆخ و سەرکێش. شاتر: ئەوەی نامە لە نێوان دوو کەسدا دێنێ و دەبا.

واتە: شانازی بەو پێغەمبەرەوە (د.خ) بکەم کە وەك مانگ بە شەو دەڕواو بوراق ئەسپی ژێریەتی و جوبرەئیل شاتر و پەیام بەریەتی.

(٦) عوقبا: پاشەڕۆژ، رۆژی قیامەت.

واتە: هەرکەس ئازا بوو بە باڵی هیممەت لە ئارەزووی خراپی دنیا خۆی رزگار کرد، ئەوە بەڕاستی ئازایە. ئەگەر لەو دنیاش هەر چاوی لە یارەوە بوو و ئومێدی بەهەشت و ترسی دۆزەخی نەبوو، بازێکی ئازاتر و چالاکترە.

ئەم بەیتە تا رادەیەك لە مەعنای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ) دەچێ کە دەڵێ: «نِعْمَ

**ئەگەر ئەم ئەهلی دنیایە، وەکوو هەن، ڕێ خەنە جەننەت**
**دەنـــائەت زوو دەکـــا ئـــەو دونـیە لەم دنـیایە دنـیاتر** (٧)

**کەسی من گەر کەسن کەس من نەخاتە فکری ئـەو شـاهە**
**بە یادی نـاکـەسان ئـازوردە حـەیفە خـاتیری عـاتیر** (٨)

**خودا بیدا بە ڕەحمەت، داغی دڵ چـاوی دڵە «مـەحوی»**
**بە گریە چاو ئەگەر چوو، شك دەبەم چاوێکـی بـیناتر** (٩)



العَبْدُ صُهَيْبٌ، لَوْ لَمْ يَخَفِ اللّٰهَ لَمْ يَعْصِهِ» واتە: سوهەیب (سوهەیبی ڕۆمی) بەندەی چاکە، ئەگەر لە خوایش نەترسایە هەر بێ گوێیی نەدەکرد. یا لەو فەرموددەیەی رابیعەی عەدەوی دەچێ کە وتوویە: «لەبەر تـەمای بـەهەشت و تـرسی دۆزەخ نـیە کـە گـوێڕایـەڵی خـوام و لە قسـەی دەرناچم».

(٧) ڕێ خەنە: ڕێیان بکەوێتە. دەنائەت: سووکی و پەستی. دونیە: دنیا، دنیا. دنیا: سووك.
واتە: ئەهلی ئەم دنیایە ئەوەندە سووك و پەستن، ئەگەر بێت و لەو دنیا ڕەوشتیان نەگۆڕێ و هەروەك هەن وەها بچنە بەهەشت، ئەو دنیایش ئەوەندە سووك و بێ حورمەت دەکەن گەلێ گەلێ لەم دنیایەی ئێستا هیچ و پووچ تر بێ.
(٨) ئازوردە: تێك چوو. خاتیر، [«خاطِر»]: دڵ. عاتیر، [«عاطر»]: بۆن خۆش.
واتە: ئەگەر کەسانی من کەسی ڕاستەقینەن، با کەسیان من نەخاتەوە بیری یار، تا خەیاڵی بێ گەردی بە بیرکردنەوە لە من تێك نەچێ.
ئازوردە (ن): ئالوودە.
(٩) واتە: ئەگەر خوا بە ڕەحمەتی خۆی بیدا، ئەو داخەی یار دەینێ بـە دڵـی دڵدارەوە بـۆی دەبێ بە چاوی دڵ و ئەگەر هات و چاوی سەری لەبەر زۆری گریان کوێر بوو، چاوێکی بیناتری دەبێ کە چاوی دڵیەتی.
ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لە هەندێ نوسخەدا لەجێی یەکتردان.

-٤-

موحەققەق هەرکەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققیە مەنزوور
سولووکی چوونە سەر دارە، تەریقەی پیریە مەنسوور[١]

لە ئولکەی عیشقەدا بۆ هەرکەسێ سەرداریە مەنزوور
«عُلُوّ»ی مەرتەبەی سەر دارە، بۆتە پەیڕەوی مەنسوور[٢]

دەڵێ دانام و دڵخۆشی دەخاتە داوی زوڵف و خەت
ئەگەر عەقڵی هەیە بۆچی حەزەر ناکا لە مارو موورا![٣]

کەمالات و مەعاریف مەبیە، بێدەخڵی هەوێنی عیشق
عەجەب پشکووتووە لەم جەزوە نارە پڕ بە عالەم نوور[٤]

---

-٤-

(١) مەسلەك: ڕەوشت، ڕێگای گیراوەبەر. مەنزوور: مەبەست.

واتە: بێ گومان ئەوەی بەدوای حەقدا بگەڕێو حەقی مەبەست بێ، دەبێ بۆی بچێتە سەر دار و لە پێناویدا خۆی بدا بە کوشت. ئەمە ئەو ڕێگایە کە مەنسووری حەللاج کە سەردەستەی حەقخواهان بووە، گرتوویەتیەبەر و پیادا ڕۆیشتووە.

(٢) «عُلُوّ»: بەرزی. مەرتەبە: پایە.

مەعنای ئەم بەیتەش وەك بەیتی پێشوو وایە.

وادیارە مەحوی خۆی دوو دڵ بووبێ لەوە کە ئاخۆ ئەم بەیتە یاخود بەیتی پێشوو بکا بە سەربەندی ئەم پارچە و ئەویان بکا بە نوسخە، چونکە هەردوکیان لە مەعناو داڕشتندا لەیەك دەچن، بەڵام هەردوکیانی هەروا هێشتبێتەوە، چونکە هەردوو بەیتەکە لە هەموو نوسخەکانی بەردەستماندا لە چوارچێوەی پارچە شیعرەکەدان.

«عُلُوّ»ی مەرتەبەی (ن): مەقامی ئاخری.

(٣) واتە: دڵ خۆی بە دانا دادەنێو خۆیشی دەخاتە داوی خاڵو زوڵفی یار. ئەگەر ڕاستە عەقڵی هەیە بۆچی خۆی دەخاتە داوی ماری زوڵف و مێروولەی خاڵی ڕەش!.

(٤) جەزوە: پشکۆ. نار: ئاگر.

واتە: زانست ناگیرسێو نابێ بە زانستی ڕاستەقینە تا هەوێنی عیشقی تێ نەکرێ. بەڕاستی سەیرە لەم پشکۆ ئاگرەی عیشق دنیا هەمووی ڕۆشن بووەتەوە.

به خوێنم تینووه، با نۆشی کات و نۆشی بێ، ئەمما
لەسەر چی، تۆ بڵێ ئەو لێوە مۆره وا له من بوو سوور[٥]

ویسالت ناره، هیجرت رۆژەرەش، وەك ئافتابی تۆ
له تۆ نەزدیکه پشکۆیه، خەڵووزه گەر له تۆ بێ دوور[٦]

تەعەججوب گرتمی، سۆفی که تەسبیحم له ملیا دی:
که بێ تەقریبه پیرێژن لەبەریا بێ بەر و بەرموور[٧]

بە زەرد و سووری دنیا زەردەواڵەت لێ نەگۆڕابێ
به هەنگی تێبگەی، هەر نێشه، نۆشێکی نیه زەنبوور[٨]

---

(٥) واته: یار مادەم تینووه به خوێنم، با بیخواتەوه، نۆشی گیانی بێ. بەڵام نازانم هۆی چیه وا لێوی مۆری، یا لێوی وەك مۆرکراو بێدەنگی، به خوێنی من سوور بووه، یا ئەو یاره لێو مۆره لەسەر مژینی خوێنی من سووره؟.

خوێنم (ن): خوونم.

(٦) نەزدیك: نزیك.

واته: گەیشتن به تۆ وەك ئاگر وایه دڵ رۆشن دەکاتەوه، دووریش لێت وەك رۆژی رەش وایه. تۆ رۆژی، ئەوەی لێت نزیك بێ وەك پشکۆ تیشك دەداتەوه و ئەوەی لێت دوور بێ وەك خەڵووز رەش دەبێ.

رستەی «ویسالت ناره» ئیشارەته بو فەرموودەی خوا له قورئاندا که به زوبانی مووساوه دەیگێڕێتەوه که وتوویه: ﴿إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِ إِنِّي آنَسْتُ نَاراً سَآتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ آتِيكُمْ بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ واته: هەستم به ئاگرێ کردووه دەچمه سەری یا هەواڵێکتان لێوه بۆ دێنمەوه یا دەسەچیلەیەکتان لێ بۆ دێنم بۆئەوەی خۆتانی پێ گەرم کەنەوه. ئاگرەکەش تیشکی تەجەللای خوا بووه که له کێوی توورەوه بۆی دەرکەوتووه.

(٧) تەسبیح: تەزبێح. بێ تەقریب: بێ مەعناو نامەعقوول.

واته: پیرەژن چەند دەتوانێ خۆی بکا به کچی جوان، سۆفیش ئەوەنده دەتوانێ ببێ به خواناسی راستەقینه. بۆیه سەرم سوڕما که تەزبێحم له ملی سۆفیدا دی.

(٨) نێش: چزوو. زەنبوور: زەردەواڵه.

لە تێغی تۆ هەتا «مەحوی» شەرەفیابی شەهادەت بوو
خوێنی بوو بە ئاو، ئیتر لە داوێنت نەما مەحزوور[٩]

**-٥-**

ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا، تاقە رۆژێ گەر
بە قەرنێ من ئەوەند ئەهلی خودا بم دەبمە پێغەمبەر[١]

بە کەم مەگرە سروشك و ئاه و نالەی بێنەوایانت
کە سەیلی بێ ئەمانە، تیری دڵدۆزە، گولەی وەروەر[٢]

---



واتە: دیمەنی هەڵت نەخەڵەتێنێ زەردەواڵەی زەرد و سوورت لێ بگۆڕێ بە شتی جوانی زەرد و سووری دنیاو وابزانی هەنگە. زەردەواڵە هەر چزووی ئازاربەخشی هەیە و هەرگیز هەنگوێنی لێوە دەسگیر نابێ.

بە زەرد و سووری (ن): بە سوور و زەردی.

(٩) شەرەفیاب: ئەوەی سەربەرزی دەسگیر بووبێ. مەحزوور «محذور»: شتێ مەترسی لێ بکرێ.

واتە: تا بە تێغی دەستی تۆ شەرەفی شەهید بوونم دەسگیر بوو، خوێنم بوو بە ئاو. لەبەر ئەوە ئیتر ئەگەر خوێنیشم برێژی، نیشانەی تاوان دەرناکەوێ، چونکە داوێنەت سوور و خوێناوی نابێ.

**-٥-**

(١) واتە: ئەم خەڵکە ئەوەندە دنیا پەرستن، یا ئەهلی دەنائەت و سووکین، ئەگەر من بە سەد ساڵ ئەوەندەی تاقە رۆژێکی دنیا پەرستی ئەوان خواپەرستی بکەم لە پیاو چاکیدا دەبمە پێغەمبەر.

(٢) سروشك: فرمێسك. بێنەوا: هەژار و داماو. سەیل: لافاو. ئەمان: ئامان. دڵدۆز: دڵ کونکەر. وەروەر: جۆرە دەمانچەیەکە لەو سەردەمەدا بەناوبانگ بووە.

چ کـەس نـابێ بـە کـەسدارم، نـیە لەو بـەردەرە یـارم
خودایا تۆ بکەی چارم کەسێکم بـێ کـەس و بـێ دەر[٣]

چڵو چۆکەر مەدە دەورم، خـودا حـافیز نـەسیحەتگەر
لە شەکوەی عیشق و لۆمەی عەقڵ ئەمن هەم لاڵم و هەم کەڕ[٤]

زوبان و گوێ گلە و پەندی نە لێ دەبیەن، نـە پـێ دەبـیەن
عەبەس دێن و دەچن بەم جۆشە غەمماز و مەلامەتگەر[٥]

لە ئیعجازی مەحەبیەت چار فـەسڵم جـوملە بـۆ جـەمعە
سروشکم سوورە، ڕەنگم زەردە، لێوم وشکە، چاوم تەڕ[٦]

---

(٣) کەسدار: ئەوەی خۆی بە بەرپرس بزانێ لە کەسێکی تر. بەردەر: بەردەرگا. خاك و بووم.

(٤) چڵو چۆکەر: ئەوەی قسە دەهـێنـێ و دەبـا. نـەسیحەتگەر: ئـامۆژگـاریکەر. شـەکـوە: شکات.

واتە: نە قسەهێن و قسەبەر بە هیوای ئەوە بێ گلەییم لە دەردی عیشق لێ ببیسێ تـا بیبا نەملاو لەولا بیگێڕێتەوە، نە ئامۆژگاریکەریش بە تەمای ئەوەبێ گوێ بۆ پەندەکانی شل کەم و واز لە دڵداری بێنم. من لەم مەیدانەدا بە تەواوی لاڵ و کەڕم و نە دەتوانم هیچ بڵێم و نە گوێیشم بۆ کەس پێ شل دەکرێ.

«لاڵ» و «کەڕ» بەرابەر بە «شەکوە» و «لۆمە» لەف و نەشری مورەتتەبی تیایە، یەکـەم بـۆ یەکەم و دووهەم بۆ دووهەم دەگەڕێتەوە.

(٥) عەبەس: لە خۆڕایی. غەمماز: توانجگر. مەلامەتگەر: لۆمە و سەرزەنشتکەر.

واتە: توانجگر و لۆمەکەر لە خۆڕایی دێن و دەچن و قسە دەکەن، چونکە نە گوێم قسەکانیان دەبیسێ و نە زوبانم پەند و ئامۆژگارییەکانیان دەڵێتەوە.

(٦) ئیعجاز: موعجیزە. جەمع: کۆ.

واتە: مـوعجیزەی دڵداری هـەرچـوار وەرزی سـاڵی بـە جـارێ تـێدا کـۆ کـردوومەتەوە. فرمێسکی سوورم گوڵاڵەی بەهارە و ڕەنگی زەردم گەڵای داوەریوی پاییزانە و لێوی وشکم قرچەی هاوینە و چاوی تەڕم بارانی بە خوڕی زستانە.

**سیاپۆشن لە داخـی خـەت و خـاڵو لێوو روو و زوڵفت**
**وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی خزر و لالە و عەنبەر**(٧)

**جگەر کون کـە، خـوێنـی گـریە بـەردە، سـینە هـەڵبـدڕە**
**نـیگاهێ کـە ببینە کـاری تـیر و نـەشتەر و خـەنجەر**(٨)

**کە سەیری دەفـتەری سـەر گـەشتەگـان و خـاکسـاران و**
**سیابەختانی کردن، دی هەموو، «مەحوی» بوو سەردەفتەر**(٩)

(٧) واتە: وەنەوشە و میسکی بۆن خۆش و ئاوی ژیان لالەو عەنبەر کە دەزانن ناگەنە پـایەی جوانی برۆو برژانگو خاڵو لێو و روو و زوڵفی تۆ، لە داخا وەك عازیەتی باریان لێ هاتووە و بەرگی رەشیان پۆشیوە. مەبەست لە رەشی وەنەوشە تۆخی مۆرییەکەی و لە رەشی ئاوی ژیان ئەوەتە کە لە ئەفسانەدا هەیە کەوا لە ئەشکەوتێکی تاریکدایە کەس رێی ناباتە سەر.

(٨) واتە: لایەکم لێ بکەرەوە، بەو لاکردنەوەیە جگەرم کون کە و بەری فرمێسکی خوێنینم بەردە و سینەم هەڵبدڕە. جا ببینە تیری روانینت چۆن جگەری کون کردم و نەشتەری برژانگت چۆن فرمێسکی خوێنینی پـەنگ خـواردووەوەی چـاومی بـەرداو خـەنجەری بـرۆت چـۆن سینگمی هەڵدڕی.

(٩) سەرگەشتەگان: سەرگەردانـان. خـاکسـار: خـۆڵاوی. سـەردەفتەر: ئـەوەی نـاوی لەلای سەرووی هەموانەوە نووسرابێ.

واتە: کە یار تەماشای لیستەی سەرلێشێواوان و لە خاك و خۆڵاکەوتووان و چارەڕەشانی دەستی خۆی کرد و نـاوی هـەموویانی دی، بـۆی دەرکـەوت کـە «مـەحوی» سـەردەفتەری هەموویانە و ناوی لەپێش ناوی گشتیانەوە نووسراوە.

-١-

ئەو عیشوەبازە دەرحەقی من چارە گرژە باز
بێچارە ماوە بەندە، خوداوەندی چارەسازا!(١)

دەستم کە گەییە دامەنی، مردم لە خۆشییان
گەردم، خودا بکەیتەوە بەو روتبە سەرفرازا!(٢)

ئیعجازی عیشقە مەنشەئی هەر موعجیزێکی حوسن
«مەحموود»ە بەندە، بۆیە بووە پادشا «ئەیاز»(٣)

ئەو چاوە چی دەکا کە هەموو عاشقانی کوشت!
بێ نازە ناز ئەگەر بەر و دەوری نەدا نیاز(٤)

---

-١-

(١) باز: دیسانەوە.

واتە: یاری عیشوە و نازکەر دیسانەوە رووی لێ گرژ کردووم. منی بەندە بێچارە و بێ دەسەڵات داماوم، سا خودای چارەساز چارەیەکی کارم بکە.

(٢) گەرد: تۆز. سەرفراز: سەربەرز.

واتە: کە دەستم گەیشتە داوێنی یار، لە خۆشییاندا مردم و بووم بە تۆز و با بردمی. سا خوایە تۆزەکەشم وەك خۆم بەو روتبە و پایەیە سەرفراز بکەی کە بگەمە داوێنی و داوێنی تۆزاوی بکەم...

(٣) واتە: جوانی بێ بەهۆی هەرکارێکی موعجیزە ئاسا، لە خۆیەوە نیە، لەوەوەیە کە جوانی مرۆ عاشقی دەبێ و عیشقەکەیە ئەو کارە موعجیزە ئاسایە بە عاشقەکە دەکا، وەك چۆن رەوشتی مەحموود و جوانی «ئەیاز»ی بەندەی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی، گەیاندیە پلەی پادشایەتی.

هەرچەند مەبەست لە «مەحموود» لەم بەیتەدا رەوشتی پەسەند کراوە، کۆ کردنەوەشی لەگەڵ «ئەیاز»داکە وەزیری سوڵتان مەحموود بووە، وردەکارییەکی جوانی تێدایە. شایانی وتنە «ئەیاز» ئەو کەسەیە لە فۆلکلۆری کورددا بە «هەیاسی خاس» ناوبانگی دەرکردووە.

(٤) واتە: تا دڵدارەکانی یار دیار بوون، هەموو بەتەمای پێگەیشتنی بوون و ئەویش بە چاو

**پرسی کە: حاڵی چاو و دەروون و دڵت چیە؟**
**هەر ئەشك و ئاهو داغە لەگەڵ سۆزی جانگوداز (٥)**

**مەشغووڵی «شەرحی گوڵشەنی راز»م، دەفەرموێ**
**سینەم کە شەرحە شەرحە دەکاتن بە تێغی ناز (٦)**

**حوققە و قەڵەم لە بەردەمیە شێخی نووشتەنووس**
**ئەفسوونگەری تەمایە لەگەڵ چەرخی حوققە باز (٧)**

---

☞

نازی بەسەردا دەکردن. ئێستا کە کوشتوونی و کەسیان نەماوە، چاوی بێ کار ماوە و نازی بێ نیاز کەوتووە.

(٥) جانگوداز: گیان توێنەوە.

واتە: یار هەواڵی چاو و دەروون و دڵی لی پرسیم. منیش لە وەڵامدا وتم: چاوم فرمێسك دەرێژێ و دەروونم هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ و دڵم پڕە لە داخ و سۆزی گیان توێنەوە.

دەشگونجێ رستەی «پرسی کە» بە «پرسێ کە»یش بخوێنرێتەوە. ئەم بەیتە لەف و نەشری مورەتتەبی تیایە، «ئەشك» بۆ «چاو» و «ئاه» بۆ «دەروون»و، «داغ» و «سۆز» بۆ «دڵ» دەگەڕێتەوە.

(٦) گوڵشەنی راز: کتێبێکی هەڵبەستە بە فارسی شاعیری ویجدانی بەناوبانگی ئازەربایجان «مەحموود شەبوستەری» دایناوە لە بابەتی تەسەووفدا. چەند کەسیش شەرحیان لەسەر نووسیوە وەك «موزەفەرەدین» عەلی شیرازی و «شەمس دین» موحەممەدگەیلانی نووربەخشی و مەولانا ئیدریسی کوڕی حیسامەدینی بیدلیسی و شێخ بابا «نیعمەتوڵڵای کوڕی مەحموودی نەخچەوانی... شەرحە شەرحە: توێ توێ.

واتە: سینەی من وەك دیوانی «گوڵشەنی راز» پڕە لە بیر و هەستی ناسك و بەرز. یاریش کە بە تێغی نازی برژانگەکانی سینەی لەت لەت دەکردم، لێم پرسی چی دەکەی؟ فەرمووی گوڵشەنی راز لێك دەدەمەوە و لەسەری دەنووسم.

(٧) حوققە: شووشەی مەرەکەب. ئەفسوونگەری: نووسینی دوعا بە نیازی جێبەجێ بوونی مراز. حوققە باز: ساختەچی.

واتە: شێخی نوشتەنووس کە قەڵەم و مەرەکەبی لە بەردەمی خۆیدا داناوە تەمایەتی بە دوعاو نووشتە چەرخی ساختەچی رام بکا کە ئەوەشی هەرگیز بۆ ناکرێ، چونکە چەرخیش لەو کەمتر ساختەچی نیە.

بـــبيه له مـــن، درەخـــتی «مـــنی» لەعـــنەته بـــەری
یـــەعنی بکـــە له کـــیبر و ئـــەنانییەت ئـــیحتیراز(٨)

هەرکەس تەکەللومی بـە «أَنَـا الْـخَیْر»ه وەك بـلیس
ئـــەمرۆ ســـبەی خـــیتابیه «يٰـــا أَيُّـــهَا الْـبَراز»(٩)

بـا زۆری بـیّ بـە کـەم مـەگـرە ئـاهی بـیّ‌کـەسان
بەم سروە بـایە عـەرشی خـودا دێـتە ئـیهتیزاز(١٠)

«مەحوی»! نیساری رەوزە کە ئەمجارە نەقدی جان
مەرگ ئەر نەبوو بە حاجیز و هەم چوویەوە حیجاز(١١)

---

(٨) منی: من ـ من کردن و خۆپەرستی و خۆدەرخستن. کیبر: فیز. ئەنانییەت: خۆدەرخستن. ئیحتیراز: خۆپاراستن.

واتە: ئەوەی خەریکی من ـ من کردن بێ و هەرخۆی بە شت بزانێ، وەك شەیتان لەعنەتی لێ دەکرێ. ئەمەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە پێویستە ئادەمیزاد خۆی لە فیز و خۆبە زل زانین بپارێزێ.

(٩) بلیس: ئیبلیس، شەیتان. بەراز: ئەگەر عەرەبی بێ مەعناکەی «پیسایی»یە. ئەگەر کوردیش بێ ئەوە دیارە.

لە قورئانی پیرۆزدا هەیە کەوا شەیتان سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد و وتی: ﴿أَنَـا خَـيْرٌ مِـنْهُ، خَلَقْتَنِي مِنْ نٰارٍ وَ خَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ واتە: من لەو چاترم، منت لە ئاگر و ئەوت لە قوڕ دروست کردووە. مەحویش دەڵێ: ئەو کەسەی وەك شەیتان بکاو بڵێ من لە خەڵك چاترم، ئەمڕۆ بێ و سبەی بێ گرفتار دەبێ و پێی دەوترێ هەی پیسایی یا هەی بەراز.

(١٠) ئیهتیزاز: لەرزە.

واتە: هەناسەی ساردی ستەم لێ کراوان بە کەم مەزانە هەرچەند زۆردار زۆر بەهێزیش بێ، یا بە کەمی مەزانە هەرچەند زۆریش لە دەم بێتە دەر و درێژە بکێشێ، چونکە ئەم هەناسەی ساردە عەرشی خودا دەلەرزێنێتەوە.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ حەدیسی پێغەمبەر (د.خ) کە دەفەرموێ: «عَرْشُ الرَّحْمٰانِ يَهْتَزُّ لِبُكٰاءِ الْمَظْلُومِينَ» واتە: عەرشی خودا لەبەر گریانی ستەم لێ کراوان دێتە لەرزە.

(١١) رەوزە [«رَوضە»]: مەرقەدی پێغەمبەر (د.خ). نەقد: نەختینە. حاجیز: ڕێ گر.

-٢-*

تۆ نەبی مەلجەئی من بی، «أبَداً» نیمە مەلاز
لەو دەرە بێتو دەرمکەی، بە خودا نیمە مەلاز (١)

قاپیو بابی کەسێکی کە نیشانم دە، بچم
غەیری قاپی کەرەم و بابی عەتا نیمە مەلاز (٢)

تەمی غەم عالەمی داگرتووە، بێ مەئوا بووم
بەر دەری مەیکەدەیە و بەس، لەوەلا نیمە مەلاز (٣)

بەم هەموو تیرەوە، دڵ سینەمی دی، ئەو شێرە
لەرزی هاتێ، وتی: ئەم بێشە نەما نیمە مەلاز (٤)

---



واتە: ئەگەر مەرگ مۆڵەتی دای و ئەمجارەیش چوویتەوە حیجاز، نەختینەی گیانی خۆت لە بەردەمی مەرقەدی پێغەمبەردا ببەخشەرەوە و بیکە بە قوربانی.

دیارە مەحوی ئەم پارچە شیعرەی بە یادی مەدینە و مەککە و لەپاش گەڕانەوەی لە سەفەری حەج وتووە.

(*)[ئەم پارچە شیعرە و پارچە شیعری پاش ئەمە لە نوسخە پێشووەکەدا لە پیتی «ذال»دا بوون بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم چاپە تازە لەسەر ڕێنووسی نوێی کوردی نوسرایەوە، گواستماننەوە بۆ پیتی «زێ» (بڵاوکردنەوەی کوردستان)].

-٢-

(١)مەلجە ء مەلاز [«مَلاذ»]: پەنا. «أبدا»: هەرگیز.

(٢)باب: دەرگا. عەتا: بەخشش.

واتە: لە دەرگای کەرەم و بەخششی خۆت بەولاوە من پەنایەك شك نابەم. ئەگەر هەیە پیشانم بدە با پەنا بەرمە لای.

(٣)مەئوا: ماوا، شوێن بۆ خۆ تێدا حەشاردان. دەر: دەرگا. مەیکەدە: مەیخانە.

(٤)واتە: دڵم کە سینەمی دی بەم هەموو تیرەوە کە پێیدا چووە، لەگەڵ ئەوەش کە لە ئازایەتیدا دەڵێی شێرە، لە ترسا لەرزی لێ هات و وتی: مادەم ئەم بێشەیەی سینەم لەدەست دەرچوو، ئیتر ڕێ و شوێن بۆ خۆم شك نابەم.

بـەختە، زاهـید کـە بـەهەشتی بـووەتە مـەئوا، مـن
غەیری «بَیْتُ الْحَزَن»ی دەرد و جەفا نیمە مەلاز[٥]

شوکری حەق بەر دەری هـەر فـەقرە ئـیقامەتگاهم
بەر دەروباری نە سوڵتان و نـە شـا نـیمە مـەلاز[٦]

بەڵکە لەو ڕێـیەوە مـن پـەی بـەمە عـیمرانـی بـەقا
«مەحویا» غەیری خـەرابـاتی فـەنا نـیمە مـەلاز[٧]

-٣-

بۆتە موئنیس، بۆتە مەئوا، قەوم و شـاریٚ ئـەلعەیاز
دێوی بێتیٚ، جیٚ بە جیٚ دەڕوا بە باریٚ ئەلعەیاز[١]

هەرکەسیٚ ساتیٚ لەگەڵ ئەو قەومە بووبیٚ، تا ئـەبەد
بـــێتـــەوە فکـری، لە زاری دادەبـاریٚ ئـەلعەیاز[٢]

---

(٥) واتە: زاهید بەختی هەیە کە بەهەشت بووە بە جێگەی و منیش لە چارەڕەشی خۆمە لە خەفەتخانەی دەرد و جەفا بەولاوە پەنایەکم نیە.

(٦) فەقر: فەقیری. ئیقامەتگاه: شوێنی نیشتەجێ بوون. دەروبار: دەربار، کۆشکی شاهانە.
واتە: لە سایەی خواوە هەر لە بەردەرگای هەژاریدا بار و بارگەی خۆم دەخەم و دەحەسێمەوە و پەنا نابەمە بەر دەرباری هیچ پادشاهێك.

(٧) واتە: بۆیە کەلاوەکۆنی نەمانم کردووە بە پەناو شوێنی خۆم، بەڵکوو لەم ڕێگایەوە بگەمە ئاوەدانی ژیانی راستەقینە.

-٣-

(١) موئنیس: هاودەم. ئەلعەیاز [«اَلعَیاذ»]: پەنا بەخوا... باریٚ: جاریٚ.
مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە مەعنای بەیتی پاشەوەیەوە.

(٢) واتە: شارێکی وا بووە بە جێگەم و کۆمەڵە خەڵکێکی وا بوون بە هاودەمم، پـەنا بـەخوا ☞

ئـەهلی تـەزویر و فـەسادن، غـاسبی مـاڵی عـیباد
موبتەلا بن بەم بەڵایە، ئـەهلی شـارێ، ئـەلعەیاز (٣)

فیتنە جۆیی، یەك بە یەك دانە بـە کـوشتن، ئـیشیان
روو بەوانە ئەغڵەبـەی ئـینزاری بـارێ ئـەلعەیاز (٤)

هارو مارن، غەیری یەك یەك، یەکسەری دێوو دەدن
ئیکتیفا نابێ بکەی «مەحوی»! بە جارێ ئەلعەیاز (٥)

---



ئەگەر دێو بچێتە ئەو شارە لە تاوا بە یەگجاری ڕا دەکاو هەرکەس ساتێکی لەگەڵ ئەوکەسانەدا ڕابواردبێ، تا دنیا دنیایە هەرچەند یادیان بکاتەوە «پەنا بەخوا» لە دەمی دادەبارێ.

لە ناو کوردانا مەشهوورە دەڵێن فڵان کەس دێو لەگەڵی هەڵناکا.

(٣) تەزویر: ساختە. غاسب، [«غاصِب»]: زەوتکەر.

واتە: دانیشتوانی ئەم شارە ساختەچی و ماڵی خەڵك خۆرن. پەنا بەخوا لەوە کە خەڵکی شارێ تووشی دەردی وا ببن کە خەڵکی شارەکەی من تووشی بوون.

(٤) فیتنە جۆیی: بە دوای ئاژاوەدا گەڕان.

واتە: ئیشیان بریتیە لە ئاژاوە گێڕان و یەك بە یەك بە کـوشت دان. لە هـەر کـۆمـەڵە «پـەنا بەخوا»یەکدا، کۆمەڵێکی روو بەوانە.

ئەگەر لەبەر ڕاگرتنی هاوسەنگی بەیتەکان نەبوایە، وشـەی «بـارێ»ی ئـەم بـەیتەمان بـە «باری» دەخوێندەوە بە مەعنا «خوا» و مەعنای بەیتەکەش وا باشتر دەهات.

(٥) دەد: دڕوندە.

واتە: تاکە تاکەیەکیان نەبێ هەموو هارن و بوون بە مار و دێوو دڕوندە و نابێ ئادەمیزاد بە تەنیا جارێك «پەنا بەخوا کردن» لێیان واز بێنێ.

ئاخۆ «مەحوی» لەم پارچە شیعرەیدا باسی کێ و کوێ دەکا؟ هیچ بـەڵگـەیەکـی تـایبەتی بەدەستەوە نیە ئەمەمان بۆ دیاری بکا. لە مێژووی ژیـانی مـەحوی خـۆیشـیدا، لە سـلێمـانی بەولاوە شارێك نیە ئەوەندەی تێدا ژیابێ بەم جۆرە لێی بێزار بـبێ. ئـێمـە وای بـۆ نـاچین لە سلێمانی بەولاوەی مەبەست بێ، بەڵام بەداخەوە سلێمانی و خەڵکەکەی بوون بە قوربانی بۆ

-٤-*

به داوه وەعزی و، خۆشی به تاوه یـاحافیز!
له هەڵقوڵانه که لیکی دەم و لچـی واعـیز (١)

دەفەرموێ که حەکیم و دەوا مـەیه و سـاقی
دەگرنەوه له نەخۆشی منا کـەوا «حـافیز» (٢)

که باسی لێوو ددانی بکەن، بەدەر دەکـەوێ
نیساری لەعل و گوهەر کردنی دەمی لافیز (٣)

---



کردەوەی بەد و ستەمکارانەی تاقمێ لەوانەی کەسانی ئازادبیری وەك مەحوییان ئازار داوە و وا مەحوی لێرەدا تێکڕای خستوونەتە بەر هێرشی خۆی. دیارە ئەگەر مەحوی کەسێك بوایە لە چەرخێکدا ژیابوایە گرێ کوێرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ لێك بکرایەتەوە، دەیتوانی بە وردی دیاری بکا کێ شایانی ئەوەیە بیکا بە نیشانەی تیری هێرشی خۆی و شارێك تێکڕا وا نەداتە بەر هێرش.

(*) [ئەم پارچە شیعرەمان لە پیتی «ظ» گواستەوە بۆ ئێرە. (بڵاوکردنەی کوردستان)].

-٤-

(١) واتە: خوا بمانپارێزێ، واعیز گەرم بووە و هاتووەتە جۆش و لیك بە دەم و لچ و لالغاوەیدا دێتە خوارەوە و وەعزەکەشی هەموو هەر فێڵ و کەڵەك و داوە دەینێتەوە بۆ خەڵك.

(٢) حافیز [«حافظ»]: مەبەست دیوانی خواجە حافیزی شیرازییە کە بووە بە باو دەیگرنەوە بەنیازی زانینی سەرەنجام. گرتنەوەکەشی بەم جۆرەیە: کتێبەکە پێوە دەدەن، ئەنجا دەیکەنەوە، تەماشای سەرەتای ئەو قەسیدەیە دەکەن کە کەوتووەتە لاپەڕەی یەکەمی و بەپێی مەعنای قەسیدەکە تێ دەگەن کەوا ئەو مەبەستەی لە دڵیان گرتووە سەرەنجامی چۆن دەبێ.

واتە: کە دیوانی حافیزی شیرازیم بۆ دەگرنەوە بزانن نەخۆشییەکەم کەی و بە چی چاك دەبێتەوە، تەماشا دەکەن دەڵێ دەرمانی دەردم بریتیە لە مەی و دوکتۆری بریتیە لە مەیگێڕ.

(٣) نیسار: بڵاوکردنەوە. لافیز، [«لافِظ»]: ئەوەی وتە (لَفظ)ی بە دەما دێ.

واتە: کە باسی لێوو ددانی یار بکەن، دەردەکەوێ کەوا قسەکەرەکە بە قسەکانی لەعل و گەوهەر بڵاو دەکاتەوە. مەبەستی ئەوەیە بڵێ لێوی سووری یار لەعلێکی وایە و ددانە سپیەکانی گەوهەرێکی وان باس کردنیان وەك لەعل و گەوهەر بەنرخە.

**لە نەقسی باتین ئەسەر ئاخری دەبێ زاهیر**
**لە ئاخرا شەلو شێتی عەقیدە ما جاحیز(٤)**

**چ شۆخە! هاتبوو، گۆیا عەیادەتە «مەحوی»**
**کە ڕۆیی، ڕووشی نەدامێ بڵێ خودا حافیز(٥)**

---

(٤) ئەسەر: نیشانە. جاحیز [«جاحِظ»]: یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی ئیسلام و لە پێشەوایانی بەرەی موعتەزیلە، لە دەوروبەری ٧٧٥ی زاینیدا لەدایك بووە و لە ٨٦٨ی زاینیدا مردووە. لە زانستەکانی سەردەم شارەزاو زانایەکی ورد و بیر تیژ بووە، داب و نەریتی خەڵکی سەردەمی لە نووسینەکانیدا تۆمار کردووە. «الحَیوان» و «البَیان وَالتّبیین» و «البُخَلاء» لە کتێبە هەرە بەناوبانگەکانینی.

واتە: ئەوەی لە دەروونیدا کەم و کورتی هەبێ، لە لەشیشیدا دەردەکەوێ. بۆیەش جاحیزی موعتەزیلی کە باوەڕێکی نادروستی پێچەوانەی ڕێو شوێنی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی بووە، شەلو شێت کەوت. مەشهوورە جاحیز شەل بووە و باڵاو ڕواڵەتێکی ناشیرینیشی بووە.

دیارە مەحوی بەم بەیتە دەیەوێ پلار بگرێتە کەسێکی تایبەتی کە هەم بەدیمەنیش ناشیرین بووە و هەم بیر و ڕایشی پەسەند نەبووە لای، ئەگینا بەڵگەی وا بەڵگەیەکی بێ ڕێو جێیە و هیچ پەیوەندییەك لە نێوان جوانی سەر و سوورەت و ڕاستی بیر و باوەڕدا نیە.

ئەم جۆرە کە ئێمە مەعنای بەیتەکەمان پێ لێکدایەوە، لە ڕاستیدا ڕاست کردنەوەی بەڵگە هێنانەوەکەی مەحوییە، ئەگینا دیارە نیوەی یەکەم و دووهەمی بەیتەکە لەگەڵ یەك ناگونجێن. بەپێی نیوەی یەکەمی دەبێ جاحیز لەبەر چەوتی بیروباوەڕی لە ئاخردا شەلو شێتیش بووبێ، کەچی ئەم نیوەی دووهەمە دەڵێ جاحیز سەرەنجام، وەك شەلو شێتی لەش بوو، شەلو شێتی بیروباوەڕیش بوو.

(٥) عەیادەت: مەبەست لە نەخۆشی کەوتووی ناو جێگایە.

واتە: سەرم لە بێباکی و کەمتەرخەمی یار سڕ ماوە. لای خۆی هاتبوو بۆ سەرخۆشی لێ کردنم بەهۆی نەخۆشیمەوە، کەچی کە ڕۆیشت، لایەکیشی لێ نەکردمەوە و ماڵاوایی لێ نەکردم.

-١-

ڕووتــی دی لەو ڕۆژەوە، گــەر ڕۆژە ســەرگەردانــە ڕۆژ
گــەییە ئـێوارە وەکــوو مــن، ئـیشی قــوڕ پـێوانــە ڕۆژ [(١)]

ڕەهڕەوی ڕێگەی مـەحەببەت وا دەبــێ، هــەر ســەعیەتی
تــا هــەیە لەم ڕێگــە ئــاخر کــاری ســەردانـانە ڕۆژ [(٢)]

لاجەرەم کردوویە نـووری جـیلوەی ئـەو مـاهە بـە چـاو
دەوری بۆ ئـەو شـەمعەیە دایـم وەکـوو پـەروانـە ڕۆژ [(٣)]

شــەو بــە ئــێمــە بــا نــەویدی هــاتنی جــانانی دا
یـەعنی: ئـەی شـەونم گـەلینە! مـوژدەبێ مـیوانـە ڕۆژ [(٤)]

---

-١-

(١) واتە: ڕۆژ لەو ڕۆژەوە ڕووی تۆی دیوە، بە ڕۆژدا سەرگەردانە و دێ و دەچێ. کە گەییە ئێوارەیش وەك من بۆ خۆی قوڕ دەپێوێ.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ واتە: کە ئەسکەندەری جووت شاخ گەیشتە شوێنی ئاوابوونی ڕۆژ دیتی لەناو کانییەکی قوڕە ڕەشەدا ون دەبێ.

(٢) ڕەهڕەو: ڕێبوار. سەع: سەعی، هەوڵ.

واتە: ڕێبواری ڕێگای دڵداری دەبێ وەك ڕۆژ بێ، تا بەڕێوە بێ هەر هەوڵ بداو سەرەنجامیشی سەردانان بێ، وەك ئەو.

(٣) لاجەرەم: بێ گومان.

واتە: دیارە ڕۆژ تیشکی دەرکەوتنی مانگی یاری بە چاو دیوە، بۆیە هەمیشە وەك پەروانە بەدەوری مۆمی ئەودا خول دەخوا.

(٤) نەوید: موژدە. جانان: دۆستان. شەونم گەلینە: ئەی کۆمەڵی شەونم!.

واتە: شەو کە با هەڵی کرد موژدەی هاتنی دۆستانی داو وتی: موژدەتان بدەمێ ئەی دڵدارینە، یاری وەك ڕۆژ جوان میوانتانە، لە خۆشییاندا هەڵسن بچن بە ئاسماندا بە پیرییەوە و منیش هەڵتان دەگرم. مەبەست لەوەیە کە ڕۆژ هەڵدێ شەونم دەبێ بە هەڵم و دەچێ بە ئاسماندا.

مــەتڵەبت گــەر یــارە، هـەر سـەعیت بـەکـارە دائـیما
بـــۆ تــەوافــی قــاپییەك وا بــەر زەدە دامــانە رۆژ[٥]

شــەو دەبــێ بــادەی لە دەســتی ســاقییەك وەرگـرتبێ
ئــەم ســبەینێیــە لە مـەشریق دێتـەدەر مـەستانە رۆژ[٦]

ئــەڵبــەتە مــەجنوونی رۆژی روومــەتی لەیــلایەکــە
موتتەسیل، شام و سەحەر، کەوتۆتە ئـەم شـاخانە رۆژ[٧]

مــاهەکــەم ئــەمشەو شــوکر پــڕتــەوفشانی خــانەیە
قەت لە دەرگا دەردەچم گـەر بـێتـە ئـەم سـەربانە رۆژ[٨]

ئــەم گــلاراوەی لە عــیشقە تــا قــیامەت هــەر دەبــێ
سەد مەسیحا چاری نـاکـا، دەردی بـێ دەرمـانە رۆژ[٩]

---

(٥) بەرزەدە دامان: داوێن هەڵکردوو.

واتە: ئەگەر دەتەوێ بگەی بە یار، دەبێ بزانی کەوا هەمیشە هەر هەوڵدان کەڵکی بـۆت هەیە. نابینی رۆژ وا داوێنی خۆی هەڵکردووە و مەبەستی تەنها زیارەتی ماڵێکە...

مەبەست لە داوێنی رۆژ شەوقەکەی و لە داوێن هەڵکردنیشی سێبەرکردنیەتی لە دیواری ماڵدا.

(٦) واتە: کە رۆژ سبەینان وەك سەرخۆش لەودیوی شاخەوە دێتەدەر، دیارە هی ئەوەیە شەو پیاڵەی شەرابی لە دەستی پیاڵەگێڕێك وەرگرتووە.

(٧) موتتەسیل [«مُتَّصِل»]: پەیدەرپەی. شام: ئێوارە. سەحەر: سبەینێ.

مەبەستی لەوەیە کە رۆژ سبەینان لە پەنا شاخەوە هەڵدێ و ئێواران لە پەنا شاخدا ون دەبێ.

(٨) پڕتەوفشان: تیشك دەرەوە. خافە: ماڵەوە.

واتە: لە سایەی خواوە ئەمشەو یارە جوانەکەم لە ماڵدا تیشك دەداتەوە، بۆیە ئەگەر رۆژ بیشیەتە سەربانەکەم ناچم بۆ لای و لای یارەکەم بەجێ ناهێڵم.

سەربانە (ن): بەردەرگانە.

(٩) گلاراو: ئۆقرە نەگرتن لە شوێنێکدا، چاوئێشە. مەسیحا: حەزرەتی عیسا کـە یـەکـێك لە موعجیزەکانی ئەوە بووە کوێری مادەرزادی چاك کردووەتەوە.

رۆژو شەو ئەم سەرزەمین و بن زەمینەی پشکنی
نەبووە شوێن هەڵگر لە عەکسی جیلوەی ئەو جانانە رۆژ(١٠)

رۆحی بەفدا کە، بزانە کێیە چەوگان بازەکە
«مەحویا» چەوگانە عیشق و گۆیە لەم مەیدانە رۆژ(١١)

حەقیە رۆژو شەو کە بێ تابی دەکا، وادەی ویسال
شەو بوو، بێبەش ما لە وەسڵی ئەو سەراپا جانە رۆژ(١٢)



واتە: ئەم گلاراو پێکەوتنەی رۆژ کە لە شوێنێکدا ئۆقرە ناگرێو وەك چاوئێشەدار هەر ئەملاو ئەولا دەکا، بەهۆی دەردی عیشقەوەیە و تا قیامەت هەر بەردەوامە و دەردێکی بێ دەرمانە، تەنانەت عیسایش کە تیماری چاوی کوێری مادەرزادی کردووە پێی چار ناکرێ.

عیشقە (ن): عیشقا.

(١٠) شوێن هەڵگر: ئەوەی بەدوای کەسێکدا بگەڕێو بتوانێ بزانێ بەکوێدا رۆیشتووە.
جیلوە: تیشك دانەوە.

واتە: رۆژ، بە شەو و بە رۆژ رووی زەوی و بنی زەوی هەموو پشکنی بەدوای یاردا، کەچی هێشتا بەو هەموو رۆشناییەوە کە هەیەتی شوێنی تیشکی ئەوی نەدۆزیەوە و پەیی پێ نەبرد و نەیزانی بەکوێدا رۆیشتووە...

(١١) چەوگان: گۆچان، ئەو دارەی لە یاری گۆو چەوگاندا گۆکەی پێ هەڵدەدەن.

واتە: لە مەیدانی عیشقدا رۆژ وەك گۆ وایە و عیشق ئەو گۆچانەیە پێی هەڵدەدەن. بەڵام هێشتا گۆچان هەڵگرەکە نەدۆزراوەتەوە، بەڵکوو مەحوی تۆ بیدۆزیتەوە و گیانی خۆتی بەقوربان بکەی.

لێرە بەدواوەی ئەم پارچە شیعرە لەبارەی ناوەرۆکەوە لە پارچە شیعرێکی سەربەخۆ دەچێ، بەڵام چونکە دوا وشەی نیوەی یەکەم و دووهەمی بەیتی یەکەمی وەك یەك نیە و ناوی شاعیریش لە دوا بەیتدا نەهێنراوە وەك لە پارچە شیعرەکانی تردا و لە هەموو هۆیەکانیش گرنگتر چونکە لە نوسخە دەستنووسەکاندا بە سەربەخۆ دانەنراوە، ئێمەش هەروەك خۆی هێشتمانەوە.

(١٢) بێ تابی: بێتاقەتی.

**شەو چ شەو، لێ پشکواوی قەڕنەها سوبحی ئومێد**
**هەر لە داوێنی یەکێ سوبحا بە لەك پەنهانە ڕۆژ(١٣)**

**شەو شەوی میعراجی شاهی ئەنبیا بێ، وا دەبێ**
**بیپەرستێ، بەڵکی سوجدەی بۆ ببا هەر ئانە ڕۆژ(١٤)**

**شەو نەبوو، بەحری موحیتی عەنبەری بوو، ناوی شەو**
**بوو بە نیسبەت ئەو شەوە، خاکستەری گوڵخانە ڕۆژ(١٥)**

**بۆ کەمێ لەو عەنبەرە، بۆ تەقوییەی ڕۆحی دەماغ**
**بێنی کا، وەك ئێمە دایم چاوەڕێی ئیحسانە ڕۆژ(١٦)**

**من فیدای ئەو زاتە بم، بەو، ئەو شەوە بوو بەم شەوە**
**تا قیامەت هەر حەسەد با، بەو شکۆهـ و شانە ڕۆژ(١٧)**

---



ئەم بەیتە باسی میعراجی پێغەمبەر (د.خ) دەکا بۆ ئاسمان. دەڵێ: ڕۆژ حەقیەتی بە شەو و بە ڕۆژ بێتاقەتی دەکا، چونکە وادەی گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەر شەو بوو و ئەو بە شەو چوو بۆ ئاسمان. لەبەر ئەوە ڕۆژ نەیتوانی بگا بە خزمەتی و لەو نیعمەتە بێبەش مایەوە و ئەو زاتەی نەدی کە سەرتاپای وەك گیان شیرینە.

(١٣) واتە: ئەو شەوە چ شەوێ بوو؟ شەوێ بوو سەدەها ساڵە بەرەبەیانی هیوا لەوەوە دەپشکوێ‌و لە داوێنی هەرکام لە بەیانییەکانیدا هەزاران ڕۆژ پەنهانە و خۆی حەشار داوە.

(١٤) ئان: کات. بەڵکی: بەڵکوو.

(١٥) خاکستەر: خۆڵەمێش. گوڵخان: توونی گەرماو.

واتە: ئەو شەوە شەو نەبوو. هەر بەناو شەو بوو. ڕەشییەکەی هی ئەوە بوو ئوقیانووسێکی پڕ لە عەنبەری بۆن خۆش بوو. ڕۆژیش لەچاو ئەو شەوەدا خۆڵەکەوەی ناو توونی گەرماو بوو.

(١٦) تەقوییە: بەهێز کردن. دەماغ: مێشك. بێن: بۆن. ئیحسان: خێر و حەسەنات و چاکە لەگەڵ کردن.

بێنی (ن): بۆنی.

(١٧) واتە: شەوی میعراج لەسایەی پێغەمبەرەوە -بەقوربانی بم!- بوو بەم شەوە پایەبەرزە کە تا دنیا دنیایە ڕۆژ بەخیلی بە شان و شکۆی دەبا.

تۆ قوبوولّم کەی بە عەبدی خۆت و بەندەی ئەو، خودا!
تا ببێتە خانەڕووبم، چەند ئەگەر خاقانە، ڕۆژ[١٨]

دائیمەن سەر خۆی و سەر ئال و سەحابەی بێ نیسار
پڕ بە عیلمی تۆ، سەلاتی تۆ، هەتا تابانە ڕۆژ[١٩]

بەڵکە تا ئەو وەقتە مەبرووکە موبارەك جێگەیە
غەیری نووری ئەو، نە مەهـ نووری لەناوا ما، نە ڕۆژ[٢٠]

لەو سەلاتانە کە وەك گەوهەرن و دەدرەوشێنەوە
جیلوەدەر، لامیع، هەموو ڕەخشندە، وەك ڕەخشانە ڕۆژ[٢١]

---

(١٨) خانەڕووب: ئەوەی ناوماڵ گسك دەدا. خاقان: لەقەبی پادشاهانی چین و تورکستان بووە.

واتە: خوایە بمکەی بە بەندەی خۆت و ئەو پێغەمبەرە، تا ڕۆژ بەو هەموو شان و شکۆوە کە هەیە و دەڵێی قاقانی چینە، لە ئاستمدا ئەوەندە سووك و بێ بایەخ بنوێنێ، ببێ بە گسكدەری ناو ماڵم.

(١٩) نیسار: بڵاو کردنەوە و هەڵپرژاندن. تابان: تیشكدەرەوە. مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەوە.

(٢٠) مەبرووك: موبارەك، پیرۆز. مەهـ: مانگ.

واتە: خوایە! ئەوەندەی خۆت دەزانی. هەمیشە ڕەحمەت بەسەر پێغەمبەر (د.خ) و ئال و ئەسحابیدا بڕێژی تا دنیا دنیایە و تا ڕۆژ تیشك دەداتەوە، بەڵکوو تا ئەو وەخت و سەعاتە پیرۆزە کە لە نووری پێغەمبەر (د.خ) بەولاوە، نە نووری ڕۆژ لەناوا دەمێنێ و نە نووری مانگ.

(٢١) جیلوەدەر: تیشك بەخش. لامیع: خاوەن شەوق. ڕەخشندە: دەرەوشاوە. ڕەخشانە ڕۆژ: ڕۆژی ڕەخشان.

-٢-

پــرسرا حــاڵم، کــه مــن کــەوتم لەبــەر پــێیــا درێژ
ئەو وتی: هەر سێبەری دیوم بووه سەرسام و گێژ (١)

تا له دەوری لێوی ئاڵی خەتتی سەبزی بوو عــەیان
عاشقانی جومله وەك بــەنگی دەبــینم گــێژو وێژ (٢)

وا موشەووەش بوو که میحرابی برۆتــی دی ئــیمام
ئیزنی خەڵقی دا که دنیا ئــاخره، بــۆ دێنــه نــوێژ (٣)

ئــــابڕوو رێژه ویســـالی یــار و خــوێن رێژه فــیراق
عالەمی عیشق و مەحەببەت هەر بڕێژه، هەر بڕێژ (٤)

-٢-

(١) واته: که لەبەر پێی یاردا درێژ کەوتم هەواڵمیان لێ پرسی، ئەویش له وەڵامدا وتی: تەنها به دیتنی سێبەرم سەرسام و گێژ بووه و کەوتووه، ئەگینا نه دیومه و نەدیومی.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیته له دەسنووسێکی پاکنووس نەکراوی شاعیر خۆیدا بەم جۆرەش نووسراوه:

ئەو وتی: هەر سێبەرم سەرخست و بوو سەرسام و گێژ

(٢) بەنگی: بەنگ کێش.

واته: هەر به دەرکەوتنی گەنەمووی دەوری لێوی، دڵدارەکانی هەموو وەك بەنگ کێش گێژو وێژ کەوتن. مەبەست له پەیوەندی نێوان دەرکەوتنی گـەنەمووی دەوری لێوی یـار و گـێژووێژ کەوتنی دڵداران، یا پەیوندەی نێوان رەنگی بەنگ و گەنەمووی سەرلێو یا ناسکی و باریکییانه.

(٣) واته: که پێش‌نوێژ له میحرابی مزگەوت و له کـاتی نـوێژدا بـرۆی رەشـی وەك مـیحراب هیلالیتی دی؛ سەری لێ شێوا، وای زانی رۆژی قیامەت هەڵساوه و مانگ رەش بووەتەوه و له ئاسمان کەوتووەته خوارەوه، به خەڵکەکەی وت: بڵاوەی لێ بکەن و نـوێژ نـەکـەن چـونکه قیامەت هەڵساوه و تەکلیف لەسەر خەڵك نەماوه.

(٤) ئابڕوو رێژ: ئابڕووبەره.

کێ لە گوڵزاری نیشاتا گوڵبـوونی شـیرینی نـاشت
ئەو لە کۆساری غـەما فـەرهادی کـردە لالەنـێژ(٥)

هەر بە تیرێ خستمی، هـەڵیـاوەسیم، ئـیشی مـنی
بەس لە کورتی بڕیەوە، عومری موژە و زوڵفی درێژ(٦)

نەبووە قەت «مەحوی»!، وتی: بوونی من و تۆ پێکەوە
حوسنە ئاوی زیندەگی، عیشق ئاگرێکە دڵ برێژ(٧)

---



واتە: دڵداری یا دەبێ بەهۆی ئابڕوو چوونی دڵدار یا دەبێ بەهۆی ڕشتنی خوێنی، چونکە ئەگەر بگا بە یارەکەی ئەوا لە خۆشییاندا شێت دەبێ و ئابڕووی دەچێ چونکە خەڵك گەمە و گاڵتەی پێ دەکەن. ئەگەر لێیشی دوور بێ ئەوا لەتاو دەرد و ئازار بەکوشت دەچێ.

(٥) واتە: دڵداری وەنەبێ هەر سەرێکی هەبێ کە بریتی بێ لە خۆشی گەیشتن بە یار، چونکە وەك لە باخچەی خۆشیدا دار گوڵی جوانی «شیرین» دێنێتەکایە، لەکۆساری خەم و مەینەتیشدا «فەرهاد» دەدا بەکوشت و لە دڵۆپی خوێنی لالەی سوور بەسەر شاخەوە دەڕوێنێ.

لە هێنانی ناوی «شیرین» و «فەرهاد»دا لەم بەیتەدا دوو ئیستیعارەی موسەڕەحە و تەناسوبێکی جوان و لەبارەی مەعناشەوە تیباقێکی ناسك هەیە.

(٦) موژە: برژانگ.

واتە: خوا عومری برژانگ و زوڵفی یار درێژ کا، یار لە کورتی کاری منی پێیان بڕییەوە، بە تاقە تیرێکی برژانگی کوشتمی و بە تاڵێکی زوڵفی کردمی بە دارا.

ئەم بەیتە لەف و نەشری مورەتتەبی تیایە، «موژە» پەیوەندی بە «خستن» و «زوڵف» پەیوەندی بە «هەڵواسین»ەوە هەیە.

(٧) زیندەگی: ژیان. دڵ برێژ: دڵبرژێن.

واتە: یار پێی وتم: من و تۆ پێکەوە نامانکرێ، چونکە جوانی من وەك ئاوی ژیان و عیشقی تۆیش وەك ئاگرێکی دڵ برژێن وایە، ئاو و ئاگریش هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە.

-١-

بپرسە حالْم، ئیهمالی وەفا بەس
بترسە تۆ لە حەق، جەور و جەفا بەس(١)

بە کامی غەیر و بێگانە، براله!
بەری بوونت لە یار و ئاشنا بەس(٢)

ئیلاهی بێ بەلابێ نەخلی بالاّت
بەری بۆ من بەلاّ بوو، هەر بەلاّ بەس(٣)

نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید
وەرە با تۆبە کەین، ئیتر ریا بەس(٤)

خودا ئەم دەردی عیشقەم لێ نەکا کەم
هەتا هەم بەس لەباتی هەر دەوا بەس(٥)

ئەوی ئەو وێڵیە بورجی زەمینە
دە بەس بڕوا مەسیحا بۆ سەما، بەس(٦)

---

-١-

(١) ئیهمال: پشتگوێ خستن و گوێ پێنەدان. حەق: خودا.

(٢) کام: ئارەزوو.

(٣) نەخل: دار خورما، کینایە لە بەرزی.

(٤) ریا: رووپامایی کە بۆ خاتری خودا نەکرابێ.

(٥) واتە: خوا دەردی دڵداریم سووك نەکاو دڵم هەمیشە هەر پڕ بێ لە خۆشەویستی. تا ماوم ئەم دەردەم لەجیاتی هەموو دەرمان و تیمارێك بەسە.

(٦) واتە: ئەو شوێنەی عیسا بەدوایدا دەگەرێ و بۆی وێڵ و سەرگەردان بووە، لە ئاسماندا نیە بەڵکوو بورجی زەوییە. کەواتە با بەس بڕوا بۆ ئاسمان بۆ گەڕان بەدوایدا.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بەوە کە عیسا، وەك لە حەدیسی پێغەمبەردا (د.خ) هەیە، لە رۆژی قیامەتدا لە ئاسمان دێتە خوار و پاش چەند ساڵێ وەفات دەکاو لە مەدینە لەپاڵ مەرقەدی پێغەمبەردا (د.خ) دەنێژرێ. کەواتە مەحوی لەم بەیتەدا تەفسیری چوونی عیسای بۆ ئاسمان بەوە کردووەتەوە کەوا سەرگەردانی عیشقی پێغەمبەرە (د.خ) و بەدوای ئەودا وێڵە.

لەسەر تێپەڕ بووە خوێناوی جەرگم
بە سەرما بێنە، ئەی دڵ، ماجەرا بەس (٧)

کە من دڵ پڕ کەدەرم و لێڵە عەیشم
لەکن من بەس بکەن باسی سەفا، بەس (٨)

کە نادا «مەحویا» دادێ بە حاڵت
بەسی بێ داد و ئاه و ناڵە، با بەس

-٢-

چ بکەم نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لەلا بە کەس
خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەو من بکا بە کەس (١)

گەر ئیشی رۆحتە، کە نەبوو کەس بە دەستەوە
دەست هەڵگرە لە رۆح و مەبە ئیلتیجا بە کەس (٢)

---

(٧) ماجەرا: «ماجریٰ»، ئەوەی رووی دا، رووداو.

واتە: خوێناوی جگەرم ئەوەندە هەڵچووە لە سەرم تێپەڕیوە. دەسا ئەی دڵ ئیتر با بەسی بێ، کەم دەرد و بەڵام بەسەردا بهێنە.

(٨) کەدەر: تاریکی، تاڵی. سەفا: خۆشی و بێ گەردی.

-٢-

(١) واتە: چی بکەم، چارم چیە! نە خۆم کەسێکی ئەوەندە پێ گەیشتووم خەڵك لە بەردەستما پێ بگەن و نە دەستیشم گەیشتە کەسێکی وا پێم بگەیەنێ.

(٢) واتە: تەنانەت بۆ مەسەلەیەکیش کە پەیوەندی بە گیانتەوە ببێ، ئەگەر کەسێکت دەسگیر نەبوو لەخۆیەوە بەفریات بگات، تۆ دەست لە گیانی خۆت هەڵبگرە، ئەوە باشترە لەوە پەنا بەریتە بەر کەسێك کە لەوانەیە دەست بەڕووتەوە بنێ.

**نــائەهلی ئــەم ئــەهالییە مــەعلوومی مــن کــە بــوو**
**شوکری خودا، خودا بەس، ئومێدم نەما بە کەس**[٣]

**لێوی بــە پــرسشی چ نــەخۆشــێ نــەپشکوانــد**
**دەردا! تــەبیبی ئــێمــە کــە نــادا دەوا بــە کــەس**[٤]

**خــورشید و ســایە پــێکــەوە نــابن، دە حــەقیەتی**
**ئەو جیلوە وەحشییە کە نــەبێ ئــاشنا بــە کــەس**[٥]

**بــەس بــێسەبەب پــەرستی، ئــەتیبا دەوا دەدەن**
**بەس هەر خودا تەبیبە کــە نــادا شــیفا بــە کــەس**[٦]

---

(٣) واتە: کە بۆم دەرکەوت ئەم خەڵکە چەند نامەردن، لە سایەی خواوە دەستم لە هــەموان داشۆری و پشتم تەنها بە خوا بەست.

ئەم چەند بەیتە نیشانەی کێشەیەکی سەختن لە دەروونی مەحویدا بەرابەر بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناو خەڵك و تەنگو چەڵەمەی ژیان و ناڵەیەکی سـەخت و تـوندی دەربـڕیـنی بێزارین لە ژیانی پڕ لە تاڵو سوێری کە کەسی تێدا بەدەم کەسەوە ناچێ.

(٤) پرسش: پرسیار.

واتە: یار لێوی نەکردەوە هەواڵی نەخۆشیك بپرسێ. ئەی دەرد وادیارە پزیشکەکەی ئێمە نیازی نیە دەرمانی دەردی کەس بدا.

(٥) خورشید: خۆر. سایە: سێبەر. وەحشی: کێوی، دەسەمۆ نەبوو.

واتە: یار وەك خۆر وایە و ئێمە وەك سێبـەر وایـن. کـەواتـە تـێشکی سـڵ کـەرەوەی ئـەو حەقیەتی نابێ بە هاوڕێی هیچکام لە ئێمە.

(٦) ئەتیبا، [«أطِبّا»]: جەمعی «طبیب»ە بەمەعنا پزیشك.

واتە: با بەسی بێ سەبەب پەرستی و تۆزێکیش موسەببیب بپەرستین.

ئەم سەبەبانە کە پێیان دەڵێن پزیشك هەر دەرمان دەدەن. پزیشکی راستەقینە هەر خوایە کە چاك کردنەوەی نەخۆشی لە دەستدایە و بە کەسی ناسپێرێ.

زاهــید وەرە رووییــێ بکــەرە بــارەگــاهی عــیشق
عــالی جــەنابە، وا نــیە هــەر رێ بــدا بــە کــەس[٧]

موحتاجی مەرحەمەتیە چ ناکەس، چ کەس، بە گەل
ئەو تاقە بێ‌کەسێکە کە گــرتی خــودا بــە کــەس[٨]

جێی ئیعترازی کەس نــیەت و نــەبووە، هــەرکەسێ
لادا لە نـــابەکـــار و حـــەزەر کـا لە نـابەکــەس[٩]

گـــەر تــێ‌بگــەن لە گــەوهەری دڵدا چ مــەوج ئــەدا
ئەم شەوچراغە لەم شەوەدا کەس دەدا بە کەس[١٠]

حەق بێژی یەك گــوناهیە مــەنسوور و حــەقمە مــن
ئەم قەتعە گەر نیشانی نەدەم «مەحویا» بە کەس[١١]

---

(٧) واتە: بارەگای عیشق زۆر بەرز و دڵ فراوانە، جێی هەموو کەسێکی تێدا دەبێتەوە، دەسا زاهید وەرە رووبەکی تێ بکە، وەنەبێ تەنها رێی ئەوانە بداکەکەسن. رێی تۆیشی تێدا دەبێتەوە.

(٨) واتە: ئەو کەسە تاك و بێ‌کەسەی کە خوای گرتبێ بە کەس بۆ خۆی، کەسێکی وای لێ دەردەچێ کەس و ناکەس هەموو بە کۆمەڵ موحتاجی مەرحەمەتی ئەو بن.

بێ‌کەسێکە (ن): بێ‌کەسێکی.

(٩) نیەت: نیە. نابەکار: ناکار، بێکارە. نابەکەس: ناکەس.

(١٠) مەوج: شەپۆل. شەوچراغ: گەوهەری شەوچراغ کە لە تاریکاییدا دەدرەوشێتەوە.

واتە: ئەگەر خەڵك بزانن لە گەوهەری دڵدا چ جۆرە راز و نهێنییەك شەپۆل دەداتەوە، کەس لەم رۆژگارە وەك شەوی تاریك و رەشەدا ئەم گەوهەری شەوچراغی دڵە نادا بە کەس.

(١١) قەتعە: پارچە شیعر.

واتە: مەنسوری حەللاج بە «أَنَا الحَق» وتنێك چووە سەر سێدارە. کەواتە من ناهەقم نیە ئەم پارچە شیعرەم پیشانی کەس نەدەم و خۆم نەدەم بەکوشت، چونکە هەمووی هەر قسەی هەقە.

-٣-*

بێ میهر و بێ مرووەتیی تۆ هەر عەلەلخوسووس
دەرحەق فیدائییانی جگەر سوختەی خولووس (١)

رەحم و مرووەتت نەبوە و نیشە، با خوسووس
دەرحەق بە عاشقانو، لە دەرحەق منا خوسووس (٢)

تێر ئاوی کردووە دەمی تێغت چ گەلوەها
تینوو لەو ئاوە مامەوە من هەروەها خوسووس (٣)

ئەم عالەمە کە مونتەزیری جیلوەی ئەو مەهەن
دەمرن بەو ئینتیزارە هەموولا «بِلا» خوسووس (٤)

---

(*) [ئەم پارچە شیعرە لە چاپە پێشووەکەدا لە پیتی «صاد»دا بوو، بەڵام لەبەر ئەوە ئەم چاپە تازەیە لەسەر رێنووسی نوێی کوردی نووسرایەوە ئەم پارچە شیعرەمان گواستەوە بۆ ئێرە بۆ پیتی «سین» (بڵاوکردنەوەی کوردستان)].

-٣-

(١) میهر: خۆشەویستی. جگەر سوختە: جگەر سووتاو. خولووس: دڵسۆزی.

واتە: کینە و نامەردی تۆ بەتایبەتی لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان دەکەن بە قوربانت و جگەریان لە دڵسۆزیدا سووتاوە.

(٢) واتە: لەگەڵ هەمووکەس بێڕەحمی، بەتایبەتی لەگەڵ دڵداران و لەناو دڵدارانیشدا بەتایبەتی لەگەڵ من.

منا (ن): بە من.

(٣) گەلوەها: چەندین گەلوو. گەلوو: گەرروو، قورگ.

واتە: دەمی تێغت گەرووی هەزاران دڵداری بە خوێن تێراو کردووە. بەڵام من هێشتا بەتایبەتی ماومەتەوە و تینووی ئاوی دەمی تێغتم.

(٤) واتە: ئەوانەی کە چاوەڕوانی دەرکەوتنی مانگی رووی یارن، بێجیاوازی هەموویان لە چاوەڕوانیدا دەمرن.

لەو شۆخـە نـیمە چـاوی تـەڕەحـحوم، کـە مـەزهەبی
جەور و جەفایە، دەرحەقی ئەهلی وەفـا خـوسووس (٥)

لەم شـــارە خــۆ هــەموو ڕەوش و دەئـبی ئـادەمی
یەکـبارە بـاری کـردووە، دیـن و حـەیا خـوسووس (٦)

نـــامەرد ئـــەوەندە مـــوعتەبەرن لەم زەمـــانەدا
مەرد ئیعتیباری کەم بووە، مەردی خودا خـوسووس (٧)

ڕەنـــجانی ئـــەهلی دڵ دڵە دەردە بـــەڵایـــەتی
مونکیر کـە نـاوی ئـێمـە ئـەوەندە دەبـا خـوسووس (٨)

هـــەرکەس لە حـــەزرەتێ بـــەتەما حـــەللی مـــوشکیلە
«مەحوی» لە حەزرەتی شەهی موشکیل‌گوشا خوسووس (٩)

---

(٥) چاو: مەبەست چاوەڕوانییە. تەڕەححوم: بەزەیی.
(٦) ڕەوشت: خوو. دەئب: نەریت و عادەت. یەکبارە: بە یەکجاری.
(٧) ئیعتیبار: قەدر و حورمەت.
(٨) واتە: ئێمە ئەهلی دڵین و ڕەنجاندنی ئەهلی دڵیش دەبێ بە مایەی دەردە دڵ. مـونکیر و نەویستیش کە ناوی ئێمە ئەوەندە بە خراپ دەبا، لەبەر ئەوەیە کە تووشی دەرد و بەڵا بـووە، ئەگەر تووشی دەرد و بەڵا نەبوایە ناوی بە خراپ نەدەبردین.
(٩) حەزرەتێ: کەسێکی پایەبەرز کە پـێی بـووترێ حـەزرەتی فـڵان کـەس. مـوشکیل‌گوشا: ئەوەی گیروگرفتی خەڵك دەکاتەوە. مەبەست لێی پێغەمبەرە (د.خ).

-٤-*

**زەمزەم چیە، بە زەمزەمەی ئایات و سەد حـەدیس**
**پـــابوونەوە لە شــەئنی نـــیە تــینەتی خـەبیس**(١)

**ئـــەهوالی رۆژی فـــیرقەت و ئـــەحوالّی عـاشقان**
**لەو رۆژەدا مـــوتابیقیە «هَـــلْ أَتـــىٰ حَـــدیث»**(٢)

**عـــەهد و وەفــا نـــەماوە کـــە جـــەور و جـەفایە بــاو**
**لەم عەسر و ئەهلە شەکوە ئەبەر تۆیە «یا موغیس»**(٣)

---

(*) [ئەم پارچە شیعرە لە چاپە پێشووەکەدا لە پیتی «ث»دابوو، بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی کە لەم چاپەدا رێنووسی نوێی کوردیمان رچاو کردبوو، گواستمانە بۆ پیتی «سین». (بڵاوکـردنەوەی کوردستان)].

-٤-

(١) زەمزەم: بیرێکە لە حەرەمی کەعبەدا لە مەککە، ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم و هـاجەری دایکی هەڵیانکەندووە. پاشان پڕ بووەتەوە تا «عـەبدولموتەلیب»ی بـاپیری پێغـەمبەر (د.خ) شوێنەکەی دۆزییەوە و هەڵی‌کەندەوە. لە سەردەمی نەزانیشدا وەك ئەمڕۆ لای خەڵك پیرۆز بووە. حاجی ئاوی لێ دەخۆنەوە و لێی دێننەوە بۆ وڵاتی خۆیان بۆ پیرۆزی. ئێستاش ئاوگێڕی تێدا بەدەس بنەماڵەی «عەبدولموتەلیب»ەوەیە. زەمزەمە: دەنگی لە دوورەوە بیستراو. تینەت: کەرەستەی لێ دروستکران. خەبیس [«خبیث»]: چەپەڵ.

واتە: ئەوەی لە کەرەستەیەکی پیس دروست کرابێ، نەك بە ئـاوی زەمـزەم، بـەڵکـوو بـە هەرچی ئامۆژگاری قورئان و حدیـسیشە پاك نابێتەوە و نایەتەوە سەر رێگای راست.

(٢) واتە: دەردی دووری و نارەحەتی حاڵی دڵداران، لە چـەشنی دەرد و نـارەحـەتی رۆژی قیامەتە، کە لە ئـایەتی: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾و ئـایەتەکـانی پـاشەوەیدا بـاسی کـراوە لە سوورەتی «الغاشیة» لە قورئاندا.

(٣) شەکوە: شکات. موغیس [«مُغیث»]: فریادڕەس.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرەیە:

فەریادڕەس نەماوە کە بێداد و جەورە باو

**دڵ لەت دەبێ کە هەردوو جگەر گۆشـەی ئـادەمن**
**قـابیلە ئـەشقیایە، «اَبُـو الأَنـبِیا»یـە شـیس** (٤)

**«مەحوی» بە لوتفی تـۆیـە پـەناهی لە قـەهری تـۆ**
**«یـا غَـوْثُ، یـا غِـیٰاثُ، بِکُـمْ مِـنْکُمْ أَسْـتَغِیثُ»** (٥)

---

(٤) قابیل: کوڕەکەی حەزرەتی ئادەم کە هابیلی برای خۆی کوشت. ئەشقیا: پیاو خراپ. شیس [«شیث»]: کوڕێکی حەزرەتی ئادەمە، خوا کردی بە پێغەمبەر و ناردی بۆسەر براو برازاکانی.

واتە: دڵی بنیادەم لە داخانا لەت دەبێ کەوا پیاوێکی چاکی وەك حەزرەتی ئادەم دوو کوڕی دەبێ یەکێکیان ڕێگای خراپە و ئەویان ڕێگای چاکە دەگرێ وەك قابیلی پیاوکوژ و شیسی پێغەمبەر بن، کە دەبوو مادەم هەردوو کوڕی ئەو باوکەن هەردوو ڕێگای چاکە بگرنە بەر...

(٥) قەهر: قین.

واتە: خوایە! مەحوی لەتاو قار و قینی تۆ پەنا دەباتە بەر لوتفی خۆت، ئەی فریادڕەس من پەنا بە خۆت دەگرم لە خۆت...

-١-

بەس بکە، ئەی ئەشکی خوێنینم، بە غەممازی تەلاش
رازی عیشق و دەردی دڵ خۆ هەرچی بوو کردووتە فاش (١)

روومەتی ئازاری گەییێ من کە روانیمێ، وتی:
من قسەم گەر دڵخەراشە، تۆ نیگاهت جانخەراش (٢)

شەرتی کرد ئیتر لە کوشتن بەس بکا، یارەب بکەی
ئەو وەفا بەم شەرتە کا، ئەمما لە قەتڵی من بە پاش (٣)

دڵ بژێوی هەر بە دەرد و داغە، تەزییدی دەوێ
قەت مەکە مەنعی، دوعاگۆ سەعیە بۆ «ضَمّ»ی مەعاش (٤)

---

-١-

(١)غەممازی: غەمزەکەرانە. فاش: ئاشکرا.

مەبەستی لەوەیە ئەوەندە فرمێسکی رشتووە، هەرچی رازی دڵو دەردی عیشقی هەیە هەمووی لای خەڵك دەرکەوتووە، تازە ئیتر هیچ نەماوە بیشارێتەوە.

(٢)خەراش: رووکێن، جێگای نینۆکی تیژ، یا هەرشتێکی تر کە نووکێکی تیژی هەبێ.

واتە: کە سەیری یارم کرد، بە تەئسیری روانینەکەم روومەتی ئازاری پێ گەیشت. ئەویش وتی: بۆ گلەییم لێ دەکەی کە قسەم دڵت بریندار دەکا، خۆ تۆ خۆت تەماشات گیانی مرۆڤ بریندار دەکا...

(٣)بەس بکا: دەست هەڵبگرێ.

واتە: خوا بکا یار لە پێشاندا من بکوژێ، ئەوسا تۆبە بکا لە دڵدار کوشتن.

(٤) بژێوی: گوزەران، ئەوەی بنیادەم پێی بژی. تەزیید: زیادکردن. دوعاگۆ: ئەوەی دوعای خێر بۆ خۆی و بۆ خەڵك دەکاو لە خوا دەپاڕێتەوە. سەع: سەعی، هەوڵ. «ضَمّ»: زیادکردن و خستنە پاڵ. مەعاش: مایەی گوزەران.

واتە: دڵ گوزەرانی هەر بە دەرد و داغە و هەمیشە هەر زیاتری دەوێ و لە خوا دەپاڕێتەوە کە یار دەرد و داغی زیاتری بداتێ... لۆمەی دڵ مەکەن کە ئەمە حاڵیەتی، چونکە وەك ئەو کەسانە وایە کە هەمیشە لە خوا دەپاڕێنەوە خوا رۆزییان بداتێ و ژیانیان بۆ دابین بکا.

سینە سەد لەت بوو، سەرم سەد داغی سەودا پێوە، چووم
عەرزی حاڵم کەم، بە ئیستیهزاوە دەیوت: چاك و باش[٥]

سەنگسارە زاهیری عاشق، دەروونی لالەزار
سوورەتی مەعشووقە گوڵزارە، جیبیللەت بەرد و تاش[٦]

دەرکی سەعبە، دەم مەدە «مەحوی» لە ئەسراری دەمی
چونکە بۆ «لاشَیْء»ە، هەر سەعیەك بکا دەڕوا بەلاش[٧]

-٢-

لە کن من ئەسڵی نیە و نەبووە عەیشی تەنها خۆش
نیە بەهەشتی خودا هەم بەبێ ئەحیببا خۆش[١]

(٥) سەد لەت: سەد پارچە. سەودا: خەیاڵ، شێتی. ئیستیهزا: گاڵتە پێ کردن.

(٦) سەنگسار: بەردەلان. لالەزار: گوڵزار. جیبیللەت: سروشتی دروستبوو.

واتە: دڵدار و یار بەپێچەوانەی یەکەوەن. دڵدار دەرەوە و دیمەنی بووە بە بەردەلان، چونکە هەرچەند بە دەوروبەری ماڵی یاردا دەسووڕێتەوە بەردەباران دەکرێ. یاریش دیمەنەکەی وەك گوڵزار جوانە، بەڵام دەروونی بەرابەر بە دڵدار ئەوەندە رەقە دەڵێی بەرد و تاشە.

(٧) دەرك: لێ حاڵی بوون. سەعب [«صَعب»]: زەحمەت.

واتە: مەحویا! دەم مەدە لە باسی راز و نهێنییەکانی دەم و لێوی یار، چونکە لە ناسکیدا وەك نەبوو وایە. هەرکەسێکیش باسی شتی نەبوو بکا رەنجی خۆی بەتاڵان دەدا.

-٢-

(١) عەیش: ژیان. ئەحیببا «اَحِبّا»: جەمعی «حَبیب»ە بەمەعنا دۆست.

واتە: لای من وایە درۆیە، ژیانی بە تەنیا هەرگیز خۆش نەبووە و نابێ. تەنانەت بەهەشتی ماڵی خوایش ئەگەر بنیادەم بەتەنیا تیا بژی خۆشی تیا دەسگیر نابێ.

«من ئەسڵی» لەبەر راگرتنی سەنگی بەیتەکە بە «منەسڵی» دەخوێنرێتەوە.

**لە خۆم و لەو کەسە خۆشم دەوێت و خۆشی دەوێم**
**خودایە خۆش ببیو، تۆ ببی خودایا، خۆش[٢]**

**لە زولفیا ونە روو، لێوی هەر لە کارایە**
**ئەو ئافتابە گەر ئاوا بووە، مەسیحا خۆش[٣]**

**کەسێکی هەرزە بە مەجنوونی وت: خەلیفەکە مرد**
**وتی: بە من چی، ئەتۆ بمرە، چاوی لەیلا خۆش![٤]**

**بەلایەکە، چ بەلا؟ خوبسی باتینی هەمدەم**
**بە بێنی دەمیە دەکا وەقتی عەیشی من ناخۆش[٥]**

**لە حینی بوونی رەقیبا وتم: کە حەیفە جنێو**
**وتی: چ حەیفە، دڵی ئەو سەگەش ببێ با خۆش[٦]**

---

(٢) مەبەستی لەوەیە کەوا ئەگەر خوا لە هەردوکیان خۆش بوو، بۆ خۆیان پێکەوە دەژین لە بەهەشتدا.

(٣) ئافتاب: خۆر، مەبەست لە حەزرەتی عیسایە. مەسیحا: عیسا، مەبەست لێوی یارە کە هەناسەیەکی لێ دەردەچێ وەك ئەو هەناسەیەی لە دەمی حەزرەتی عیسا دەردەچوو و مردووی پێ زیندوو دەبووەوە.

(٤) مەبەستی لەوەیە هەرکەس لە دەلاقەی سوودی تایبەتی خۆی و باری سەرنجی خۆیەوە سەیری دنیا دەکا.

(٥) خوبسی باتین [«خُبث باطِن»]: پیسی ناوەوە.

وادیارە مەحوی لەم بەیتەدا باسی کەسێك دەکا کە ناچار بووە لەگەڵیدا بژی و کابرایش سەرەڕای بۆگەنی دەم، دەروونیشی پیس و چەپەڵ بووە.

بێنی (ن): بۆنی.

(٦) حین: کات.

واتە: بە یارم وت: کاتێ کە بەدکار دیار بێ جنێوم مەدەرێ با ئەوگوێی لێ نەبێ، ئەویش لە وەڵامدا وتی: حەیفت نەکرد! ئەی نابێ تۆزێ دڵی ئەو سەگەش خۆش بکەم.

چ حەیفە (ن): مەڕەنجە. مەڕەنجە: مەڕەنجێ، زویر مەبە.

له تۆش و بولبول و دێوانه مـوژده بـێ «مـهحوی»!
بههاره شێته کهکردوویه بـاغ و سـهحرا خـۆش(٧)

(٧) واته: مهحویا موژدهبێ له تۆیش و له بولبولی گوڵپهرست و له شێتیش کهوا بههاره شێته دهشت و دهری بهگوڵ سوورکردهوه و رازاندیهوه.

بۆیه بههار به شێت ناوبراوه، چونکه تاوێ خۆشه و تاوێ دایدهکاته باران. بۆیهش موژده دراوه به شێت، چونکه مهشهووره شێت به دیمهنی جوان و رازاوه و سوور دڵی زۆر شادمان دهبێ.

# تیپی «ضاد»*

---

(*) [پێویستە خوێنەران ئاگادار بکرێن کە پیتی «ض» لە رێنووسی کوردیدا نیە. بەڵام ئەوەی کە لێرەدا نووسراوەتەوە و بە پیتێك دانراوە لەناو هۆنراوەکانی ئەم شاعیرەدا، ئەوەیە کە وشـەی ئاخری ئەم شیعرانە هەموویان عەرەبین و وشەی کوردی نین و گۆڕان و نووسینیان بە رێزمانی کوردی لە مانا سەرەکییەکەی خۆیان دەردەچن و مانای هۆنراوەکانیش تێك ئەدەن، بەم بۆنەوە پیتی «ض»مان لە شوێنی خۆیدا هێشتەوە و نەمانگوێزایەوە بۆ پیتی «ز» و وشەکانیشمان هەر بە عەرەبی لەناو دوو کەواندا نووسینەوە و لە کوردییەکە جیامان کردنەوە؛ هەروەك لە کتێب و دیوانی شاعیرەکانی تردا ئەم ئیشەمان بە چاك زانیوە. (بڵاوکردنەوەی کوردستان)].

-١-

واعیز لە رەندی مەیکەدە دەگرێ کە «اعتراض»
رازی نیە بە سەرنوێشتی ئەزەل «إنّنِي لَراض»[١]

بە و تاعەتە کە بۆ ئەم و ئەویە، بەهەشتی ویست
زاهید ئومێدەوارە بە ئەجری ریا «رِیاض»[٢]

تاکی رواوی خاکی چ مەینەتزەدە بووە
پشکووتووە لە بەزمی مەی ئەمشەو هەر «إنقِباض»؟![٣]

---

-١-

(١) رەند. سەرخۆش. ئیعتیراز: رەخنە. سەرنویشت: چارەنووس. ئەزەل: ئەوەی کە سەرەتای نەبێ، کۆن.

واتە: هەرچی بکەین دیارە خوا لە ئەزەلدا لە چارەمانی نووسیوە. کەواتە ئەگەر ئامۆژگاریکەر رەخنە لە سەرخۆشانی مەیکەدە بگرێ کە بۆچی مەی دەخۆنەوە و سەرخۆش دەبن، ئەوە مەعنای وایە رازی نیە بەوەی خوا لە ئەزەلدا لە چارەی نووسیون... کەواتە بڵێین کاممان خواپەرستترین، ئێمەی مەی خۆر و سەرخۆش، یان ئامۆژگاریکەری ناڕازی بەوەی خوا لە ئەزەلدا لە چارەی ئادەمی نووسیوە؟!

(٢) ئەجر: پاداش. «ریاض»: باخچەی بەهەشت.

واتە: زاهید بە تەمایە بەو خواپەرستییەی کە بۆ خوای نەکردووە و بۆ رووپامالّی لای ئەم و ئەوی کردووە بەهەشتی دەستگیر بێ و بەرابەر بەو ریاکارییەی کە کردوویە و لە بازاڕی خوادا وەك پارەی قەڵب وایە باخچەی بەهەشتی دەسکەوێ.

لە نێوان «ریا» و «ریاض»دا جیناسی ناقیس هەیە.

(٣) تاك: دار مێو. مەینەتزەدە: تووشی مەینەت هاتوو. «اِنقِباض»: پەستی و دڵتەنگی.

واتە: دار مێوی شەرابی بەزمی ئەمشەومان، دەبێ لە خاکی چ دەردەدار و کەساسێکدا روابێ، وا هەر پەستی دامان دەگرێ!.

خاکی (ن): ئاوی.

ئــەم شـــان و شــەوكەتەی لە پــەناهی مــنایە غــەم
وا مــن دەڕۆم و دەوڵەتــی غــەم دێتــە «إنـقِراض»[٤]

وەك داغـــی غـــەم نــیە، ســپیە داغــی ئــینتیزار
چــاوم بــبینە، چــاوە! کــە مــوتبیقیەتی «بَـیاض»[٥]

نــەقشی خــودا بــبینە، لە خــەڵقــی خــودا گــەڕێ
گەر ئەهلی ئیحتیرازی، لە کەس مەگــرە «إعـتِراض»[٦]

---

(٤) «اِنقِراض»: دوایی هاتن و بڕانەوە.

واتە: دەوڵەتی خەم لە سایەی منەوە پەرەی سەندووە و بووە بە خاوەنی شان و شکۆ. وا من دەمرم، ئیتر ئەویش دەڕووخێ.

(٥) موتبیق: سەرانسەر داگیرکەر. «بَیاض»: سپێتی.

واتە: داخی چاوەڕوانی کردنی یار وەك داخی خەفەت نیە، داخی خەفەت رووی بنیادەم زەرد دەکا، بەڵام هی چاوەڕوانی کردنی یار چاوی سپی، واتە کوێر دەکا. چاوەکەم، تەماشای چاوم ناکەی چۆن سەرانسەری سپی هەڵگەڕاوە! لە کوردیدا مەشهوورە دەگوترێ: چاوی چاوەڕوانیم سپی بوو.

(٦) ئیحتیراز: خۆپاراستن.

واتە: کە چاوت بەو جوانانە دەکەوێ کە دڵی دڵدار رادەکێشن، بیر لە خۆیان مەکەرەوە و ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت کە خوا چی دروست کردو... ئەگەر لە خواترسی راستەقینەشی واز ئەو خەڵکانە بێنە کە دڵیان لەو جوانانە چووە و رەخنەی ئەوەیان لێ مەگرە بۆچی واگرفتاری ئەو نازدارانە بوون.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ فەرموودەی خواکە دەفەرموێت: ﴿اَلَّذِینَ یَذْکُرُونَ اللّٰهَ قِیاماً وَ قُعُوداً وَ عَلیٰ جُنُوبِهِمْ وَ یَتَفَکَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمٰوٰاتِ وَالْأَرْضِ...﴾ واتە: ئەوانەی بە پێوە و بە دانیشتنەوە و لەسەرلا ناوی خودا دێنن و بیر لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە. نیوەی دووهەمیشی ئیشارەتە بۆ ئەو فەرموودە مەشهوورە کە دەڵێ: «عَجِبتُ لِمَنِ اشْتَغَلَ بِعِیوبِ النّاسِ وَ هُوَ غافِلٌ عَنْ عُیُوبِهِ» واتە: سەرم لەو کەسە سڕ ماوە کە هەر باسی ناتەواوی خەڵك دەکاو بیر لە ناتەواوی خۆی ناکاتەوە.

**«مەحوی» حەزەر لە چاوی نەخۆشی ئەو ئاهووە**
**«كَمْ صَادَتِ الْأَسْوَدَ بِأَلْحَاظِهَا الْمِرَاض»**(٧)

---

(٧) واتە: مەحویا! خۆت لە چاوی بیماری ئەو یارە بپارێزە کە دەڵێی ئاسکە، چونکە گەلێ شێری بە تیری چاوی داوە بە ئەرزداو نێچیری کردوون.

-١-

شەتێ ئاوی کە زاهید بۆ وزوویەك کردووە زایع
فەقیرە، هەر بە بایەك ئەو هەموو رەنجەی چووە زایع [١]

میسالی وایە بەحرێ گەوهەری دابێ بە خەرموهرێك
لەبۆ دنیا ئەوی عومری عەزیزی کردووە زایع [٢]

هەتا تۆ چوویە گوڵشەن، گوڵ بە بێنی میسکی زوڵفت کەوت
کەوا ئەو رەنگە خۆشەی سیس و هەم بێنی بووە زایع [٣]

نەکەوتە دام و رامی کەس نەبوو وەحشی نیگاری من
جیهانێ سەعی و کۆشش چوو لە رێی ئەم ئاهووە زایع [٤]

---

(١) وزوو [«وضو»]: دەستنوێژ.

واتە: زاهیدی بەدبەخت ئەوەندە وەسواسە تا دەستنوێژێك دەگرێ ئاوی زێیەك دەبڕێتەوە، کەچی لەپاشا بە بایەك کە لێی دەبێتەوە، ئەو هەموو رەنجەی بە با دەچێ... مەبەستی ئەوەیە بڵێ کەسانی وا هەمیشە خەریکی کاری بێبەرهەمن.

(٢) خەرموهرە: موورووە کەرانە.

بەیتەکە بکرێ بە پەخشان وای لێ دێتەوە: ئەوەی عومری عەزیزی خۆی بۆ دنیا لە کیس بدا، لەوە دەچێ پڕی دەریایەك گەوهەری دابێ بە تاقە موورووە کەرانەیەك...

(٣) واتە: هەر کە تۆ چوویتە باخچەی گوڵان، گوڵ بە تەئسیری بۆنی خۆشی زوڵفت کەوت و نەخۆش کەوت، رەنگیشی کاڵ بووەوە و سیس بوو و بۆنە خۆشەکەشی نەما، وەك منداڵ کە بۆنێکی خۆش بدەن بە لووتیا نەخۆش دەکەوێ و دەڵێن بە بۆن کەوتووە.

بێن (ن): بۆن.

(٤) دام: داو. رام: دەسەمۆ. ئاهوو: ئاسك.

واتە: یاری وەك وێنە جوانیماڵی نەبووی من، ئەوەندە سڵە ناکەوێتە داوی کەس و بۆ کەس کەوی نابێ... پڕی دنیایەك هەوڵ و تەقەلا لە پێناوی ئەم ئاسکە دەسەمۆ نەکراوەدا بە فیڕۆ چووە.

خەتی دا روومەتی تۆ، موو لە چاوی عاشقانت هات
نەماوە چاوەکەم، چاوێ نەبووبێ بەم مووە زایع [٥]

«مُؤَذِّن» بەزمی شەو وەك مورغی بێ وادە دەشێوێنێ
هەموو وەختی لە ئێمە کردووە بەم قوو قووە زایع [٦]

لەبۆ ئەربابی دنیا قەت مەدە بەست و بەیانی عیشق
کە «مەحوی» شەرحی نوکتەی جانفزا بۆ مردووە زایع [٧]

-۲-

کەلامێکە لە حیکمەت کەیل و جامیع:
عەتا کەر هەر یەکە، هەر ئەوشە مانیع [١]

---

(٥) موو لە چاو هاتن: یەکێکە لەو نەخۆشییانەی تووشی چاو دێن.

واتە: کە روومەتی تۆ خەتی داو مووی لێ هات، دڵدارەکانت ئەوەندەیان پێ ناخۆش بوو و ئەوەندە لە تاوا گریان، موو لە چاویان هات. ئازیزا ئێستا چاوێك نەماوە بەهۆی ئەم مووەوە کە لە رووی تۆ دەرهاتووە، مووی لێ نەهاتبێ و خراپ نەبووبێ.

لە کۆ کردنەوەی ئەم هەموو وشەی «چاو» و «موو»ەدا لەم بەیتەدا وشە ئارایییەکی جوان هەیە.

(٦) «مؤذّن»، [موئەززین]: بانگدەر. مورغی بێ وادە: کەڵەشێری ناوەخت. قووقوو: خوێندنی کەڵەشێر.

(٧) بەست: لێکدانەوە. جانفزا: گیان ژیێنەوە.

مەبەستی لەوەیە ئەهلی دنیا وەك مردوو وان و بۆ ئەوە ناشێن باسی بابەتێکی بایەخداری وەك خۆشەویستی و دڵدارییان لا بکرێ.

-۲-

(١) کەیل: پڕ. ئەوشە: ئەویشە.

واتە: ئەمە کە لە حەدیسی پێغەمبەردا (د.خ) باسی خوا واکراوە، کەوا: ﴿لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَ لاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ﴾ بەمەعنا: کەس ناتوانێ ئەوە ببڕێ کە خوا داویە و ناتوانێ ئەوە بداکە ئەو

ئـەمەت زانـی، لە کـەس بـاکت نـەما تـۆ
زەرەردەر هەر ئەوە، هەر ئـەوشە دافـیع [۲]

گەدا شەه، چـونکە «لا یُـفنیٰ»یـە کـەنزی
شـــەهەنشاهی هـــەموو دنـــیایە قـانیع [۳]

شـــوکر روو زەردی عـــیشقم، نـووسراوە
لەســـەر رووم ئـایەتی «صَـفْراءُ فـاقِعْ» [٤]

لە قـــاپی عـــیشقەدا وەك شـــاهە بـــەندە
لەسەر خـوانـە چ مـەتبووع و چ تـابیع [٥]



بریوبە. قسەیەکە پڕە لە ڕاستی و هەموو ڕاستییەکی تێدایە.

وشەکانی «جامیع» و «مانیع» سەرەڕای مـەعنایان وەك دوو وشـە، ئیشارەتیشن بـۆ ئـەو ڕاستییە مەنتیقییە کە دەڵێ: تەعریف دەبێ جامیع و مانیع بێ، واتە: هەموو تاکەکانی تەعریف کراوەکە لە چوارچێوەی خۆیدا کۆکاتەوە و هەموو بێگانەیەك بکاتە دەرەوە.

(۲) واتە: کە ئەوەت زانی زیان گەیێن هەر خوایە و زیان لادەریش هەر خۆیەتی، تـرست لە هیچ نامێنێ.

(۳) واتە: گەدا پادشایە، چونکە گەنجینەیەکی هەیە هەرگیز نابڕێتەوە کە گەنجینەی قەناعەتە؛ وەك لە حـەدیسی پێغـەمبەردا (د.خ) هـەیە کـەوا: «اَلْـقَنَاعَةُ كَـنْزٌ لَا یُـفْنیٰ» واتـە: قـەناعەت گەنجینەیەکە هەرگیز نابڕێتەوە.

(٤) ئـایەتی: ﴿...صَـــفْرَاءُ فَـاقِعٌ لَـوْنُهَا تَسُـرُّ النَّـاظِرِینَ﴾ واتـە: زەردێکـی ڕەنگ کـاڵە دڵی تەماشاکەران خۆش دەکا؛ ئایەتێکە باسی ئەو مانگایە دەکاکە دەبوو ئیسرائیلییەکان سەری بڕن و بیکەن بە خێر و هەمیشە بە بیانووی ئەوەوە کە نازانن مانگایەکی چۆنـە، هـەر خـۆیـان لە مـەسەلەکـە دەدزیـەوە. وە نـەبێ مـەحوی لەم بـەیتەدا تێکـڕای مـەعنای ئـایەتەکـە و سەرگوزەشتەکەی مەبەست بێ. کاری تەنها بە گەیاندنی مەعنای زەردی ڕوو هەیە.

(٥) مەتبووع: ئەوەی خەڵك شوێنی بکەون. تابیع: ئەوەی شوێنی خەڵك بکەوێ. مەبەست لە ئاغە و نۆکەرە.

ئوسوولی دینی عیشقە سووتن و بەس
پەڕی پەروانەمە «جَمعُ الجَوامِع»(٦)

لوغاتی ئێمە ناڵە و ئاهە، قەتعەن
لوغەی وا ناگرێ «بورهانی قاتیع»(٧)

کە تۆ دەرکەوتی ناڵە و گریە جۆشا
نیە ئەم جیلوە غەیری بەرقی لامیع(٨)

زەلیلی حەسرەتم، مەحزوونی خەجڵەت
کە بۆ عومری عەزیزم دا بە زایع!(٩)

---



واتە: لە جیهانی خۆشەویستیدا گەورە و بچووك و ئاغە و نۆکەر نیە، هەرچی لەسەر خوانی عیشق جێی بووەوە وەك ئەوانی تر وایە.

(٦) «جَمعُ الجَوامِع»: کتێبێکە لە بابەتی ئوسوولی دیندا، «ابن السُّبکی» دایناوە و «جَلال الدّین المحلی» شەرحی لەسەر کردووە. یەکێك بوو لەو دوا کتێبانەی فەقێکانی کوردستان دەیانخوێندن.

واتە: ئوسووڵی ئایینی دڵداری تەنها ئەوەتە دڵدار بە دەوری یاردا بسووتێ. منیش یەکێکم لە پەیڕەوانی ئایینی دڵداری و «جمع الجوامع»ی دەستم، واتە کتێبی ئوسووڵی ئایینم، پەڕی پەروانە ئاسامە کە بە دەوری مۆمی یاردا دەسووتێ.

(٧) بورهانی قاتیع، [«برهان قاطع»]: فەرهەنگێکی فارسییە، موحەممەد حوسەینی کوڕی خەلەفی تەبریزی دایناوە کە لەقەبی «بورهان» بووە.

واتە: ئێمە کە دەستەی دڵدارانین، لەبەر ئەوە کە بەشمان هەر دەرد و مەینەتە بە زمانی ئاهو ناڵە قسە دەکەین کە هەمووکەس تێی ناگاو تەنانەت لە فەرهەنگیشدا وشەکانی نادۆزرێنەوە.

(٨) واتە: دەرکەوتنی تۆ وەك دەرکەوتنی هەورە بروسکەی ئاسمانە. وەك چۆن کە ئەو دەرکەوت ناڵە ناڵ لە ئاسمانەوە پەیدا دەبێ و باران دەست دەکا بە بارین، کە تۆش دەرکەوتی ئێمە ناڵە ناڵمان پێ دەکەوێ و فرمێسکی چاومان بە خوڕ دەست دەکا بە هاتنە خوار.

ئەم (ن): ئەو.

(٩) حەسرەت: داخ و هەناسە هەڵکێشانی پەشیمانی. خەجڵەت: خەجاڵەتی و روو زەردی.

بـــــەیانی واقـــیعم کـــەم، کـــێیـــە بـــبیێ
کە سامیع زوو دەکا سەددی مەسامیع[١٠]

دەزانم چـیم و «مـەحوی» چـم لە پـێشـە
مەگەر ئەو حەزرەتەم بۆ بێ بە سـامیع[١١]

کە ئیشی ئوممەتی بێ حـەشر و نـەشری
لە حەشرا هەر بەوە، بەو رەفع و راجیع[١٢]

لەسەر ئەو بێ لەسـەر ئـال و سـەحابەی
ســەڵاواتـی پـەیاپەی، بـێ مـەوانـیع[١٣]

---

☞

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:

کە ئەم عومری عەزیزەم دا بە زایع

(١٠) واتە: دەرد و مەینەتێکی ئەوەندە سەختم بەسەردا هاتووە، بۆ هەرکەسی دەگێڕمـەوە، گوێی خۆیم لێ دەئاخنێ. جا مادەم گوێگر گوێی خۆیم لێ کەڕ بکا، ئیتر باسی حاڵی خۆم بۆ کێ بکەم؟.

(١١) چم: چیم.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە مەعنای بەیتی داهاتووەوە.

(١٢) رەفع: لابردن و هەڵگرتن.

واتە: خۆم زۆر چاك دەناسم و دەزانم چ لێپرسینەوەیەکم لە پێشە. هیچ چار و رزگارییەکم نیە مەگەر ئەو پێغەمبەرە بە فریامەوە بێت و گوێ بۆ هاوارم شل بکا کە ئیش و کاری ئوممەتی گوناهباری بۆ حەشر و نەشر نەشیاوی دراوەتە دەستی و هەر ئـەو دەتـوانـێ سـزا لە کـۆڵی ئادەمیزاد لاداو هەموو شتێ دەچێتەوە لای ئەو.

(١٣) بێ مەوانیع: بێ ئەوەی هیچ شتێ ببێ بەهۆی بڕانەوەی.

-١-

دۆزەخ لە عیشقە خاڵیو جەنەت لە دەردو داغ
عاشق لە حەشریشا نیەتی جێ دڵێ فەراغ (١)

گەر عازیمی زیارەتی کەعبەی مەحەبەتی
ڕێ: چاکی دڵ، عەلامەتی ڕێ: داغ و شوێنی داغ (٢)

عیشق ئاگرێکە بەربووە هەرکەس، دەبێ بە کەس
گەر ڕۆژە ڕەش وەکوو شەوە بێ، بوو بە شەوچراغ (٣)

دەستم دەوێ سواوی ئەسەف، دیدە کەیلی ئەشك
یا ڕەب بە دوشمنیشی نەدەی دەست و چاوی ساغ (٤)

---

-١-

(١) واتە: عاشق لەو دنیایش جێگە دڵێکی بە چۆڵی و خاڵییەتی دەسگیر نابێ دڵی خۆی تیا بحەسێنێتەوە، چونکە ئەگەر دەچێتە دۆزەخ، دۆزەخ دڵداری تیا نیە و ئەمیش بە دڵداری دەژی. ئەگەر دەشچێتە بەهەشت، بەهەشت بۆ ئەو ناشێ، چونکە دەرد و داخی تیا نیە و کاری دڵداریش بە دەرد و داخەوە بەندە.

(٢) عازیم: ئەوەی نیازی شتێکی هەبێ. چاك: درز.

واتە: ئەگەر نیازی زیارەتی کەعبەی خۆشەویستیت هەیە، بزانە ڕێگاکەی بەناو درزی دڵی لەت کراودا دەڕواو نیشانەی ڕێگاش بریتیە لەو داخانەی نراون بە دڵەوە.

(٣) واتە: عیشق ئاگرێکی وایە بەربووە گیانی هەرکەسێك دەیکا بە پیاوێکی راستەقینە. تەنانەت ئەگەر ڕۆژە ڕەشی عاشق وەك تاریکە شەویش بێ وا ڕۆشنی دەکاتەوە وەك گەوهەری شەوچراغی تێدا دانرابێ.

(٤) واتە: من دەستێکم دەوێ ئەوندە لەداخا درابێ بەیەکدا، سوابێ. چاوێکم دەوێ ئەوەندە لە خەفەتدا گریابێ پڕ بووبێ لە فرمێسك. دەست و چاوی ساغ نیشانەی ئەوەن کە دڵی خاوەنیان عیشقی تێدا نیە، خوا شتی وا بە دوژمنیش نەدا. ئەم دوعایە لە راستیدا دوعای خێرە بۆ دوژمنیش، چونکە دەستی سواو و چاوی پڕ لە گریان نیشانەی پاشگەز بوونەوەن لە خراپە و پاشگەز بوونەوەش لە خراپە نیشانەی ئاخر خێرییە. کەواتە وا شاعیر بۆ دوژمنیش چاکەی ویست.

دەستی حـەنا نـیگارو، مـژە و چـاوی سـورمەدار
بۆ غـەیری خـان و خـانمەفەندی نـیە مـوساغ(٥)

هەر کـۆششـە بـەکـارە، ئـەگـەر چـووبیە فـەناش
دڵ بوو بە گەرد و عالەمی دامـەن دەکـا سـوراغ(٦)

هــەر ئــاهی عـاشقە دەمـی پـێ بـێتـە پـێکـەنین
ئـەم غـونچە بـەو نـەسیمەیە بـیپشکوێ دەمـاغ(٧)

جــــۆیــارە، لالەزارە، هــەتا چـاوی بــڕ دەکـا
«مەحوی» بەهەشتی بۆ چیە، چ بکا لە ئاو و باغ؟!(٨)

---

(٥) حەنا نیگار: بە خەنە رەنگ کراو. خانمەفەندی: خانم ئەفەندی، ژنی ئەفەندی، یـا ژنـی خۆ بە پیاو کردوو روو هەڵمراو. موساغ: دروست، شیاو.

واتە: من دەستی سواوی دەرد و مەینەت و چاوی پڕ لە گـریانم دەوێ، چـونکە دەسـتی ناسك و نازداری بە خەنە سوورکراوو چاوی بە کلە رێژراو هەر بۆ خان و ئاغە و ژنە ئەفەندی دەست دەدا. پیاوی پیاوانە دەبێ دڵدار بێ و نیشانەی دەردی دڵ بە دەست و چاو و هەموولایەکی لەشیەوە دیار بێ.

(٦) سوراغ: پشکنین. کون.

واتە: هەر رەنجدان سوودی هەیە، چونکە مرۆی رەنجدەر ئەگەر بشفەوتێ و دڵی ببێ بە تۆز، تۆزەکەی دەچێ بە ئاسماناو بە دوای جیهانی خوارەوەدا یـا بـە دوای داوێـنـی یـارانـدا دەگەڕێ، یا داوێنەی دۆستان کون دەکا.

(٧) واتە: هەر هەناسەی ساردی عاشقانە بۆ ئەوە بشێ دەمی یاری پێ بێتە پێکەنین. چونکە دەبێ خونچەی دەمی یار بە نەسیمی هەناسەی عاشقان دەماخی بپشکوێ.

(٨) واتە: مەحوی کە سەیر دەکاو دەڕوانێ تا چاوی بڕ دەکا جۆگەلەی فرمێسك و گوڵزاری خوێنی جگەری خۆی دەبینێ، ئیتر چی بکا لە بەهەشت و ئاو باخی بۆ چیە؟ دیارە نایەوێ و پێویستی پێی نیە.

-١-

لا لغاوەی واعیز ئەمڕۆ مەوج ئەدا، دەم پڕ لە کەف
ریشی قیروسیا، کتێبی وەعزەکەی بوو بەرتەرەف(١)

زاهید و سۆفی بە شەڕ هاتن لەسەر تەزویر و شەید
خێری رەندانە خودا کا بەرتەرەف بێ هەر تەرەف(٢)

وەرنە سەیری سەر خۆشان! ئەو شۆخی مینا گەردنە
بوو بە ساقی، دەم بە شەککەر خەندە دێ، مینا بە کەف(٣)

دەمدەمەی ئەم حەشرە هەستان ئەم دەمە، یارەب چبوو
لێوی نەی ژەن گەییە نەی، دەف زەن کە پەنجەی گەییە دەف!(٤)

-١-

(١) بەرتەرەف: فەوتاو و کەڵك پێوە نەماوە.

واتە: واعیز ئەوەندە چەنەی داوە دەمی پڕ بووە لە تف و کەفی دەریای دەمی لە لالغاوەیەوە شەپۆل دەدا. چش لە ریشی کە کەفی پێدا دێتە خوار، خەمی کتێبەکەی بەردەستیمە ئەوەندە پرژی کەفی لێ کەوتووە کەڵکی هیچی پێوە نەماوە.

(٢) تەزویر: ساختەکاری. شەید: فێڵبازی. رەند: ئەوەی خۆی بە هیچەوە نەبەستبێتەوە. لێرەدا مەبەست لە کەسانی دڵداری دەست و دڵ پاکە.

واتە: زاهید و سۆفی لەسەر ساختەچییەتی و فرو فێڵی خۆیان بوو بە شەڕیان. شەڕێ بێ و خێری ئێمەی تێدا بێ کە دەستەی دڵدارانین، خوا بکا هەردوولایان بە فەتەرات بچن.

(٣) مینا گەردن: گەردن وەك بلوور سپی. شەککەر خەندە: پێکەنینی وەك شەکر شیرین. مینا: پیاڵەی شەراب. کەف: دەست.

واتە: وا یاری شۆخی گەردن وەك بلوور سپی بوو بە مەیگێڕ و دەم بە پێکەنینی شیرینەوە و پیاڵەی مەی بەدەستەوە هاتە کۆڕی دڵداران. خەڵکینە! وەرن سەیر کەن، مادەم یار مەیگێڕ بێ و بەم جۆرە مەی بەسەر دڵداراندا بگێڕێ، دەبێ سەرخۆشەکانی شەرابی دەستی چییان بەسەر بێ!.

(٤) دەمدەمە: هەراو زەناو دەنگە دەنگ.

کەی بـە لەعـل و گـەوهەر ئـەو لێو و ددانـی دا نـیشان؟!
ئەو رەهندەی شاخە، ئەم خۆشارەوەی ژووری سەدەف(٥)

جێ نـیشانەی زامـە لەو روخسـارە، یـا ئـاساری خـەت
یا لە رووی ئاوێنـە لەککـە، یـا لە بـەدرا بـوو کـەلەف!(٦)

مـەنعی نـاکـەم بـۆیە کـرد و کـۆششـی دامـەنیە، دڵ
پێوە نیشێ، حەول ئەدا ئەڵبەتە هەرکەس بـۆ شـەرەف(٧)

دڵ چووە وادی مەحەبیەت، هەرچی دی هەر کوشتە یا...
نـیوە کـوژراوە، لەسـەر لێو ئـاه و نـاڵەی «وٰا أسَـفْ»(٨)

---



واتە: خوایە! ئەم هەرای بەرپابوونی رۆژی حەشرە چ بوو لەم کاتەدا، کە لێوی شمشاڵ ژەن گەیشتە شمشاڵەکەی و پەنجەی دەف ژەن گەیشتە دەفەکەی!.

(٥) رەهندە: رێ گرتووەبەر، سەرگەردان.

واتە: یار، کەی لێوی ئاڵو ددانی سپی خۆی پیشانی لەعلی ئاڵو گەوهەری سپی داوە، وا لەو کاتەوە لەعل لە تاوا شێت بووە و سەری خۆی هەڵگرتووە و چووە بۆ نـاو شـاخەکـان و گەوهەریش لە شەرمەزاریدا خۆی لەناو سەدەفی دەریادا شاردووەتەوە!. مـەحوی دەیـەوێ بڵێ: بوونی لەعل لەناو کانە بەردی شاخان و بوونی گەوهەر لە بنی دەریادا هی ئەوەیە روویان نایێ خۆیان لە ئاست لێوو ددانی یاردا بنوێنن.

لەعل (ن): لوو لوو: «لُؤ لُؤ».

(٦) بەدر: مانگی چواردە. کەلەف: رەشایی.

واتە: ئەو خەتەی بەسەر رووی یارەوە پەیدا بووە، نازانم جێ نیشانەی زامە، یا نـیشانەی خەتدان و موو دەرهاتنە، یا لەکەی سەر ئاوێنەیە، یا رەشایی ناو مانگی چواردەیە!.

(٧) واتە: لۆمەی دڵی خۆم ناکەم کە تێدەکۆشێ بۆ ئەوەی ببێ بە تۆز و لە داوێنی یار بنیشێ، چونکە هەمووکەس هەوڵ بۆ پایەی بەرز دەدا بۆ خۆیو، پایەی بەرزی دڵیش ئەوەیە ببێ بە تۆز و لە داوێنی یار بنیشێ.

(٨) وادی: شیو، وڵات. «وٰا أسَفْ»: داخەکەم!.



**لاڵە خۆ «مەحوی» لە وەسفی حوسنی بێ‌چــوونی نــیگار**
**لا لە تــەئویلی خــەلەف، قــوربانی تــەئویلی ســەلەف(٩)**

---



واتە: دڵ ڕۆیشتە وڵاتی خۆشەویستی، سەیری کرد هەرچی تێدایە یا کوژراوە یا نیوە کوژراوە و هەر هاواری «داخەکەم... داخەکەم»یەتی و هەناسە بۆ ئەوە هەڵدەکێشێ کەوا بۆچی یار بە تەواوی نەیکوشت.

(٩) بێ‌چوون: بێ‌هاوتا.

واتە: مەحوی لە عاستی باس کردنی جوانی بێ‌هاوتای یاردا لاڵە و هیچی پێ ناوترێ‌و لە دڵی خۆیدا دەڵێ: واز بێنە لە مەعنا لێدانەوەی ئەو جوانییە لەسەر شێوەی زانا پاشینەکان و وەك پێشینەکان مەعنای لێ بدەرەوە.

مەحوی لەم بەیتەدا جوانی یاری داناوە بە وەك یەکێ لە ئایەت و حەدیسە «مُتَشابِه»ەکان کە شتی وا دەدەنە پاڵ خوا کە نابێ بدرێتە پاڵی وەك دەست و پێ‌و چاو و دانیشتن و هەڵسان و ڕۆیشتن و شتی وا. لەم جۆرە شوێنانەدا زانایانی ئایین دوو بەشن. پێشینەکانیان دەڵێن بەڵێ خوا ئەم شتانەی هەیە چونکە خۆی و پێغەمبەر داویانەتە پاڵی. بەڵام چونکە ئەگەر ئەو شتانە بە مەعنا دیارییەکەیان مەعنایان لێ بدەینەوە بۆ خودا ناگونجێن، وایان مەعنا لێ نادەینەوە. بۆیشمان نیە دەسکاری فەرموودەی خواو پێغەمبەر بکەین، لەبەر ئەوە مەسەلەکە حەواڵەی عیلمی خوا خۆی دەکەین. پاشینەکانیشیان دەڵێن ناتوانین ئەم شتانە بدەینە پاڵ خوا چونکە نیشانەی ئادەمیزاد و مەخلووقاتی‌ترن و بۆ خوا دەست نادەن، لەبەر ئەوە تەئویلیان دەکەین و مەعنایەکی وایان لێ دەدەینەوە بگونجێ، دەڵێن: دەست واتە هێز و چاو واتە ئاگاداری و هەروا بەم جۆرە. دیارە لەم دوو رایەشدا رای یەکەمیان لەگەڵ گەورەیی خوا باشتر دەگونجێ، بۆیە مەحویش دەڵێ: مەڵێ جوانی یار وەك جوانی جوانانی‌تر وایە، چونکە ئەوە کەم کردنەوەیە بۆ پایەی، بەڵکوو بڵێ هەر ئەوەندە دەزانم یار جوانە، ئیتر چۆن جوانێکە، ئەوە هەر لە عیلمی خوادایە و مەگەر ئەو هەر خۆی بتوانێ جوانییەکەی لێك بداتەوە.

دەشگونجێ «لا لە تەئویلی....» بە «لا لِتَأْوِیلِ...» بخوێنینەوە، واتە: بە تەئویلی پاشینەکان بڵێ نەء. بەم پێیە رستەکە عەرەبی دەبێ. بەڵام بەپێی مەعنا لێدانەوەی پێشوو جۆرە جیناسێك لە نێوان «لاڵە» و «لا لە»دا پەیدا دەبێ.

-١-

ئەو دەمە ڕۆحم لەسەر لەب بوو لەبەر دەردی فیراق
هات و زوو کردم بە پێ شاباشی، «نِعْمَ الإتِّفاق»(١)

بێمە کوێ؟ دڵبەر وتی: گەر چاوە، تۆفانێکی ئەشك
دڵ، تەنووری ئاگری عیشق و خرۆشی ئیشتیاق(٢)

ئەو دوو ئەبرۆیە کە پەیوەستە بە جووتە، وەك هوما
سایەبانی چاوی بیمارن، لە عـالەم بـوونە تـاق(٣)

مەحشەرێ هەستاکە هەستا ڕۆیی، ڕۆیی دوو بە دووی
«اَلوِداع»ێکــی ئــەوا نـاڵەی هـەزاران «اَلفِـراق»(٤)

هەر شوانێ کەی دەبێتـە هـەمقەرینی شـاهی مـن؟
سواری کەر نابێ ببێتە هەمتەکی سواری بـوراق(٥)

---

-١-

(١) واتە: هەڵکەوتێکی چاك بوو، ئەوکاتە کە گیانم لەبەر دەردی دووری یار هاتبووە سەر لێوم و خەریك بوو دەرچێ، یار هاتە لام و گورج گیانم کرد بە شاباشی بەری پێی و بەقوربانیم کرد و لەوکاتەدا گیانم دەرچوو.

ئەودەمە (ن): ئەو شەوە. پێ شاباشی (ن): پائەندازی.

(٢) واتە: یار وتی: گلەییم لێ دەکەی کەوا نایەمە لات. ئاخر بێمە کـوێ؟ ئـەگـەر دێمـە نـاو چاوەکانت، ئەوەتەن فرمێسك لافاوی تێیاندا کردووە و لەوانەیە بخنکێم. ئەگەر دێیشمە ناو دڵت، دەبینم ئاگری عیشق و خرۆشی ئارەزووی دیدارکردوویە بە تەنوور و لەوانەیە بسووتێم.

(٣) هوما: باڵدارێکە دەڵێن بەسەر هەرکەسێکەوە سێبەر بکا دەبێ بە پادشا. سایەبان: سێبەرکەر.

واتە: ئەو جووتە برۆ پەیوەستانە کە وەك هوما بوون بە سێبەرکەری سەر چاوی بیمار، بوون بە میحراب و ڕووی سوجدە بردنی عالەمیان کردووەتە چاوی یار.

(٤) واتە: کە یار هەستا ڕۆیی، ئەوەندە خەڵك کەوتنە دووی وەك بڵێی ڕۆژی حەشر هەستابێ و، بەدوای ماڵاوایی کردنێکی ئەودا هەزاران کەس هاواری دەردی دووریان لێ هەڵسا.

(٥) هەمقەرین: هاوجووت. هەمتەك: هاوتاك. بوراق: ئـەو وڵاخـەیە کـە پـێغـەمبەر (د.خ) لە

☞

عەیشی ناخۆشە، سەری مەدهۆشە دایم زەڕ پەرست
خاسسە هەر سەفرایە بۆتە موریسی تاڵی مەزاق (٦)

تا لە ماڵی دەرنەکردووی ئەم شەویٚ سەد شوو کەرە
«مەحوی» ئازانە بدە تۆ سیٚبەسیٚ دنیا تەڵاق (٧)

-٢-

ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلووق
لە دەوری نەعشیا سبحەی دەبینی وەلوەلەی مەخلووق (١)

---

ئەوی میعراجدا سواری بووە و پێی چووە بۆ ئاسمان.

«شوان» ئیشارەتە بۆ حەزرەتی مووسا کە حەیوانی لەوەڕاندووە و «سواری کەر»یش ئیشارەتە بۆ حەزرەتی عیسا کە کەرێکی بووە هاتوچۆی پیٚ کردووە. مەبەستی مەحوی ئەوەیە بڵیٚ: نە مووساو نە عیسا ناگەنە پێغەمبەری ئێمە لە پایە بڵندیدا.

(٦) خاسسە: بەتایبەتی. سەفرا: ئاوێکی زەرد ڕەنگە جگەر هەڵیدەهێنێتەوە، تامێکی تاڵی هەیە و هەندیٚ خوێی مەعدەنی تێدایە، دەبیٚ بەهۆی تاڵی تامی دەم. موریس «مورِث»: هۆیٚ پەیدابوون. مەزاق: تامی دەم.

واتە: زەڕپەرست هەمیشە ژیانی ناخۆشە و سەری لیٚ تێك چووە، وەك چۆن کەسێك کە سەفرای بیٚ تامی دەمی هەمیشە تاڵ دەبیٚ تا سەفراکەی هەڵدەهێنێتەوە.

مەحوی لەم بەیتەدا زێڕی شوبهاندووە بە سەفراو زێڕ پەرستی شوبهاندووە بە سەفرادار.

(٧) واتە: دنیا وەك ئافرەتێکی عەیار وایە شەویٚ سەد شوو بکا. کەواتە دەس و برد کە تا لە ماڵی دنیا دەری نەکردووی و کەسێکی تری نەهێناوەتە جێگاکەت و بە کوشتی نەداوی، سیٚبەسیٚ تەلاقی بدە و سیٚ بەردە بخەرە مشتی.

سیٚبەسیٚ (ن): شەش بەشەش.

-٢-

(١) هەلهەلە: قولولوو کێشان لە خۆشییاندا. نەعش: تەرم. وەلوەلە: هاوار و گریان، لە وشەی «وَیل»ەوە وەرگیراوە.

**بە پەل پەل کـردنی سـبحەی ئـەگـەر ببوایـە بـاوەڕیـان**
**دەبوو قەت بەم حەدە نەبوایە بۆ دنیا پەلەی مـەخلووق(٢)**

**دەخاتە فکری ئەهلی مەعریفەت شێوەی جەجاڵ «اَلحَق»**
**دەبینی بەعزە ئەشخاسێ بە دوویا خەرگەلەی مەخلووق(٣)**

**وەها پڕ فـیتنە بـوو عـالەم کـە ئـیبلیسێکـی وەك ئـیبلیس**
**نەماوە مەئمەنی غەیری کلێشە و کەڵکەڵەی مـەخلووق(٤)**

---



واتە: دنیا تا سەر بۆ کەس نامێنێ. ئەوەی ئەمڕۆ پادشایە و خەڵك بەدەوری تەختەکـەیدا قولولووی شادمانی دەکێشن، سبەینێ بە دەوری تەرمەکەیدا شین و زاری دەکەن.

لە هەموو نوسخەکانی بەردەستماندا «هەلهەلە» لە پێش «وەلوەلە»وەیە، بەڵام ئـاشکرایـە ئەوە هەڵەیە و راستەکەی بەم جۆرەیە کە ئێمە نووسیومانەتەوە.

(٢) پەل پەل کردن: پارچە پارچە کردن. دەشگونجێ «پل پل کردن» بێ. سبحەی: سبەینێ.

واتە: ئەگەر ئادەمیزاد باوەڕی بە سزاو تۆڵەی رۆژی قیامەت بوایە، وا بۆ دنیا نەدەکـەوتە هەڵپە هەڵپ.

لە نێوان «پەل پەل» و «پەلە»دا وشە ئاراییەکی جوان هەیە.

(٣) جەجاڵ: دەججاڵ. کابرایەکـە لە دوادوایـی دنـیادا پـەیدا دەبـێ بـە سـواری کـەرێکـەوە دەگەڕێو ئیددیعای خوایەتی دەکاو خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێن. پاشان موحەممەد مەهدی پەیدا دەبێو دەچێتە غەزای و دەیکوژێ. خەرگەلە: گەلەکەر.

واتە: بەڕاستی کە تۆ هەندێ کەسی ناچیز و ناشایستە دەبینی خەڵکێکی زۆری نەفام وەك کەرکەوتوونەتە دوایان، ئەو دیمەنە دیمەنی جەجاڵت دەهێنێتەوە بیر کە لە ئاخر زەماندا پەیدا دەبێو خەڵك گومڕا دەکاو ئەوانیش دەکەونە دوای.

دیارە مەحوی بەم بەیتە پلاری لە یەکێ لەو شێخانە گرتووە کە دەروێش و سـۆفـییەکـی زۆریان هەبووە و دوایان کەوتوون.

(٤) ئیبلیس: شەیتان.

واتە: دنیا بەجۆرێك پڕ بووە لە خراپە، شەیتان بەو هەموو شەیتانی و زۆرزانیەی خۆی کە هەیە، جێگایەك نەماوە خۆی تیادا حەشار بدا، ئەوە نەبێ بچێتە بن کلێشەی خـەڵقـەوە و لە رێگای ئەوانەوە کاری شەیتانانەی خۆی بکا.

**لە پەردەی جیلوەیەکتا روو نمایە شۆری سەد مەحشەر**
**نیقابێ لادە لەو چیهرە، ببینە زەلزەلەی مەخلووق (٥)**

**بە ئاوی تێ گەیشتین ئێمە دنیا، هەر سەرابێ بوو**
**هەموو دەشچن بە خنکان و لە وشکیشە مەلەی مەخلووق (٦)**

**لە سووقی دەهردا دووکانی هەرکەس موددەتی عومرە**
**گوهەر دانە بە پشکڵ دانە «مەحوی»! مامەڵەی مەخلووق (٧)**

---

(٥) روو نما: روو دەرکەوتوو. شۆر: هەرا. نیقاب: پەچە. چیهرە: روو. زەلزەلە: تەکان، وەك بوومەلەرزە.

واتە: دڵدارانت ئەوەندە زۆرن، لە توێی تاقە خۆدەرخستنێکتدا شۆر و هەرای سەد رۆژی مەحشەر بەرپا دەبێ و خۆی دەردەخا. ئەگەر باوەڕ ناکەی پەردەیەك لە رووت لادە و سەیرێکی خەڵك بکە بزانە چ تەکانێکی وەك تەکانی رۆژی قیامەت بەرپا دەکەن.

مەحوی لەم بەیتەدا وشەی «پەردە» و «ڕوونما» و «نیقاب» و «چیهرە»ی لە جیهانی بووك گواستنەوەوە خواستووە. وشەی «زەلزەلە»یش ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿إِذَا زُلْـزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ کە باسی رۆژی قیامەت دەکا؛ واتە: کاتێ کە زەوی تەکانە گەورەکەی خۆی بەسەردا هات...

(٦) واتە: خراپ لە دنیا حاڵی بووبووین، وامان زانی کانی ئاوە و ئینسان کە چووە سەری دەحەسێتەوە، کەچی بە بەردەرێژگە دەرچوو کە لە دوورەوە تیشك دەداتەوە و نەزان بە ئاوی دێتە پێش چاو. ئەم خەڵکەیش کە هەمیشە لە هەوڵی دنیادان، رەنجی بێ سوود دەدەن و لە وشکاندا مەلە دەکەن کە بۆ مەلە تێدا کردن دەست نادا، لەگەڵ ئەوەشدا بە خنکان دەچن، هەرچەند ئاویش نیە، چونکە ئەوەی مەلەی بۆ دەسرخستنی دنیا بێ، ئەنجامی لە ئەنجامی خنکان زیاتری دەسگیر نابێ.

مەحوی لەم بەیتەدا دنیای شوبهاندووە بە سەراب و، دنیاپەرستانی شوبهاندووە بە تینووکە سەرابی بێتە رێ و لە تینووانا بخنکێ.

(٧) سووق: بازاڕ. دەهر: گەردوون، زەمانە. گوهەردانە: دەنکە گەوهەر.

واتە: دووکانداری هەرکەس لە بازاڕی گێتیدا ئەوەندەی ماوەی ژینیەتی. داخی بەجەرگم، ئەم خەڵکە لەباتی ئەوەی لەم ماوەیەدا مامەڵەیەکی وا بکەن ئەو دنیایان لێوە دەسگیر ببێ،

-٣-

وەك بولبول، ئەی تۆ تازە گوڵم، پڕ بە دڵمە شـەوق
وەك قومری، ئەی تۆ سەرو سەهی، پڕ بە ملمە تەوق (١)

خۆشە بە یادی ئـەو لەبـەوە نـۆشـی خـوێنـی دڵ
بەم نەشئە ئـاشنا نـەبووە غـەیری ئـەهلی زەوق (٢)

بـالآتـە وەك ئـەلیف لە حـورووفاتی کـائینات
مافەوقی تۆ کوژایەوە نـاوی لە تـەحت و فـەوق (٣)

---



عومری عەزیزی وەك دەنکە گەوهەر گرانبەهای خۆیان بە دەنکە پشقەڵی ناچیز و بێبایەخی دنیا دەگۆڕنەوە.

مەحوی لەم بەیتەدا گێتی شوبهاندووە بە بازاڕو، ژیانی ئینسان بە دووکان و خواپەرستی بە مامەڵەی بەسوود و بێفەرمانی خوا بە مامەڵەی زیانبەخشو، دایناوە ئەوەی کەوا لەجیاتی خواپەرستی بێفەرمانی خوا دەکا، وەك کەسێك وایە گەوهەر بگۆڕێتەوە بە پشقەڵ.

-٣-

(١) قومری: باڵدارێکی خاکییە، لە کۆتر بچووکترە، جووت جووت بەیەکەوە دەژین. سەرو سەهی: داری سەرو کە لقەکانی راست بن.

لەوانەیە مەبەست لەوە کە مەحوی خۆی شوبهاندووە بە قومری لەوەدا کە پڕی ملیە لە تەوق، ئەوەبێ کە خۆشەویستی خۆی بە تەوقی گەردن دانابێ و قووڵی خۆشەویستییەکەی بە زۆری تەوق لە گەردنیداو، خاڵی ملی قومریشی شوبهاندبێ بە تەوق لە خرپدا.

(٢) لەب: لێو. نۆش: خواردنەوە.

مەبەستی لەوەیە خوێنی دڵ رەنگی لێوی یاری دێنێتەوە یاد.

(٣) تەحت: ژێر، مەبەست زەوییە. فەوق: سەر، مەبەست ئاسمانە.

واتە: وەك چۆن پیتی ئەلف لەناو تیپەکانی «ئەلف» و «بێ»دا راست و قیتە و لەبەر راستی نە لە خوار و نە لە سەرەوە گەردی نوختەی لێنەنیشتووە، باڵای تۆیش لەناو جوانانداا راست و دیارییە و ناوی تۆ، ناوی لە تۆ بەرەوژووری لە ئاسمان و لە زەویدا کوژاندووەتەوە.

ئەگەر رووی دەمی مەحوی لەم بەیتەدا لە پێغەمبەر (د.خ) بێ، ئەوە مەبەستی لە ناو کوژانەوە، هەڵوەشاندنەوەی ئایینی پێغەمبەرەکانی تر دەبێ.

ئەو بەرقی جیلوە شەوقی کە ئـەمشەو بـڕی لە مـاه
سینەی جیهانی بۆ بووە مەجمەر بە ناری شەوق[٤]

ســەیری هــەیە عـەقیقی لەبـی، خـەت بـەدەوریا
بۆ سەر یەمەن لە زەنگەوە لەشکر کـراوە سـەوق[٥]

شـێرێکـی پـێ لە سـیلسیلەدایـە ئـەسیری عـیشق
مەردی، بزانە زیـنەتی مـەردانـە تـەوق و رەوق[٦]

هــاتۆتــە سـەر ئـەمە لە سـەرتدا، سـەر هـەڵبـڕە
«مەحوی» ئەم ئیشی خێرە لەسەر تۆیە ماوە عەوق[٧]

---

(٤) جیلوە: دەرکەوتن. مەجمەر: ئاگردان. نار: ئاگر.

واتە: ئەو تیشکی دەرکەوتنی یارە کە ئەوەندە بەهێز بوو شەوقی مانگی فەوتاند، کارێکی وای لە دڵی عالەمدا کرد سینەی هەموو کەسێکی بۆ بوو بە ئاگردانی ئاگری ئارەزووی دیدار.

(٥) واتە: خەتی رەش بە دەوری لێوی ئاقیق رەنگی یاردا چەند جوانە. دەڵێی لە وڵاتی قولە رەشەکانی ئەفریقاوە لەشکر بۆ سەر یەمەن براوە کە ناوی بە ئاقیقی نایاب دەرکردووە.

(٦) سیلسیلە: زنجیر.

مەبەستی لەوەیە عاشق شێرێکی زنجیر کراوە و گرفتار بوون بە داوی دڵداریدا شوورەیی نیە بۆ عاشق، وەك چۆن شێریش بەوە عەیبدار نابێ کە پێی بخرێتە زنجیرەوە.

(٧) عەوق: پەككەوتن.

واتە: یار هاتووەتە سەر ئەوە بدا لە سەرت و بیپەڕێنێ. ئەم کاری خێرە لەسەر خۆت پەککی کەوتووە، دەسا سەر هەڵبڕە با بدا لە گەردنت.

-١-

چ خاکێ کەم بە سەرما، مامەوە تاك
بە لێو ئاهو، بە چاو ئەشك و، بە سەر خاك[(١)]

بە دوویا وێڵم و ئەشکم دەپرسێ
لە هەر دارو دیارێ «أَیْنَ سَلْماك»؟[(٢)]

جگەر دەبڕێ، دڵ ئەڕفێنێت و دەڕوا
چ بێ مروەت، چ بێ پەروا، چ بێ باك[(٣)]

کە کوژرا، شاهی عالی جاهی عیشقە
هەتا سەیدت نەکەن ناگەیتە فیتراك[(٤)]

---

-١-

(١) واتە: خۆڵی کوێ بکەم بە سەری خۆمدا، بێ کەس و بێ دەر ماومەتەوە، بە لێو هەناسەی سارد هەڵ دەکێشم، بە چاو فرمێسك دەڕێژم، بە سەریش خاك بەسەر خۆمدا دەکەم.

دەشگونجێ مەبەستی ئەوەبێ هاوتای لە هیچ لایەك دەستگیر نابێ و تاك و بێ وێنەیە، چونکە ئەو هەموو بەڵایەی بەسەردا هاتووە.

(٢) دار: ماڵ. دیار: وڵات. [«این سلماك»: سەلما لە کوێیە؟].

واتە: من بە دووی یاردا وێڵم نایدۆزمەوە، دەگەمە هەر وڵاتێك و دەچمە بەر هەر دەرگایەك، دڵۆپێ فرمێسك سەر لە چاومەوە دەردێنێ، دەپرسێ «سەلما»ت لەکوێیە؟.

لە ئەدەبی دڵداری عەرەبیدا «سەلما» وەك «لەیلێ»ی کوردی وایە.

(٣) لەم بەیتەشدا، لەبەر ناچاری «دە»ی و «دەڕفێنێت» کراوە بە «ئە» و بووە بە «ئەڕفێنێت».

(٤) فیتراك: تیلمە چەرمێکی باریکە بەدوای زینی ئەسپیەوەی دەکەن، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکیان خستە پاشکۆوە پێی ببەستنەوە.

واتە: ئەوەی لە مەیدانی دڵداریدا بکوژرێ دەبێ بە پادشاهی پایە بڵندی ئەو مەیدانە و بێ ئەوەی بکوژرێ نابێ بەوە، وەك چۆن نێچیر تا راوی نەکەن ناگاتە ئەو پایە بڵندە کە بە پاشکۆی وڵاخیدا هەڵواسن.

به خەنجەر دڵمی لەت لەت کرد کە بێ ئۆف
وتی: خۆ وا خراپو دڵ وەها چاك![٥]

نیساری خاکی ڕێگەت جانە، فەرمووی:
«چە نسبت خاک را با عالم پاك»[٦]

گوڵاو و ئاگراوە بادە ئەمشەو
تەرەبناکە مەی و ساقی غەزەبناك[٧]

وتم: عیشق ئاگری گرتە وجوودم
وتی: هەر بابەتی سووتانە خاشاك[٨]

لە دڵدا خەڵق و خوا بوو، فائیدەی چی
کە دەم پڕ بێ لە ﴿إِیّاكَ... وَ إِیّاكْ﴾[٩]

---

(٥) واتە: کە یار دڵمی دی بە خەنجەر لەت لەت کراوە بێ ئەوەی ئۆفێك بکەم و بناڵێنم، وتی: سەیری کەن خۆی چەند کابرایەکی خراپە هیچ هاوار و ئۆف ناکا، کەچی چاکەشی لەگەڵ کراوە و دڵی لەت کراوە.

لە وشەی «چاك»دا تەوریە هەیە، بەڵام مەعنا نزیکەکەش هەروا ڕاگیراوە. دەشگونجێ وشەی «خۆ» بە «خوو»ش بخوێنرێتەوە.

(٦) واتە: بە یارم وت: گیانم بە قوربانی خاکی ڕێگاتە، ئەویش وتی: خاکی بەری پێی من جیهانێکی پیرۆزە و گیانی تۆیش لەچاو خاکی بەری پێی مندا وەك خاك بێ قیمەتە، کەواتە ئەم دوو شتە لە یەك دوورە چۆن بە یەك بەراورد دەکرێن؟.

(٧) تەرەبناك: شادی بەخش. غەزەبناك: توورە.

واتە: شەرابی بەزمی ئەمشەومان لەلایەکەوە وەك گوڵاوو لە لایەکیکەوە وەك ئاوی ئاگر کراو وایە. ئەمەش هی ئەوەیە مەی خۆی شادی دەبەخشێ، بەڵام مەیگێڕ توورەیە.

(٨) خاشاك: پلو پووش.

واتە: گیانی تۆ وەك پلو پووش وایە و هەر بۆ سووتان دەست دەدا.

(٩) واتە: سوودی چیە بە دەم دڵپاکی بەرابەر بە خوا پیشان بدەین و بڵێین: ﴿إِیّاكَ نَعْبُد وَ إِیّاكَ نَسْتَعِینُ﴾ واتە: هەر تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین، مادەم دڵمان پڕ بێ لە یادی ئەم و ئەو کە ئەوەش جۆرە هاوبەش دانانێکە بۆ خوا.

**دەزانـــــی جــــیفەیە دنـــیا، دە حـــەیفە**
**وەکوو سەگ ئەم شەڕو شۆڕە لەسەر لاك** (١٠)

**خــــودا تـۆ لا گـری لەو لاکـە «مـەحوی»**
**بە جاهی پـادشاهی تـەختی «لَـوْلاك»** (١١)

**-٢-**

**مەئلووفە زەوقی زاهـید ئـەوەندە بـە تـامی نـیسك**
**بێگانە ماوە شەممی لە نەشئەی خیتامی مـیسك** (١)

---

(١٠)جیفە: لاکە تۆپیو.

واتە: مادەم دەزانی دنیا وەك لاکە تۆپیو وایە، ئیتر بۆچی دەبێ وەك سەگ شەڕی لەسەر بکەیت!.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئەو حەدیسەی پێغەمبەر (د.خ) کە دەفەرموێت: «اَلدُّنْیا جِیفَةٌ وَ طَالِبُهٰا کِلٰابٌ» واتە: دنیا لاکە تۆپیوە و ئەوانەش کە دەیانەوێ، سەگی سەر لاکە تۆپیون.

(١١)«لَولٰاكَ»: مەبەست پێغەمبەرە (د.خ) کە خوا پێی فەرمووە: «لَوْلٰاكَ لَوْلٰاكَ لَما خَلَقْتُ الأَفْلٰاك» واتە: ئەگەر لەبەر تۆ نەبوایە ئاسمانەکانم دروست نەدەکرد.

واتە: خوایە! بۆ خاتری پادشای سەر تەختی «لَولٰاك» کە پێغەمبەرە، مەحوی دوور خەیتەوە لە لاکە تۆپیوی دنیا.

لە نێوان «لەو لاکە» و «لَوْلٰاكَ»دا وشە ئاراییەکی جوان هەیە، هەرچەند بەپێی مەعنا جوان نەهاتووە.

-٢-

(١)مەئلووف: ئولفەت پێوە گیراو، شتێ کە خەڵك هۆگری بووبن. شەم، «شَمّ»: بۆن کردن.

واتە: وشکە سۆفی زاهیر بین ئەوەندە خووی بە دیمەن پەرستی وەك نیسکێنە خواردنەوە گرتووە، تێگەیشتنی مەعنەویاتی نەماوە و لووتی بۆنی میسك ناکا.

«خیتامی میسك» ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿خِتَامُهُ مِسْكٌ وَ فِي ذٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾واتە: ئاخرەکەشی میسکی بۆن خۆشە، جاکەواتە ئەوانەی دەیانەوێ خۆیان لەپێش بن با بۆ شتی وا هەوڵ بدەن، کە باسی ئەهلی بەهەشت دەکا. مەبەستی مەحوی ئەوەیە بڵێ ئەم جۆرە کەسانە لە موسوڵمانەتی راستەقینە دوورن.

روتبەی کەماڵە ڕۆژە ڕەشی بـۆ جگـەر بـە خـوون
ناکامە تا کە ڕەش نەبووە خوونی خامی میسك [٢]

خـەت، خـاڵەکـانی دەوروبـەری لێوی گـرتە نـاو
ئەم عەنبەرەم نەدیوە کە بووبێ بە دامـی مـیسك [٣]

بەر خـیدمەتی غـوباری ڕەهـی یـاری مـن: سـەبا
دێنێ هەموو دەمێ، بە دوعاوە، سەلامی مـیسك [٤]

مـــــەیلێ خــەتایە: ڕوو لە خـــەتایە بـــتم، بــلێ:
سوبحی بتانی چین و خەتا کەوتە شامی میسك [٥]

---

(٢) واتە: بۆ دڵداری جگەر بریندار، ڕۆژی ڕەش و مەینەت بـە پـێ گـەیشتن و پـایەی بـەرز دادەنرێ، وەك چۆن خوێنی خاو و کاڵی بـن نـاوکی ئـاسك کـە دەبـێ بـە مـیسك، تـا تـەواو نەگیرسێ و ڕەش نەبێتەوە بە ناکام دادەنرێ.

خوونی (ن): خوێنی.

(٣) واتە: خەتی مووی تازە دەرهاتووی ڕووی یار دەوری خاڵەکانی ڕووی داوە. من هەرگیز نەمدیوە عـەنبەر بـووبێ بـە داوو مـیسکی پـێوە بـووبێ. مـەبەستی لە «عـەنبەر» مـووە تـازە دەرهاتووەکان و لە «میسك» دانە خاڵەکانە.

(٤) بەرخیدمەت: پێش خزمەت، خزمەتکار. سەبا: شنەی بای بەیانی.

واتە: پێش خزمەتی تۆزی ڕێگای یاری من کە بای بەیانییە، هەموو کاتێ هەواڵ پرسی و سەلامی ئەو میسکەم پێ دەگەیەنێ کە تۆزی داوێنی یارە.

دەشگونجێ «بەر خیدمەت» یەك وشە نەبێ بەمەعنا «پێش خزمەت»؛ بـەڵکـوو «بـەر» و «خیدمەت» بێ و مەعنای بەیتەکە وای لێ بێتەوە: میسك بەو هەموو بۆن خۆشییەوە کە هەیە خۆی لە ئاستی تۆزی ڕێگای یاردا بە هیچ دانانێ، بۆیە هەموو بەیانییەك بای سەبا سەلام و دوعای ئەو دێنێتە خزمەتی تۆزی ڕێگای یار.

(٥) واتە: مەڵێ ئەمە تاوان و نـاپەسەندە کـە بـتەکـەی مـن کـە ڕووی یـارە ڕووی کـردووەتە تاریکستانی «خەتا» کە زوڵفەکانی یارە، بەڵکوو بڵێ ئەو بەرەبەیانەی کە بتەکانی چین و خەتاو خوتەن ڕووی تێدەکەن کە ڕووی یارە کەوتووەتە تاریکەی ئێوارەی میسکەوە کە زوڵفی یارە.

ﷺ

**گەردی ڕەمی غـەزالی چ دەشـتێکـە پـێوە نـیشت**
**ئەم تیبە لەو تەمەووج ئەدا هەر بە نامی میسك؟!(٦)**

**زولفی بـە دەوری خـاڵەکـەیا دێ، هـەموو دەمـێ**
**«مەحوی» ببینە عەنبەری سارا غولامـی مـیسك(٧)**

**-٣-**

**زەمـــانەی پـــڕ تـەعەب دەتکـاتە تـیرۆك**
**لەتـێ نـانت دەداتـێ دوو بـەشی نـۆك(١)**

---



وشە رازاندنەوەی مەحوی لەم بەیتەدا زۆر بە جوانی دەرکەوتووە.

دەشگونجێ نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە بەم جۆرە بخوێنرێتەوە:

مەیلی خەتایە ڕوو لە خەتایە بتم، بەڵێ

بەم جۆرە مەعنای بەیتەکە وای لێ دێتەوە: یارە وەك بت پەرستراوەکەم ئارەزووی خەتاو تاوان دەکا [کە ڕەش بوونەوەی ڕوویەتی بە موو، کە دەبێ بەهۆی دوورکەوتنەوەی لە دۆستان. «ع.ح»]، چونکە نزیکە خەتی ڕووی دەرکەوێ. بەڵێ ڕۆژی بتانی چین و خەتا (کە دوو وڵاتی ڕۆژهەلاتن) [مەبەست لە ڕووی ڕووناکی یارە. «ع.ح»] کـەوتووەتە شـام (ئێوارە)ی مـیسکی ڕەشی بۆن خۆشەوە.

بەم پێیەش بەیتەکە کۆمەڵێ جیناس و تەناسوب و تەوریەی تێدا دەبێ.

(٦) ڕەم: ڕەوگ. تیب، [«طِیب»]: بۆنی خۆش. تەمەووج [«تَمَوُّج»]: شەپۆلدان. نام: ناو.

واتە: ئاخۆ دەبێ ئەم بۆنە خۆشە کە بە نـاوی مـیسکەوە شـەپۆل دەدا لە ئـاسکی خـەتاو خوتەندا، تۆزی ڕێگای کام کۆمەڵە شۆخی وەك ئاسکی بیابان بێ لە ئاسکی خەتاو خـوتەن نیشتبێ و بۆن بداتەوە.

(٧)واتە: زولفی یار هەمیشە بە دەوری ڕوویدا دێ و دەچێ. سەیرکە چۆن عەنبەری سارا بووە بە غولامی میسك. مەبەست لە «عەنبەری سارا» زولفی یارو، لە «میسك» خاڵی ڕوویەتی.

-٣-

(١) تەعەب: ماندوویەتی.

پــــیاڵەی دیـــــدە لەبــڕێزە، دڵا تــۆش
بجۆشـە، سـازی نـاڵە هـەم بـبێ کـۆك (٢)

بە نووکی تیری شـۆخـێکـی کـەوا چـۆخ
لەبـــەرما تـەن بـووە جـامەی بـرنجۆك (٣)

بــە کــوڵمــی ئـاڵیـا ئـاڵا خـەتی سـەبز
ترنجی کـەوتە بـەر پـەنجەی تـرنجۆك (٤)

---



بە تیرۆك کردن کینایەیە لە لەڕو لاواز کردن.

لە کۆکردنەوەی «تیرۆك» و «نان»دا تەناسوب هەیە.

(٢) لەبڕێز: پڕ، ئەوەی چی تیایە لە لێواریەوە سەر بکا. کۆك: کۆك بوون، ئامادەبوونە بۆ کار، دەڵێن سەعاتەکە کۆك بکە.

واتە: پیاڵەی چاو پڕ بووە لە شەراب، کەواتە بۆ ئامادکردنی بەزمەکە، بە تەواوی با دڵێش بێتە جۆش و ئامێری سازیش کە بریتی بێ لە ناڵە لەجیاتی مۆسیقا با کۆك بێ.

مەحوی لەم بەیتەدا کاسەی چاوی شـوبهاندووە بـە پـیاڵەی شـەراب و فـرمێسکـیش بـە شەراب. رووی شوبهاندنەکەش لە یەکەمیاندا پـڕی و لە دووهـەمیاندا سـووریيە «سـووری فرمێسکی خوێنین و شەرابی سوور» هـەروەها نـاڵەی دەروونـیشی شـوبهاندووە بـە سـازو، جۆشی دڵیشی شوبهاندووە بە کۆڕی یاران.

(٣) چۆخ: چۆخە، شاڵ. تەن: لەش. برنجۆك: جۆرە قوماشێکی کونکونە.

واتە: لەشم وا بە تیری برژانگی یار بێژراوە دەڵێی کراسی برنجۆکە لە بەرما.

لە نێوان «کەوا» و «تەن» و «جامە» و «چۆخ» و «برنجۆك»دا تەناسوب هەیە.

(٤) ترنج: مێوەیەکە لە چەشنی پرتەقاڵ، توێکـڵێکـی زبـر و ئـەستووری هـەیە، مـرەبای لێ دروست دەکەن. ترنجۆك: رواوێکی رەش سەوزە.

واتە: مووی تازە دەرهاتووی دۆست لە دەوری کوڵمی ئاڵاو، کوڵمی وەك ترنجی کەوتە بەر پەنجەی ترنجۆکی مووی تازە دەرهاتووی.

گەر ئەم ريش و سەرەى زاهيد لەگەڵ بـێ
دەبێ جەننەت بە دەشتى شنگ و پيشۆك (٥)

رەقـيبە لەعـنەتى، عـاشق دەكـەى رەجـم
لەباتى سەگ دەكەى شێرێ سەمەندۆك (٦)

بە خۆڕايى لە «مـەحوى» بـەس بـڕەنـجە
نەجيبى، مەگرە وەك هۆكڵ، بەگم هۆك (٧)

ـ ٤ ـ

ئـەو سـەروى نـازە تـەوسەنى هـێنـايە تـازو تـەك
هــەستا قــيامەت و فـەلەك ئـەستوونيە گـەرەك (١)

ئەى دڵ! بناڵە، سـاز بـدە چـەنگى بـەزمى عـيشق
مەى خوێنى جەرگە، ناڵەيى مەحزوونيە گـەرەك (٢)

---

(٥) شنگ: گيايەكى بەهارەى كوێستانييە و دەخورێ، لقێكى باريك و گەڵايەكى لوولى هەيە، بنكدار و شيرەداريشە. پيشۆك: گيايەكى بەهارى كوێستانييە، گەڵاى باريك و درێژى هەيە، سەلكێكى بچووكى سپى هەيە دەخورێت. (٦) سەمەندۆك: بە پەندكراو.

(٧) هۆكڵ: ئەوەى هۆك بكاو بتۆرێ. هۆك: تۆران و بيانوو گرتن.

ـ ٤ ـ

(١) تەوسەن: ئەسپى شۆخ و سەركێش. تاز و تەك: غارغارێن. ئەستوون: ستوون، كۆڵەكـە. گەرەك: پێويست.

(٢) چەنگ: ئامێرێكى مۆسيقايە. مەحزوون: ئاوازێكى مۆسيقايە.

واتە: ئەى دڵ بناڵێنە و چەنگى كۆڕى دڵدارى رێك بخە و لێى بـدە. ئـەو شـەرابـەى لەم كۆڕەدا دەيخۆينەوە خوێنى جەرگى دڵدارە، شەرابى وايش پێويستى بە ئاوازى خەمگينە، چ ئاوازێكى خەمگينيش لە ناڵەى دڵى خەفەتباران خەمگينترە؟!.

وشـەى «سـاز» تـەوريەى تـێدايـە، چـونكە وەك چـۆن بـەمەعناى رێكخـستنە، بـە هـەر ئامێرێكيش دەڵێن لە ئاميرەكانى مۆسيقا.

دەگونجێ وشـەى «بناڵە» بە «بە ناڵە»ش بخوێنرێتەوە.

ئــەمڕۆ لە کـــن زەمـانە هـونەر بـۆتـە قـەشمەری
شـــێری ژیـــانی بـۆ چـیە، مـەیموونیە گـەرەك! (٣)

فـیترەت بـڵند و پـایە بـڵنـدم نـەدی، بـە گـوێش
گەردوون ئەوەندە دوونە کە هەر دوونیە گـەرەك (٤)

تینوو بە خوێنی عاشقە، ئـەی دڵ! ببە بـە خـوێن
ئەو لێوە، مـوژدە بـێ، دڵی پـڕ خـوونیە گـەرەك (٥)

قوم هـەر دەبـێ لە خـوێنـی جگـەر دا بـە ئـاهەوە
ئەو مەستی غـەفڵەتـە لەبـی مـەیگوونیە گـەرەك (٦)

دلبەر عەجەب نیە دڵی «مەحوی»ی بە دڵ کـە بـرد
ئـــــەسکەندەری زەمـــانە فـــلاتوونیە گـــەرەك (٧)

---

(٣)قەشمەری: گاڵتە و گاڵتەجاڕی.
(٤)فیترەت: سروشت.
واتە: نەك هەر بە چاو کەسی سروشت و پایە بەرزم نەدیوە، بە گوێیش باسیم نەبیستووە. ئەمەش سەیر نیە، چونکە خەڵك لە زەمانەدا دەژین و زەمـانەش ئـەوەندە دوون و هـیچە لە کەسانی دوون و هیچ بەولاوە پێ‌ناگەیەنێ، چونکە خۆی کەسانی وای دەوێ.
(٥)واتە: ئەی دڵ موژدە بێ کەوا یار بە خوێنی دڵدارانی تینووە و لێوی دڵێکی دەوێ کە پڕ بێ لە خوێن، کەواتە ببە بە خوێن تا بتخواتەوە.
(٦)مەیگوون: وەك مەی.
واتە: یاری سەرخۆشی بێ‌ئاگایی لێوی مەی‌ڕەنگی دڵداری دەوێ، بەڵام دەستی ناکەوێ. بۆیە دەبێ هەمیشە بە داخەوە قوم لە خوێنی جگەری خۆی بدا.
(٧)فلاتوون: ئەفلاتوون (٤٢٧-٣٤٧ی پ.ز) یەکێکە لە بەناوبانگ‌ترین فەیلەسووفەکـانی یۆنان، قوتابی «سوکرات» و مامۆستای «ئەرستاتالیس» بووە.
واتە: هیچ سەیر نیە کە دلبەر دڵی مەحوی بەرێ بۆ خۆی، چونکە ئەو فەرمانڕەوای هەموو جیهانە وەك ئەسکەندەرو، مەحویش کەسێکە لە پایە و پلەی ئەفلاتووندا و ئـەسکەندەریش ئەفلاتوونی دەوێ بۆ خۆی بێ و لەگەڵی بێ.

-٥-

ئـاشتی تـۆ، تـۆری مـن، بـۆ بـێ سـەباتی هـەردوو یـەك
گەیوەتە حەددی یەقین، ئەم دوو یەقینەن هەردوو شەك(١)

ئـاخر ئـەم دنـیایە ئـەمری دێتـە سـەر: ئـاخر بـبە
یەعنی بەس ئەی فاحیشە عالەم بە قڕ دە یەك بـە یـەك(٢)

---

-٥-

بیستراوە و لە شێوەی ئەم پارچە شیعرە خۆیشیەوە وا دەردەکەوێ هۆی دانانی ئەوە بووە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە مەجلیسێکدا باسی خەلافەت دەکرێ کە ئاخۆ حەقی حەزرەتی ئەبووبەکر بووە یا هی حەزرەتی عەلی مەسەلەی بە میرات هاتنەوەی باخی «فەدەك»یش دێتە پێشەوە کە حەزرەتی ئەبووبەکر بە حەقی حەزرەتی فاتیمەی کچی پێغەمبەری نەزانی و نەیدایە چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: «نَحْنُ مَعَاشِرَ الْأَنْبِياءِ لا نَرِث وَ لا نُورَثُ» واتە: ئێمە کە تاقمی پێغەمبەرانین نە میراتمان بۆ دێتەوە و نە میراتمان لێوە دەگەڕێتەوە. پاشان یەکێك لە دانیشتوانی مەجلیسەکە دەچێ مەسەلەکە بە ئاوەژۆیی بۆ یەکێك لە شێخانی ئەو سەردەمەی سلێمانی دەگێڕێتەوە و هەندێ غەیبەتی مەحویشی لا دەکاو دڵی لێی دێشێنێ. مەحویش کە ئەوەی بەر گوێ دەکەوێتەوە. ئەم پارچە شیعرە بۆ ئەو شێخە دەنووسێ.

(١) تۆر: تۆران. سەبات: بەردەوامی.

واتە: ئیسپات بووە و باوەڕ بەوە کراوە کەوا ئاشتی تۆ لەگەڵ مـن و تـۆرانـی مـن لە تـۆ لە ناپایەداریدا وەکوو یەك وان. مادەمیش ئەمە بووە بە یەقین کەوا ئەم دووانە هیچیان پایەدار نین. ئەم دوو شتە ڕاست و یەقینە وەك شتی گومان لێکراویان لێ هاتووە و نازانرێ ئاخۆ ڕاستن یا ڕاست نین.

(٢) واتە: هەرچەند زۆرکەس وا دەزانـن ئـەم دنـیایە کـە ئـەم هـەموو کـارەساتە بـەسەر ئـەم خەڵکەدا دێنێ. بڕانەوەی بۆ نیە و بە ئارەزووی خۆیان خراپە و فیتنەیی تیا دەکەن. بەڵام ئاخری هەر دوایی دێ و فەرمانی بڕانەوەی دەچێتە سەر کە ئیتر بەس خەڵك بە قڕ بدا.

ئەم بەیتە پلارێکی قووڵیشی تیدایە بۆ ئەو کەسەی ویستوویەتی نـاکـۆکـی بـخاتە نـێوان مەحوی و ئەو شێخەی سلێمانییەوە کە باسمان لێ کرد.

نــاوی ئــەو لێوە بــەرن، دەم هــەڵدەپــچڕن بـۆ دوعـا
وا لە بــەرچــاوی بــرینی دڵ هــەیە حـەققی نـمەك (٣)

ئەو سەگــانەن سپڵە، سـەبب و رەفـزی زاتـی وا دەکـەن
هیممەتی ئەو بەعدی ریحلەت نەبووەوە ئەم دینە حەك (٤)

وەرعــی فــارووقی تـەماشاکـەن، وتـی: نـاکـا قـوبووڵ
غــیرەتم ژاکــاوی ئــەو گـوڵبـاغە بـۆ بـاغی فـەدەك (٥)

---

(٣) واتە: هەرچەند ناوی لێوی بەتام و خوێی یار بهێنرێ، برینی دڵی دڵداران دەکـرێتـەوە و برینەکان دەم هەڵدەپچڕن بۆ دوعای خێر کردن بۆی، چونکە ئەوبەری هیواو ئـاواتیان لێی قسەیەکی سوێرە لێیەوە و لەبەر ئەوەکە بە قسەی سوێری ئەو ئەم برینانە برژاونەتەوە، نمەکیان لەبەرچاوە و لە یادی ناکەن و هەمیشە دوعای خێری بۆ دەکەن.

بەو پێیەش کە ئەم بەیتە ئیشارەت بێ بۆ هۆی دانانی پارچە شیعرەکە، پوختەی مەعناکەی وای لێ دێتەوە: ئەی ئەولادی حەزرەتی عەلی! ئێوە ئەگەر بـەهۆی فـەرموودەی حـەزرەتی ئەبوبەکرەوە بێبەش بووبن لە باخی «فەدەك»، پێویسـتە هـەرکاتێ نـاوی ئـەو بـبرێ، دەم بکەنەوە بۆ دوعای خێر کردن بۆی، چونکە برینی دڵتان کە بێبەش بوونە لەو باخە، نمەکی ئەو زاتەی لە بەرچاوە کە نەیهێشت ماڵی حەرامتان دەسکەوێ و تووشی حەرام خواردن بین.

(٤) سەبب: جنێو. رەفز: نەویستن. حەك: کوژانەوە.

واتە: سپڵە ئەو سەگانەن کە جنێو بە حەزرەتی ئەبووبەکر دەدەن و بە خەلیفەی پێغەمبەری پەسەند ناکەن. ئەگەر حەزرەتی ئەبووبەکر نەبوایە کە بەگژی پاشگەز بووەوەکاندا چوو و قورئانی کۆکردەوە، لەوانەبوو ئایینی ئیسلام پاش کۆچ کردنی پێغەمبەر (د.خ) بکوژێتەوە و لەناو بچێ.

مەلا ئەسعەدی مەحوی مەعنای ئەم بەیتەی وا لێ داوەتەوە گوایە مەبەست لە «زاتی وا» پێغەمبەر و مەبەست لە جنێو پێدانی ئەوە بووە کە کـافرەکـان پـێیـان وتـووە سـیحرباز. دەڵێ مەبەستیش لە نیوەی دووهەمی بەیتەکە ئەوەیە لەبەر هیممەتی پێغەمبەر خۆی بوو ئایینەکەی لەپاش وەفات کردنی لەناو نەچوو. بەڵام ئەم مەعنایە زۆر دوورە و بۆ شوێنەکە دەست نادا.

(٥) فاروقی: هی حـەزرەتی عـومەر. بـاغی فـەدەك: بـاخێك بـووە لە نـزیکی خـەیبەردا لە غەزایەکدا کەوتە بەر پێغەمبەر (د.خ) و پێغەمبەر لە ژیانی خۆیدا مەسرەفی لێ دەکرد بۆ ماڵ و منداڵی و، پاش وەفاتی حەزرەتی فاتیمە داوای کرد لە حەزرەتی ئەبووبەکر کە بیداتێ چونکە

سەر ئەوان و سەر هەموو یارانی پێغەمبەر، خودا
داڕژێ ڕەحمەت هەموو دەم پڕ زەمین و پڕ فەلەك!

بەڵکە سەرڕێژێکی بێ بۆ ئێمە، چاوەڕوانەکان
کۆمەڵی جینن و جەماعەی ئینس و ئەفواجی مەلەك(٦)

هەر دەبێ سەرڕێژێ بێ وادەی غیزا، خواجەی کەریم
کردی یادی بەندەگانی خۆ بە یەك دوو لوقمەیەك(٧)

وادەیێکت دا بە «مەحوی»: دێمە سەیری کۆشتنت
وەختێ هات ئەو خێرە، سا مەبیە لە بەدگۆ حەرفی پەك(٨)

---



میراتی باوکیەتی و ئەویش بەپێی حەدیسەکە نەیدایە، وەك پێشان باسمان کرد.

واتە: حەزرەتی ئەبووبەکر ئەو زاتە پایە بڵندە بوو کە دینی پێغەمبەری پاراست لە فەوتان. ئەمجا وەرن سەیری لە خواترسانی حەزرەتی عومەر بکەن، حەزرەتی عومەریش ئەو زاتەیە کە فەرمووی غیرەتم قوبووڵ ناکا لە پێناوی باخی فەدەکدا گوڵباخی حەزرەتی فاتیمە بژاکێ و بە هۆی وەرگرتنی ئەو بەشە باخەوە تووشی حەرام خواردن ببێ.

باس کردنی وەرعی فارووق لەم شوێنەدا لەوەوەیە کە حەزرەتی عومەر لەکاتی داواکردنی باخەکەدا لەلایەن حەزرەتی فاتیمەوە، پشتی حەزرەتی ئەبووبەکری گرت و دووپاتی کردەوە کە ئەو حەدیسە ڕاستە و فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ). پاشانیش کە دوو سێ جاریتر مەسەلەکە سەری هەڵدایەوە و لەناو هەندێ لە یارانی پێغەمبەردا بوو بە مقۆ مقۆ، حەزرەتی عومەر لە مەجلیسێکدا کۆمەڵێ لە گەورە گەورانی یارانی سوێند داکەوا ئەو حەدیسەیان لە پێغەمبەر بیستووە و بەو جۆرە مەسەلەکەی بڕییەوە.

(٦) سەرڕێژ: ئەوەی لە سەری کاسەی پڕبووەوە دەڕژێ. جین: جنۆکە. ئینس: ئادەمیزاد. مەلەك: مەلائیکە.

(٧) غیزا، «غِذا»: نان خواردن. بەندەگان: بەندەکان. لوقمە: پاڕوو.

واتە: گەورەی خاوەن دەست و دەهەندە، دەبێ لەکاتی نان خواردندا شتێکی لێ بمێنێتەوە و بە یەك دوو پاڕوویەك یادی بەندەکانی خۆی بکاتەوە.

(٨) وادە: وەعدە، گفت. مەبیە: مەبیسە. پەك: پەك خستن، تەگەرە.

-١-

وتی: بۆچی وەها بێ تین و بێ ڕەنگ؟
وتم: تۆ بۆچ ئەوەندە شۆخی و شەنگ؟[١]

گەیشتن بەو شەهی عالی مەقامە
نیە فکرم، خەیاڵم خاوە، پێ لەنگ[٢]

هەتا لەو یاری دەمسازە جودا مام
وەکوو نەی بێ نەوا کەوتووم و بێدەنگ[٣]

دەگەییە مەنزڵی سەلما بە سەد قەڕن
بە گامێ تەی بکەی گەر سەد دە فرسەنگ[٤]

یەکێ عاشق بە خوو، یەك تالیبی روو
یەکێ مەجبووری بۆ، یەك مایلی رەنگ[٥]

---

-١-

(١) بۆچ ئەوەندە (ن): بۆچی ئێندە. (٢) لەنگ: شەل.

(٣) هەتا: ئەوەتێ. دەمساز: هاودەنگ. جودا: جیا. نەی: شمشاڵ. بێنەوا: بێ ئاواز، لات.

واتە: جاران بەهۆی ئەو یارەوە یارای دەنگ لێهاتنم بوو. ئێستا ئەوەتەی لەو جیابوومەتەوە و لێی دوور کەوتوومەتەوە وەك شمشاڵی بێ شمشاڵژەن کپ و بێدەنگ کەوتووم.

(٤) سەلما: لە ئەدەبی کلاسیکی عەرەبدا کینایەیە لە یار. قەڕن: سەد ساڵ. گام: هەنگاو. سەد دە: دە سەدی، هەزار. فرسەنگ: فرسەخ، نزیکەی ٦ کیلۆمەترە.

واتە: هەواری یار ئەوەندە دوورە، ئەگەر بە هەنگاوێك هەزار فرسەنگ ببڕی، ئەوسا بە هەزار ساڵ دەیگەیتێ.

(٥) بۆ: بۆن. مائیل: حەز لێکەر.

واتە: یاری من هەر سەرێکی تەماشا بکەی جوان و دڵڕفینە. بۆیە یەکێك دڵی لە خوو و ڕەوشتی چووە و یەکێکیتر ئارەزووی لە دیمەنیەتی. کەسێکیتریش هۆگری بۆنی خۆشی بووە و هی وایش هەیە ئارەزووی لە رەنگ و شێوەیەتی.

**خـــەت و زاری کـــە بـاسـی کـەوتە گـوڵزار**
**کەچ ئەستۆ ما وەنەوشە، غونچە دڵ تەنگ** (٦)

**جیهانی کـردووە سـەرخـۆش و مـەدهۆش**
**لەبی وەك بادە، خەتتی سەبزی وەك بەنگ** (٧)

**مـەگـەر خـوێنـم سـیجافی بـێ بـەری دەم**
**کەوا ئەو دامەنەم کـەوتۆتـە بـەر چـەنگ** (٨)

**دڵی سـەنگە، دەبـارێ گـوڵ بـە سـەریا**
**ئەوی گوڵ بوو، زەمانە دایـە بـەر سـەنگ** (٩)

---

(٦) خەت: موو. زار: دەم. کەچ ئەستۆ: مل لار.

واتە: کە باسی دەمی بچووك و مووی ناسکی دەم و چاوی یار گەیشتە ناوباخ، وەنەوشە لە شەرمەزاریدا ملی کەچ کرد چونکە خۆی لە ئاستی مووی ئەودا بە هیچ هاتە پێش چاو و خونچەیش دڵتەنگ بوو، چونکە دەمی ئەوی لە خۆی بە نەپشکووتووی بچووکتر دی.

ئەم بەیتە لەف و نەشرێکی مورەتتەبی تیایە، «وەنەوشە» بۆ «خەت» و «غونچە» بۆ «زار» دەگەڕێتەوە.

(٧) واتە: لێوی وەك شەراب سووری یار و مووی وەك دووکەڵی بەنگ باریك و کشاوی، جیهانیان سەرخۆش و بێئاگا کردووە.

(٨) سیجافی: وەك سیجاف. سیجاف: پەراوێز. دامەن: داوێن. چەنگ: چنگ، دەست.

واتە: مادەم کە دەستم لە داوێنی یار گیر بووە، نابێ بەریدەم، مەگەر گیانم تێدا نەمێنێ و خوێنم وەك رەنگی پەراوێز کاڵ ببێ. عادەت وایە ئەو پارچەیەی دەکرێ بە پەراوێزی کەوا، سوورێکی کاڵە.

(٩) واتە: ئەوەی دڵی وەك بەرد رەقە گوڵی بەسەردا دەبارێ و ئەوەش کە وەك گوڵ ناسکە زەمانە دەیداتە بەر بەرد. بەپێی ئەم مەعنایە مەحوی گلەیی لە رەوشتی بەدی زەمانە دەکا کە هیچ شتێکی لە جێی شایانی خۆیدا نیە.

دەشگونجێ مەعنای بەیتەکە وا لێ بدەینەوە کەوا واتە: دڵی یار بەرابەر بە دڵدارەکانی وەك بەرد رەقە، ئەمان فرمێسکی خوێنینی وەك گوڵ سووری بەسەردا دەڕێژن، کەچی ئەویش دڵە ناسکەکانی ئەمان دەداتە بەر بەردی کەمتەرخەمی و گوێ پێ نەدان و دڵڕەقی.

کـــە بـــۆتـــە دۆشـــەك «اَظْـفارُ المَـــنِیَّةَ»
لە نائەهلان ئەوەندەم دیوە سـەرچـەنگ[(١٠)]

بـــتان ئـــەمڕۆ لە فـــەزڵی ئـــێمـــە دەدوان
فەرەنگ ئیشی چ بێ «مەحوی» بە فەرهەنگ![(١١)]

(١٠) «اظفار المنیّة»: نینۆکی مەرگ. سەرچەنگ: لێدان، شەقازلە.
واتە: ئەوەندە لێدان و تێسرەواندنم لە دەستی ناکەسانەوە دیوە، نینۆکی تیژی مەرگم لا بووە بە دۆشەکی نەرم. مەبەستی لەوەیە ئاواتی مەرگی خۆم دەخوازم.
(١١) فەرهەنگ: زانست و ئەدەب و تێگەیشتن.
مەبەستی ئەوەیە بڵێ: یارەکانی ئێمە لە بێڕەحمیدا وەك فـەرەنگی وان، کـەواتـە دەبـێ موناسەبەتی چی بێ باسی زانست و ئەدەب و تێگەیشتنی ئێمە بکەن و ئەوان پەیوەندیان بە بابەتی واوە چیە؟.

-١-

که شێخ و واعیز و سۆفی به جەننەت بـەن گـەد و گـیپاڵ
دەبێ ئەمسالی ئێمـە بـۆ جـەهەننم بـەن سـڕو سـیپاڵ [١]

بە دەرسی من نەشا ﴿وَالشَّمس﴾ی پاری تەلعەتت، ئەمساڵ
ئیجازەم دە موتاڵاکردنی ﴿وَاللَّیْل﴾ی خەتت و خـاڵ [٢]

لە چاوم خوێنی جاری کرد و هـەم رەنگـی لە روو بـردم
ئەم ئـاشووبی دڵو دیـنە بـە لێوی ئـاڵو چـاوی کـاڵ [٣]

---

-١-

(١) گەدوگیپاڵ: تەنگە و ورگی زل. سڕو سیپاڵ: شڕو شیتاڵ، جلە شڕە.

پەیوەندی ئەم «شەرت و جەزا»یە لەوەوەیە کە مەحوی نە لە بەرەی شێخ و واعیز و سۆفییە و نە گەدوگیپاڵیشی هەیە و مادەم شێخ و واعیز و سۆفی بەو هەموو گەدوگیپاڵەیانەوە بـچنە بەهەشت، ئەو وا دەگەیەنێ کە چوونە بەهەشت دوو مەرجی هەیە، یەکەم ئەوە کە شێخ یـا واعیز یا سۆفی بی و دووهەمیش ئەوە کە گەدوگیپاڵت هەبێ.

(٢) نەشا: نەشیا. تەلعەت: روو.

واتە: پارەکە زۆر خەریکی دەرسی سوورەتی «وَالشَّمس»ی باسی رووت بووم، لێی حاڵی نەبووم و لە پلەی تێگەیشتنی من بەرزتر بوو، چونکە چاوم یارای تەماشاکردنی رووتی نەبوو. دەسا رێگام بدە ئەمساڵ لە دەرسی سوورەتی «وَاللَّیل»ی باسی خەت و خاڵت ورد ببمەوە، چونکە موناسبی بەختی رەش و حاڵی ناخۆشمە، بەڵکوو شتێکی لێ تێ بگەم.

جاران لە حوجرەی فەقێدا عادەت بوو بە شەو موتاڵای دەرسی سبەینێیان دەکرد و لێکیان دەدایەوە و بۆ سبەینێ دەیانخوێند. بۆیەش مەحوی لەم بەیتەدا دەرسی بۆ «وَالشَّمس» داناوە کە خۆر بە رۆژدا هەیە و موتاڵاکردنی بۆ «وَاللَّیل» داناوە کە موتاڵا بە شەو دەکرێ.

تەلعەتت (ن): روومەتت.

(٣) واتە: کە سەیری لێوی ئاڵی یارم کرد، عەکسی ئاڵیی لێوی دای لە چاوم و خوێنی لێ هێنا. کە تەماشای چاوی کاڵیشیم کرد عەکسی کاڵییەکەی دای لە رووم و رەنگی لێ بڕی.

که سەیری ئاینەی کرد و لەپاشان ئەم کەلامەی دی
وتی: من هەم بە بێ تیمسال و ئەم شیعرانە بێ ئەمسال(٤)

زوبانی واعیزی بێ دڵ درێژە دەرحەق ئەهلی دڵ
بەجێشە، غەیری ئەو مل پانە کێ بێ هەڵگرێ ئۆباڵ!(٥)

کە رێی ئەو شاهە کەوتە ئەم مەقامە، جێ‌بەجێ هەستا
وتی: ئەم زاتە ساحێب حاڵە، حەیفێ کەوتووە بێ حاڵ(٦)

چ خۆشە بەم هەموو عیسیانەوە یارەبی بمبەخشی
ببەخشە، بگرە دۆزەخ خۆڵەمێشی کەم بوو یەك مسقاڵ(٧)

بەبێ یارێ مەچۆرە مەعرەکەی ئەسفەندیاری نەفس
کە لەم مەیدانەدا هەر پیرە زاڵە رۆستەمی بێ زاڵ(٨)

---

(٤) ئاینە: ئاوێنە. تیمسال: وێنە.

واتە: یار کە ئەم قسەی منەی بیست لە باسی لێوو چاویداو بۆ تاقی کردنەوەی راستی قسەکەم روانیە ئاوێنە، باوەڕی کرد و وتی: نە جوانێکی‌تری لە چەشنی من هەیە و نە شیعرێ وەك ئەو شیعرانەی تۆیش وتراوە.

(٥) بەجێشە: بەجێیشە. ئۆباڵ: تاوان.

واتە: شتێکی زۆر بەجێیە زوبانی واعیز لە ئاستی عاشقان ئەوەندە درێژ بێ، چونکە مەگەر هەر ملی ئەستووری ئەو ئۆباڵی گوناهی ئێمە بگرێتە ئەستۆ. مەبەستی لەوەیە کە واعیز لە پاش‌ملە خراپەی ئێمە دەڵی و دەیتی هەموو گوناهی ئێمە دەکەوێتە ئەستۆی ئەو.

(٦) واتە: کە یار رێی کەوتە لای من و دیمی ئاگام لە خۆم نیە، بەزەیی پیامدا هاتەوە و وتی: حەیفە کەوا ئەم زاتە پێگەیشتووە وا بێهۆش کەوتووە.

(٧) واتە: خوایە چەند خۆشە بەم گوناهەوە لێم خۆش ببی و بمبەخشی. ئەمە بۆ تۆ هیچی تێ ناچێ ئەوە نەبێ کە دۆزەخ تۆسقاڵێك خۆڵەمێشی گوناهبارە سووتاوەکانی لێ کەم بێتەوە.

(٨) ئەسفەندیار: کوڕی گوشتاسیپ، یەکێك بووە لەو قارەمانانەی رۆستەمی زاڵ لەگەڵیاندا جەنگیوە و بەزاندوونی. زاڵ «ی یەکەم»: ریش سپی. زاڵ «ی دووهەم»: باوکی رۆستەم، دەڵێن بۆیە وا ناونراوە چونکە لەدایك بووە تووکی سپی بووە.

**بە غەمزەی نازەوە ئەو سەروی نازە کەی چۆوە گوڵشـەن**
**کە نێرگس وا بووە چاوی سپی، سەروی بووە تـۆپـاڵ**(٩)

**کــە بــمرێ عــاشقی زاری مــەلائیك بـێن و بـیبینن**
**دەڵێن: ئەم باقە چیلکە ناگرێ یـارەب بـەرێ گـۆپـاڵ**(١٠)

**سەماعی سازی عیشق و ڕێگە بۆ پاڕانـەوەت «مـەحوی»**
**لەبەر قاپی تەڵەب بێ، گوێ دەبێ کەڕ بێ، زوبانت لاڵ**(١١)

---

☞

واتە: بەبێ یارمەتی پیرێکی پایە بەرز، هەرگیز مەکەوەرە جەنگ لەگەڵ نەفس و شەیتانی وەك ئەسفەندیاری بەهێز، چـونکە لەم مـەیدانـەدا هـەر ڕۆسـتەمێك قـارەمانێکـی وەك زاڵ یارمەتی نەدا، ئەوەندەی پیاوێکی پیری ریش سپی بێ دەسەڵات دەبێ.

(٩) تۆپاڵ: ئەو وردەیەی لە ئاسن و مس دادەوەرێ لەکاتی کوتانەوە و چەکوش لێدانیاندا.

واتە: نازانم ئەو یارە باڵا وەك سەرو بەرزە کە دەڵێی لە ناز دروست کراوە، کـەی بـە لارو لەنجەوە چووە ناو باخ و کە نێرگس چاوی بە چاوی مەستی کەوت چاوی سـپی بـوو و، کـە سـەرو سەیری باڵای بەرزی کرد دارزاو داوەری و بوو بە پرووش.

(١٠)گۆپاڵ: گورز.

واتە: دڵداری ئەم یارە لەبەر دەردی عیشق ئەوەندەی خەفەت خواردووە، ئـەوەندە لەڕو لاواز بووە، هەموو ئەندامی لەشی وەك چیلکەی لێ‌هاتووە، بە ڕەنگێ ئەگەر بمرێ فریشتەی سزای ناو گۆڕ دەڵێن خوایە ئەم کۆمەڵە چیلکەیە، بەرگەی گورز و گۆپاڵی ئێمە ناگـرێ و لێی دەگەڕێن.

(١١)واتە: مەحویا! ئەگەر مەبەستت ئەوەبێ گوێت لە ساز و ئاوازی عیشق بێ و ڕێگات بدرێ لەبەر دەرگای یاردا بپاڕێیتەوە، دەبێ سەر بۆ باری دڵداری شۆڕ کەیت و هیچ نەبیسی و هیچ نەڵێیت.

-٢-

شنەی بادی بەهاری هاتەوە، خۆشی لە تۆ بولبول!
بە شایی هاتی گوڵ کۆکی کە سازی چەهچەهە و غولغول(١)

چەمەن هەر سەروو نەسرینە لە تەرزی خوابگەی شیرین
سەری کێوانە یەکسەر وەك کەناری کۆهکەن هەر گوڵ(٢)

چ شۆرێکی جنوونی پێوەیە بای ئەم بەهارانە
لە شارا هەر زڕەی زنجیرە، سەحرا شۆرشی بولبول!(٣)

دەبینی ﴿قُلْ هُوَ اللّٰهُ﴾ خوێنەکانی کونجی مزگەوتان
رووە و سەحرا، کە دەبیەن وا سوراحی هاتەوە قولقول(٤)

---

-٢-

(١) باد: با. هات: هاتن. کۆکی کە: بیخەرە کار. چەهچەهە: ئاواز و چریکە. غولغول: شۆری بوڵبوڵان و دەنگو هەرای بەیەکدا چوو.

(٢) تەرز: جۆر. بە تێکڕای قوماشی جوان و بە بەرگی نووستنیش دەڵێن: خوابگە: جێگە خەو، مەبەست لە گۆڕە. کەنار: داوێن. کۆهکەن: کێوکەن، فەرهاد.

مەحوی لەم بەیتەدا چەمەنی لەکاتی ئاڵانی گوڵی نەسریندا لە داری سەرو، شوبهاندووە بەوە کە شیرین لە گۆڕەکەیدا بە گوڵی رەنگاو رەنگ دەوری درابێ، وەك لە جێگای نووستنیدا بەرگی جوانی خەوی پێوە پێچرابێ. لووتکەی کێوانیشی بە گوڵەوە شوبهاندووە بە بەرپێی فەرهاد بە دڵۆپی خوێنی خۆکوشتنەکەیەوە.

(٣) واتە: بای بەهار دەماری شێتی پێوەیە و عالەم شێت دەکا. لە شاردا نازداران بە زڕەی کەمەرە و لوولەیانەوە دەخاتە جووڵە جووڵ، لە دەرەوەشدا بوڵبوڵان دەهێنێتە جۆش.

(٤) سوراحی: کاسەی شەراب. قولقول: مرقە مرقی داکردنی شەراب.

واتە: تەنانەت ئەوانەش کە لە کونجی مزگەوتدا کەوتوون و خەریکی خواپەرستین، کە بەهار هات و کاسەی شەراب مرقەی شەراب لێ داکردنی لێوە هات، هەموو بە جارێ رووە و دەشت دەکەونە رێ.

دەبینم سیبحە دەردەستانی مل کەچ بوو لە تەکیانا
لە سەحنی گوڵشەنا سەرمەست و دەستەملانی شیشەی مول (٥)

هەموو خوێنی شەهان و تاجدارانە لە بن خاکا
کەوا هەوری بەهاری سەرزەمینی پێ دەکا گوڵ گوڵ (٦)

زوبانی لاڵە، بۆ حەیرانە، حاڵی بۆ پەرێشانە
لە سۆسەن دەفکرم «مەحوی»، لە وەزعی نێرگس و سونبول (٧)

-٣-

پەروانەیەك بە بولبولی وا وت: کە «بُوالفُضُول»
سووتانە ئیشی ئەهلی مەحەبەت، نە هوولە هوول (١)

---

(٥) سیبحە: تەزبێح. دەردەست: لەناو دەستا بوو. سەحن: حەوشە. مول: مەی.

واتە: ئەوانەی لە تەکیە کاندا ملیان کەچ کردووە و خەریکی خواپەرستین و پشتیان لە هەموو رابواردنێ هەڵکردووە، هەرکە بەهار هات روو دەکەنە باخ و دەست دەکەنە ملی شووشەی مەی.

(٦) واتە: ئەم گوڵاڵە سوورانە کە دەشت و دەریان پێ رازاوەتەوە. هەموو خوێنی ئەو شەهیدانەیە کە لە مەیدانی عیشقدا شاهەنشاو تاجدار بوون و بە تیری یاران کوژراون، وا ئێستا هەوری بەهار دەیڕژێنێتەوە و لە شێوەی گوڵدا لە بنی خاکی دەردێنێتە دەر.

(٧) شاعیر لەم بەیتەدا دەپرسێ: لەبەر چیە وا مەحوی زوبانی لاڵە و حەیران بووە و حاڵی تێك چووە؟ ئەنجا هەر خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێ: بۆیە زوبانم لاڵ بووە چونکە بیر لە جوانی رووی وەك گوڵە سۆسەنی یار دەکەمەوە و گوڵە سونبولیش زوبانداره. بۆیەش حەیران بووم چونکە لە وەزعی چاوی وەك نێرگس مەستی یار ورد دەبمەوە و نێرگسیش چاوی ئەبڵەقە. بۆیەش حاڵم تێك چووە چونکە سەرنج لە زوڵفی وەك سونبول ئاڵۆزی ئەو دەدەم و سونبولیش ئاڵۆزە.

ئەم گواستنەوەیە لە شێوەیەکی قسە کردنەوە بۆ شێوەیەکی تر وەك لێرەدا کە لە غائیبەوە گواستوویەتیەوە بۆ موتەکەللیم، شتێکی باوە لە ئەدەبداو پێی دەڵێن: «ئیتیفات».

-٣-

(١) کە: ئەی. «بوالفضول»: ئەوەی کردەوەی هەر هیچ و پووچ بێ.

**چـاوی لە وەعـدی کـوشتنی مـن چـاوی دزیـەوە**
**خوونکاری وا، دەبێ لە قسەی خۆی نەکا نکوول** (۲)

**بەم ئیختیساسە سا سەری من بۆ نـەگـاتە عـەرش**
**هات و لە سەرمی دا، وتـی: «اِبْـدَأْ بِـما یَـؤُول»!** (۳)

**وەك دێوی لەعـنەتی کـە کـەلامی قـەدیمی بـیست**
**زاهید کە باسی عیشق ئەبیێ، دێتە جووڵە جووڵ** (٤)

**سەججادە مەی پیا رژاوم و، عوریان و لەش بە خوون**
**نـوێژم مـەزەننە وایـە لەمـەولا بکـەن قـوبووڵ** (٥)

---



مەبەستی لەوەیە خۆشەویستی راستەقینە بە دیمەنکاری و خۆ دەرخستن نابێ. خۆشەویست دەبێ وەك پەروانە بێ کە دەسووتێ و دەنگێکی لێوە نایەت، نەك وەك بولبول کە دەڵێ: عاشقی گوڵم و بەسەر چڵەوە دەیکا بە هەراو لەوە زیاتری لە باردا نیە.

(۲) خوونکار: خوێنڕێژ. نکوول: پەشیمانی.

واتە: یار گفتی دابوومێ بە تیری چاو بمکوژێ، کەچی چاوی، چاوی لەو گفتەی دابووی دزییەوە. خوێنڕێژی وا نەدەبوو لە قسەی خۆی پاشگەز ببێتەوە.

(۳) واتە: چۆن سەرم ئەوەندە بەرز نەبێتەوە بگاتە عەرش، مادەم یار منی بەتایبەتی هەڵاوێرد بۆ کوشتن و وتی لە پێشا دەست بە کوشتنی ئەو کەسانە دەکەم کە سەر بە خۆمن.

**«بِما یَؤُول»** (ن): «بِمَن یَؤُول». ئێمە بۆیە نوسخەی «بِما»مان لا پەسەندتر بوو چونکە «ما» باشتر بۆ موڵکایەتی دەست دەدا تا «مَن».

(٤) واتە: زاهید کە باسی عیشق دەبیسێ ئۆقرەی لێ دەبڕێ، وەك شەیتانی لە رەحمەتی خودا بێبەش کراو کە گوێی لە دەنگی قورئان دەبێ جێگە بە خۆی ناکرێ و هەڵدێ.

(٥) سەججادە: بەرماڵ. مەزەننە: گومان.

واتە: بووم بە دڵدارێکی راستەقینە و سەرخۆشێکی تەواو. مەی بە بەرماڵمدا رژاوە و لەسەر خۆشیدا هیچم بە بەری خۆمەوە نەهێشتووەتەوە و بە تیری یار هەموو گیانم خوێناوی بووە. بەم مەرجانەی تیامدا هاتوونەتە دی دەردەکەوێ کەوا لە عیشقدا گەیشتومەتە پلەیەکی بەرز و لەمەوە گومان دەکەم لەمەولا نوێژم لە بارەگای خوادا پەسەند بێ.

دەرچوو لە حەددی غـایە عـورووجی دەجـاجیلە
یارەببی تـۆ بکـەی کـە بکـا عـیسەیەك نـزوول![٦]

زاڵم! سـبەی بـە زەڕڕە حـیسابت لەگـەڵ دەکـەن
ئەمڕۆش، ئەتۆ مەبوورە، حیسابت بکە بە پوول[٧]

ڕێگـەی هـودا تـەریقەتی عـیشقە، دە «مـەحویا»
وەرن و پـیا بـڕۆن و «وَ صَـلُّوا عَـلَى الرَّسُـول»[٨]

هەر ئەم تـەریقە بـوو بـە هـەموو سـەحبی گـرتیان
ڕۆیـین پیا، هـەتا گـەیینە مـەرتەبەی وسـوول[٩]

---

(٦) عورووج: سەرکەوتن. دەجاجیلە: دەجاڵەکان. عیسە: عیسا.

واتە: پایە بەرزی دەجاڵەکان لە رادە دەرچووە. مەگەر خودا بکا عیسایەك داپەڕێ بۆیان و لەناویان بەرێ.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئەوەکە لە دنیا ئاخردا عیسا لە ئاسمان دادەپەڕێ و دەجاڵ دەکوژێ. مەبەست لەو دەجاڵانەی کە مەحوی قسەیان لێ دەکا پیاوی خراپە کە دەستیان بەسەر کاروباری وڵاتدا گرتبوو. بەم پێیە ئەم بەیتەش نیشانەیەکی تری نارەزایی مەحوییە لە سیستێمی کارگێڕی کۆمەڵ.

لە نێوان «عورووج» و «نزوول» و «دەجاجیلە» و «عیسا»دا تیباق و تەناسوبێکی ورد و ناسك هەیە.

(٧) واتە: هۆ کابرای ستەمکار! چی دەکەی بیکە و لە هیچ چاوپۆشی مەکە. سبەینێش کە نۆرە هاتە سەر تۆ سزای تاوانەکانت هەموو لێ دەستێنرێتەوە.

(٨) هودا: هیدایەت، پێچەوانەی گومڕایی. تەریقەت: ڕێگا.

(٩) سەحب: هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ). مەرتەبەی وسوول [«وصول»]: پلەی بەرزی خواناسین و بە خوا گەیشتن.

-٤-

حەیاتم سەرفی عیشقت کرد بە ئوممێدی «فَـمَنْ یَـعْمَلْ»
بە هیجرت کوشتم و نەتکردەوە فکری «وَ مَـنْ یَـعْمَلْ» [(١)]

جەمالت حەیفە دەرخەی بۆ کەس و ناکەس وتم، فەرمووی:
جەلالی حوسنە ئێمەی کـردە شـاهەنشاهی «لَا یُسأَل» [(٢)]

وتم: ئـەم عـالەمە دڵیـان ئـەسیری غـەمزەتە، بـەس بـێ!
وتی: کەی بۆتە قووتی شاهبازێ پڕ بە کەف خـەردەل! [(٣)]

---

-٤-

(١) واتە: بە هیوای ئەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ﴾ واتە: ئەوەی ئەوەندەی تۆسقاڵێك چاکە بکا پاداشی وەردەگرێتەوە، ژیانی خۆم لە عیشقی تـۆدا سـەرف کرد، کەچی تۆ بە دەردی دووری کوشتمت و بیرت لەوە نەکردەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَ مَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ واتـە: هـەرکەسێ ئـەوەندەی تـۆسـقاڵێك خـراپـە بکـا تـۆڵەی وەردەگرێتەوە.

(٢) واتە: بە یارم وت: حەیفە جوانی خۆت پیشانی هەموو جۆرە کەسێك دەدەی، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: شان و شکۆی جوانییە منی کردووە بە کەسێك کە ﴿لَا يُسأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ... ﴾ واتە: لێی ناپرسرێتەوە بۆچی وادەکا.ئەم رستەیە بەشێکە لە ئایەتێك لە باسی خوادا.

لە نێوان «جەمال» و «جەلال»دا بەش بەحاڵی بابەتی خواناسی تەناسوبێکی جوان هەیە، نەخوازەڵا ئەگەر «لا یُسأَل»ەکەشیان بخرێتە پاڵ.

(٣) خەردەل: شینایییەکە تووێکی رەشی وردی هەیە.

واتە: بە یارم وت: دڵی ئەم عالەمە هەمووی بە تیری نازی تۆ دیل بووە، ئیتر با بەسی بێ، بەرەڵڵایان کە. ئەویش لە وەڵامدا وتی: کەی پڕی مشتێ تۆوی خەرتەلە بەشی دانی شابازێکی وەك من دەکا؟ مەبەستی ئەوەیە دڵی هەموو دڵدارەکان ئەوەندەی پڕی مشتێ تۆوی خەرتەلە بایەخی هەیە لای ئەو.

دەشگونجێ مەبەست لە «خەردەل» «خەرتەل» بێ کە داڵەکەر خۆرەیە. بەم پێیە لە نێوان «شاهباز» و «خەرتەل»دا تیباقێکی جوان پێك دێ. مـەعناکـەشی وای لێ دێتـەوە: کـە یـار دەسبەرداری دڵ دیل کردن نابێ و هەمیشە هەر دڵی تازە دیل دەکا.

موسەببیب حەز نەکا، پڕ عالەم ئەسبابت پەڕێ کایە
فەقەت چاری نیە قەت یەك بە دوو بینینی مام ئەحوەل(٤)

بەچی، بۆچ ئەم غوروور و کیبر و نازە، دەبیە تۆزێ خاك
بە ئەسڵ و فەسڵ ئەنازی؟ چۆڕە ئاوێك ئەسڵتە و ئەووەل(٥)

پەلی داوێنی پاکت گرتنی بۆ بوو زیاد ئەوجا
لە مەیدانی مەحەبەتدا ئەگەر «مەحوی» کرا پەل پەل(٦)

بەجێ ماوم لە گەڵ من حەسرەتا، مەکسم لەسەر بایەك
بە جارێ هاژە بێنم «مەحویا» وەك دارەکەی سەرکەل(٧)

---

(٤) موسەببیب: سەبەب ساز، خوا. ئەحوەل: خێل.
واتە: ئەگەر خوای سەبەب ساز ئارەزووی لەکردنی شتێك نەبێ، هەزار سەبەب ئەوەندەی دەنکەکایەك قیمەتی نابێ و سەبەب هیچ جۆرە دەورێك ناگێڕێ، وەك چۆن یەك بە دوو بینینی خێل هەرگیز یەك ناکا بە دوو.
(٥) غورروور: خۆ لی بایی بوون. کیبر: فیز. دەبیە: دەبیتە. چۆڕە ئاو: ئاوی تۆوی ئادەمیزاد.
ئەم بەیتە قسە لەگەڵ ئادەمیزاد دەکا و ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسانُ مِمَّ خُلِقَ خُلِقَ مِنْ ماءٍ دافِقٍ﴾ واتە: با ئادەمیزاد بیر لە خۆی بکاتەوە لە چی دروست کراوە؟ لە ئاوێکی هەڵقوڵیو دروست کراوە.
(٦) واتە: کە مەحوی بە ئاواتی خۆی گەیشت و لە مەیدانی خۆشەویستیدا پەل پەل کرا و کرا بە چەند کەرتەوە، هەر کەرتێکی پەلێکی داوێنی پاکتی گرت و بەری نەدا. بەم پێیە ژمارەی پەلی داوێنی تۆ گرتنی زیاد کرد و زیاتر پێتەوە نووسا و لە پتر لە یەك سەرەوە پێتەوە نووسا.
(٧) مەکس «مَکث»: مانەوە. داری سەرکەل: تاقە داری سەر بەرزایی کە داریتری بەدەوردا نەبێ و خۆی لەبەر بادا پێ نەگیرێ و زوو بشکێتەوە و بکەوێ.
واتە: بەداخەوە لە هاوڕێیان دواکەوتووم و لەسەر بایەك بەندم کە هەڵکا و لێم بدا و بمخا و بەجارێك وەك دارەکەی سەرکەل هاژە بکەم و بکەوم.

-١-

**ناڵەم لە سینە، هەم لە دڵم دەرد و غەم حەرام...**
**بێ، بێ تۆ بەزمی عوشرەت و عەیش ئەر نەکەم حەرام[١]**

**ئیعلانە: عاشقانی بە کۆیا نەکەن گوزەر**
**فەتویی چ مەزهەبێکە، تەوافی حەرەم حەرام![٢]**

**جۆبارە، لالەزارە، وەرە سەر چەمم، وتی:**
**ئاشووبە ئەم بەهارە، بووە سەیری چەم حەرام[٣]**

---

-١-

(١) عوشرەت: رابواردن. ئەر: ئەگەر.

واتە: ئەگەر بەبێ تۆ بەزم و رابواردن لە خۆم حەرام نەکەم، یاخوا ناڵە لە سینەم نەیەت و دەرد و غەم لە دڵمدا نەمێنێ. مەبەستی لەوەیە ژیان بێ خۆشەویستی خۆش نیە و خۆشەویستیش بریتیە لە ئازار چەشتن وکەواتە دوعای شەڕەکە وای لێ دێتەوە ئەگەر لەگەڵ نەبوونی تۆدا رابواردن لە خۆم حەرام نەکەم، یاخوا ژیانم ببێ بە هیچ.

(٢) کۆ: کۆڵان. فەتویی: فتوا. حەرەم: حەرەمی کەعبە لە مەککە.

واتە: جاڕ دراوە نابێ کەس بە بەر دەرماڵی یاردا گوزەر بکا کە وەك حەرەمی کەعبە وایە بۆ دڵداران. من نازانم بە مەزهەبی چ پێشەوایەك گەڕان بە حەرەمی کەعبەدا حەرامە.

لە «تەوافی حەرەم»دا ئیستیعارەی موسەررەحە و لە نێوان «حەرەم» و «حەرام»دا جۆرە جیناسێکی موزاریع هەیە.

ئیعلانە عاشقانی (ن): ئیعلانی عاشقانە.

(٣) جۆبار: یا جۆیبار، شوێنێ جۆگە ئاوی زۆری تیا بێ، یا هەر جۆگەی ئاو، یا جۆگەیەکی گەورە کە لە چەند جۆگا پێك هاتبێ. لالەزار: گوڵزار، مەبەست لە دڵۆپی فرمێسکی سوورە. چەم «ی یەکەم»: چاو. چەم «ی دووهەم»: رووبار.

واتە: بە یارم وت: وەرە سەر چەمی چاوم تەماشای جۆگەلەی فرمێسکی گوڵ ڕەنگم بکە، کەچی وتی: بەهاری رووت پڕە لە ئاشووب و تەماشای چەم حەرام بووە، لەبەر ئەوە نایەم.

شوبهاندنەکە بەم جۆرە هاتووە وەك چۆن بەهاران لافاو هەڵدەستێ و چوونە سەرچەم مەترسی تێدا دەبێ و لەوانە دەبێ بنیادەم بەرێ و هەرچیش کە مەترسی تیابێ کردنی بەپێی ☜

خـوێنـاوی جـەرگ و نـاڵەیـی دڵ گـەر عـەتا کـرا
نۆشینی مەی، سەماعی نەیە و زیر و بەم حەرام(٤)

ئـەو تـەکـیە سـەببی عـیشقی تـیابێ، تـیا مـەبە
بۆ سوننیيە تەوەتتونی موڵکـی عـەجەم حـەرام(٥)

گـەر ئـاگـری مـەحەبیەتی شك بـەم لە دۆزەخـا
ئەو دۆزەخە بەهەشتمە، جەننەت دەکەم حـەرام(٦)



شەرع حەرامە، رووی دڵداریش لەوەدا کە فرمێسکی زۆری پیا هاتووەتە خوار وەك لافاوی بەهاری لێ‌هاتووە و لەوەدا کە فرمێسکی خـوێنـاوی پـیا هـاتووە وەك لالەزاری بـەهاری لێ هاتووە و چوونە سەرچەمی بەهارانیش کە مەترسی خنکانی تیابێ حەرامە.

(٤) واتە: ئەگەر کەسێك بەختی یار بێ خوا خـوێنـاوی جگـەر و نـاڵەی دڵی بـداتـێ، ئـەوە لەجیاتی خواردنەوەی مەی و گوێ گرتن لە شمشاڵ بەسیەتی و مۆسیقای‌تری بۆ حەرامە.

دەشگونجێ «نەیەو» بە «نەی و» بخوێنرێتەوە و ئەوکاتە رستەی تێکڕای نیوە بەیتەکە بە تەقدیر کردنی «دەبێ» یەك تەواو دەبێ، دەبێ بە خەبەر و نیوە بەیتی پێشوو تەواو دەکا.

(٥) تەکیە: جێگای دەروێشان. سەبب: جنێو. سوننی: ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بەرابەری شیعەیە. تەوەتتون [«توَطُّن»]: بە نیشتمان کردن.

واتە: هەر تەکیەیەکی وشکە دەروێشانی نەفام کە جنێوی تیادا بدەن بە خۆشەویستی، تیا دامەنیشە، چونکە ئەو تەکیانە وەك وڵاتی عەجەم وان بۆ سوننی کە لە وڵاتی عەجەمدا جنێو بە ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عائیشە دەدەن و بە سووك تەماشای بیروباوەڕی سوننییەکان دەکەن. جنێودانیش بە خۆشەویستی لای دڵداران وەك جنێودانـە بـەو ئیمامانە لای ئـەهلی سوننەت و جەماعەت و بۆ کەسێکیش کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بێ حەرامە لە وڵاتێکا دانیشێ کە جنێوی تیا بدرێ بەو پێشەوایانە.

(٦) واتە: دڵدار دەبێ عەودالّی دوای یار بێ و لە دەلاقەی ئەوەوە سەیری هەموو شتێ بکا. بۆیە من ئەگەر لە دۆزەخیشدا ئاگری خۆشەویستی یار شك ببەم بەدوایدا دەڕۆم و دۆزەخم لەبەر ئەو ئاگری خۆشەویستییە لا وەك بەهەشت خۆش دەبێ و بەهەشتی‌تر لە خۆم حەرام دەکەم.

بۆ سەیدی «مەحوی»، ئەو موژە ئیمایەکا، بەسە
سەحرایی ئولفەتە کە لە نێچیری رەم حەرام[٧]

-٢-

بڕوانە سووتنم، وەرە بڕواکە من نەمام
پەروانەم ئیترم نیە پەروا کە من نەمام[١]

ئەو نەونەمامە کەی بەری میهر و وەفا دەدا
بۆ من، لە دەستی جەور و جەفادا کە من نەمام![٢]

بازاڕی دەرد و خەمکەدەی ئەندۆە و کونجی غەم
بێ رەونەق و نیشات و سەفا ما کە من نەمام[٣]

مانم ئەوەندە پڕ فەتەراتە، کە قەوم و خوێش
ئوممێدی هەر بە عەفوە، خودایا کە من نەمام[٤]

---

(٧) ئیمایەکا: ئیمایەك بکا، ئیشارەتێك بکا. رەم: هەڵاتن.
واتە: ئەگەر یار مەیلی کوشتنی ئێمەی ببێ، تەنها بە برژانگێك ئیشارەتێك بکا بۆ کوشتنمان، بەسە و پێویست بە هیچی تر ناکات، چونکە ئێمە ئاسکی هێدی و نێچیری راو کراوین و لە بیابانی دەسەمۆییدا دەژین و ئاسکی وایش راکردنی لێ حەرامە و هەرگیز هەڵنایەت.

-٢-

(١) سووتن: سووتان. ئیترم نیە: ئیتر نیمە.
(٢) واتە: کە من لە دەستی جەور و جەفادا فەوتام، ئیتر ئەو نەونەمامە چ سوودێکی بۆ من دەبێ و کەی بەری وەفام بۆ دەگرێ!.
(٣) خەمکەدە: خەمخانە. ئەندۆە: خەفەت. رەونەق: درەوشانەوە.
مەبەستی لەوەیە خەم و مەینەت بازاڕی بە بوونی من گەرمە و کە من فەوتام ئەویش روودەکاتە کزی و کەساس دەبێ.
(٤) فەتەرات: فەتارەت، زیان، لێرەدا مەبەست لە گوناهە.

چـــقڵی مـەزاری مـن چـەقییە دامـەنی، چ سـوود
شوومی بەرۆکی بەختمی بـەردا کـە مـن نـەمام(٥)

ئەو شۆخە هەر کە نەعشی مـنی دی، قـیامی کـرد
چی بم من؟ ئەم قیامەتە هـەستا کـە مـن نـەمام(٦)

«مەحوی» کە غـەمیە مـردم و غـەم پـەروەری نـیە
غەم مایەوە بە بێکەس و مـەئوا کـە مـن نـەمام(٧)

---



واتە: خوایە! ژیانم ئەوەندە پڕە لە گوناه، کەس‌وکارم کە دڵیان پێمدا دەسووتێتەوە و لە دوا ڕۆژم دەترسن، هیوایان هەر بە عەفووی تۆیە کە بگاتە فریام، ئەگینا حاڵم زۆر بەدحاڵ دەبێ.

(٥) مەزار: گۆڕ. دامەن: داوێن.

واتە: تا مابووم هەر بە تەما بووم یار ڕۆژێك بێتە لام، بەڵام هەر نەهات. ئێستا کە مردووم، بە من چی نەگبەتی یەخەی بەختم بەردەدا و یار دێتە سەر گۆڕەکەم و چقڵی سەر گۆڕم بە داوێنیا دەچەقێ و من چ سوودێك لەم هاتنەی ئەو وەردەگرم؟!.

(٦) نەعش: تەرم، جەنازە. قیام: ڕاست بوونەوە.

واتە: یار کە جەنازەکەمی دی هەستایە سەر پێ و بە ڕاست بوونەوەی ئەو هەموو عـالەم هەستایە سەر پێ، وەك بڵێی ڕۆژی قیامەت بەرپا بووبێ. نازانم من چیم وا بە مردنی من ئەم قیامەتە هەستا!.

(٧) پەروەر: پەروەردەکەر و سەرپەرشتیکەر.

واتە: مەحوی خەفەتی ئەوەی لە دڵدایە دەڵێ تا من مابووم خەم منی هەبوو و لە پەنای مندا دەژیا. ئێستا کە مردووم، کەسێکی وا شك نابا پەروەردەی بکا و دەستی بـەسەردا بگـرێ و نەهێڵێ بێکەس و بێدەر بکەوێ.

-٣-

بنازم مـن بـە کـوفری زوڵفـی تـۆ ئـەی ئـافەتی ئـیسلام
کە ئەستۆبەندی جیزیەی خستەمل ئیمانی خاس و عام(١)

بـە دەفـعی سـیخنی کـردن لە زاهـید راغـیبی مـەی بـوو
کەچی ساقی وتی: نادەم بەکەم فام ئەز مەیی گوڵفـام(٢)

لە رۆژێکـــی فـــەلەك ســـاقی بـووە، تـێفکـرە لەم بـەزمە
قەدەح ئاشامە هەر نادان و هـەر دانـایە خـوون ئـاشام(٣)

---

-٣-

(١) ئەستۆبەند: تەوق. جیزیە: ئەو خەرج و باجەی کە لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا لەو کافرە کیتابییانە دەستێنرا کە لە وڵاتی موسوڵمـاناندا دەژیـان، بـەرابـەر بـە هـەموو واجـبێکـی هـاو نیشتمانێتی کە لەسەر موسوڵمانان خۆیان هەبوو.

واتە: جاران ئیسلام (کە رۆشناییە) جیزیەی لە کـافران دەسـەند (کـە نـیشانەی تـاریکی گومڕایین) بەڵام ئێستا زوڵفی رەشی تۆ کە لە رەشیدا وەك دڵی کافر وایـە، تـەوقی جـیزیەی خستووەتە گەردنی ئیمانی هەموو خواناسێك و هەموو رەشە موسوڵمـانێك و ئیمانیانی بـۆ خۆی شل کردووە. کەواتە بنازم بەم زوڵفەت کە ئەوەندە کاریگەرە و بووە بە ئافەت و بەڵا بۆ دڵی هەموو موسوڵمانان.

مەحوی لەم بەیتەدا زوڵفی رەشـی یـاری شـوبهاندووە بـە کـوفر لەوەدا کـە چـۆن کـوفر تاریکایی و رەشی دەگەیەنێ، زوڵفی یاریش هەروا رەشە.

(٢) سیخنی: تەمەڵی و لە خواردن بەولاوە هیچ نەکردن. ئەز: من. گوڵفام: گوڵڕەنگ.

واتە: بە هەر جۆرێ بوو زاهیدمان هێنایە سەر ئەوە کە واز لە تەمەڵی و گۆشەگیری بێنێ و بێتە کۆڕی خواردنەوەوە و داوای مەی بکا. کەچی مەیگێڕ لەجیاتی ئەوەی پیاڵەی بۆ پڕ بکا، وتی من بەشی بنیادەمی نەفام نادەم لە شەرابی سووری گوڵڕەنگ.

دەشگونجێ رستەی «ئەز مەیی گوڵفام» فارسی بێ و لە بەیتێکی فارسی وەرگیرابێ و بەم جۆرە بێ: «از مَی گُلفام».

(٣) ئاشام: ئەوەی شتێ بخواتەوە.

فسانەی من بووە زینەی مەجالیس، ئافەرین ئـەی عـیشق
چەها بێ‌نام و خامی وەك منت كردۆتـە سـاحێب نـام[٤]

بە حـیرەت لەو گـوڵ ئـەندامـەم كـەوا بـادامـییە چـاوی
دڵی نازك وەكوو گوڵ، هەم رەقە وەك تـوێكـڵی بـادام[٥]

بـــناگـــۆشـــی لە چـــینی زوڵفـیا دەركـەوتبوو، دەتـوت
ئەمە بازی سپی سوبحە، چووە بـن بـاڵی زاغـی شـام[٦]

---



ئەم بەیتە مەعنای بەیتی پێشوو تەواو دەكا. واتە: تەماشای كۆڕی مەی خواردنەوە بكەن، لەو رۆژەوە كە گەردوون بووە بە مەی‌گێڕ، هەر نەفامە و مەی هەڵدەدا و هەر دانایە خوێنی دڵی خۆی دەخواتەوە. بۆیەش بەشی زاهیدی نەدا كە بە هەزار مـەینەت هـێنـابوومانە سـەر رێی راست و فێری مەی خواردنەوەمان كردبوو، ئەگینا ئەگەر ئەو راست مەیی بە دانا دەدا، دەبوو بیدایە بەو زاهیدە كە هاتبووە سەر رێی راست.

(٤) فسانە: چیرۆك و سەرگوزەشتە. زینە: جوانی. مەجالیس: جەمعی مەجلیسە واتـە: كـۆڕ. چەها: چەندین‌كەس. خام: خاو، كاڵ.

واتە: لە سایەی عیشقەوە عەقڵم لەسەر خۆم نەماوە و ناوبانگم زڕاوە و قسە و باسم بووە بە مایەی رازاندنەوەی هەموو كۆڕێك. دەسا ئافەرین ئەی عیشق وا چەندكەسی خاو و بێ‌ناوی وەك منت ناودار كرد و ناوت خستنە سەر زمانی خەڵك.

ئافەرین ئەی عیشق (ن): ئافەرینی عیشق. منت (ن): منی.

(٥) گوڵ‌ئەندام: ئەوەی ئەندامی لەشی وەك گوڵ جوان بێ.

واتە: سەرم لەو یارە گوڵ‌ئەندامە سوور ماوە كەوا چاوێكی بادامی هەیە، دڵی لە لایەكەوە وەك پەڕەی گوڵ ناسكە و كەمترین شت كاری تێدەكا، كەچی لەلایەكی‌كەشەوە وەك توێكڵی بادام رەقە و بە هیچ كلۆجێ بەزەیی بە دڵداراندا نایەتەوە.

توێكڵی (ن): تۆكڵی.

(٦) بناگۆش: بناگوێ. زاغ: قەلەڕەش. شام: ئێوارە.

**بە «مەحوی» کێ خەبەر دا بۆ سەفەر چوو ئەو دلارامە!**
**هوجوومی غەم بە جارێ هات و یەکسەر باری کرد ئارام[٧]**

**-٤-**

**دیارم دەیری عیشقە، جێ بە سووتن بێ لەوێ دەگرم**
**کە من مشتێ چڵو چێوم، بە چی بم، کەڵکی کێ دەگرم[١]**

**نەگەییە دامەنی دەستی دوعا، جا دەبمە خاکی رێی**
**تەریقەی گۆشەگیری بەردەدەم، ئەمجارە رێ دەگرم[٢]**

---

(٧) دلارام: مایەی ئارامی دڵ. ئارام: ئارامی، ئۆقرە.

واتە: چ خوا خراپ بۆ بوو کردوویەك بوو خەبەری بە مەحوی داکەوا یاری مایەی ئارامی دڵ چوو بۆ سەفەر. بەو خەبەردانەی ئەو لەشکری خەم بەجارێ هێرشی هێنا بۆ سەر دڵ و ئارامی بە جارێ باری کرد و رۆیی.

**-٤-**

(١) دیار: جەمعی «دار»ە بەمەعنا شوێن و وڵات. دەیر: شوێنی رەبەنە مەسیحییەکان.

واتە: من خەڵکی وڵاتی عیشق و خۆشەویستیم و ئەگەر ئاگریشم تێ بچێ دەست لەوێ هەڵناگرم. کە من بەهۆی دەردی دڵدارییەوە ئەوەندە لەرو لاواز بووم، بووم بە مشتێك چڵو چێو و کەڵکی هیچم پێوە نەماوە، ئیتر بۆچی بمێنمەوە؟ با لەوێ بۆ خۆم بسووتێم!.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرە نووسراوە:

لە شاگردانی کوورەی «یا: کۆڕی» عیشقم و جێ هەر لەوێ دەگرم

(٢) واتە: هەرچەندم کرد لە گۆشەگیریدا دەستی پاڕانەوەم نەگەیشتە داوێنی یار. بۆیە لەمەولا خۆم دەکەم بە خاك تا بەسەرمدا گوزەر بکا و گەردەکەم داوێنی بگرێ. بۆ ئەم مەبەستە واز لە «تەریقەت» و رێو شوێنی گۆشەگیری دێنم و دێمە دەرەوە و رێگا دەگرمەبەر و دەبم بە «ڕێ گر».

ئەم بەیتەی مەحوی دوو وردەکاری جوانی تیایە؛ یەکەم: گەیاندنی مەعنای بێ‌سوودی خۆ بە زل گرتن و سوودمەندی خۆ بە کەم زانین کە لە نیوە بەیتی یەکەمەوە دەردەکەوێ کە دەڵێ «دەستی» پاڕانەوە نەگەیشتە داوێنی و لەمەولا دەبمە «خاکی رێی». دووهەمیش: بەرابەری یەك راگرتنی «تەریقەت» و «گۆشەگیری» لەلایەکەوە و «ڕێ گرتنەبەر» و بوون بە «ڕێ گر» لەلایەکی ترەوە.

که دادی یەئسی خۆمـم بـردە لا، ئـەم عـارفە تـوند بـوو
وتی: ئاخر سبەینێ جەژنە، خوێنی تـۆ لە پـێ دەگـرم(٣)

لە رووسووری عیبادەت لام و روو زەردی خەجاڵەت مام
بە نـاوی سـێوی نـاوم بـاغەوان و مـن بـەهێ دەگـرم(٤)

لەسەرخۆ چوونە، شەیدا بـوونە، قـوڕ پـێوانـە، سـووتانە
هەتا مردن، مەحەببەت ئێشـی زۆرە، رێزی لێ دەگـرم(٥)

چ شۆخە ئـاگـرم تـێ بـەردەدات و پـێم دەڵێ: یـا شـێخ!
بە خاشاکی دەوت شوعلە عەسامە، دەستی پێ دەگرم(٦)

---

(٣) عارفە: رۆژی پێش جەژنی قوربان.

واتە: کە لەم رۆژی عارفەدا دادی نائومێدی خۆمم بردە لای یار، کە بۆچی هێشتوومیەتەوە بۆ نامکوژێ، لێم توند بوو وتی: نائومێد مەبە، سـبەینێ جـەژنی قـوربانە، سـەرت دەبـڕم و دەتکەم بە قوربانی و خوێنت لەجیاتی خەنە دەگرمە پێی خۆم و بەوە بە ئاواتی خۆتت دەگەیەنم.

وشە ئاراییەکی جوان لە وشەی «عارفە»دا هەیە کە بۆ ئەوە دەست دەدا بە «عـاریفە»ش بخوێنرێتەوە بەمەعنا خواناس.

(٤) لا: تەریك و بێبەش و ملپێچیکەر.

واتە: لە سەربەرزی و روو سووری خواپەرستی کلام و روو زەردی شەرمەزاریم بۆ ماوەتەوە. باخەوانەکەم کە خوایە بە ناوی سێوەوە منی ناشتووە، کەچی من بەهێی بۆ دەگرم. ئـەو روو سووری خواپەرستی لە من دەوێ، کەچی من بەهێی شەرمەزاری و روو زەردی بۆ دێنمە بەر.

ئەم بەیتە ئیشارەتێکی تیایە بۆ ئایەتی: ﴿وَ مٰا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونَ﴾واتە: ئامیزاد و جنۆکەم بۆ هیچ دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە بمپەرستن.

(٥) واتە: دڵداری، تا دڵدار دەدا بەکوشت گەلێ دەرد و مەینەتی دێنێتەرێ. منیش بڕیارم داوە ئەو هەموو دەرد و مەینەتانە قوبووڵ بکەم و رێزیان لێ بگرم یەك لەدوای یەك تووشیان ببم.

(٦) شۆخ: عەیار و زۆرزان. خاشاك: پڕو پووش، چیلکە و چەوێڵ.

واتە: یار ئەوەندە عەیار و زۆر زانە، ئاگریشم تێ بەردەدات و بە شێخی خۆیشـیم بـانگ دەکا! وەك ئەوە کە بڵێسەی ئاگر بەردەبووە چیلکە و پوش و دەیسووتاند و دایدەمرکاندەوە، کەچی دەیوت بۆیە دەستی بۆ دەبەم کە وەك عاسام وایە دەستی پێوە دەگرم.

که سینەی ڕێشمی بەو تێغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد
وتی: پەژموردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێ دەگرم[(٧)]

لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاهو هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ، من بەرقی تێ دەگرم[(٨)]

شوکر هۆشیارە «مەحوی»، تێدەگا دنیا خەراباتە
کە بەدمەستی بکا ئەهلی، خراپەی بۆچی لێ دەگرم![(٩)]

-٥-

لە ناکەس کارییا، خاکم بەسەر، ڕۆیی بە با عومرم
خودا! تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم[(١)]

---

(٧) ڕێش: بریندار. پەژموردە: سیس بوو.

واتە: یار کە سینەی بە تیری خۆشەویستی زامارمی بە تێغی ناز ئەنجن ئەنجن کرد، وتی گوڵزاری سینەی خوێناویت سیس بووە، بۆیە بە تێغی ناز لەت لەتی دەکەم تا خوێنی تێ بزێت و ئاو بخواتەوە و بگەشێتەوە.

(٨) سەرد: سارد.

واتە: لە تۆڵەی قسەی سارد و ناخۆشی وەك بەردی ڕەقی یارانی بێبەزەییدا، منیش هەڵکێشانی ئاخ و هەناسەی گەرمم هەیە کە وەك هەورە برووسکە و بەرقی ئاسمان کاریگەر و سووتێنەرە.

(٩) خەرابات: مەیخانە. بەدمەستی: سەرخۆشی لەڕادە بەدەر.

واتە: دنیا وەك مەیخانە وایە و خەڵکیش وەك سەرخۆش وان. بۆیە هەرچی بکەن، منی هوشیار و ئاگادار لێیان ناگرم.

لە نێوان «خەرابات» و «خراپە»دا وشە ئارایییەکی جوان هەیە.

-٥-

(١) ناکەس کاری: کاری لە چەشنی کردەوەی ناکەسان. کەسێ: پیاوێکی پیاوانە، پیاوێکی ڕاستەقینەی خوا.

به زایع چوو له «مٰا لٰا یَعْنِی»یا وەقتم هەموو، یەعنی...
دەبێ وەقتێ له «بُوالوَقت»ێ بخوازم دا تیا بمرم[٢]

ئەجەل دەورم دەدا: حازر بە، وادەی دەور و تەسلیمە
منی غەفڵەت زەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم[٣]

خەیاڵی پووچی دنیا وا دەماغ و دڵمی پێچاوە
قیامەت، هەر مەگەر رۆژی قیامەت بێتەوە فکرم[٤]

---



ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ حەدیسی پێغەمبەر (د.خ) کە فەرموویەتی: «مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مٰا لٰا يَعْنِيهِ» واتە: لە نیشانەی باش موسوڵمانێتی بنیادەمە ئەمە کە واز لە شتێ بێنێ کە ئیشی پێ نەبێ.

لە نێوان «ناکەس کاری» و «کەسێ» و مەعنای «بمژێنە» و «دەمرم»دا جۆرە تیباقێکی ناسك هەیە.

(٢) «مٰا لٰا یَعنی»: کاری بێ کەڵك. «بوالوقت»: خاوەن کات. دا: تا.

واتە: هەموو کاتم لە کاری هیچو پووچدا بەسەر چوو، بەجۆرێ کە کاتی ئەوەشم نەماوە تەنانەت تیا بمرم، بۆیە دەبێ داوای کەمێك کات لە خاوەن کاتێك بکەم کە خوایە، بمداتێ تا تێدا بمرم.

(٣) غەفڵەت زەدە: ئەوەی تووشی دەردی بێئاگایی و لەبیرچوونەوە بووبێ. دەور «ی سێهەم»: لە ئیستیلاحی زانایانی عیلمی کەلامدا ئەوەیە پەیدابوونی شتێك بەسرابێ بە پەیدابوونی شتێکی ترەوە کە پەیدابوونی ئەویش بەسرابێ بە پەیدابوونی ئەمەوە کە ئەمەش هەرگیز نابێ. ئەم مەسئەلەیە لە عیلمی کەلامدا دەکرێ بە بەڵگە بۆ پێویستی بوونی خودا.

واتە: مەرگ دەوری داوم دەڵێ: وادەی ئەوە هاتووە سەردەمی ژیانی خۆت بەدوایی هاتوو دابنێیت و گیانت بدەی بەدەستەوە. کەچی من تازە وادەزانم سەرەتای ژیانمە و خەریکی مەسئەلەی دەورم کە فەقێ لە سەرەتای خوێندنیاندا دەیخوێنن.

(٤) مەبەستی لەوەیە توانای بیر کردنەوەم لە هیچ نەماوە، لەو کاتەم نەبێ کە تیا دەژیم.

له پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکوو منداڵ
لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم (٥)

چیه سووچ و گوناهی؟ بۆچی دەیکاتە جەزاخانە؟
له قەبر هەڵکەن، هەتا رۆژی جەزا دەعوا چیه قەبرم (٦)

سبەینێ «يُحشَرُ المَرْء»ە، براگەل فرسەتە ئەمڕۆ
تەبەڕڕا بن له من، با کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم (٧)

له من نازانم ئیتر نەفسی بەدخوو چی دەوێ «مەحوی»
که بەدکردار و بەدڕەفتار و بەدئەفکار و بەد تەورم (٨)

---

(٥) واتە: لەبەر پیری و نەخۆشی پەکم کەوتووە و له پێ کەوتووم، کەچی نەفسم وەکوو منداڵ بە دەم ئارەزووەوە دەشنێ... لەبەر پیری سەرم بۆ راگیر ناکرێ، کەچی له رووی نەفس و ئارەزووەوە دەڵێی تازە پێ دەگرم و سەرەتای ژیانمە.

(٦) واتە: ئەوەندە گوناهبارم، قەبرەکەم تا رۆژی قیامەت هەر شکات دەکا لەدەست قەبر هەڵکەن کەوا کردی بە جێگای سزادانی من و منی تێ خست. نازانم ئەو قەبرە بەدبەختە چی کردبوو و گوناهی چی بوو وا قەبر هەڵکەن کردی بە جێگەی من و ئازار و سزای منی بردە ئەوێ.

(٧) تەبەڕڕا: بێ بەری.

واتە: سبەینێ رۆژی زیندوو کردنەوەی مردووانە و هەرکەس لەگەڵ دۆست و برادەری خۆی دەبرێ بۆ حیساب وەك پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «يُحْشَرُ الْمَرْءُ مَعَ مَنْ اَحَبَّ» واتە: هەرکەس لەگەڵ دۆستی خۆی حەشری دەکرێ. جا ئەی برادەرەکانم، لەبەر ئەوە کە من زۆر تاوانبارم و بۆ ئەوەی کەس بە تاوانی من گرفتار نەبێ، تا هەلتان لەکیس نەچووە پاکانەم لێ بکەن و لێم جوێ ببنەوە.

(٨) ئەوە هەڵەیە کە هەندێ کەس وشەی «بەدئەفکار» بە «بەدئەفگار» دەخوێننەوە، چونکە ئەگەر «ئەفگار» بوایە «بەد»ی نەدەویست لەبەر ئەوە کە «ئەفگار» واتە نەخۆش و بریندار. جگە لەوە کە «ئەفگار» بۆ ئەم شوێنە دەست نادا.

مەگەر بەر مەوجی بەحری رەحمەتم خا وەسفی سەتتاری
وەگەرنا زەحمەتە پا بوونەوەم، ناومێکینە سەترم (٩)

-٦-

ئەوی دڵدار و دولبەرمە ئەوا دەڕوا لەبەرچاوم
بە دوویا بۆچی دڵ نەتوێتەوە نەڕوا لەبەر چاوم (١)

خەریکی حیفزی «حِزبُ البَحْر»ە یار، ئەڵبەت بە فکرێکە
خودا حیفزی بکا، باقڵ قەدەم دێنێتە سەر چاوم (٢)

بریقەی بەرقی جیلوەی کێ جەلابەخشی بینایىمە
کە قورسی ئافتاب و مەهـ وەکوو تەم دێتە بەرچاوم (٣)

لەکن پشکووتنی غونچەی دەمی، وەك گوڵ، سەراسەر گوێم
گوڵی روخساری دەرخا، نێرگس ئاسا سەربەسەر چاوم (٤)

---

(٩)سەتتاری: سەتتاریی خوا، گوناهـ پۆشی خوا. پا بوونەوە: پاك بوونەوە. سەتر: داپۆشین.

-٦-

(١)دەڕوا لەبەرچاوم: لەبەرچاوم ون دەبێ. نەڕوا لەبەر چاوم: بە چاوما نەیەتە خوار.

(٢)«حِزب البَحر»: دوعایەکە لە کتێبی «دلائِل الخَیْرات»دا لەچاپ دراوە کە هەمووی پاڕانەوەیە لە خوا و سەڵاواتە لەسەر پێغەمبەر (د.خ).

واتە: یار خەریکی لەبەرکردنی دوعای «حِزب البَحر»ە، خوا ئاگاداری بێ، رەنگبێ نیازی وابێ بێتە سەر دەریای فرمێسکی چاوم و بۆیە ئەو دوعایە لەبەر دەکا نەوەك بخنکێ.

لە بەکارهێنانی وشەی «حیفزی»دا بە دوو مەعنای جیا وردەکارییەکی جوان هەیە. خۆیشیان جیناسی تەواویان لە نێواندایە.

(٣)واتە: ئاخۆ بریقەی برووسکەی جیلوەی کێ چاوی وا رووناك کردوومەتەوە، رووناکی رۆژ و مانگم لا وەك تەم لێ هاتووە؟.

(٤)سەربەسەر: سەرانسەر، سەرتاسەر، هەمووی.

دەبێ حورمەت بگیرێ جێ نەزرگەی حەزرەتی یارە
کە ناکا دەم بە دەم تۆفانی دەم زێر و زەبەر چاوم(٥)

بە شۆخی دین و دڵمی دا بە تاراج، ئێستە وەك سۆفی
بە سەبحەی ئەشکەوە هاتۆتە سەر تەرکی نەزەر چاوم(٦)

سەبا کوحلی غوباری رێی کەسێکی پێیە دێ «مەحوی»
بەبێ حیکمەت نیە دەفرِێ لە ئێوارێوە گەر چاوم(٧)

---

☞

واتە: کە غونچەی دەمی یار دەپشکوێ و قسەیەك دەکا، هەموو گیانم وەك گوڵ دەکرێتەوە و دەبێ بە گوێ بۆ بیستنی ئەو قسەیە. کە گوڵی روخساریشی دەردەخا، هەموو گیانم دەبێ بە چاو و وەك نێرگس مەستی تەماشا کردنی دەبێ.

(٥) نەزرگە: نەزەرگە، ئەو شوێنانەی کە پیاوانی خودا تیایاندا دانیشتوون و ئێستا وەك شوینێکی پیرۆز تەماشایان دەکرێ. بۆیە وای پێ دەڵێن چونکە ئەو پیاوی خودایە بە چاوێکی تایبەتی تەماشای ئەو شوێنەی کردووە و بەر سەرنجی پیرۆزی خۆیی خستووە. دەشگونجێ لە «نزڵ گە»وە هاتبێ واتە تیا دابەزیوە و تیا حەساوەتەوە. دەم بە دەم: جار لەدوای جار. دەم: خوێن. زێر و زەبەر: سەرەوژێر.

واتە: بۆیە لافاوی خوێن کە جار لەدوای جار لە چاومەوە دەڕوا، چاوم سەرەوژێر ناکا و نایبا، چونکە نەزەرگەی یارە و شێوەی ئەوی تیا جێگیر بووە و بووە بە شوێنێکی پیرۆز خەڵك رووی تێ دەکەن. هەر لەبەر ئەوەش دەبێ قەدری بگیرێ و بە چاوی رێزەوە تەماشای بکرێ.

باوەڕێکی میللی لە کوردستاندا هەیە کەوا لافاو شوێنی پیرۆز نابا و هەورە برووسکە لێی نادا و بەڵکوو بە بەرەکەتی ئەوەوە شوێنی‌تری دەورو پشتیشی لە ئافەت و بەڵا دوور دەبن. مەحوی لەم بەیتەیدا ئیشارەت بۆ ئەو باوەڕە میللییە دەکا.

(٦) تاراج: تاڵان. سەبحە: تەزبێح.

واتە: وەختی خۆی چاوم بە شۆخی و بێ‌ترس، دین و دڵمی دا بە تاڵان ئەوەندە سەیری یاری کرد. ئێستایش تەزبێحێکی لە دڵۆپی فرمێسك هۆنیوەتەوە و خۆی کردووە بە سۆفی تۆبەکار و دەیەوێ ئیتر تەماشای یار نەکا. مەبەستی لەوەیە ئەوەندە گریاوە کوێر بووە.

(٧) کوحل «کُحل»: کلە. غوبار: تۆز.

☜

-٧-

به پیر ئەو ماهەوە چووم و بـە سـەر چـووم
پەری بوو، ئەو نەبوو، شەو بوو، بەسەر چووم (١)

تـەڵێ نـێرگسـم و بـاغی حـیرەتم پـێ
بە فەڕ هات و وەکوو گوڵ زوو بەسەر چووم (٢)

گلەی پێشم لەسـەر سـەر هـەم بـووە بـار
کە دی من دولبەرم هات و بە سەر چووم (٣)

---



واتە: لە خۆڕایی نیە وا لە ئێوارەوە چاوم دەفڕێ؛ ئاخۆ بای بەیانی تۆزی ڕێگای چ دۆستێکی هەڵگرتبێ و هێنابێتی وەك کلە بیکاتە چاوم.

لە ئەفسانەی کوردیدا هەیە ئەوەی چاوی بفڕێ میوانێکی خۆشەویستی دێ.

-٧-

(١)واتە: لەجیاتی پێ بە سەر بە پیری ئەو یارە وەك مانگ جوانەوە چووم، کەچی دەرکەوت ئەو نەبوو، پەری بوو و لەبەر ئەوەکە شەو بوو من بە هەڵە چووبووم.مەبەستی لە هێنانی ناوی «پەری» و «شەو» ئەوەیە ئەگەر پەری نەبوایە دەبینراو، ئەگەر ئەو بوایە شەویش بوایە دنیای ڕۆشن دەکردەوە چونکە ئەو وەك مانگ وایە.

(٢)باغی حیرەت: ئەو باخەی کە هەمووکەسی تیا سەرسام دەبێ. مەبەست لێی دنیایە.

واتە: من تاقە تەڵە نێرگسێکم، کەچی دنیام هەموو پێ پڕ بوو لە فەڕ و بەرەکەت. بەڵام بەداخەوە ئەوەندە نەمامەوە و وەك گوڵ زوو بەسەر چووم و فەوتام.

(٣)واتە: کە پێم دیتی لەجیاتی ئەوەی بەو بڕۆم بە پیری یارەوە، لەسەر سەر چووم، گلەیی لێ کردم و وتی: بۆ منت بەکار نەهێنا؟ ئەو شان و شکۆی بەکارهێنانەی لە بە پیری یارەوە چووندا بۆ خۆی دەویست. گلەیی ئەویش بوو بە بار بەسەر سەرمەوە.

لە کۆ کردنەوەی هەر سێ «سەر»دا وشە ئاراییەکی جوان و لە نێوان «پێ» و «سەر»دا تەناسوب هەیە.

دەزانـــم بـــادیەی عـــیشقە خـــەتەرناك
کەچی هەر چووم، ئەگەر مام و ئەگەر چووم [٤]

لە حـــینی نـــەزعی رۆحـــا، رۆحـــی عـــاشق
وتی: ئۆخەی لە میحنەتخانە دەرچـــووم [٥]

بـــە ئـــۆغـــر کـــردنی مـــن بـــوومە قـــەقنەس
کە ئەو چوو بۆ سەفەر، من بۆ سەقەر چووم [٦]

وتـــی: قـــەت وا مـــەیە، مـــن واوە هـــەر دێم
نەهات ئەو وا قەت و من واوە هەر چووم [٧]

شـــــوکر مـــــوورم بـــــووە پـــــامالّی مـــیرێ
بـــەبێ نـــامی ژیـــام و نـــاموەر چـــووم [٨]

غـــەمی قـــاتیلمە «مـــەحوی»! مـــونفەعیل مـــا
لە حەشرا کفنی خوێناوی بە بـەر چـووم [٩]

---

(٤) واتە: دەزانم بیابانی دڵداری بیابانێکی پڕ مەترسییە و لەوانەیە دڵدار سەری لێ دەرنەکا. لەگەڵ ئەوەشدا هەر گرتمەبەر، بێ ئەوەی گوێ بدەمە ئەوە بگەڕێمە دواوە یا لەناو بچم.

(٥) حین: کات. نەزعی رۆح: گیانکێشان. میحنەتخانە: ماڵی پڕ لە مـەینەت، مـەبەست لە لەشی ئادەمیزاد یاخود دنیایە.

(٦) قەقنەس: دەڵێن پەلەوەرێکە ئەوەندە دەفڕێ و بەرز دەبێتەوە تا تینی خۆر دەیسووتێنێ و دادەکەوێ. سەقەر: دۆزەخ، مەبەست ئاگری دوورییە.

(٧) واتە: یار پێی وتم: تۆ مەیە بەلای منەوە. من ئاخری هەر دێم بۆلای تۆ. کەچی ئەو هەر نەهات و من هەر چووم بەلایەوە.

(٨) موور: مێروولە. پامالّ: سواوە لەژێر پێدا. ناموەر: ناودار.

واتە: لە سایەی خواوە مێروولەی لەشی بێهێز و ناتەوان و لاوازم بوو بە ژێرپێی میرێکەوە کە یارمە. بەهۆی ئەوەوە منی لە ژیاندا وەك مێروولە نەناسراو و بێناو و نیشان، بە ناوبانگێکی زۆرەوە لە دنیا دەرچووم، چونکە خەڵك وتیان یار کوشتی.

(٩) مونفەعیل: شێواو.

-٨-

له باسی مەینەت و دەردی دەروونی بۆیە دەم نادەم
له خوێناوی دڵی پڕ غەم کە سینەم مەوج ئەدا تا دەم[١]

غەمم دێتێ کە بۆ وەك کۆدەك ئاگر بەردەمە کاغەز
لەبۆ نووسینی غەمنامەی دڵم هەرگا قەڵەم دادەم[٢]

هەلە پارانەوە ئەمڕۆ، زوبان و دڵ لە کارایە
زوبان ئاوەر کە بەستەزمانە سبحەینێ کە قووچا دەم[٣]

---

☞

واتە: خەمی خۆمم نیە کە یار دەمکوژێ، خەمی ئەوەمە کە بە بەرگی خوێناویمەوە لە ڕۆژی حەشردا بە بەردەمیدا دەڕۆم، دەمناسێتەوە و دەپەشۆکێ و ترسی لێپرسینەوەی لێ دەنیشێ.

-٨-

(١) واتە: بۆیە دەم لە باسی مەینەت و دەردی دەروون نادەم و لێی نادوێم، چونکە لە سینەمەوە تا دەمم لە خوێناوی دڵەی پڕ خەمم شەپۆل دەدا و دەمم گیراوە و هیچم پێ ناگوترێ.
(٢) کۆدەك: کوودەك، منداڵ. هەرگا: هەرگاه، هەرکاتێ.
واتە: هەرچەند قەڵەم دادەدەم و کاغەز دێنم نامەت بۆ بنووسم، ئاگری سۆزی دڵم گڕ بەردەداتە کاغەزەکە و دەیسووتێنێ. خەڵك تێناگەن مەسەلە چیە، وادەزانن خۆمم وەك منداڵان کاغەز دەسووتێنم. لەبەر ئەوە خەفەت دامدەگرێ و دەڵێم بۆ کارێ بکەم خەڵك وام لێ تێبگەن... بۆیە هەموو جارێ هەرکە نیازی نووسینی نامەم بە دڵدا دێ، بەرلەوەی دەستی پێ بکەم پەشیمان دەبمەوە.
(٣) زوبان ئاوەر: زۆر بڵێ و قسە زۆرکەر. بەستەزمان: زمان بەستراو، بێدەسەڵات.
واتە: تا زوبان و دڵ لە کاردایە، هەل لە کیس مەدە هەندێك لە خوا بپاڕێرەوە. سبەینێ کە مردیت و دەمت بەسترا، کام کەس زۆر قسە زۆرکەر بێ زوبانی دەبەسترێ و هیچی پێ ناوترێ.
دڵ: لە نوسخەی ئەسڵدا «دەم»، بەڵام لە هەموو نوسخەکانی تردا کراوە بە «دڵ». وادیارە شاعیر خۆی وای لێ کردووە، بەڵام ئەو نوسخەی یەکەمە دیار نیە کە ئەو دەستکاری کردووە.

**بە حەق هەر حەق، بە ناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژێ بووم**
**وەکوو مەنسوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم(٤)**

**بـڵا گـوڵ ئـاتەشی تـێ بـەر ببێ، پـەروانـە بـێ بـولبول**
**دەبێ هەر بچمە باغ و ڕازی دڵ شەممێکی بەر بـا دەم(٥)**

**سـبەینێ وەرنـە سـەیری کـوشتنم وادەم چـەها داوە**
**لەسەر وادەی درۆی ئەو نادەم ئیتر وادە، قـەت نـادەم(٦)**

**وتم: گەر حاڵی «مەحوی» تێبگەی ڕەم بەم حەدە ناکەی**
**وتی: ئەو تێنـەگـەیوە، مـن پـەریم و ئـەو بـەنی‌ئادەم(٧)**

---

(٤) لە ڕۆژێ بووم: لەو ڕۆژەوە کە هاتوومەتە دنیاوە.

(٥) بڵا: یا بلا، وشـەیەکـە لە زاراوەی کـرمانجی سـەروو، لەمـەویێش لە زاراوەی کـرمانجی خوارووشدا بەکارهێنراوە، بەمەعنا: دەسا، با، چش... ئاتەش: ئاگر. شەممێکی: شەممەیەکی، تۆزێکی.

واتە: من دەستبەردار نابم، دەبێ بچمە ناو باخ وکەمێك لە ڕازی دەروونی خۆم بدەم بە با، هەرچەند لە سۆزی ئەو ڕازی دەروونەم گوڵیش ئاگری تێ بەربێ و بولبول وەك پەروانە بە دەوری گوڵدا بسووتێ، چش با بسووتێن...

لە کۆ کردنەوەی «گوڵ» و «ئاتەشی»دا ئیشارەتێکی ناسکیش کراوە بۆ «گوڵ ئاتەشی» کە جۆرە گوڵێکە.

(٦) چەها: چەندەها، زۆر. نادەم «ی دوایی»: ناوەخت.

واتە: لەسەر وادەی درۆی یار کە وتی دەتکوژم، گەلێ جار وادەم بـە خـەڵك داوە و پێم وتوون سبەینێ وەرنە سەیری کوشتنم. بەڵام ئێستا چونکە بۆم دەرکەوتووە کە یار قسەی خۆی ناباتە سەر و ڕاست ناکا، ئیتر هەرگیز وادەی ناوەخت نادەم.

نادەم «ی یەکەم» (ن): نادیم. نادیم: پەشیمان.

(٧) ڕەم: ڕا، هەڵاتن.

واتە: ...یار لە وەڵامدا وتی: لەبەر ئەوە نیە کە شارەزای حاڵی مەحوی نیم، بۆیە خۆمی لێ نزیك ناکەمەوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە من پەریم و ئەو ئادەمیزادە و ئـادەمیزادیش پـەری نابینێ.

-٩-

ئەسیر و سەیدی قەیدی کەید و شەیدی نەفسی ئەممارەم
لە دەست ئەم مارە بەدچارە، چیە چارم، خودا چارەم![(١)]

لە حـــەفتا تـــێپـــەڕیم و حـەفتەیەك بـۆ دیـن و بـۆ دنـیا
بە کاری خۆم و کاری کەس نەهاتم، وەی چ بێکـــارەم![(٢)]

چ خۆش وەقتێ بوو ئەو وەقتەم لە گۆشەی بێ کەسیدا بووم
وەکـوو هـایم لە دەشـتی نـاکـەسیدا ئـێسـتە ئـاوارەم[(٣)]

بە ناخوون سوورەتی یارم لە سـەفحەی سـینە نـووسیوە
لە حەشرا وەقتی نەشری نامە کـردن، مـنم و سـیپارەم[(٤)]

---

-٩-

(١) سەید: نێچیر. قەید: کۆت و زنجیر. کەید و شەید: فێڵ و فر. نەفسی ئەممارە: نەفسی داوای خراپەکەر، ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ واتە: نەفس فەرمانی خراپەکردن دەدا بە ئادەمیزاد.

لە کۆکردنەوەی «سەید» و «قەید» و «کەید» و «شەید» و، «چار» و «چارە» و، «ئەممارە» و «ئەم مارە»دا کۆمەڵێ وشە ئارایی هەیە.

(٢) مەبەستی لەوەیە بنیادەم دەبێ بۆ کاروباری دین بە کەڵکی خۆی و بۆ کـاروباری دنـیا بە کەڵکی خەڵك بێت.

(٣) خۆش وەقتێ: کاتێکی خۆش. هایم: کەسێ سەری خۆی هەڵگرتبێ.

واتە: ئەو کاتە کاتێکی چەند خۆش بوو کە لە کونجی بێ کەسیدا کەوتبووم و نە باوکم هەبوو و نە دایك و هێشتا نەهاتبوومە دنیاوە. بەڵام ئێستا لە بیابانی خراپەکاریدا ئاوارە بووم و سەری خۆم هەڵگرتووە.

دەشتی (ن): چۆڵی.

(٤) سیپارە، «سی پارە»: کتێب. ئەسڵەکەی بە مەعنای قورئان بووە، چونکە سیپارە واتە سی پارچە و قورئانیش سی بەشە.

سەراپامی بەر ئـەشکەنجەی عـوقووبەت گـرتووە دەوران
لەبەر بێدەستییە وا تـێدەگـەن خـەڵقـی کـە بـێچـارەم(٥)

لە جـەیبمدا ئـەگـەر یـەك پـارە شك نـابەم، چ پـەروامـە
خودا گەر قابیلی دیبم هەتا سـەر جـەیبی سـەد پـارەم(٦)

نـە شـەیتان و نـە دەوران و نـە خـزمانم بـە مـن نـاکـەن
ئەوی نەفسی خەسیسم «مەحویا» کـردوویە دەربـارەم(٧)

---



لە قورئان و حەدیسا هەیە کەوا لەو دنیا هەرکەس نامەی کردەوەی خۆی دەدرێتە دەستی تا پیشانی بدا. مەحویش دەڵێ: من بە ناخوون سنگی خۆمم لەت لەت کردووە و وێنەی یارم لەسەر تەختەکەی کێشاوە. جا کە لە قیامەتدا هەرکەس نامەی کردەوەی خۆی کردەوە، منیش سیپارەی تەختی سینەم پیشان دەدەم و بەو نامەیەوە دەچمە مەیدانی مەحشەرەوە، دەڵێم ئەمانە نامەی کردارمە لە دنیادا.

(٥) عوقووبەت: سزا. دەوران: گەردوون. بێچارە: هیچ لەدەست نەهاتوو.

واتە: چەرخی زەمانە سەرتاپامی داوەتە بەر ئازاری سزا و دەسەڵاتی نەهێشتووم. ئێستە کە خراپە ناکەم، هی ئەوە نیە کە ئادەمیزادێکی چاکم، هی ئەوەیە دستم بەسراوە و دەسەڵاتم نیە.

(٦) جەیب «ی یەکەم»: گیرفان. جەیب «ی دووهەم»: بەرۆك.

واتە: مەبەستم نیە گیرفانم پووڵێکی تیا نەبێ، مادەم خوا ئەم سینەی بە دەردی عیشق سەد پارچە بووەم تا سەر پێ رەوا ببینێ.

لە بەکارهێنانی وشەی «جەیب» و «پارە»دا بە دوو مەعنای جیاواز وشە ئارایییەکی جوان هەیە.

(٧) واتە: ئەو دەرد و بەڵایەی کە نەفسی سووکی خۆم بەسەریدا هێناوم، نە شەیتان و نە زەمانە و نە خزمی خراپ کەسیان بەسەریان نەهێناوم و پێیان نەکردووم.

-١٠-

به نووری بادە کەشفی زوڵمەتی تـەقوا نـەکـەم، چبکـەم!
بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم، چبکـەم![1]

لە خەزنەی دڵمدا هەرچی هـەیە، هـەر داغـی سـەودایـە
دەسا ئەم نەقدە دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم، چبکەم![2]

لەگەڵ دەستی مەلا رێ نـاکـەوێ زونـناری زوڵفـی یـار
وەکوو «شێخ» ئیختیاری مەزهەبی «تەرسا» نەکەم، چبکەم![3]

لە رێی ئەو شۆخەدا خۆم کردە خـاك و پـێی نـەنا پـێمـا
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم، چبکەم![4]

---

-١٠-

(١) بادە: مەی. تەقوا: لە خواترسان.

واتە: چارم چیە ئەگەر بە تیشکی شەرابی عیشقی راستەقینە، تاریکایی وشکە سۆفیەتی لە دڵ دەرنەکەم و بە شەوقی مۆمی ئەو عیشقە شەوی بەندەگی نادڵسۆزانە رۆشن نەکەمەوە.

(٢) سەودا «ی یەکەم»: دەردی عیشق. نەقد: نەختینە. سەودا «ی دووهەم»: مامەڵە.

واتە: گەنجینەی دڵم تەنها جێگە داخی خڕی دەردی عیشقی پێوەیە و ئەگەر بە نەختینەی ئەم داخە خڕانە ئەوەندەی‌تر دەردی عیشق بۆ خۆم نەکڕم، چی بکەم؟! مـەبەستی لەوەیـە قازانجی لەوەدایە هەر خەریکی ئاڵو وێڵی دڵداری بێ.

(٣) زوننار: ئەو پشتێنەیە جاران مەسیحییەکان لە پشتیان دەبەست بۆئەوەی لە موسوڵمـانان جوێ بکرێنەوە. شێخ: شێخی سەنعان کە دەڵێن موسوڵمانێکی خواپەرست بووە دڵی لە کچە مەسیحییەك چووە و لە پێناوی ئەو خۆشەویستییەیدا چووەتە سەر ئایینی ئەو کچە. تـەرسا: رەبەن، مەسیحی.

واتە: زوڵفی یار وەك زونناری مەسیحییان وایە و بە دەستی مەلای موسوڵماندا ناپێچرێ. لەبەر ئەوە ناچارم وەك شێخی سەنعان بچمە سەر پێڕەوی مەسیحی تا ئەو زوڵفەم دەستگیر ببێ.

(٤) لەم بەیتەدا بەراوردێکی جوان و تیباقێکی مەعنەوی زۆر ورد لە نێوان بوون بە خاك و پێ پیا نەنان لەلایەکەوە و، خاکی هەموو جیهان بەسەردا کردندا هەیە لەلایەکی‌ترەوە.

دەمێکە شاری پڕ شۆری مەحەببەت مات و خامۆشە
به قانوونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا نەکەم، چبکەم!(٥)

لە چاوا نم نەما بۆ گریە، نۆبەی سەجدە بەردەریە
سیا ساڵم نەبارە، نوێژی ئیستیسقا نەکەم، چبکەم!(٦)

لەسەر تۆم دوشمنە دنیا، قەزییەم «مانع الجَمع»ە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم، چبکەم!(٧)

---

(٥) تەجەننون: خۆ شێتکردن. ئینشا: دامەزراندن.

مەبەستی لەوەیە دڵدار شێتە و شێت هەرچی بکا تەکلیفی لەسەر نیە.

(٦) نم: تەڕایی. گریە: گریان. بەردەر: بەردەرگا. سیا ساڵ: وشکە ساڵ. نەبار: بێ باران. ئیستیسقا: داوای باران بارین لە خوا. نوێژی ئیستیسقا: نوێژە بارانە.

واتە: ئەوەندە گریام چاوم تەڕایی تیا نەما تا بەدەم گریانەوە بێتە خوار، لەبەر ئەوە دەبێ سوجدە لەبەر دەرگای یاردا بەرم تا دڵی پێم بسووتێ و بەزەیی پیامدا بێتەوە، وەك چۆن لە ساڵی بێبارانا کە باران لە ئاسمانەوە نەهاتە خوار، دەبێ خەڵك سەر بنێنە زەوی و نوێژە بارانە بکەن بۆ خوا تا بەزەیی پیایاندا بێتەوە و بارانیان بۆ بیارێنێ.

لەوانەیە مەبەستی مەحوی ئەوەبێ بڵێ ئەوەندە گریام یار هەر خۆیی پیشان نەدام و منیش لەداخا کوێراییم داهات و فرمێسك لە چاوم بڕا. ئێستا دەبێ سوجدە بەرمە بەر خاکی بەری پێی و بە چاویدا بهێنم تا چاك بێتەوە، یا تا خۆیم پیشان بداو منیش لە خۆشیاندا چاوم چاك بێتەوە و فرمێسکی شادمانی بڕێژێ، وەك چۆن خەڵکی نوێژە بارانە بۆ خوا دەکەن و سەری بۆ دەخەنە سەر زەوی تا بەزەیی پیایاندا بێتەوە و بارانیان لە سەرەوە بۆ بیارێنێ.

(٧) «مانع الجَمع»: مەنتیقیەکان دەڵێن جیایی لە نێوان دوو شتدا یەکێکە لە سێ جۆر. جۆرێکیان پێی دەڵێن «حەقیقی» کە ئەوەتە نابێ هەردوو شتەکە پێکەوە بین و نابێ هیچیشیان نەبێ، بەڵکوو دەبێ یەکێکیان ببێ و یەکێکیان نەبێ، وەك ئەمە کە ژمارە یا تاقە یا جووت. جۆرێکی تریشیان پێی دەڵێن «مانِعةُ الخُلُو» کە ئەوەتە نابێ هیچیان نەبن، ئیتر با هەردوکیشیان بن وەك ئەوە کە پیاو و ژنێك پێکەوە بژین نابێ هیچکامیان دەرامەتێکی نەبێ، ئیتر با هەردوکیشیان بیانبێ. ئەو جۆرەکەشیان پێی دەڵێن «مانِعةُ الجَمع» وەك ئەمە کە مەحوی لەم

☜

**بەجێ‌ماوم لە یاران، نابەجێ ماوم، ئەجەل! زوو بە**
**بە مردن لەم قوسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم، چبکەم![٨]**

**ئەوا لەیلا بە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا «مەحوی»!**
**هەتا قامی قیامەت، ئاه و واوەیلا نەکەم، چبکەم![٩]**

---



بەیتەدا بە دۆستەکەی دەڵێ هەموو دنیام لەسەر تۆ لەگەڵ بووە بە دوژمن و مەسەلەی دۆستی من لەگەڵ تۆ و لەگەڵ ئەم دنیایە هەموو مەسەلەیەکی «مانعة الجمع»ە، چونکە ناتوانم دۆستی تۆیش بم و دۆستی هەموو ئەم عالەمەیش بم و؛ مادەم نامەوێ دەست لە تۆ هەڵگرم، ناچارم دەبێ دەست لە دنیا و چی لە دنیادایە لە تۆ بەولاوە هەموو هەڵگرم، هەرچەند ئەگەر بیەوێ دەتوانێ دەست لەهەردوکیان هەڵگرێ بەپێی ئوسوولی قەزییەی «مانِعة الجَمع»، بەڵام ئەو لێرەدا ئەو سەرەی «مانعة الجمع»ی مەبەست نیە.

لە نوسخەیەکدا لەجیاتی «نەکەم» نووسراوە «بکەم». بەم پێیەیش دەتوانین مەعنای بەیتەکە ڕاستکەینەوە و بڵێین دەڵێ: مادەم من دەستم لە تۆ هەڵگرت، ئیتر کەسیترم بۆ چیە و کێ بێ لای من لە تۆ نازدارتر بێ و چۆن دەبێ دەستبەرداری ئەوانیش نەبم. ئەم مەعنایە هەرچەند دەگونجێ، بەڵام دیارە بۆ ئێرە دەست نادا و لەگەڵ مەبەستی ئێرە ناکەوێتە یەك. بۆیە وادیارە هەڵەی نووسیارە، قەڵەمی خوارگرتووە و نوختەی نوونی کردووە بە هی بێ...

(٨) نابەجێ: ناشایان. قوسوور: ناتەواوی. کۆشك. ئیستیعفا: داوای دەست لێ هەڵگرتن.

واتە: یاران هەموو کۆچیان کرد و تەنها هەر من بە ناشایان لە شوێنی ناشایاندا ماومەتەوە. دەسا ئەی مەرگ، زووکە وەرە سەرم گیانم بکێشە، من ناچارم دەست لەم کردەوەی نابەجێیە هەڵبگرم کە ئەوەتە لە ناتەواوی ژیندا یا لە کۆشك و باڵەخانەی ژیندا ماومەتەوە.

زۆر ڕێی تێدەچێ ئەم بەیتەی مەحوی کە وشەی «یاران» و «قوسوور» و «ئیستیعفا»ی تێدایە، لە ژێر تەئسیری ڕووداوێکی سیاسی ئەو سەردەمەدا بەم جۆرە وترابێ.

(٩) قامی قیامەت: بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت.

واتە: یار دەڵێ لە ڕۆژی حەشردا دێمە لات و پێت دەگەم. سا توخوا مادەم ئەو وادەی وا دوورم بۆ دابنێ، من لەوە زیاتر چارم چیە کە هەر لە ئێستاوە تا ڕۆژی قیامەت هەر شین و واوەیلا بکەم و هەناسە هەڵبکێشم!.

لە نێوان «لەیلا» و «واوەیلا»دا وشە ئارایییەکی جوان هەیە.

-١١-

بـــبیبیێ، یـــا نـــەیبیێ، مـــن داد و بـێدادێ دەکـەم
گوێ بداتێ، یا نەداتێ، ئـاه و فـەریادێ دەکـەم[١]

حەققی ئیخلاسە بەجێ هێنانی ئادابـی خـولووس
پێ بزانێ، یا نەزانـێ، مـن بـە دڵ یـادێ دەکـەم[٢]

بێستوونی عیشقی شـیرینێك ئـەوا هـاتۆتـە پـێش
گەر لە حەق بێم و نەیەم، تەقلیدی فەرهادێ دەکەم[٣]

ئاوی تێغی وەفقی هەر توشنە لەبـێکـە، مـن نـەبێ
کارگەر بێ، یا نەبێ، لەم مەزڵەمـە دادێ دەکـەم[٤]

---

-١١-

(١) بیبیێ: بیبیسێ.

مەبەستی لەوەیە هەڵوێستی یار هەرچۆن بێ، ئەم ئەرکی سەرشانی دڵدار هەر بەجێ دێنێ و پێویستییەکانی خۆی جێبەجێ دەکا.

(٢) خولووس: ئەوەتە لە یار بەولاوە کەست لە دڵدا نەبێ.

(٣) واتە: وەك چۆن بەهۆی عیشقی شیرینەوە ئەرکی تاشینی شاخی بێستوون کەوتە ئەستۆی فەرهاد، منیش بەهۆی عیشقی یارەوە، ئەرکێکی وام کەوتووەتە سەرشان و ئەگەر لە توانامدا بێ یا لە توانامدا نەبێ چاولێکەرییەکی فەرهاد هەر دەکەم و شان دەدەمە بەر ئـەو ئـەرکەی هاتووەتە پێشم، جا بزانم لە عۆدەی دێم یا نایەم.

(٤) توشنە لەب: لێو تینوو. کارگەر: کاری. مەزڵەمە: ستەم.

واتە: هەر دڵدارێك لێوی بە ئاوی دەمی تێغی ئەو یارە تینووی بێ، گورج ئاواتەکەی دێنێتە دی و لێوی بەو ئاوە تەڕ دەکا و دەیکوژێ، من نەبێ کە لەکەیەکەوە چاوەڕوانم و هیچ دیار نیە. بۆیە ناچارم شکاتێك لە دەست ئەم بێدادییە بکەم کە لەگەڵم دەکرێ، جا خواهـ یار گوێ بداتێ یا گوێ نەداتێ و شکاتەکەم سوودمەند بێ یا نە.

دەرسی عیشقم هەر لە کن پەروانە یا بولبول بــووە
بیگەمێ، یا نەیگەمێ، هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم[٥]

کوشتنی ئیسفەندیاری نەفسە بــەستەی رایــی پــیر
گەر مەدەد کا، یا نەکا، لەو شاهە ئیمدادێ دەکەم[٦]

بەم نــزیکانە لەبــەرمە «مــەحویا»! رێگــێکــی دوور
بێتە دەستم، یا نەیێ، هەر کۆششی زادێ دەکــەم[٧]

---

(٥) ئوستاد: مامۆستا.

واتە: من هەمیشە مەشقی دڵداریم لەسەر دەستی پەروانە و بولبولدا کردووە کـە ئـەویان بێدەنگ دەسووتێ و ئەمیان هەمیشە هەر هاوار و ناڵەیەتی. جا خواە بگەمە پایەی ئەوان یـا نەگەم، یا بگەم بە یار یا نەگەم، دەبێ هەر لەبەر سەرمەشقی مامۆستایەك خەریك بم و خۆم رابێنم.

(٦) ئیـسفەندیار: کوڕی گوشتاسبی پادشای کەیانی کە بە فەرمانی باوکی چوو بۆ «زابول» بۆ ئەوەی رۆستەم بەند بکا، بەڵام لەسەر دەستی رۆستەمدا کـوژرا. مـەدەد: یـارمەتی. ئـیمداد: داوای یارمەتی. را: راو تەگبیر.

واتە: کوشتنی نەفسی وەك ئیسفەندیار بەدەسەڵات و بەدخوو لەسەر راو تەگبیری پیری تەریقەت وەستاوە و ئەو دەتوانێ بەکوشتنی بدا یا نەیدا، وەك چۆن کوشتنی ئیسفەندیار لەسەر راو تەگبیری پیرەزاڵی باوکی رۆستەم وەسـتابوو. بـۆیـە مـن داوای یـارمەتییەکـی لێ دەکـەم بۆئەوەی بتوانم نەفسم ببەستمەوە و بیکوژم، ئیتر ئەو خۆی دەزانێ بە فریامەوە دێت یا نایەت.

رایی (ن): راهی.

(٧) رێگێکی: رێگایەکی؛ مەبەست کۆچی مەرگە. زاد: توێشوو. مەبەست کردەوەی چاکەیە. ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿إِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوىٰ﴾ واتە: خۆ لە گوناه پاراستن چاترین توێشـووە بـۆ سەفەری ئەو دنیا.

-١٢-

تەرەب کەن، شوکر زۆری هێناوه غەم
«تَوَقَّعْ زَوٰالاً اِذٰا قِيلَ تَمّ»(١)

بەس ئەمڕۆ بڵێ مەن سبەی وا دەکەم
هەموو «وا دەکەم»تە سبەی «وا نَدَم»(٢)

زمانت کە ببڕی قسەت دێ بەکار
قەڵەم دادەدەم، پەندی خۆ دادەدەم(٣)

بەبێ جێ کەسێ بێ بکا غەیبەتم
سەگی هارە، دێ دەمگەزێ پڕ بە دەم(٤)

---

-١٢-

(١) واتە: شادمان بن وا شوکر خەم زۆری هێناوە و گەیشتووەتە رادەی ئەوپەڕی. هەر شتێکیش کە گەیشتە رادەی ئەوپەڕی، ئەوە نیشانەی تەواوبوونیەتی و دەبێ چاوەڕوانی تەواوبوونی بکرێ. ئەمەی مەحوی دەیلێ شتێکی زانستییانە و راستە.

(٢) واتە: بەس وابزانە هەموو شتێکت هەر لە دەستی خۆتدایە و کەم بڵێ سبەینێ واو وا دەکەم، چونکە ئەو خۆ بە خاوەن دەسەڵات و خاوەن ئیختیار زانینەت دەبێ بەهۆی پەشیمان بوونەوەی سبەینێت کە قەدەر رێت لێ دەگرێ و مەیدانی هەڵسووڕانت نادا.

مەبەستی مەحوی ئەوەیە هەموو کارێ بەستەیە بە خواستی خواوە و مرۆ لە راستیدا هیچ بەدەست نیە.

دەتوانرێ «وا دەکەم» بە «وادەکەم»یش بخوێنرێتەوە، واتە ئەو وادە و گفتی کارە کە داومە.

(٣) واتە: زمانی خۆت ببڕە و قسەی هیچ و پووچ مەکە، تا قسەت کاریگەر بێ، چونکە ئەو زمان بڕینە وەك قەڵەم دادان وایە بۆ قەڵەم، چۆن قەڵەم کە دابدرێ باش دەنووسێ و کە دانەدرێ باش نانووسێ، بنیادەمیش کە زمانی خۆی لە وتنی شتی خراپ گرت، وەك بڕیبێتی وایە و کە بڕیشی خراپەی بۆ ناگوترێ و چاکەی گوناهبار نەبوونی بۆ دەمێنێتەوە، ئەوەش وەك ئەوە وایە کە قەڵەم دابدرێ و باش بنووسێ...

(٤) دیارە ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ یەکێ لەوگیروگرفتانەی هاتوونەتە رێی مەحوی لە سلێمانیدا، لەسەر دەستی ئەو بنەماڵە و خێزانانەی گەلێ جار لە شیعریدا پلاری تێ گرتوون.

لە جـێ مـانەوە تـرش و تـاڵت دەکـا
ترێ بوو بە سرکە، عەسەل بوو بە سەم (٥)

زەعیفی منی کردە پووش، ئێستەکەش...
لە من هەر دەکەن ئەم غـەزالانـە رەم (٦)

لە کـۆیـا مـنی گـرتە بـەر تـیری تـەعن
رەقیب ئیشیە قەتڵی سەیدی حـەرەم (٧)

لە شێوەت پەشێوانی فورس و عـەرەب
لە لەهجەت خورۆشانی رۆم و عەجەم (٨)

کە لەو بـەردەرە بـووم بـە قـاپی نشـین
منم «مەحویا»! واریسی تەختی جەم (٩)

---

(٥) عەسەل: هەنگوێن. سەم: ژار.

لەوانەیە ئەم بەیتە نیشانەی بێزاربوونی مەحوی لە ژیانی سلێمانی و بڕیاردانی چوونی بێ بۆ شوێنێکی‌کە...

(٦) غەزال: ئاسك. رەم: راکردن.

واتە: لاوازیم گەییوەتە رادەیەك کردوومی بە پووش، تا ئەو یـارانـە کـە وەك ئـاسك سـڵ دەکەنەوە لێم نەترسن و بێنە سەرم، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر لێم دەسڵەمێنەوە و نایەن.

(٧) واتە: بەدکار لە حوزووری یاردا دامیە بەر تیری تانە و توانج، بێ‌ئەوەی قەدری ئەو شوێنە بزانێ. لێی ناگرم، پیشەی خۆیەتی لە حەرەمی کەعبەی یاردا دڵدار نێچیر بکا، هەرچەند راو کردن لە حەرەمی کەعبەدا حەرامە.

وشەی «رەقیب» هەم فاعیلی «گرتە»یشە و هەم موبتەدای «ئیشیە»یشە...

(٨) واتە: بەهۆی دیتنی دیمەنی جوانتەوە فارس و عـەرەب هـەموو شـێواون و سـەریان لێ تێك‌چووە و بەهۆی گوفتاری شیرینتەوە رۆم و عەجەم خورۆشاون.

مەبەستی لەوەیە لە هیچ‌لایەك هاوتات نیە.

(٩) واتە: ئەگەر ببم بە دەرگاوانی دەرگای ماڵی یار، ئەوە بەویەڕی شان و شکۆ دادەنێم بـۆ خۆم و خۆم بە میرات‌گری موڵکی جەمشید دەزانم.

بووم بە (ن): بوو بە. بەپێی ئەم نوسخەیە دەبێ بەیتەکە هونەری ئیلتیفاتی تێدابێ.

-١٣-

غونچە دڵ بوونم لە حەسرەت لێوی تۆیە، غونچە دەم!
غونچەکەی تۆ مەر شیفا دا غونچەکەم، ئەی غونچەکەم![١]

سینە چاکم وەك گوڵ و دڵ پڕ لە خوێنم غونچەوەش
بێ گوڵی روخسار و غونچەی لێوەکەت، قوربانی بەم[٢]

غولغولی بولبول لە عیشقی گوڵ نەبوو لەم سوبحەدا
شەعشەعەی ئەو غەبغەبە کەوتبووە سەر ئەم باغە هەم[٣]

لاڵە بێ لالەی روخت «مەحوی»، وەکوو مورغی خەمۆش
مەر بە چاکی سینە وەك گوڵ شەرحی دووری کا، سەنەم[٤]

---

-١٣-

ئەم پارچە شیعرە لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) واتە: ئەی یاری دەم وەك خونچە گیراو کە قسەیەکت لە دەم دەرنایەت، من لە داخی بێدەنگی لێوی سووری تۆیە، دڵم وەك خونچەی سوور گووشراوەتە یەك و خوێناوی بووە و بە وتەیەکی خونچەی نەپشکووتووی دەمی تۆ نەبێ خونچەی دڵی گووشراوی من چاك نابێتەوە.

(٢) چاك: لەت. غونچەوەش: وەك خونچە.

واتە: هەی بەقوربانی گوڵی روخسار و خونچەی لێوت بم، من بێ ئەوان سینەم وەك گوڵ کراوەیە و دڵم وەك خونچە پڕە لە خوێن.

(٣) غولغول: هەرا. شەعشەعە: پرشنگ. غەبغەب: گۆشتی ژێر چەناکە.

واتە: بولبول کە ئەم بەیانییە کەوتبووە هەراو ئاواز خوێندن، وەنەبێ بەهۆی عیشقی گوڵەوە بووبێ ئەوەی کردبێ، بەڵکوو بەهۆی ئەوەوە بوو کە تیشکی ژێر چەناکەی یار دابووی لە باخیش...

(٤) خەمۆش: کپ و بێدەنگ.

واتە: بێ لالەی رووی تۆ، ئازیز، مەحوی وەك باڵدارێکی کپ و بێدەنگ وایە. بۆیە ئەم بتە بێدەنگەکە مەحوییە، مەگەر چەشنی گوڵ بە لەت لەتی سینەی بتوانێ رازی دڵیت بۆ لێك بداتەوە.

لە دەستنووسەکانی بەردەستماندا لە نێوان ئەم بەیتە و بەیتی پێشوودا، جێگەی بەیتێك بە بۆشی ماوەتەوە. دیارە فەوتاوە. شێخ موحەممەدی مەحویش نووسیویە زۆرمان هەوڵدا، دەستمان نەکەوت.

-١-

وەك گوڵ هەموو دەمە دەرەوەم سەربەسەر زوبان
وەك غونچەیە دەروونی، دڵی گوڵ لەسەر زوبان[(١)]

یەعنی: کە زیکری زاهیرم و فیکری باتینم
هەر وەسفی لێوتە بە هەموو دەم، بە هەر زوبان[(٢)]

ناوت دەبەم، دڵم بە زوبانم حەسەد دەبا
یادت دەکەم، لەگەڵ دڵەکەم دێتە شەڕ زوبان[(٣)]

دێ باسی دیدەو و لەب و گوفتاری تۆ بکەم
بادام و شەککەر و نوقڵم دێتە بەر زوبان[(٤)]

هەر حەرفی کوشتنە کە دەمی پێ بپشکوێ
ئەم توتییە بە خوونی پژاوە مەگەر زوبان[(٥)]

---

-١-

(١) هەموو دەمە: هەمیشە.

واتە: هەمیشە دەرەوەی لەشم وەك گوڵ کراوەتەوە و سەرتاپای بووە بە زوبان و باسی تۆ دەکا. ناوی دڵی گوڵ لەسەر زوبانیشم وەك خونچە پێچراوە بەیەکدا و خۆی توندکردووەتەوە و بیر لە تۆ دەکاتەوە.

مەحوی بۆیە سیفەتی «گوڵ لەسەر زوبان» بۆ دڵ دادەنێ، چونکە دڵی شوبهاند بە خونچە و خونچەش گوڵی بەسەر زوبانەوەیە هەرکە کرایەوە دەبێ بە گوڵ. چونکە دڵیش هەر بیر لە گوڵی رووی یار دەکاتەوە و ناوی ئەو بەسەر زوبانیەوەیە.

(٢) زیکری زاهیر: قسەی دەم. فیکری باتین: بیری دڵ.

ئەم بەیتە مەعنای بەیتی پێشوو روون دەکاتەوە.

(٣) مەبەستی لەوەیە دڵ و زوبانم شەڕیانە لەسەر تۆ و هەرکامیان دەیەوێ بەتایبەتی بۆ ئەو بێ.

(٤) واتە: دیدەت وەك بادام و لێوت وەك شەکر و گوفتارت وەك نوقڵە.

(٥) واتە: خونچەی دەمی یار تەنها بە وشەی کوشتن دەپشکوێ. بۆیە وادیارە زمانی ئەم توتییە کە لە وشەی «کوشتن» بەولاوە هیچ نازانێ، بە خوێن پژاوە.

خوونی (ن): خوێنی.

بۆ شـوكری جـەوری ئـەو دوو بـرۆیـە لە قـەتڵمـا
هەر بن موێكە میسلی گوڵی شەست پەڕ زوبـان(٦)

هـەر ئـەم زوبـانە بـاعیسە بـۆ سـەربڕیـنی شـەمع
«مەحوی»! سەرم رەحەت بووە بێڵێ ئەگەر زوبان(٧)

-٢-

بەهاری عومر ئـەوا گـەییە حـوزەیران
كەچی وەك كۆدەك ئێستە دەچمە سەیران

دەبێ رەم كەم لە شار و بـبمە وەحشـی
نـیە حـیلەی‌ترم بـۆ رامـی جـەیران(١)

لە ئـاوی تـێغـی هـەر زامـێ بـوو ئـاوا
بـرینی مـن نـەبێ هـەروایـە وەیـران(٢)

---

(٦) واتە: هەر بن موویەكی لەشم وەك گوڵە شەستپەڕ شەست زوبانی لێ‌بووەتەوە و هەموو سوپاسی برۆی یار دەكەن بەرابەر بەوە كە بوو بە شیر بۆ كوشتنم.
(٧) واتە: وەك چۆن ئەگەر زوبانەی گڕی چرا لار بێ، سەری فتێڵەكەی دەبڕن، زوبـانی زۆر بڵێی منیش لەوانەیە سەرم بە بڕین بگەیەنێ. ئەگینا ئەگەر زوبانم لێم گەڕێ سەرم رەحەتە و بۆ خۆم سەلامەت دەبم.

-٢-

(١) وەحشی: كێوی. جەیران: ئاسكی دەشت.
واتە: یارم بە هیچ كلۆجێ بۆ دەسەمۆ و ماڵی ناكرێ. بۆیە تا لە ئاوەدانیدا بم دەستم لێی گیر نابێ، لەبەر ئەوە ناچارم سەری خۆم هەڵگرم و بچمە بیابانێك، بەڵكوو كە منیش وەك ئەو بووم بە كێوی، بتوانم دەستی لێ گیر بكەم.
(٢) وەیران: وێران، لەبەر راگرتنی سەنگی بەیتەكە دەسكاری كراوە.
واتە: برینی هەموو دڵدارێك بە ئاوی تێغی برۆی یار ئاوەدان بووەوە، برینی من نەبێ كە هەر وەك خۆی وێرانە و یار ناكا جارێك تێغێكی لێ بدا.

به نەشئەی بۆنـی گـوڵزاری چ کـۆیـەك
لە تەنما مورغی ڕۆحم هاتە تەیران؟![٣]

سـولەیمانم هـەواڵی مـووری پـرسیم
لەناو ئەمساڵم ئەز هودهود لە تەیران[٤]

بریقەی بەرقی جـیلوەی تـۆ لە چـاوی
نەدابـێ، بـۆ چـیە ئـایینە حـەیران؟![٥]

لە «مەحوی» دڵ ئەگەر ون بوو وەکوو گەنج
سۆراغی‌کەن لە کونجی کۆنە دەیـران[٦]

-٣-

هـــەموو عــالەمتە پــابەند و لە دامــان
کەچی دەستی کـەست نـاگـاتە دامـان[١]

---

(٣) کۆ: کۆڵان، مەبەست لە دەوروبەری یارە. تەن: لەش. مورغ: پەلەوەر. تەیران، [«طیران»]: فڕین.

(٤) موور: مێروولە. ئەز: لە. وشەیەکی فارسییە. هودهود: پەپوو سلێمانە. تەیران: باڵندەکان.
واتە: یاری سولەیمان پایەم، لەناو هەموو هاوچەشنەکانمدا هـەواڵی مـنی وەك مـێروولە بێ‌دەسەڵاتی لە پەپووە سلێمانە پرسی لەناو هەموو باڵداراندا.

(٥) واتە: ئاوێنە بۆچی حەیران و سەرسام بووە، ئەگەر لەبەر ئەوە نیە کە تیشکی دەرکەوتنی تۆ داویە لە ناوچاوی!.

(٦) واتە: ئەگەر دڵم ون بوو لێم، لە کونجی بتخانە کۆنەکاندا بۆی بگـەڕێن، وەك چـۆن لەو شوێنانەدا بە دوای گەنجدا دەگەڕێن، چونکە دیارە چووە بۆ لای یارێکی وەك بت جـوان و ڕازاوە.

-٣-

(١) پابەند: پێ بەسراوە، گیرۆدە.

**دوهـــاتی ئـــەوروپا وەك ئـــەهلی دێهـات**
**لە چارەی دەردی عیشقا جوملە دامـان (٢)**

**بـــرا! مـــەردم دەویٚ عـــەقڵی نـــەلەنگیٚ**
**بە لەنجەی ناز و عیشوەی نـەونەمامان (٣)**

**لەگـــەڵ زانت دەکـــەویە کـــۆشـــی دنـــیا**
**ســـبەی قـــاتیلتە، ئـەمڕۆ بـۆتـە مـامان (٤)**

**ســـەرو ســـامانمت پـــرسی، مـــەپرسە!**
**سەری تۆ خۆش، نە سەر ماوە نە سامان (٥)**

**غـورووری حـوسنە فـیرعەونی بـە تـۆ دا**
**رەقیبی سەگ بەچی بوو، بوو بە هامان؟!(٦)**

---



واتە: عالەم هەموو گیرۆدەی عیشقی تۆن و لە داوتدا بەسراونەتەوە، کەچی تۆیش ئەوەندە دوورەدەستی، دەستی کەس ناگاتە داوێنت.

لە نێوان هەردوو «دامان»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٢) دوهات، «دهاة»: جەمعی «داهیە»یە واتە بلیمەت و زۆرزان.

واتە: زیرەکەکانی ئەورووپایش وەك لادێییە ساویلکەکانی لای خۆمان لە چارەکردنی دەردی عیشقدا داماون و نازانن چۆن چار دەکرێ.

لە نێوان «دوهات» و «دێهات»دا وشە ئارایییەکی ناسك هەیە.

(٣) واتە: مەردێکم دەوێ بتوانێ لەبەر ناز و عیشوەی نەونەمامانَدا خۆی رابگرێ و عەقڵی نەگۆڕێ.

(٤) زان: لەدایك بوون.

واتە: کاری دنیا سەیرە، کە لەدایك بووی دەس‌بەجێ دەکەویە ناو کۆشی ئەو، وەك بڵێی ئەو مامانتە، کەچی سبەینێیش هەر ئەو خۆی بە کوشتنت دەدا.

(٥) سامان: دارایی.

(٦) هامان: وەزیری فیرعەونی سەردەمی حەزرەتی مووسا.

**لە دنـــیادا وەکـــوو مـــنداڵی نـــاکـــام**
**بـــە نـــاکـــامی دەچـــن دنـــیا بـــە کـــامان(٧)**

**بـــەهانە مـــەگـــرە، لەو جـــامانە جـــامێ**
**کـــــەرەم کـــە ســـاقیا، بگـــرە رجـــامان**

**بە کولفەت ئەو، بـە ئـولفەت ئـەم گـرفتار**
**وەکوو یەك زاهید و «مەحوی» لە دامان(٨)**

**-٤-**

**نیسبەت بدرێ حوور و پەری گەر بە لە تۆ چـوون**
**باڵیدە دەبن تا دەگـەنە ئـەوجی لە خـۆ چـوون(١)**

---



واتە: ئەی یاری نازدار، ئەوە تۆ بە هەر رەنگ بەهۆی جوانیتەوە خۆت لێ بـایی بـووە و خۆت کردووە بە فیرعەون، بەڵام ئەی بەدکاری نامەرد بـەچی دەنـازێ و بـەهۆی چـیەوە و لەبەرچی خۆی کردووە بە وەزیری تۆ؟!.

(٧) دنیا بە کامان: ئەوانەی دنیا بە ئارەزووی ئەوانە.

(٨) کولفەت: ئەرك خستنە ئەستۆی خۆ.

واتە: زاهید و مەحوی هەردوکیان کەوتوونەتە ناو داو وگرفتار بوون، ئەو بە دەردی ئەرکی قورس خستنە ئەستۆی خۆ کە لە عۆدەی نایەت و ئەمیش بە دەردی خۆشەویستی و دڵ دان بە یار.

**-٤-**

(١) حوور: حۆری بەهەشت. باڵیدە: فڕندە. ئەوج: لووتکە.

واتە: ئەگەر بە حۆری بەهەشت و بە پەرییان بوترێ کەوا لە تۆ دەچن، لە خۆشـییاندا وا دەدەنە شەقەی باڵ و ئەوەندە بەئاسماندا دەفڕن، هۆشیان لە خۆیان نامێنێ و دەمرن.

نیسبەت بدرێ (ن): وەسفی بکرێ.

ئەم خـەڵقـە کـەوا تـێ گـەییون گـەییونە مـەقسوود
ڕێشگاوییەکی مەحزە، بە دەردی من و تۆ چوون [٢]

بـۆ جـیلوەیی بـێچـوونی نـیە قـووەتی چـوونم
«لَا حَوْلَ وَ لَا قُوَّة» کە مـن حـەولمە بـۆ چـوون [٣]

بێ چوونە عەدەم، پەی بە سوراغـی دەمـی نـابەی
فایز ببە بەم گەوهەرە لەو بـەحرە بـە ڕۆ چـوون [٤]

مـوشتاقی دەمـی تـێغت ئـەوەندە بـە بـەهانەن
بۆ چوونە فەنا، هەر بە ئیشارێکـی بـڕۆ چـوون [٥]

---

(٢) گەییونە: گەیشتوونەتە. ڕێشگاوی: خەیاڵی خاو. مەحز: ڕووت.

واتە: ئەوانەی وا تێ گەیشتوون کەوا گوایە بە ئاوات گەیشتوون و بوون بـە پـیاوی تـەواو، شوێنی خەیاڵی خاو کەوتوون و وەکوو من و تۆ فـەوتاون و تـووشی ئـەو دەردە بـوون کـەوا تووشی ئێمە بووە.

(٣) بێچوون: بێ‌هاوتا. «لَا حَوْلَ وَ لَا قُوَّةَ»: لەگەڵ «إِلَّا بِاللّٰهِ»، ڕستەیەکە لەکاتی سەرسامی و نیازی دەربڕینی بێ‌دەسەڵاتیدا دەوترێ. حەول: تەقەلا، هەوڵ.

واتە: هێز و توانای چوونم نیە بۆلای تیشکی بێ وێنەی یار. سەرسامم کەوا لەگەڵ ئەوەشدا چۆن کەوتوومەتە هەوڵدان بۆ ئەوەی بچمە لای!.

(٤) سوراغ: کون، کەوتنە پەیجۆر بۆ دۆزینەوەی کەسێك یا شتێك.

واتە: بێ ئەوەی بچیتە جیهانی نەبوونییەوە و بفەوتێیت، هەرگیز پەی نابەی بە دەمی یار و ئاوی حەیاتی لێ نۆش ناکەی. جا ئەگەر دەتەوێ گەوهەری دەمی یارت دەستـکـەوێ، بـە دەریای نەبووندا ڕۆ چۆ و بچۆرە بنەکەی.

(٥) ئیشارێکی: ئیشارەیەکی.

واتە: ئەوانەی موشتاقی دەمی تێغی تۆن. ئەوەندە لەسەر بیانوون بۆ مردن. هەرکە برۆیەکت لێ هەڵتەکاندن. دەس‌بەجێ بە کوشت دەچن.

**خەندێکی لە غونچەی دەمی تۆ دی کە لە باغا**
**هەر لەو دەمەوە لێو و دەمی غونچە لە گۆ چوون[٦]**

**بۆ قورسی گەنمگوونیە رۆحی چووە «مەحوی»**
**وەك زاهید و سۆفی کە لەبۆ خەپلەیی جۆ چوون[٧]**

**-٥-**

**شەخسێکی ساحێب ئەحواڵ پرسی: کە ئەی فلاتوون!**
**یۆنانییانی قەومت بۆچی بە دەردی سەگ چوون؟[١]**

---

(٦) خەندێکی: خەندەیەکی، پێکەنینێکی.

واتە: دەم و لێوی خونچە کە زەردەخەنەیەکیان لە دەمی تۆوە دی لەناو باخدا، دەس‌بەجێ لە تاوا لە گۆ چوون و لە جووڵە کەوتن و خونچە پشکووتنی نەما.

(٧) گەنمگوون: گەنمڕەنگ. خەپلە: کولێرە.

واتە: گیانی مەحوی بۆ قورسی رووی گەنمڕەنگی یار دەرچووە، وەك چۆن گیانی زاهید و سۆفی بۆ کولێرە خڕێکی جۆ دەردەچێ.

-٥-

مەحوی ئەم پارچە شیعرەی بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی خۆی بەبۆنەی سەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانییەوە بەسەر گەلی یۆناندا وتووە کە راپەڕیبوو بۆ داوای مافی خۆی و بۆ سەندنەوەی ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتەکەی تێدەکۆشا.

لەم پارچە شیعرەوە دیارە مەحوی هەستی بەوە نەکردووە کە رژێمی سوڵتان «عبد الحميد» رژێمێکی ستەمکار و داگیرکەر بووە و گەلی یۆنانیش، وەك گەلانی عەرەب و کورد و گەلانی بەڵقان گەلێکی خەباتکەر بووە و بۆ لە مل داماڵینی کۆت و زنجیری کۆیلەیی عوسمانییەکان هەوڵی داوە. مەحوی تەنها وەك موسوڵمانێکی باوەڕ بە «خەلافەتی عوسمانی» کردوو هەستی خۆی دەردەبڕێ و تێکڕای قەسیدەکەی و ئەو دەمەتەقێ خەیاڵییەی کە لەگەڵ ئەفلاتوونی فەیلەسووفی یۆنانیدا بوویەتی، لەم سەرچاوەیە ئاو دەخواتەوە.

(١) ساحێب ئەحواڵ: ئەوانەی حاڵیان لێ دێ، پیاوی خوا. فلاتوون: ئەفلاتوون، یەکێکە لە

ئــەو زوو فــونوونە جــوابــی دابــوو: بــەجێیــە وا بــێ
خۆی دایە بــەر شــیهابی ســاقیب کــە دێوی مــەلعوون (٢)

بـــــاتیل مــــــوقابیلی حــــەق وەســـتا، بـــەتاڵە ئــیشی
گەردی بــە بــادە خــاکــێ بــێ هــەڵپــژێ بــە گــەردوون (٣)

خورشیدە موعجیزەی شەرع، زوڵماتە سەفسەتەی پووچ
ئــیسلامییان هـــەموو دیــن، یــۆنــانییان هــەموو دوون (٤)



فەیلەسووفە بەناوبانگەکانی یۆنان، قوتابی سوکرات و مامۆستای ئەرستاتالیس بووە، خاوەنی کتێبی «کۆمارێتی» و «ڕامیار» و «دەمەتەقێ» و چەند کتێبی ترە. لە ٤٢٧ تا ٣٤٧ی پ. ز ژیاوە.

واتە: یەکێ لە پیاوانی خوا لە ئەفلاتوونی پرسی کەوا هی چی بوو یۆنانییەکانی خزمەت لە شەڕەکەیاندا لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمید کارێکیان بەسەر هات، مەگەر بەسەر سەگ هاتبێ؟

وەڵامی ئەفلاتوون لە بەیتەکانی پاشەوەدایە.

دەردی سەگ (ن): دەردی سك. بەپێی ئەم نوسخەیە مەبەست زەحیری و بەلەفیرەیە.

(٢) زوو فونوون: «ذُو فُنون»، هونەرمەند. شیهابی ساقیب: ئەو ئەستێرەیەی بە شەو دەکشێ.

واتە: ئەفلاتوونی هونەرمەند لە وەڵامدا وتی: بەجێیە یۆنانییەکان وایان لێ بێ، چونکە ئەوان وەك شەیتان و عوسمانییەکان وەك ئەو ئەستێرانە وان کە بە ئاسماندا دەکشێن. هەرکاتێ کە شەیتان بیەوێ بچێ بۆ ئاسمان گوێ لە قسەو باسی مەلائیکەتان بگرێ، خوا ئەستێرەیەکی بەدوادا دەکشێنێ و دووری دەخاتەوە، وەکوو خوا لە قورئاندا دەفەرموێت.

(٣) واتە: یۆنانییەکان ناحەق و عوسمانییەکان حەقن. ناحەقیش ئەگەر بێ بەربەرەکانێ لەگەڵ حەقدا بکا، ڕەنجی بە با دەچێ. خاکێکیش بێ بە ڕووی ئاسمانا هەڵپژێ، گەردی دەدرێ بە با.

بێ هەڵپژێ (ن): پێ هەڵبڕێ.

(٤) خورشید: خۆر. سەفسەتە: ئیددیعا بە بەڵگەی هیچ و پووچەوە. بە ئینکار کردنی شتی مەحسووسیش دەوترێ. دوون: سووك.

واتە: موسوڵمانان ئایینیان هەیە کە موعجیزەی وەك ڕۆژ دیارە. یۆنانییەکانیش ئیددیعای بێ بەڵگەیان هەیە.

**لەم کـــارەدا تکـاکـەر کـێ: حـەزرەتی ریســالەت**
**«لاسِــیَّما» تکــاگــر کــێ: «ذُوالجَـلال»ی بـێچـوون[٥]**

**فــەتح و زەفـەر بـە نـاوی کـێ بـێ؟ خـەلیفەی ئـیسلام**
**عەبدولحەمیدی غازی، سوڵتـانی روبـعی مـەسکوون[٦]**

**ســائیل کــە لەو جــەنابە فــائیز بــوو بــەم جــەوابــە**
**مەزموونی پڕ لە حیکمەت، ئـەلفازی پـڕ لە مـەزموون[٧]**

**پێی وت بە سەد تەئەددوب، ئوستادی بـێ تـەعەسسوب!**
**بەم حاڵ و سـاڵە لایـق تـەئریخی چـی دەفـەرموون؟[٨]**

---

(٥) حەزرەتی ریسالەت: مەبەست لە پێغەمبەرە (د.خ). «لاسِیَّما»: نەخوازەڵا. «ذُوالجَـلال»: خاوەن شکۆ، مەبەست لە خوایە.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوە پێکەوە دێ.

(٦) غازی: وڵاتان داگیرکەر. روبعی مەسکوون: ئەو بەشەی گۆی زەوی کە ئـادەمیزادی تـیا دەژی.

واتە: لە شەڕی موسوڵمانان و یۆنانییاندا تکاکاری سەرکەوتنی موسوڵمـانان پـێغـەمبەرە دروودی خوای لێ بێ و، تکا لاکراویش خواوەندی بێ هاوتا و خاوەن شکۆیە. دیاریشە کە پێغەمبەر (د.خ) تکای شتێ لە خوا بکا خوا بۆی جێبەجێ دەکا و بەم پێیە دەبێ موسوڵمانان بەسەر یۆنانییەکاندا زاڵ ببن و سەرکەوتن بە ناوی سوڵتان «عبد الحمید»ەوە بێ.

(٧) سائیل: پرسیارکەر. فائیز: بەختەوەر. مەزموون، [«مضمون»]: ناوەڕۆك.

مەعنای ئەم بەیتەش بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٨) تەئەددوب [«تَأَدُّب»]: ئەدەب کردن. تەعەسسوب [«تَعَصُّب»]: لایەنی لایەك بـە نـاحەق گرتن.

واتە: کە پرسیارکەرەکە ئەم وەڵامە پڕ مەعنا و وردەی لە ئەفلاتوون بیست، بە ئەدەبێکی فراوانەوە پێی وت: کەواتە ئەی مامۆستای بەناحەق لایەنی کەس نەگرتووم چ مێژوویەکتان بە بیردا دێ داینێین بۆساڵی ئەم سەرکەوتنە؟.

دووبـــاره هـاته گـوفتار: مـن زوو وتـوومه نـاچار
ئـیسلامییان بـفەرموون یـۆنـانییان تـەلەف بـوون[(٩)]

-٦-

له مــەیخانه، خـودا! گـەر ئـێمـه دەرچـین
بەکێ بەین ئیلتیجا، بۆ کـێهـه دەرچـین؟![(١)]

کــه ئـێمـه چـوونه جـەننەتمان بـه تـۆ دا
له ئــێمـه لاده زاهـیدا! ئـێمـه هـەرچـین[(٢)]

خەت و زوڵفی بـه یـەکـدا دێ لەسـەر روو
مەگەر زەنگ و خەتا شەڕیە لەسەر چـین[(٣)]

---

(٩) نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە، بە حیسابی ئەبجەد، بەپێی شێوە نووسینی کـۆنـی کـوردی، واتە بەم جۆرە:

«اسلامیان بفرمون یونانیان تلف بون»

مێژووی ساڵی ئەو جەنگەیە کە دەکاتە ١٣١٧ی کۆچی، بەرابەری ١٨٩٩ـ١٩٠٠ی ز.

-٦-

(١) ئیلتیجا: پەنا. کێهە: کام. دەر: دەرگا. چین: بچین.

واتە: خوایە! ئەگەر لەم مەیخانەی دنیایە دەرچووین و مردین، لە خۆت بەولاوە پەنا بەرینە بەر کێ و روو بکەینە ماڵی کێ؟. (٢) هەرچین: هەرچی هەین.

(٣) مەگەر: بۆچی. زەنگ: وڵاتی قولە رەشەکان. خەتا: خەتاو خـوتەن لە تـورکستان. چـین: وڵاتی چین.

مەحوی لەم بەیتەدا رووی یاری شوبهاندووە بە چین، لەوەدا کە وەك چۆن وڵاتـی چـین دەکەوێتە رۆژهەڵات، رووی یاریش وەك رۆژ جوانە، یا لەوەدا وەك رووی چینی زەرد و سوورە. زوڵفی رەشیشی شوبهاندووە بە قـولەڕەش. مـووی روویشـی شـوبهاندووە بـە خـەتا. هـۆی شوبهاندنەکەش نزیکی وشەی «خەت» و «خەتا»یە لە یەکەوە.

له باوەشما دەدا مـەوج ئـەشكی حـەسرەت
كەمەرتی گـرتە بـاوەش تـا كـەمەرچـین[٤]

ئــەوەندە تــەنگ و نــاخۆشــە، لە دنـیا...
خۆشە دەرچوون، ئەگەرچی بۆ سەقەر چین[٥]

ســەرت پــێ لازمــە، مـەیبازە «مـەحوی»
دەبێ دولبەر كە هات ئێمە بە سـەر چـین[٦]

مــەحاڵاتــە لە بــەندی زولفـی دەرچـوون
چەها چـینە، چـەها چـینە لەسـەر چـین[٧]

-٧-

خوداكەی! بەس كە بۆ دنیا ئـەمەندە ئـاین و ئـۆیـین
تەماشا كە ئەحیبا ساغ و ئۆینچی هەموو رۆیـین[١]

---

(٤) كەمەر: ناوقەد. كەمەرچین: پشتێن.

واتە: لەوكاتەوە كە پشتێن باوەشی پیا كـردووی، مـن لە داخـا كـە لە جـێی ئـەو نـەبووم، فرمێسكی خەفەت لە باوەشما شەپۆل دەدا.

مەحوی لەمبەیتەدا بە شێوەیەكی ناسك دەیەوێ بڵێ پشتێن باوەش بە ناوقەد و كەلەكەی یاردا دەكا و منیش باوەش بە فرمێسكدا دەكەم... جا سەیری ئەم كلۆڵییە بكەن!.

(٥) سەقەر: دۆزەخ.

واتە: دنیا ئەوەندە ناخۆشە، تەنانەت ئەگەر بۆ دۆزەخیش بووە خۆشە ئینسان بەجێی بهێڵێ.

(٦) مەیبازە: لە كیس خۆتی مەدە، مەیدۆڕێنە.

واتە: مەحویا! سەرت پێویستە، نەكەی لەناوی بەری. چونكە كە یار هات دەبێ بە سـەر بڕۆین بە پیریـەوە، نەك بە پێ. (٧) چەها: چەندەها.

-٧-

(١) خوداكەی: توخوا. ئاین و ئۆیین: فرۆفێڵ و چەپوگوپ. ئەحیبا «اَحِبّاء»: جەمعی حەبیب بە مەعنا خۆشەویست.

**لە مانمدا نەدیوە حاسڵیٚ غەیری تـەوەححوش، مـن**
**خودا پیٚداو: ئەوانەی لەم وحووشستانە زوو رۆیین** [٢]

**لە بەرچاوی بتم کەوتووم ئەمن، وەك ئەشکی نەومیٚدی**
**هەتا دەچمە فەنا خاکم بەسەر، منم و بە روو رۆیین** [٣]

**بڵا نەیشیگەمیٚ، هەر بۆ سەرئەفرازی بە سەر نەك پیٚ**
**بە ریٚگەی یاردا «لابُدَّ مِنە»ە دووبـەدوو رۆیـین** [٤]

**عیبارەت چی هەیە؟ هەر «سیمیا» تەعبیری پیٚ لیٚدەم**
**لە دنیایەك، عیبارەت بیٚ لە مەحزی هاتن و رۆیین** [٥]

---



واتە: توخواکەم لە پیٚناوی دەستخستنی دنیادا خەریکی فڕوفیٚڵ و چەپوگوپ بەو خۆت بە خۆشەویستی راستەقینەوە خەریك بکە. سەرەنجام هەر بۆ دۆستانی راستە و هەر ئەوان بە ساغی دەمیٚننەوە و تەڵەکەباز و چەپوگوپکەر هەموو دەڕۆن و دەفەوتیٚن و خۆت ئەمە بە چاو دەبینی.

(٢) تەوەححوش: دوڕندەیی و کیٚوییەتی. وحووشستان: وڵاتی دوڕندان.

واتە: جگە لە دوڕندەیی بەرهەمیٚکیترم نەدیوە لە مانەوە لە دنیادا. بەختیار ئـەوکەسانەن ئەم وڵاتی دوڕندانەیان زوو بەجیٚ هیٚشت و زوو رۆیشتن...

(٣) نەومیدی: پەشیمانی، یاخود لە «نائومیٚدی» وەرگیراوە.

واتە: بە تەواوی لەبەرچاوی یارکەوتووم و لیٚم زیزە. بۆیە دەبیٚ تا ئەو رۆژەی دەمرم، وەك فرمیٚسکی پەشیمانی کە تازە ئیٚترگەڕانەوە دواوەی بۆ نیە، هەر بڕژیٚم و بەرەو پیٚشەوە بە روودا، بڕژیٚمە خوار و سەر هەڵنەبڕم...

(٤) سەرئەفرازی: سەربەرزی.

واتە: چش با نەشگەم بە یـار. نـاچارم بـە سـەر هـەر بـە دوایـدا دەڕۆم، چـونکە مـایەی سەربەرزییە بۆم دووبەدوو بەڕیٚدا بڕۆین، ئەو لە پیٚشەوە و من لە پاشەوە، هەموو جاریٚ سەرم لە جیٚگە پیٚکەیدا دانیٚم.

(٥) سیمیا: زانستی تەلیسم و جادووکاری و بە قەوارەوە پیشاندانی شتی بەگومان دروستکراو.

**برۆ داگرتنت عوششاقی پێ چوونە شەرارەی مەرگ**
**دەها مەرگ ئینتیزارێکن بە ئەمرێکـی بـرۆ رۆیـین (٦)**

**لە بەینی نوور و زوڵمەت ئامەشۆ سەرناگرێ «مەحوی»**
**نیگارم بۆیە پێمی وت: لە من هاتن، لە تـۆ رۆیـین (٧)**

---

☞

واتە: دنیایەك بریتی بێ لە تەنها هاتنە دنیا و مردن و لەوە زیاتر نەبێ، عیبارەتێك شك نابەم تەعبیری پێ لێ بدەمەوە، ئەوە نەبێ بڵێم سیمیا و ساختەکاری و جادووگەرییە.

(٦) دەها: سیغەی دەربڕینی سەرسامییە بە مەعنا «ئای، چۆن!». مەرگ ئینتیزار: چـاوەڕوانـیکەری مەرگ. رۆیین: مردن.

واتە: دڵدارانت بە تەنها برۆ داگرتنێکت چوونە شەرارەی مەرگ. ئای! ئەوانەی بە فەرمانێکی برۆت یا بە تەنها وتنی «بڕۆ»یەك رۆیشتن و مردن، چۆن چاوەڕوانیکەرێکی مەرگ بوون؟!.

(٧) ئامەشۆ: هات و چۆ.

واتە: تاریکی و رووناکی پێکەوە نایانکرێ تا لەملاوە ئەمیان و لەولاوە ئەویان بێ. یا هەر تاریکییە یا هەر رووناکییە. هەر لەبەر ئەمەش بوو یار پێی وتم: من رووناکیم و تۆ تاریکیت و پێکەوە نامانکرێ، بۆیە هەرکە من هاتم، تۆ تەنها ئەوەت بۆ دەمێنێتەوە کە بڕۆی.

-١-

دنـــیا تـــیاترۆیـــە، مـــەوەستە تـیا، بـــڕۆ
کـــێ مـایەوە تـیا کـە نـەبووبێ تـیا، تـڕۆ![1]

دنـیایەکـە دوو ڕۆژە نـەوازش بکـا، سـێیـەم
ڕۆژی گودازشـە، ئـەمەتە داکـی سـێبـەڕۆ[2]

---

-١-

مەحویی جارێکیان لە ئەستەمووڵ دەبێ؛ لەوێ بە شوێنێکدا تێدەپەڕێ، دەنگی مۆسیقای بەر گوێ دەکەوێ، دەپرسێ ئەمە چیە، بۆی روون دەکەنەوە کە تیاترۆیە و بۆی باس‌دەکـەن تیاترۆ چیە. ئەویش بەو بۆنەیەوە ئەم قەسیدەیە دەڵێ.

(١) تیاترۆ: تیئاتر، تیاترۆخانە، جێگای دانس و پیشاندانی شـانۆنـامە بـە ئـاواز و مـۆسیقا و دانسەوە. لە زاراوەی میللی کوردیدا مەعنای دانسی ناشەرعی و ئافرەتی سەماکەری نیمچە رووت و قووتی وەرگرتووە، بەڵام مەحوی بە مەعنا راستەکەی بەکاری هێناوە. تڕۆ: بەدناو و ئابڕوو چوو.

وشە ئاراییەکی ناسك لە نێوان «تیاترۆ» و «تیا بڕۆ» و «تیا تڕۆ»دا هەیە.

(٢) نەوازش: دڵدانەوە. گودازش: تواندنەوە. داکی سێبەڕۆ: لە ئەفسانەی کوردیدا هەیە کەوا نەخۆشی سێبەڕۆ جنۆکەیەکی تایبەتی هەیە هـەندێ ڕۆژ دێتـە سـەر سێبـەڕۆدارەکـە، لەو ڕۆژانەدا نەخۆشی ئەوکەسە بەرنادا.

هەندێ ڕۆژیش بەجێی دێڵێ، لەو ڕۆژانەدا باش دەبێ و سێبەڕۆکە بەری‌دەدا.

واتە: دنیا دنیایەکە دوو سێ ڕۆژێ دڵت دەداتەوە و بە ئارەزووی دڵت دەبێ، پاشان بەجێت دێڵێ و بە ئاگری بێ‌دەستەڵاتی دەت‌توێنێتەوە، وەك دایکی سێبەڕۆ کـە دەمـێك دێتـە سـەر سێبەڕۆدار و دەمێك بەجێی دێڵێ.

تەشبیهەکە بەم جۆرە بوو کە وتمان، بەڵام دیارە ناتەواویـەکـی تـیا هـەیە: لە مـەسەلەی سێبەڕۆدا هاتنی دایکەکە خراپە و ڕۆیشتنی چاکە، کە لە مەسەلەی دنیادا بە پێچەوانـەوەیە، مەگەر بڵێین مەحوی ویستوویەتی بڵێ دنیا نەبوونی لە بوونی چاکترە و بەڵکوو بوونی هیچ چاکەیەکی تیا نیە.

روو ترش و روو خۆشە لە رووێکا، لە یەك دەما
قەهری درۆیە، میهری درۆ، هەردوو هەر درۆ [٣]

پشتی کە دا بە پشتتەوە، بۆ پشت شکاندنە
ئەمرۆ خودا شوکرتە، سبەینێ براله رۆ [٤]

پیری نەمامی باغی جوانیمی کردە پووش
تازەم درەختی توولی ئەمەل دەردەکا چرۆ [٥]

گەردنکەچی چلێکە سەرئەفرازیـیە گوڵی
بڕوانە، چاوەکەم، کە لەسەر چاوە جێی برۆ [٦]

«مەحوی»! بە «مُوتُوا»وەکە لە مردن ببی نەجات
رۆیاندنت لەپێشە، لە پێشا وەرە بڕۆ [٧]

---

(٣)قەهر: قین. میهر: خۆشەویستی.

واتە: لە یەك کاتدا یەك روو بە ترشیش و بە خۆشیش پیشان دەدا. نە قینی جێگای ترسە و نە خۆشەویستی جێگای متمانەیە.

لە رووێکا لە یەك دەما (ن): لە دەمێکا لە یەك رووا.

(٤)واتە: ئەمرۆ پشتت دەگرێ و دەتخانە خۆشی، کەچی بۆ سبەینێ دەکەویتە براڕۆ و دەردەکەوێ دوێنێ بۆیە پشتی گرتووی پشتت بشکێنێ.

(٥)ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ حەدیسی «يَشِيبُ ابنُ آدَمَ وَ يَشُبُّ فِيهِ خَصْلَتَانِ: اَلحِرْصُ وَ طُولُ الأَمَلِ» واتە: ئادەمیزاد پیر دەبێ، کەچی دوو رەوشتی تێدا جوان دەبێتەوە، تەماع و هیوای درێژ بە دنیا.

(٦)واتە: بۆیە جێگای برۆ لای سەرووی چاوەوەیە، چونکە گەردنی کەچ کردووە و خۆی بە کەم دەزانێ.

(٧)رۆیاندن: بە رۆیشتووکردن، مراندن. لەوە دەچێ ئەم داتاشینە هی مەحوی خۆی بێ.

واتە: ئادەمیزاد بەوە لە ئەنجامی ناخۆشی مردن رزگاری دەبێ کە بەر لە مردنی دڵی خۆی بمرێنێ. ساکەواتە مادەم رۆیشتنت لەپێشە و دەبێ برۆی، خۆت زووتر بڕۆ.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ حەدیسی «مُوتُوا قَبْلَ اَنْ تَمُوتُوا» واتە: بمرن بەرلەوەی بمرن.

-٢-

**لە پڕ بەردی ئەجەل بۆ شیشەیی عومرم نەوا بێ زوو**
**فیداتم، دەست و بردێ، ساقیا جامی شەرابێ زوو**(١)

**چیە دنیا، ژنێکە هەر شەوێ سك پڕ بە سەد فیتنە**
**سبەینێ زوو بە خوێنی جەرگی ئەهلی دڵ دەکا بێزوو**(٢)

**کە دایەی خاکت ئاخر هەر دەبێ بگرێتە باوەش خۆی**
**بکە خاکێ بەسەر خۆتا لە قاپی «بو تُراب»ێ زوو**(٣)

**بە تابی عەکسی ئەو دیدارە دڵ سووتا، موزەککایە**
**کەتانت راگرە سا زوو بە جیلوەی ماهتابێ زوو**(٤)

---

-٢-

(١) نەوا: نەوەکوو.

واتە:کاکەی مەیگێڕ دەستوبرد کە و پیاڵەیەك شەرابم بدەرێ، نەوەك بەردی مەرگ لە پڕ بێ بدا بە شیشەی ژینمدا و ورد و خاشیکا و بمرم.

(٢) ئەم بەیتە وەك بەڵگە وایە بۆ بەیتی پێشوو. واتە: دنیا ئافرەتێکە هەر شەوێ سکی بە سەد ئاشووبی نوێ پڕ دەبێ و سبەینێیش سەرلەنوێ گورج سکی پڕ دەبێتەوە و بێزوو بە خوێنی جەرگی دڵدارانەوە دەکا و دەبێ بیاندا بە کوشت تا خوێنەکەیان بخواتەوە.

(٣) واتە:مادەم دەبێ خاك وەك دایك هەر بتگرێتە باوەشی خۆی و بمری، تۆ خۆت زووتر خاکی بەردەرگای خاکدارێك بکە بەسەر خۆتا.

وشەی «بوتُراب» هەرچەند بەمەعنا خاکدارە،کونیەی حەزرەتی «عەلی»شە.کەواتە لێرەدا مەبەست ئەوەیە تۆ بەرلەوەی بمری بچۆرە بەر دەرگای پیاوێکی خواناسی پایەبەرزی «وەك حەزرەتی عەلی» و لەسەر دەستی ئەودا خاك بەسەر نەفسی خۆتدا بکە و بیمرێنە.

(٤) موزەککا: پاك کراوە. ماهتاب: ئەوەی وەك مانگ بدرەوشێتەوە.

واتە:هەر دڵێك بە تینی ئاوێنەی رووی یار بسووتێ، لە هەموو گەردێکی دڵدان بە کەسێکی تر پاك دەبێتەوە. کەواتە تۆیش زوو کەتانی رووی زەردی خۆت بەرابەر تیشکی مانگی رووی یارێك رابگرە، با بسووتێ و پاك بێتەوە. مەشهوورە کەتان بدرێتە بەر شەوقی مانگەشەو دادەڕزێ.

**دەنی تەبعی بە جارێ عالەمی داگرت ئەوا «مەحوی»!**
**درەنگە ئیلتیجا بە بەر دەری عالی جەنابێ زوو** (٥)

**-٣-**

**شەو کەسێ پرسی لە خۆ دەرخستنی پەروانە شەو**
**ئەو وتی: ناتێگەیشتوو! تەجرەبەی مەردانە شەو** (١)

**هەر سیا بەختانی عیشقە مەزهەری نووری هودان**
**شەو نەبێ ئەستێرە مەستوورن، بە کەم مەڕوانە شەو** (٢)

---

(٥) نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لەسەر شێوەی فارسی ئامێزی نووسینی جارانی کوردی، واتە بەمجۆرە:

«درنگه التجا به بر را عالی جنابی زو»

دەکاتە ١٣١٤، کە وەك بە پارچە شیعرەکەشدا دیارە، دەبێ ساڵی وەفاتی کەسێ بێ و مەحوی ئەم پارچە شیعرەی بەو بۆنەیەوە وتبێ.

وەختی خۆی مەلا شێخ عومەری کوڕی مەحوی ویستوویە کارێك بکا ئەو نیوە بەیتە بکا بە مێژووی کۆچی دوایی مەحوی بە حیسابی حورووفی ئەبجەد. لەبەر ئەوە هاتووە «دەری = در»ی کردووە بە «رەئی = رأی». کە بەو پێیە نیوە بەیتەکە بە شێوەی فارسی ئامێزی کۆن، واتە بەمجۆرە:

درنگه التجا به بر رأی عالی جنابی زو

دەکاتە ١٣٢٤ کە ئەوەش ساڵی کۆچی دوایی مەحوییە.

-٣-

مەحوی ئەم پارچە شیعرەی وەك بۆ بەرانبەرکێ پێ کردنی ئەو پارچە شیعرەی خۆی وتبێ کە بە شان و باڵی ڕۆژدا هەڵدەدا تیایدا و لە پیتی «ژێ»دا لەژێر ژمارەی «١»دا بڵاومانکردەوە.

(١) واتە: یەکێك لە یەکێکی تری پرسی بۆچی پەروانە هەر بە شەو خۆی دەردەخا و ئەگەر بە ڕۆژدا سەدجاریش چرا داگیرسێنی نایەت بەدەوریا؟! ئەویش وەڵامی دایەوە، وتی: چونکە شەو مەیدانی خۆ تاقی‌کردنەوەی مەردانە. دیارە پەروانەش مەردە، ئەگینا هەموو جارێ خۆی نەدەدا بەدەم گڕی ئاگری مۆمەوە بێ ئەوەی دەنگێکی لە دەمەوە بێت.

(٢) واتە: بەڵگەیەکی تری پایەبەرزی شەوی تاریك و ڕەش ئەوەیە کە نووری هیدایەت لەو ☞

ئــــەم ســــیا رۆژی مـــنە پـــۆشـــیویە عـــەیبی کـــەسان
ئـــاشکارە ســـەتری ئـــەحواڵی گـــونەهکارانـــە شـــەو[٣]

بۆیە زوڵمەت پۆشە، نووری ئـەهلی جـەوهەر دەرکـەوێ
سەیری حەققی کەن لەسەر ئەم ماه و ئەستێرانـە شـەو[٤]

نـەبووە، نـابینی لە شـەو مـەحرەم‌ترێ تـا رۆژی حـەشر
پەردەپۆشە، هـەمدەمە، هـەمدەردی عـوششاقانە شـەو[٥]

شەو، هەموو شەو چاوەڕێیە رۆژ هەڵێ، هەر رۆژ هـەڵات
مـــەحوە ســـەرتاپا لەبـــەر پـــێیـــا فـیداکـارانـە شـەو[٦]

خـۆرپـەرستینە! لە شـەو فـێری پـەرستن بـن، کـە خـۆر
هـــەر دیـــاری دا، بـە دەوری ســەریەدا قـوربانە شـەو[٧]

---



کەسانەدا دیاری دەدا کە بەهۆی دەردی عیشقەوە چارەیان رەش بووە. ئەوە نیە ئەگەر شەوی تاریك نەبوایە ئەستێرە دەرنەدەکەوت! کەواتە بە کەم و بێ‌بایەخ مەڕوانە بۆ شەو.

(٣) سیا رۆژی: رۆژ رەشی، کینایەشە لە بەدبەختی. ئاشکار: ئاشکرا.
واتە: رەشی رۆژی من عەیبی خەڵکی داپۆشیوە. ئەگەر من رۆژم ئەوەندە رەش نەبوایە، عەیبی ئەم هەموو عەیبدارانە نەدەشاررایەوە، وەك تاریکایی شەو کە کردەوەی گوناهباران لە بەرچاوی خەڵك دەشارێتەوە.

لە بەکارهێنانی وشەی «سیا رۆژی»دا ناسکییەکی زۆر هەیە، ئەوەتە بە دیمەن و مەعنای وشەکە و لە ناوەڕۆکدا مەعنا مەجازییەکەی مەبەستە.

(٤) واتە: بۆیە شەو بەرگی تاریکی لەبەر کردووە، تا رۆشنایی قابیلەت‌داران دەرکەوێ. نابینی شەو حەقی چەند بەسەر مانگ و ئەستێرەوە هەیە و ئەگەر ئەو نەبوایە، ئەمان تیشکیان نەدەدایەوە.

(٥) پەردەپۆش: پەردە بەسەراهێنی راز و نهێنی.

(٦) واتە: شەو دڵدارێکی ئەوەندە بەوەفایە بۆ رۆژی یاری، لە ئێوارەوە تا سبەینێ چاوەڕوانی هەڵهاتنی دەکات. هەرکە هەڵیش‌هات سەرتاپای خۆی دەکا بە قوربانی ئەو و دەفەوتێ.

(٧) خۆرپەرستینە: ئەی ئەوانەی کە خۆرپەرستن. دیاری دا: دەرکەوت.

فـــیرقەتی رۆژە دەروونـــی کـرده داغـــێکـــی ســـیا
وەك مـنی سـەودازەده ئـاتەش‌زەدەی هـیجرانـە شـەو (٨)

گـــەر فـــیراق ئـاگـر هـەموو رۆژێ لە جـەرگی بـەرنەدا
بۆ هەموو شەو تـیره دڵ، سـینەی زوخـاڵـستانە شـەو! (٩)

تـــیرەگـــی وا فـــەزڵی بـــۆ نـــادەم بـــەسەر رووناکـیيا
مەنشەئی ئیزهاری جیلوەی فەیزی سبحەینانە شـەو (١٠)

---



واته: ئەی ئەوکەسانەی کە بەناو خواپەرستن، بەڵام لە راستیدا خـۆرپـەرستن، پـەرستنی راستەقینە لە شەو فێر ببن، سەیری‌کەن چۆن هەرکە رۆژ دەرکەوت ئەو خۆی دەکا بە قوربانی. ئێوەش ئەگەر بەڕاست خواپەرستن گیانی خۆتانی لەپێناودا بەخت بکەن.
نە هەموو نوسخەکانی بەردەستماندا نووسرابوو «خۆرپەرستینە». ئێمە ئەوەمان لا هەڵە بوو و بەمجۆرە راستمان کردەوە. مەعنای بەیتەکەشمان وا لێك‌داوەتەوە کە وشەکە «خودپەرستینە» بێ. بەڵام پاشان مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوی دەسخەتی مەحوی خۆیی پیشان‌داین کە نووسیبووی «خۆرپەرستینە». کەواتە دیارە راستەکەی ئەوەیە و ئێمە بە هەڵەدا چووین و دەبێ مەعنای بەیتەکە بەم پێیە لێك بدرێتەوە.
(٨) ئاتەش‌زەدە: ئاگر تێ‌بەربوو، سووتاو.
واته: لە داخی دووری یارە وا ناوجەرگی شەو رەش بووەتەوە. ئەویش وەك منی دەردەداری دووری دۆست، ئاگری دووری بەربووەتە گیانی.
(٩) تیره: تاریك. زوخاڵستان: رەش وەك کوورەی خەڵووز.
واته: هەروەك من کە یارم لێ جیابووەوە، بووم بە خەڵووز، رۆژیش نەما شەو دادێت وگێتی دەبێ بە خەڵووزستان.
(١٠) تیرەگی: تاریکی. مەنشەء: سەرچاوە. فەیز: لێشاو، مەبەست لە رووناکییە.
واته: تاریکییەك کە سەرچاوەی دەرکەوتنی رۆشنایی سـبەینان بـێ، چـۆن فـەزڵی نـادەم بەسەر رووناکیدا؟!.

**هـــەر لە تـــاریکی شـــەوایـــە ڕێ دریٚ ئـــەهلی نـــیاز**
**رازی دڵ ئیفشا بکەن، خەڵوەتگەهی خـاسانە شـەو**[11]

**تـــێبگـــە بـــۆچـــی بـــە جـــانن تـالیبی شـەو عـاشقان**
**نـــیوەشەو بـوو، وەعـدەگـاهی هـاتنی جـانانە شـەو**[12]

**هێندە ساحێب سیڕڕە، «میعراج» و شەوی «قەدر» و «بەرات»**
**خاسەجاتی ئـەون و مـومتازە بـەم ئـەسرارانـە شـەو**[13]

**هـــەرکەسێ تـــالیب بـــە دوڕڕی مـەعریفەت کـۆکـردنە**
**پڕ لە دوڕ دەریایەکی بێ مـەهلەکـەی خـنکانە شـەو**[14]

---

(١١) ئیفشا: دەرخستن. خەڵوەتگەه: شوێنی بە تەنیا تیا دانیشتن.

واتە: مەگەر هەر لە تاریکایی شەودا ڕێگای دڵداران بدرێ رازی دڵیان بۆ یەکتر دەرخەن، چونکە شەو خەڵوەتگای دۆستانە.

(١٢) واتە: بۆیە دڵداران بە دڵ وگیان حەز لە داهاتنی شەو دەکەن، چونکە لە شەودا نیوەشەو کاتی هێنانەدی گفتی یارانە کە گفتی هاتن دەدەن بۆلای دڵدارەکانیان.

(١٣) شەوی قەدر: «لَيلَةُ القَدر»، شەوە تاکەکانی دە رۆژی دوایی مانگی رەمەزان کە قورئانیان تێدا هاتۆتە خوار بۆ پێغەمبەر (د.خ). بەرات: شەوی بەرات، «١٥»ی کوڵەمانگ (شەعبان) کە رزق و رۆزیساڵی نوێی تیا بڕیار دەدرێ لەلایەن فریشتەی رۆزییەوە بۆ خەڵك... خاسەجات: موڵکی تایبەتی. مومتاز: هەڵاوێردە.

واتە: شەو ئەوەندە پایە بڵندە، خوا میعراج و شـەوی قـەدر و بـەراتـی خـستووەتە ئـەو و بەتایبەتی داونی بەو و نەیداون بە رۆژ.

(١٤) واتە: ئەوکەسەی دەیەوێ دوڕڕی خواناسی کۆبکاتەوە، با بزانێ شەو دەریایەکە پڕە لەو دوڕڕە و هەرکەسیشی تێبچێ ترسی خنکانی نابێ وەك لە دەریایەکی ئاودا.

ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەم جۆرەش هەیە:

تالیبە هەرکەس کە دوڕڕی مەعریفەت بێنێتە دەست
فرسەتە «مەحوی» کەوا بەحرێکی بـێ پـایانە شـەو

**وەك خــزر ئـاوی حــەیاتی فــەیزی حــەق عــافێتـیە**
**ئەو خودا پێداوە «مەحوی»! تا سەحەر نـاڵانـە شـەو** (١٥)

**-٤-**

**کە لێوی خوێنمی نۆشی، شەوی خەت گرتی دەوری ئەو**
**بـە قـوربانی خـوێنـێکـم کـەوا رۆیـی بـەسەریا شـەو** (١)

**لە ئەشك و ئاهما جۆش و خورۆشـی حـەولی تـەئسیرە**
**دەزانن رێیەکی دوورە لەپێش، ئەڵبەت دەکەن سەررەو** (٢)

---

(١٥) خزر: حەزرەتی خدر کە دەڵێن گەیوەتە سەر ئاوی حەیات و لێی خواردووەتـەوە و تـا ڕۆژی قیامەت نامرێ. فەیز: بەرەکەت. عافێتیە: عافیەتیەتی، نۆشی گیانیەتی. نـاڵان: ئـەوەی بناڵێنێ.

واتە: هەر خودا پێداوێك شەو تا بەیانی بناڵێنـێ، ئـەوکەسە وەك حـەزرەتی خـدر ئـاوی حەیاتی بەرەکەتی خودا نۆشی گیانی بووە.

موناسەبەتی ناوهێنانی ئاوی حەیات لێرەدا ئەوەتە دەڵێن کانیاوەکـەی لە تـاریکاییەکـی قووڵدایە و مەحوی ئەو تاریکاییەی شوبهاندووە بە شەوەوە.

**-٤-**

(١) مەحوی لەم بەیتەدا قەیتانی خوێنی رەشی بەسەر لێوی خوێنمژی یارەوەی شوبهاندووە بەوە کە کەسێك بکوژرێ و شەو بەسەر کوژرانەکەیدا تێپەڕێ و دەڵێ: وەك چۆن خوێن کـە شەوی بەسەردا چوو سارد دەبێتەوە و تۆڵەی ناسنرێتەوە، یـاخود خـوێنکـەرەکـە لە پـەنای تاریکی شەودا خۆی ون دەکا، مادەم خوێنی منیش لێوێکی وا مژیویە قـەیتانی خـوێنـی بـە دەوردا بووە بە خەتی رەش، ئیتر بەتەمای تۆڵە نیم.

(٢) حەول: هەوڵ. تەئسیر: کار تێکردن. سەررەو: زیادەڕەو بۆ زوو گەیشتنە بەرەوە.

واتە: وەك چۆن ڕێبوارێك کە ڕێگایەکی دووری لەبەر بێ. دەبێ زیادەڕەو بکا تـا زووتـر بگاتە بەرەوە. هەناسە و فرمێسکـی مـنیش دەزانـن یـار لەبـەر بـێوەفـایی وەك ئـامانجێکـی دوورەدەست وایە، لەبەر ئەوە دەیانەوێ کارێك بکەن بە زیادکردنی جۆش و خورۆشیان کاری تێبکەن و کەمێك دڵی نەرم بکەن.

**بڵا رۆحت موقەددەس بێ، ئەم‌و ئەو کردنت بەس بێ**
**هەتا ئاخر هەناسە ئەو بناسە، هەر بنازە بەو[٣]**

**شەوێ لەیلا بە مەجنوونی وەها وادەی تەماشا دا...**
**دەبێ رۆژێ ببینی من کە تۆ رێ خەیتە دەشتی خەو[٤]**

**لە ناڵینی منی ئیفتادە زاهید بۆ رقی هەستا؟**
**حوزووری ئاه ئاهی بوو بە غەیبەت ئەو دەکا عەو عەو[٥]**

**خودا بیدا ئەدەب «حِرْزُ الأمان»ێکە عەتییەی رەب**
**چ بوو جەرگی بڕی غەیری ئەمەی نامەی دڕی خوسرەو![٦]**

---

(٣) مەحوی لەم بەیتەدا قسە لەگەڵ خۆی دەکا و دەڵێ: دەبا گیانی خۆتت لا پیرۆز بێ و هەررۆژێك گرەویدەی یارێکی مەکە. تا دەمری هەر یارە شۆخەکەت بناسە و هەر بەو بنازە.

(٤) واتە: ئەوکاتە دەتوانی من ببینی کە بیابانی مەرگ بگریتەبەر. مەبەستی لەوەیە تا دەمری بە من ناگەی. یاخود مەگەر بە خەو بمبینی. ئەگینا لە بەئاگایی‌دا ناتوانی تەماشام بکەی.

مەلا ئەسعەدی مەحوی مەعنای ئەم بەیتەی وا لێ‌داوەتەوەکەوا واتە: مەگەر لە خەودا من ببینی، ئەوجا لە بەخەبەریدا دەتوانی تەماشام بکەی.

(٥) واتە: زاهید بۆچی لە ناڵینی من رقی هەڵدەستێ... بۆچی وا بێ‌بار و دووڕووە، لە حوزووری خۆمدا وکە خۆم دیار بم هەناسەم بۆ هەڵدەکێشێ و وا پیشان دەداکە بەزەیی پیامدا دێتەوە، کەچی لە پاشملەش غەیبەتم دەکا و پێم دەوەڕێ!؟.

(٦) «حِرزُ الأمان»»: دوعای چاوەزار. عەتییە، [«عَطیّة»]: بەخشش. خوسرەو: خوسرەوی پەروێز، دوا پادشای بە شکۆی بنەماڵەی ساسانی.

واتە: خودا بیدا ئەدەب بۆ هەرکەس وەك دوعای چاوەزار وایە و لە هەموو دەرد و مەینەتێك دەی‌پارێزێ. چی بوو بەهۆی ئەوە کە شێرۆیەی کوڕی خوسرەوی پەروێز بچێتە سەر جێگاکەی باوکی و جەرگی بە خەنجەر لەت بکا، لەوە بەولاوە کە باوکی کابرایەکی بێ‌ئەدەب بوو کە نامەکەی پێغەمبەری پێ‌گەیشت بۆ داوای موسوڵمان بوون، لەبریتی ئەوەی کە ئەگەر موسوڵمانیش نەبێ، بە قەدر و حورمەت وەڵامی بداتەوە، نامەکەی لەت‌لەت کرد. بۆیە کە پێغەمبەریش ئەوەی بیستەوە دوعای شەڕی لێ کرد و فەرمووی: «اَللّهُمَّ مَزِّق مُلكَهُ، كَما مَزَّقَ كِتابِي» واتە: خوایە موڵکەکەی پارچە پارچە بکەی، وەك ئەو نامەکەی منی پارچە پارچە کرد.

وتــی مــن بـێم و «مـەحوی» وا بـمێنـێ، نـاکـرێ، نـابێ
هـەتاو و سـێبـەرین ئـێمـە، دەبـێ یـا مـن بـبم یـا ئـەو!

-٥-

لە دنــــیادا دڵ ئـــارامــێك و ئـــارامـــی دڵێکــم بــوو
بە جارێ ماڵی وێرانم، ئەمیشم چـوو، ئـەویشم چـوو[١]

خـــوێنــی دڵ لەبـەر چـاوم نـەبێ تـاکـەی رەوان ئـاخر!
ئەوا رۆیـی لە بـەرچـاوم ئـەوی رۆحـی رەوانـم بـوو[٢]

چ حـــاڵە! قـوڕ بـەسەر حـەتتا بـە حـاڵم پـێکـەنینی دێ
بە دەست ئەتواری تۆوە قوڕبەسەر خۆم، ئەی دڵەی بەدخوو[٣]

دڵ و دڵبەر لە یەك بەدخووترن، سا مـن خـودا چ بکـەم؟
«فَلَا المحبُوبُ يَرْثِي لِـي، وَ لَا الْـقَلْبُ الشَّـجِي يَسْـلُو»[٤]

لە رۆژێکـــی کـــە ئـــەو گـــوفتار تـوتی، کـەبك رەفـتارە
لە من غائیب بووە، هەر نـاڵەمـە وەك کـۆتـری حـاقوو[٥]

---

-٥-

(١) دڵئارام: دڵ رەحەتکەر. ئارامی دڵ: ئارامی دڵ.
(٢) واتە: ئاخر تاکەی خوێنی دڵم بە بەری چاومدا نەیەتە خوار، مادەم یاری وەك گیان شیرینم رۆیشت و لە بەرچاوم ون بوو.
(٣) واتە: بە دەست رەوشتی دڵەی بەدخوومەوە کارێکم بەسەر هاتووە تەنانەت قوڕبەسەریش پێکەنینی پێم دێ.
(٤) واتە: نە ئەوەتە یار بەزەیی پیامدا بێتەوە و نە ئەوەتە دڵەی بەسۆزم دامرکێتەوە.
(٥) گوفتار تووتی: ئەوەی تەنها جۆرە قسەیەك دەزانێ و لەوە بەولاوە هیچیتر ناڵێ. کەبك: کەو. کەبك رەفتار: بە نازو لارە و لەنجەکەر. کۆتری حاقوو: جۆرە کوترێکە خوێندنێکی خەفەتبارانەی هەیە.

**چ رۆحێ کوشتەی ئەو باڵایە، قومری داری توویایە**
**«فَيا طُوبىٰ لِقَومٍ فِي سَبِيلِ الحُبِّ هُمْ ماتُوا»(٤)**

**لە دووری ئەوکوڕە فرسەتتە با زوو بمری ئەی «مەحوی»!**
**مەبادا بێتەوە بۆ کوشتنی تۆ رەنجە کا بازوو(٥)**

(٦)

(٧)

---

(٤) نە ئەوەتە یار بەزەیی پیامدا بێتەوە و نە ئەوەتە دڵەی بەسۆزم دامرکێتەوە.
(٥)

.

حاقوو (ن): حەق هوو. لەوانەیە «حاقوو»یش لە «حەق هوو» وەرگیرابێ کەواتە هەر خوا حەقە. گوایە ئەوکۆترە کە دەخوێنێ وا دەڵێ.
(٦) شاخی تووبا: لقی «شجرة الطّوبى» کە درەختێکە لە بەهەشتدا.
واتە: هەرگیانێك بە دەستی باڵای یار دەرچێ. دەبێ بە قومری و لە باغی بەهەشتدا دەنیشێ بە «شجرة الطّوبى»وە. سا خۆزگە بەوکەسانەی لە پێناوی خۆشەویستیدا مردوون.
لە حەدیسی پێغەمبەردا (د.خ) هەیە کەواگیانی شەهیدان لەو دنیا دەبێ بە پەلەوەرێك و لە باخی بەهەشتدا دەنیشێتەوە بە لقی «شجرة الطّوبى»وە...
(٧) رەنجە: ئازار چەشتوو. بازوو: قۆڵ.
واتە: کوڕە مەحوی. فرسەتتە. لەتاو دەردی دووری یار زوو بمرە. نەوەك بێتەوە و ئەزیەتی شان و قۆڵی خۆی بدا بۆ کوشتنت.
بێتەوە (ن): هاتەوە.

-۱-

له چاوی بەد خودا حیفزی بکا ئەو شـۆخـە سـەرمەستە
سەریش ئەبڕێ، سەریشی لێ دەدا، هەی هەی چ سەربەستە! [۱]

بـنازم بـەم سـەراپـا نـازە، بـازی غـەمزە تـێبـەردا
ئەگەر سیمورغی بەر بێ هەم بووە یەك مورغی پەڕ بەستە [۲]

ئەسیری چاهی غەم بێ، خانە با دەربەستە بێ مـەجنوون
لە خەیمەی نازدا عوشرەت دەکا لەیـلا، چ دەربـەستە! [۳]

بە فکرێکە کە ئەم خوونڕێزە شیری بـەستە پشت ئـەمڕۆ
لە ئەستۆ دانی کییە؟ کێ دەکـا ئـاخۆ کـەمەر بـەستە؟! [٤]

---

-۱-

(۱) سەریشی: سەری ئەو دڵدارەی کە سەری دەبڕێ.
(۲) سیمورغ «سیمرغ»: باڵدارێکی ئەفسانەییە دەڵێن ئێجگـار زۆر گـەورە بـووە و لە کـێوی قاف ژیاوە. پەڕ بەستە: باڵ بەسراو.
واتە: حەقمە شانازی بەم یارەوە بکەم کە سەرتاپای هەموو هەر نازە و ئەگەر بێتـو بـازی غەمزە و نازی خۆی بەردا بۆ نێچیرکردنی دڵداران، سیمورغیشی بێتە رێ، وەك پەلەوەری باڵ بەستراو دەبێ لە پێشیدا و هیچی پێ ناکرێ.
(۳) چاه: چاڵ. دەر بەستە «ی یەکەم»: دەرگا داخراو.
واتە: با مەجنوون بۆ خۆی لە چاڵی مەینەتدا دیل بێ و دەرگای مـاڵی گـیرابـێ، لەیـلا چ مەبەستیەتی! ئەو لەژێر دەواری نازدا بۆ خۆی رادەبوێرێ.
مەلا ئەسعەدی مەحوی لە نوسخەکەی خۆیدا نیوەی یەکەمی ئەم بەیتەی بەم جۆرە بڕگە بڕگە کردووە:
ئەسیری چاهی غەم، بێ خانە، با دەربەستە بێ مەجنوون.
(٤) کەمەر بەستە: ئەوەی پشتێنی خولامی بەستبێتە پشت.
واتە: دیارە ئەم یارە خوێنڕێژە خەیاڵێکی لە کەللەدایـە وا ئـەمڕۆ شـمشێری بـەستووەتە پشت. سا ئاخۆ دەبێ نیازی سەربڕینی کێی هەبێ و بیەوێ کێ بکا بە بەندە و دیلی خۆی...
ئاخۆ (ن): ئاخر.

بــەرەڵدا کــردنی نــەفست زەرەرخــێزە و فــەسادئەنگێز
بە رەحمەت بن قەدیمی ئێمە فەرموویانە: «خەربەستە....»(٥)

قســێکــی پــڕ لە تــەئسیری بــە فــرزەندی دەوت پــیرێ:
عەزیزم تازە گــەیوی تــۆ، ئــەمن بــاری ســەفەر بــەستە(٦)

لەبــەر قــاپی خــەراباتا مــنی دی، عــیشوەیێکــی کــرد
وتی: «مەحوی» لە بادەت چی، ئەتۆ خوێنی جگەر بەستە(٧)

-٢-

کە دیم ئاڵۆزە چــاوی، زوو وتــم: ئــەم فــیتنە هــەڵبــەستە
وتی: جاران ئەتۆ دەتوت بە من: کەم فــیتنە هــەڵبــەستە(١)

---

(٥) زەرەرخێز: زەرەری لێ پەیدا دەبێ. فەسادئەنگێز: خراپەی لێ بەرپا دەبێ.

واتە: نەفسی ئادەمیزاد وەك کەری بەرەڵڵا وایە لەوەداکە هەردوکیان زیان دەگەیەنن. کەواتە نەفست ببەستەرەوە با زیانت پێ نەگەیەنێ. پێشینان بە رەحمەت بن وتوویانە: «خەر بەستە و خاوەنی خەر لە خەم رەستە».

فەسادئەنگێز (ن): مەلالئەنگێز.

(٦) بەستە: بەستوو و ئامادە کردوو.

واتە: پیاوێکی پیر قسەیەکی جوان و بە تەئسیری بە کوڕەکەی وت، پێی وت: رۆڵە تۆ تازە گەیشتوویتە بەرەوە و هێشتا شارەزای دنیا نەبوی. دەبێ تۆزێ بحەسێیتەوە تا شارەزای دەبی. بەڵام من بەشی خۆم شارەزا بووم و لەسەر سەفەرم و کۆڵ و بارم پێچاوەتەوە... مەبەستی لەوەیە کۆچی دوایی نزیك بووەتەوە.

(٧) خەرابات: مەیخانە.

واتە: یار منی لەبەر دەرگای مەیخانەدا دی، وتی تۆ بادەت بۆچیە؟ خوێنی جگەری خۆتت بەسە لەجیاتی مەی بیخۆیتەوە.

-٢-

(١) واتــە: کــە دیــم چــاوی یــار شــێواوە، وتــم: ئــەمە راست نیە و ئــەو چــاو شــێوانــەی

**بە سووتن چم، گلەم نەبووە لە دەردی سەردی میهری تۆ**
**من و شەکوە؟ وتی: گوێ ناگرم لەم فیتنە هەڵبەستە (٢)**

**بە غەیرەز شوکر، ئەگەر شەکوەم لە جەوری تۆ ببێ، سپڵەم**
**وتی: حاشا، دەزانم ئەم رەقیبەم فیتنە هەڵبەستە (٣)**

**بەجێیە کوشتنم، سووتاندنم، خاکت بە با بۆ دام؟!**
**وتی: ئاهەنگی عیشقی من مەقاماتە لەگەڵ بەستە (٤)**

**بە زوڵفیدا هەڵاوەسرابوو دڵ عومری بە سەد ئامال**
**نیگاهی وەك ئەجەل هات و وتی: توولی ئەمەل بەستە (٥)**

---



دەست هەڵبەستە و دروستکراوە. یاریش وتی: خۆ تۆ جاران منت زۆر بە فیتنەباز دەزانی و پێت دەوتم کەم فیتنە ساز بکە، ئێستا بۆ باوەڕم پێ ناکەی و بۆ بە راستم نازانی!؟.

(٢) شەکوە: شکات.

واتە: سوێندم بۆ یار خوارد کەوا هەرگیز گلەییم لە دڵساردی و بێلوتفی ئەو نەکردووە و بەدکار هەرچی لەم بارەیەوە بۆ گێڕاوەتەوە هەمووی درۆ و دەست هەڵبەستە، ئەویش وتی: منیش هەرگیز گوێ بۆ بەدکار شل ناکەم کە باسی گلەیی و ناڕەزایی دەربڕینی تۆم بۆ دەهێنێ و ئاژاوە دەنێتەوە.

(٣) مەعنای ئەم بەیتەش هەر لە چەشنی مەعنای بەیتی پێشووە.

(٤) مەقامات: جۆرە ئاوازێکە. بەستە: ئەو گۆرانییە وردانەی لەپاش مەقامات دەوترێن.

مەبەستی لەوەیە وەك چۆن ئەوەی مەقامات بڵێ بەستەیەکیشی لەپاش دەڵێ، یاریش کە دڵداری سووتاند، ئاهەنگی دڵدار سووتاندنەکەی بەوە تەواو دەکا خۆڵیشی بدا بەدەم باوە.

(٥) توولی ئەمەل: هیوای زۆر بە دنیا.

واتە:ساڵەها بوو دڵم بە ئاواتی خۆشەوە بە زوڵفی یاردا هەڵواسرابوو، کەچی لە ناکاو وەك ئەجەل بێ بدا بەسەر یەکێکدا و بیکوژێ، یار لایەکی بەلامدا کردەوە و وتی: با بەسی بێ هیوای دوور و درێژ و بەو لاکردنەوەیەی دڵم کەوتە خوار و مرد.

بەیتەکە «اِقتِباس»ێکی لەو واتە ئایینیە تیایە کە توولی ئەمەل بە دنیا بە یەکێ لەو سیفەتە خراپانە دادەنێ کە لە ئادەمیزادا هەن و داوا لە موسوڵمانان دەکا خۆیان لە سیفەتی وا دوور بگرن.

قــەزا بــێدەســەڵاتت کــا، چـیە غـەیری رەزا چـارە؟
لە بــەردەستی جــەلابا رێویــێکـە شـێری پـەلبەستە(٦)

بە خۆکوشتن نەجاتی خۆ بدە «مەحوی» وەکوو فـەرهاد
لە زۆری قەهرەمانی عیشق، ئەفەندم، هەر ئەجەل بەستە(٧)

-٣-

لە رێگەی مەهلەکەی عیشق ئەر بـەڵاجـۆ نـی، بـرا، لادە
ئەوی من چووم و لەوما دی هەر ئـاهو داد و فـەریادە(١)

(٦) جەلاب: «جَلّاب»، ئەوەی بەندە لە شارێکەوە دەبا بۆ شارێکی‌تر بۆ فرۆشتن. پەلبەستە: پەل بەستراو.

واتە: ئادەمیزاد لە بەرابەری قەزاو قەدەردا هیچی پێ ناکرێ و چارەی هەر ئەوەیە ملی بۆ کەچ کا، وەك چۆن شێری پەلبەستراوکە رەشمەی بەدەست جەڵەب‌چیەوە بێ لە بێدەسەڵاتیدا دەبێ بە رێوی.

جەلابا (ن): جەلابە، جەلادا.

(٧) بەست: پەنا، ئەو شوێنانەی جاران تاوانبار پەنای پێ دەبردن و خۆی تێ فرێ‌دەدان و ئیتر کەس دەستی بۆ نەدەبرد.

واتە: وەك چۆن فەرهاد لە پێناوی خۆشەویستی شیریندا خۆی بەکوشت دا، چاری تۆیش ئەوەیە هەر لەو رێگایەتدا بەردەوام بی تا بەکوشت دەچی، چونکە تـەنها ئـەجەل و مـەرگ «بەست»ی دڵدارە لە رووی قارەمانێکی وەکوو عیشقدا...

بەیتەکە بە شێوەیەکی ناسك دەیەوێ بڵێ سەرەنجامی عاشق هەر مەرگە، ژیانیشی هەر دەرد و مەینەتە، جا بۆ ئەوەی زووتر لەو دەرد و مەینەتە رزگاری ببێ پێویستە زووتر لە پێناوی عیشقدا خۆی بدا بە کوشت. ئەوەشی هەر بەوە بۆ دێتە دی زۆرتر بـە نـاخی عـیشقەکـەیدا رۆچێ...

-٣-

(١) مەهلەکە: تووش و پڕ مەترسی. ئەر: ئەگەر. بەڵاجۆ، ئەوەی بەدوای بەڵادا بگەڕێ، سەر بە گێچەڵ. نی: نیت.

له بەحری نووری حوسنی بێنیشان ئیفشا کە یەك مەوجە
نیشانی دە بە عالەم ئیختیراعی حەشری بێ وادە(٢)

چیە؟ خوسران ئەمەندە مەستی لەهو و لەعبی دنیا بوون
برا! عومری گرامی بەس لە رێی ئەم بادە بەر با دە(٣)

بە غیبتە بەو خودا پێداوە «طُوبیٰ لَه»یە ئەهلی خولد
لە کوورەی ناری غەمدایە بە داغی دەردی تۆ شادە(٤)

هەمیشە دیدە بەحری گەوهەرە و دڵ پڕ لە نەقدی داغ
لە بن نایێ بە مەسرەف چونکە خەزنەی من خودا دادە(٥)

---

(٢) ئیفشا: دەرخستن. ئیختیراع: داهێنان.

واتە: شەپۆلێك لە دەریای جوانی بێهاوتای خۆت دەرخە، با عالەم هەموو بێتە سەیری و بەوە بەرپاکردنی رۆژی ناوەختی حەشر پیشانی هەموو جیهان بدە.

(٣) خوسران: دۆڕان و زیانکردن. لەهوو و لەعب: پڕوپووچ. گرامی: عەزیز.

واتە: بنیادەم بەم رادەیە بە پڕوپووچی دنیا مەست و سەرخۆش ببێ؛ لە دۆڕان و زیان و ماڵ وێرانی بەولاوە هیچیتر نیە. کەواتە، براگیان! بەس عومری عەزیزی خۆت لە پێناوی شەرابی دنیادا، یا لە پێناوی دنیای وەك با لە دەست دەرچوودا بدە بە با و بیدۆڕێنە.

وشە ئاراییەکی ناسك لە نێوان «بادە» و «بەر با دە»دا هەیە.

(٤) غیبتە: خۆزگە؛ حەسوودی بردن بە کەسێك بەرابەر بە سیفەتێکی چاکەی. «طوبیٰ لَهٗ»: خۆزگە بە خۆی. خولد: بەهەشت.

واتە: ئەهلی بەهەشت خۆزگە بەوکەسانە دەخوازن کەوا لە کوورەی ئاگری خەفەتی عیشقدا دەسووتێن و دڵیان بە داخی دەردی یارەوە تووشهاتوو و شادمانە. ئەمانە حەزیان دەکرد خۆیشیان وەك ئەوانە وا بوونایە.

غەمدایە (ن): غەمیایە. داغی (ن): داغ و.

(٥) واتە: هەمیشە دەریای چاوم پڕە لە دانەی گەوهەری دڵۆپە فرمێسك و دڵم پڕە لە نەختینەی خڕی داخی ئاگری دووری و، بە گریان و هەناسە هەڵکێشان دوایییان نایەت، چونکە گەنجینەی من خوا خۆی پێیداوم و ئەو خۆی بۆی بڕیومەتەوە.

لەسەر تۆ بوومە پەندی عالەمێ، وتم و، وتی: «مـەحوی»
بەسی بێ موشریکی، بـەس یـا لە دنـیا یـا لە مـن لادە (٦)

-٤-

عــەجیبم دێ لە عــەقڵی ئــەوکەسە وا تـێدەگـا مـەردە
کەچی وەك خان و خانم دائیما دڵخۆش و بـێدەردە (١)

بە پـیری مـەرگەوە فـرسەخ بـە فـرسەخ ڕۆیـون مـەردان
ئــەوی بــاکــی لە مـردن بـێ دیـارە بـڵح و نـامەردە (٢)

لەبەر قاپی مەحەببەت ئـەو خـودا پـێداوەیـە ڕووسـوور
حەزینە، دیدە پڕ ئـەسرینە، دڵ خـوێنـینە، ڕوو زەردە (٣)

---

(٦) واتە: بە یارم وت: بەهۆی تۆوە بوومە پەندی عالەم. ئەویش وتی: بەسی بێ شـەریك و هاوبەش دانان بۆ من. نابێ لە یەك کاتدا دڵی منیشت مەبەست بێ و شەرمیش لەوە بکەی کە ناوت بکەوێتە سەر دەمی خەڵك، واتە نابێ بایەخدان بە خۆت بکەی بە هاوبەشی خۆشەویستی من، کەواتە یا لە من بەولاوە گوێ بە کەس مەدە، یا دەس لە من هەڵبگرە.

لە هەندێ لە دەسنووسەکانی بەردەستماندا جێگای بەیتێك لە نێوان ئەم بـەیتە و بـەیتی پێشوودا بە بۆشی هێڵراوەتەوە، کە ئەوەش نیشانەی فەوتانی بەیتێکە لەو شوێنەدا.

-٤-

(١) عەجیبم دێ: سەرسام دەمێنم.

مەبەستی لەوەیە ئەوەی مەرد بێ دەبێ بیر لە باری ئەم دنیایە بکاتەوە و خەفەت بۆ ئـەم هەموو چەوت و چەوێڵییە بخوا کە تیایەتی و ترسی خوای لە دڵدا بێ؛ نەك هەمیشە خەریکی بەزم و ڕابواردنی خۆی بێ. بەیتەکە ئیشارەتە بۆ حەدیسی پێغـەمبەر (د.خ) کـە دەفـەرموێ: «رَأْسُ الْحِكْمَةِ مَخَافَةُ اللّٰهِ» واتە: سەرچاوەی وێڵ و فام ترسە لە خودا.

(٢) مەبەستی لەوەیە پیاو نابێ لە ترسی ئەوەی خـۆی تـووشی مـەینەت نـەبێ لە مـەینەتی خەڵك بێئاگا بێ، چونکە پیاوانی ڕاستەقینە خۆیان بەپێی خۆیان بە پیری مەرگ و مەینەتەوە دەچن و ئەوی وا نەبێ بێکارە و نامەردە.

(٣) واتە: ڕووسوور ئەو خوا پێداوەیە کـە لە بـەردەرگای دڵداریـدا کـەوتووە و خـەفەتبارە و

لە ئەحبابی قـەدیمی بـەزمی ئـولفەت مـاوەتن دوو تـەن
یەکێ پەروانە هەمدەردە، یەکێ بـولبول کـە هـەمفەردە(٤)

بـــراله! ئـــەم هـــەموو ئـــۆبـاڵە بـێ بـەو گـەردنە حـەیفە
بنیشێ بەم حـەدە ئـەم گـەردە لەو مـینایی بـێ گـەردە(٥)

لە دەورمدا حەسار، ئافەت، لەسەر سەر خەیمە، دوودی ئاه
لە سایەی عیشقەوە بوومە شەهی ساحیب سەراپـەردە(٦)

چلۆن ئەو دێتە چاوی من کە یـەکسـەر عـونسوری ئـاوە
مەحاڵە مـن کـە بـچمە دڵیـەوە، دڵ کـیشوەری بـەردە(٧)

---



چاوی پڕ بووە لە فرمێسك و دڵی بووە بە خوێن و رووی زەرد هەڵگەڕاوە. ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيراً﴾ واتە: با ئەم خەڵکە لە ترسی خوا کەم پێبکەنن و دڵیان بە دنیا خۆش نەبێ و زۆر بگرین، چونکە رێگایەکی تووش و سەختیان لەبەرە.

(٤) ماوەتن: ماوە.

واتە: لە دۆستانی کۆنی کۆڕی ئاشنایی تەنها دووکەس ماوە لە رێگەی خۆی لای نەدابێ و هەر بەردەوام بێ لەسەری. یەکێکیان پەروانەیە کە هاودەردی چرایە و لەگەڵی دەسووتێ و ئەویشیان بولبولە کە هاوئاوازی دڵدارانە و لەگەڵیاندا بەردەوام بۆ رووی گوڵ دەخوێنێ.

(٥) واتە: حەیفە ئۆباڵی بەکوشتدانی ئەم هەموو دڵدارە بە گەردنی یار بێ، چونکە «ذِمَّە»ی وەك گەردنی ئەو، وەك مینای بێ گەرد وایە و ئۆباڵی ئەم تاوانانەش وەك تۆز وایە و، مینای بێ گەردی گەردنی ئەویش بۆ ئەوە ناشێ تۆزی لێ بنیشێ.

(٦) حەسار: شوورە و دیوار. دوود: دووکەڵ. سـەراپـەردە: ئـەو پـەردە گـەورەیەی لەجـیاتی دیوار بەدەوری دەواریدا دەکێشن.

واتە: لەسایەی عیشقەوە بووم بە شاهێکی خاوەن حەسار و دەوار. حەساری دەورم دەرد و بەڵایە کە دەوری داوم و دەواری سەر سەریشم دووکەڵی هەناسەی سارد هەڵکێشـانمە کـە ئاسمانی بە بانی سەرمەوە راگرتووە.

(٧) چلۆن: چۆن. عونسور: پێشینان لایان وابووە هەرچی بوویەك هەیە لەم چوار عـونسورە،

تەپ و تۆزی غوباری دیـم و ڕێگـەی گـۆڕیو دەیـوت:
دەتــرسم دامــەنم ئــاخر بــبێ ئـالوودە بـەم گـەردە [٨]

دەبــینم ئــەهلی دڵ یــا ســەنگەسارە، یـا لەسـەر دارە
دیاری عیشق، ئەگەر ساغت دەوێ، هەر دارە هەر بەردە [٩]

لە باغی سێوو بەیدا باسی روخسار و چەنەی کەی بـوو
خەجڵ ما سێو و بەی ترسا،کەوا ئەو سوورە، ئەم زەردە [١٠]

ئەگەرچی من گەدام ئەو شا، لە عورفی عیشقدا «مەحوی»
بەسە نیسبەت لە بەینا، من سیابەخت، ئەو سیاچەردە [١١]

---



واتە لەم چوار رەگەزە، پێك هاتووە: «با» و «خاك» و «ئاو» و «ئاگر». کیشوەر: وڵات.

واتە: چۆن دەکرێ وێنەی یار بێتە ناو چاوی مـنەوە کـە لەبـەر گـریانی زۆر تـواوەتـەوە و هەمووی بووە بە ئاو و ئاویش وێنە وەرناگرێ! چۆن دەگونجێ من بچمە ناو دڵی یارەوە و یار خۆشی بوێم کە دڵی وەك بەرد رەقە!.

(٨)ئالوودە: تێکەڵاو، تێوەگلاو.

ئاخر ببێ ئالوودە بەم (ن): ئالوودە بێ ئاخر بە ئەم.

(٩)دیار: وڵات.

واتە: وڵاتی عیشق هەمووی هەر بەردەڵان و دارستانە. بۆیە عاشق یا سەنگەسار دەکرێ، یا بە سێدارەدا هەڵدەواسرێ.

(١٠)چەنە: چەناکە.

واتە: ئەوە کەی باسی روخسار و چەناکەی یاریان لە باخی سێو و بەیدا کرد، وا سێو کە لە روخسار دەچێ لە شەرمەزاریدا رووی سوور هەڵگەڕا و، بەی کە لە چەناکـە دەچـێ رووی زەرد بوو؟.

(١١)چەردە: رەنگی روو.

واتە: ئەوەندە بەسە بۆ نزیك خستنەوەی من و یار لە یەك، کە هەردوکمان پەیوەندمان بە رەشییەوە هەیە و من بەختم رەشە و ئەو پێستی رەشە.

-٥-

دیـــدە عـــەینی جـــارییە، دڵ پـــڕ لە نـــاری مـــووقەدە
ئاب و تابی حوسن ئەدەم بەو گوڵ عوزاری موو قـەدە (١)

سەیری سەگمەرگی رەقیبت کە، کە غەیری ئـەو سـەگـە
شیری غەمزەت شێر و بەوری رووبەڕوو بێ، دوو قەدە (٢)

لالە داغــە، غــونچە دەردە، پـێ لە خـاکـا مـاوە سـەرو
تا موشەڕڕەف بوو چەمەن بەو روومەت و لێو و قـەدە (٣)

چـــاوی مـــەیگوونت وەهـــا مـــەیخانەی ئـاوا کـردەوە
چۆڵی کرد ئـاخر بـە زاهـید خـەڵوەخـانەی شـەعبەدە (٤)

---

-٥-

(١) عەین: کانی ئاو. جاری: رەوان. مووقەدە: هەڵگڕاو.

واتە: چاوم بەجۆرێ فرمێسکی لێ دەڕوا، بووە بە کانیاوێکی رەوان و دڵیشم وەك ئاگردان پڕ بووە لە ئاگری هەڵگڕاوی دووری یار. بەم کانیاوی فرمێسك و بەم ئاگری بەتینەی دووری، رووی یاری گوڵڕەنگی قەدباریکی خۆم پاراو و گەش دەکەمەوە.

لە نێوان «مووقەدە» و «موو قەدە»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٢) سەگمەرگ: ئەوەی گیانی بەزەحمەت دەربچێ. بەور: دوڕەندەیەکی گەورەی گۆشتخۆرە، پێستی دێز و هێڵ هێڵە؛ لە شێر مەترسیدارترە، چوارپێی گەورە و جارجار ئادەمیزادیش دەخوا.

واتە: بەدکار سەگمەرگە وا ئەوەندە چاوی بە ناوچاوی یار دەکەوێ و گیانی دەرناچێ. ئەگینا شێر و بەوریش بەر تێغی غەمزە و نازی یار بکەون، دەبن بە دوو کەرتەوە.

(٣) واتە:کە ناوباخ بە تەشریف بۆ هێنانی روومەت و لێو و باڵای یار پیرۆز بوو، لالە لە داخا داخ بوو و سوور بووەوە و، خونچە لە تاوی دەرد پێچرا بە خۆیدا و کەوتە هاوار و کرانەوە و، سەرو قاچی بە قوڕدا چەقی و ریشەی لەناو خاکدا جێگیر بوو.

لەم بەیتەدا لەف و نەشرێکی موڕەتتەب هەیە، لالە بەرابەر بە داخ و، غونچە بەرابەر بە لێو و، قەد بەرابەر بە سەرو دانراوە.

(٤) مەیگوون: مەیڕەنگ. شەعبەدە: شەعوەزە، فڕوفێڵ.

دڵ دەبا غەمزەت، چ فەرقی ڕەند و سۆفی بۆ نیە
سەیدی مردوو حەیفە ئەم شەهبازەتی تێ بەر مەدە [(٥)]

بەشمە پێی قانیعم و بەسمە داغ و دەردی سەرمەدی
سەر بە دەردین ئێمە، بێدەردی!، لە ئێمە سەر مەدە [(٦)]

شەو بە قەتڵم وەعدی دا، ئەمڕۆ پەشیمانە، خودا!
خۆ لە «مەحوی» جونحە هەر گەردەنکەچی بوو سەرزەدە [(٧)]

---

☞

واتە: چاوی مەیڕەنگت مەیخانەی بەجۆرێ ئاوەدان کردەوە، زاهید خەڵوەتخانەی خەڵوەکێشانی فڕوفێڵی خۆی بەجێهێشت و ڕوویکردە مەیخانەی چاوت و عاشقی بوو.

(٥) ڕەند: هەرچەند بەمجۆرە لەسەر زمانی خەڵك بڵاوبووەتەوە، بەڵام ڕاستەکەی «ڕیند»ە واتە زیرەك و بێباك و فێڵباز و کەمتەرخەم. لێرەدا مەبەست عاشقە. سەید: نێچیر. شەهباز: شاباز کە گۆشتی مردارەوەبوو ناخوا.

واتە: غەمزەی چاوی تۆ فەرقی لا نیە، چ عاشقی بەرکەوێ و چ وشکە سۆفی خانەقا، دەیپێکێ. بەڵام ئەم وشکە سۆفییانە وەك نێچیری مردارەوەبوو وان، بۆ تۆیش حەیفە شابازی چاوت بەردەیتە نێچیری مردارەوە بوو.

(٦) سەرمەدی: هەمیشەیی و نەبڕاوە.

لە نێوان «بەشمە» و «بەسمە» و لە نێوان «سەرمەدی» و «سەرمەدە»دا جیناسی لاحیق و، لە نێوان «بەدەردین» و «بێدەردی»دا وشە ئاراییەکی ناسك هەیە.

(٧) سەرزەدە: ئەوەی ڕووی دابێ و سەری هەڵدابێ.

واتە: تاوانێك لە منەوە پەیدابووبێ بەرابەر بە یار هەر ئەوە بووە هەمیشە گەردنکەچ بووم بۆی، کەواتە خوایە دەبێ لەبەرچی پەشیمان بووبێتەوە، کە گفتی دابوومێ بێ بمکوژێ و نەهات.

-٦-

«حَــقّاً» لە رەقــیب ئـەو بـەرو دەرگـانە حـەرامـە
لەو دێوە کـە ئـەم تـەختی سـولەیمانە حـەرامـە(١)

«قِیل»ێکی زەعیف: ئاهی حەزین ئـیزنە لە عـیشقا
گــریانی بـەکـوڵ، نـاڵەیـی مـەستانە حـەرامـە(٢)

ســووتانی بــە بـێ‌دەنگـییە ئـادابـی مـەحەبەت
وەك بولبول ئەم ئـەفغانە بـە پـەروانـە حـەرامـە(٣)

وا دەربــــەدەر، دڵ وەتــەنی ســینەمی ون کــرد
لەو شــێرە خــوێڕی بـووە ئـەم لانـە حـەرامـە(٤)

-٦-

(١) مەبەستی لەوەیە بەدکار وەك دێو و بەردەرگای یاریش وەك تەختی حەزرەتی سولەیمان وایە. حەزرەتی سولەیمانیش دێو و درنجی هەموو بەستبوەوە، لەبەر ئەوە دروست نیە بەدکار رێی بکەوێتە بەردەرگای ماڵی یار.

(٢) قیلی زەعیف: لە ئیستیلاحی شەرعدا بەو قسانەی زانایانی شـەرع دەڵێن زۆر جێگـەی باوەڕ نەبن.

واتە: فتوایەك هەیە زۆر جێگەی باوەڕ نیە، دەڵێ: دروستە بۆ دڵدار هەناسەی خەفەتباری هەڵکێشێ، بەڵام گریانی بەکوڵ و ناڵەی مەستانە ئەوە قسەی تیا نیە کە ناڕەوایە.

(٣) ئاداب: شێوە. ئەفغان: هاوار و ناڵەناڵ.

واتە: داب و نەریتی خۆشەویستی ئەوەیە دڵدار بێ‌دەنگ بـۆ خـۆی بسـووتێ و دڵداری راستەقینەی وەك پەروانە حەرامە بۆی وەك بولبول دەس بکا بە ناڵەناڵ.

(٤) واتە: دڵ بەجۆرێك بەدوای یاردا وێڵ بووە نیشتمانی سینەمی ون کـردووە. تـازە ئـیتر لانەی دڵم لە شێری خوێڕی بووی دڵم حەرامە و نابێ بگەڕێتەوە بۆی، چونکە ئەگەر شێری تەواو دەبوو بە دەردی خـۆیـەوە دەی‌سـاچاند و بـەدوای یـاردا خـوێڕی نـەدەبوو، خـوێڕی بوونەکەی نیشانەی ئەوەیە یارای هەڵگرتنی دەردی دڵی نەبووە.

دەیوت کە بەڕەهمەن مەهی ڕۆی ئەم سەنەمەم دی
گەر بت ئەمە بێ، خـزمەتی بتخـانە حـەرامـە(٥)

مـن پـادشەهی عـیشقم و، هـەر داغـی جـونوونم
تـاجی سـەرە، بـاقی کـە لە دێوانـە حـەرامـە(٦)

هەر «کۆکەن»و «مەجنوون»ە کـوڕی کـێو و بـیابان
غەیری کون و قـوژبن کـە لە فـەرزانـە حـەرامـە(٧)

بێداغی نەدامەت دڵ و، بێدەردی ئـەسەف جـان
لەم کـالیبەدە دڵ، لە دڵ ئـەو جـانە حـەرامـە(٨)

---

(٥) بەڕەهمەن: پێشەوای ئایینی بەڕاهمایی.

واتە: کەگەورەی ئایینی بتپەرستانی بەڕاهمایی رووی وەك مانگی یاری دی، وتی: ئەگەر بت ئەمە بێ، حەرامە ئیتر خزمەتی بتخانە بکەم و پێویستە ئەم بپەرستەم.

(٦) واتە: من لە مەیدانی عیشقدا ئەوەندە شێت بووم، بووم بە پادشا، بەڵام لەجیاتی تـاجی پادشایەتی تەنها داخی شێتیم ناوەتە سەر سەر، چونکە شێت لەو داخـە بـەولاوە هـیچیتر ناگرێتە خۆی و هیچ بەرگێك لەبەرناکا.

(٧) کـۆکـەن: فـەرهادی شـیرین. مـەجنوون: مـەجنوونی لەیـلا. فـەرزانـە: خـاوەن عـەقڵ و تێگەیشتوو.

واتە: ئەوەی دڵی زیندوو بێ و گرفتاری دەردی عیشق بووبێ، دەبێ لە تاو قسەی بەدکاران وەکوو فەرهادی کۆکەن بداتە کێو یا وەك مەجنوونی لەیلا وێڵی دەشت و بیابان بێ، چونکە لە کون و قوژبنی کێو و بیابان بەولاوە حەرامە لێی. یا لەبەرئەوە کە پیاوی تێگەیشتوو ناچارە ئەگەر نەداتە کێو و بیابان، دەمی خۆی بگرێ و کەنارەگیری بکا و غەیری کون و قـوژبن لە خـۆی حەرام بکا.

(٨) نەدامەت: پەشیمانی. کالیبەد «کالبُد»: قەوارەی لەش.

واتە: ئەگەر دڵ داخی پەشیمانی پێوە نەبێ و، گیان تووشی دەردی خەفەتباری نەبووبێ، حەرامە قەواردی نەش دڵی تێدا بێ و دڵ گیانی لەبەردا بێ.

خوێناوی جگەر، گۆشەیی «بَـیْتُ الحَـزَن»ێ بـوو
«مەحوی»! بەسە، مەیلی مەی و مەیخانە حەرامە[٩]

-٧-

بە ئەفسوون و دوعا تەسخیری ئەو شۆخە چ ئیمکانە!
خـەیاڵی خـاوە، عـەنقا نـاکـەوێتـە داوی ئـەفسانە[١]

هوجوومی عاشقانی دی کە مشتێ جوێنی پێ بەخشین
بەسەر خۆتانییا دابەش بکەن، سا بەش بکـا یـا نـە![٢]

غــوڵامــانە سـەرم دانـا لەبـەر پـێیـا، وەکـوو زوڵفـی
کەچی ئەو هەر منی خستۆتە پشت گوێ وەك غوڵامانە[٣]

---

(٩) واتە: مەحویا ئەگەر خوێناوی جگەر و کونجی خەمخانەیەکت دەسگیر ببێ بـەستە و لەوە بەولاوە ئارەزووی مەی و مـەیخانەکـردن حـەرامـە لێت، چـونکە دەتـوانـی لەجـیاتی مەیخانە لەو کونجی خەفەتخانەیەدا بکەوی و لەبریتی مەی خوێناوی جگەر بخۆیتەوە.

-٧-

(١) ئەفسوون: سیحر. عەنقا: پەلەوەرێکی خەیاڵییە. کینایەیە لە هەرچی ناوی هەبێ و خۆی نەبێ. ئەفسانە: سەرگوزەشتەی بە خەیاڵ دروستکراو.

مەبەستی لەوەیە یـار وەك عـەنقا وایـە، چـۆن عـەنقا نـاوی هـەیە و خـۆی نـیە، ئـەمیش ناسکییەکەی لە رادەبەکدایە ناکەوێتە بەر دەست. کەسێکیش کە هەر ناوی هەبێ و خۆی دیار نەبێ، دیارە ناکەوێتە داو و دەسگیر نابێ.

(٢) مەبەستی لەوەیە دڵدار هەر ئازاری لە یارەوە تووش دەبێ و بۆ دڵدار هەرچی لە یارەوە بێ خۆشە با جنێویش بێ.

(٣) غوڵامانە «ی یەکەم»: وەك خوڵام و نۆکەر. غوڵامانەی «ی دووهەم»: کاکۆڵ، جۆرێکی تایبەتی کۆکردنەوەی مووی سەرە لەپشت گوێوە، لە کۆندا لەناو لاوان و پیاوانی کورددا بـاو بووە.

واتە: وەك چۆن زوڵفی یار کەوتووەتە بەری پێی، منیش هەر بەوجۆرە سەرم لەبەر پێیـدا

سەکینەی مەرتەبەی سووتانیە ئـاتەش پەرستی عـیشق
ئەگەر ساحێب ئیرادەت بی، عەجەب پیرێکە پەروانە (٤)

بەبێ تۆ سەیری گوڵشەن کردنم هەر وەحشەتی بـەردا
گوڵم دی جامە چاك و، بولبولم دی غەرقی ئەفغانە (٥)

نەسیحەت بـێ بـرا! گـەر رۆڵە بـوو مـەڕوانـە بـۆ ئـابا
گەواهی عەدڵی ئەم دەعوایە پووری پووری مەروانە (٦)

---

☞

دانا، بەڵام ئەو بێزی نەهات پێی پیا بنێ و لەجیاتی ئەوەی بە چاوی زوڵف سەیری بکا وەك خوڵامانە خستیە پشتی گوێی و گوێی نەدایە...

لە نێوان هەردوو «غوڵامانە»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٤) سەکینە: ئارامبوون و دامرکانەوە. ساحێب ئیرادەت: بنیادمی دڵ قایم و خاوەن بڕیار.

واتە: ئەوەی ئاگری دڵداری بپەرستێ، دڵی بەوە دادەمرکێ بگاتە پایەی سووتان و وەکوو پەروانە بسووتێ. جا ئەگەر تۆیش مرۆیەکی دڵ قایم و خاوەن بڕیار بی، بەڕاستی پەروانە ڕێگا پیشاندەرێکی تەواوە، دەتوانی دەرسی پەرستنی راستەقینەی لێوە فێر ببی.

(٥) چاك: لەتلەت کراو. ئەفغان: فوغان و هاوار.

واتە: کە سەیری باخچەم کرد تۆی تیا نەبووی، ئەوەندەی‌تر خەفەتبار بـووم. دیـم لەبـەر نەبوونی تۆ گوڵ یەخەی خۆی دادڕیوە و پەڕەکـانی لەت بـوون و بـولبول خـەریکی نـاڵەی بەسۆزە.

(٦) ئابا، «ئاباء»: آباء، باوکان. گەواه: بەڵگە، شاهید. پوور: کوڕ.

واتە: ئامۆژگاریت بێ برا، ئەگەر کوڕێکت دی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بوو، مەڕوانە بـۆ ئەوەکە کوڕی کێیە و ئاخۆ باوك و باپیری کەسانێکی چۆن بوون. بەڵگەی راستی ئەم قسەیەشم عومەری کوڕی «عبدالعزیز»ە کە کوڕەزای مەروانی کوڕی حـەکـەمە. مـەروان خـۆی لەبـەر گزی‌کردن و دەست پیسی لە نووسینەوەی قورئاندا پێغەمبەر (د.خ) لە مـەدینە دەری‌کـرد و ناردی بۆ مەککە. کەچی عومەری کوڕەزای، ئەو خەلیفە دادگەرەی لێ دەرچوو کە ناوبانگی دنیای گرتەوە.

مـــەتاعی ســـیدق و ئـیخلاسم لە بـازاڕی ریـاکـاران
لە سوورەی «قُلْ هُوَ اللّٰهُ» دەکەم لەم مـوشریکستانە (٧)

ئـــەوەندەم لەو قـەد و بـاڵایـە ئـاشووب و بـەڵا دیـوە
لە سەیری سـەروی بـاغم غـایلەی غـوولی بـیابانە (٨)

نەما جێی ئەو جگەرگۆشە، مەگەر رۆح و ئەویش دەڕوا
جگـــەر سـۆزانـە، دڵ بـریانە، دیـدە پـڕ لە گـریانە (٩)

چ بەرقی جیلوەیەك هەوری بەهاری کردووە بـێ‌تـاب
بە ناڵە و گریەوە دێت و دەچـێ وەك تـازە دێوانـە (١٠)

سیابەختی لە مەجنوونی من ئیتر چی دەوێ «مەحوی»
سـەرم شـێواوە، رۆژم تـیرەیە، حـاڵم پـەرێشـانە! (١١)

---

(٧)مەتاع: کەل‌وپەل. موشریکستان: وڵاتی ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.
واتە: لە بت‌پەرستستانی بازاڕی ریاکاراندا، لە کووتاڵی سوورەتی «قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَـد» کـە سوورەتی خوا بە یەك زانینە، جل‌وبەرگی راستی و خوا بە تەنها پەرستی بۆ خۆم ئامادە دەکەم. ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئەو واتە ئایینییە کە ریاکردن بە نیوەی بت‌پەرستی دادەنێ.
(٨)غایلە، «غائیلە»: ترس. غوول: دێو.
واتە: ئەوەندە دەرد و بەڵام لە باڵای بەرزی یارەوە تووش بووە، کە لەناو بـاغدا سـەیری داری سەرو دەکەم ترسم لێ دەنیشێ وەك بڵێی غوولی بیابانم هاتبێتە رێ.
(٩)سۆزان: ئاگر تێ‌بەربوو. بریان: هەڵقرچاو.
واتە: جێگایەکم نەماوە وێنە و خەیاڵی یاری تێدا دابنێم، مەگەر گیانم کە ئەویش خەریکە دەردەچێ، چونکە جگەرمە سووتاوە و دڵمە بووە بەکەباب و چاومە پڕ بووە لە ئاو، ئیتر دەبێ لە کوێیدا دانێم!؟.
(١٠)واتە: نازانم تیشکی دەرکەوتنی چ شۆخێك داویە لە هەوری بەهار وا ئۆقرەی لێ‌بڕیوە و وەك کەسێك تازە شێت بووبێ، دێ و دەچێ و دەناڵێنێ و دەگریێ.
(١١)تیرە: تاریك.

-٨-

شمشادە ئەمە، یـا قـەدە، یـا سـەروی ڕەوانـە
یا عەرعەرە یا نەخلی مـرادی دڵ و جـانە! (١)

داخۆ ئەمە ئەگـریجەیە پـەخشاوە بـە سـەردا
یا سونبولە کردوویە سەبا زوڵفی بـە شـانە! (٢)

ئاهووی خـوتەنە جـیلوە دەکـاتن لە خـەتادا
یا چاوی ڕەشی فیتنەگەری سورمەکەشانە! (٣)

دڵ هـایمە دائـیم کـە ئـەمە قـەترەیە داخـۆ
یا جوزئێکی بێ جوزئە موسەمما بە دەهانە! (٤)

---

☞

واتە: بەدبەختی چی‌تری لە شێت‌بوونی من دەوێ، لەوە زیاتر کە سەرم لێ تێك‌چـووە و ڕۆژم ڕەش هەڵگەڕاوە و حاڵم پەریشان بووە.

-٨-

ئەم پارچە شیعرە لە نوسخە چاپکراوەکەدا نیە. حاجی میرزا «عبداللّٰه»ی کۆیی «خادیم»یش کردوویە بە پێنج خشتەکی.

(١) شمشاد: داری شمشاڵ، دارێکی هەمیشە سەوزە، گەڵای خڕ و ورد و بچووك و ئەستوور و تیشك‌داری هەیە. دارەکەی ڕەق و پتەوە بۆ دروستکـردنی شـتی جـوان بـەکـاری‌دێنـن. عەرعەر: سەروی کێوی، درەختێکە کەمێك لە سەروی عادەتی کورتتر و بچووکترە. نـەخلی موراد: داری ئاوات. (٢) داخۆ: ئاخۆ. پەخشاوە: بڵاو بووەتەوە.

(٣) خەتا و خوتەن، دوو ناوچەن لە تورکستان بە ئاسکی موشك‌دار نـاوبانگیان دەرکـردووە. سورمەکەشان: ئەوانەی کلە دەکەنە چاویان.

(٤) هائیم: سەرگەردان و سەرلێ‌شێواو. قەترە: دڵۆپ. موسەمما: ناونراو. دەهان: دەم.

واتە: دڵ سەری لێ تێك‌چووە، نازانێ ئەم شتە بچکۆلەیـە دڵۆپـێ ئـاوە یـاخود شـتێکی ئەوەندە بچووکە کەرت ناکرێ و پێی دەڵێن دەم!؟.

ئەم مەی سیفەتی خوون خۆرە وا ناوك و سوورە
یاقووتی لەبە، یا گوڵە، یـا قـووتی رەوانـە![٥]

ناڵاندم و فەرمووی کـە ئـەم ئـاوازە حـەزینە
یا «مەحوی»یە، یا بولبولەکەی فەسڵی خەزانە[٦]

-٩-

لە رۆژێ هەڵدرا ئەم کۆنـە خـەیمەی تـان و پـۆ شـینە
لە سایەیدا شەرابی بەزمی عوشرەت گریە جۆشـینە[١]

دەبینی جێیەك ئەمڕۆ بـەزمی عـەیش و بـادە نـۆشـینە
سبەینێ زوو زەمانە وەزعـی گـۆڕیـوە، لە نـۆ شـینە[٢]

لە کێ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یـاقووت؟
عەزاپۆشی چیە و کـێیـە، جـلی پـیرۆزە بـۆ شـینە![٣]

---

(٥) خوون خۆر: خوێن مژ، مەبەست لە سووری لێوە. قووتی رەوان: خۆراکی گیان، مەبەست لەوەیە ماچکەر بە ماچکردنی دەژی.
(٦) بولبول بە پاییزاندا بە ئاوازێکی تایبەتی دەخوێنێ، وەك بڵێی وەرزی بەسەرچوونی گوڵ بلاوێنێتەوە.

-٩-

(١) واتە: لەو رۆژەوە ئەم دەوارە کۆنە تان وپۆ شینەی ئاسمان هەڵدراوە، خۆشی راستەقینەی تیا نەبووە و شەرابی بەزمی رابواردن لە سایەیدا هەر بریتی بووە لە قوڵپی گریان.
(٢) نۆ: نوێ.
واتە: هەر شوێنێکت بەرچاو بکەوێ ئەمڕۆ جێگـای بـەزم و رابـواردن و خـواردنـەوە و خۆشی بێ، پێی هەڵنەخەڵەتێی وابزانی بەردەوام هەر وا دەبێ، چونکە هەر ئەوەندەت زانی سبەینێ زەمانە تێکی داو سەرلەنوێ کردیەوە بە جێگای شین و شەپۆڕ.
زوو زەمانە (ن): رۆژنامەی.
(٣) عەزاپۆش: ئەوەی جلی تەعزیەی لەبەر کردبێ.

بەهارێکی‌کە داخۆ بێ، نەیێ، هەی بێن و شـینێ کـەین
فەلەك هەر شینە، سەحرا شینە، کێو و لێوی جۆشینە (٤)

وتم: بۆ رووت‌و پووتن ئەو کەسانەی عاشقی رووتـن؟
وتی: شان و شکۆهی زیندە دڵ هەر ژەندە پـۆشـینە (٥)

سەفای سافی جوانی رۆی و دوردی دەردی پیری هات
خوماریێ ماوە بەس ئەمشەو لە بادەی بەزمی دۆشینە (٦)



مەحوی دەیەوێ بڵێ دیاردەی خەم و خەفەت و مەینەت لەم جیهانەدا وەنەبێ هەر تایبەتی بێ بۆ ئادەمیزاد، بەڵکوو تەنانەت جەماداتیشی گرتووەتەوە. یاقووت کە بەردێکی گرانبەهای سوورە، سوورییەکەی خوێنی خـەم و خـەفەتی نـاو دڵیـەتی. پـیرۆزەش کـە بـەردێکـی‌تری گرانبەهایە و شینە، شینییەکەی جلی تازیەدارییە لەبەری کردووە... هەرچەند راز و نهێنی ئەم خەفەت و تازیەدارییەی یاقووت و پیرۆزە بۆ مەحوی دەرنەکەوتووە و نازانێ هی چـیە و لە چیەوەیە.

خوێنی (ن): خوونی.

(٤) کەین: بکەین. جۆ: جۆگا.

واتە: برادەرینە! ئێستا ئاسمان و دەشت و شاخ و گوێئاو هەمووی بەهۆی بەهارەوە شین بووە. سا توخوا هەل لەدەست مەدەن، وەرن با ئێمەیش کـۆڕێکـی شـین گـەرم بکـەین، کـێ دەزانێ دەمێنین بەهارێکی‌تری وا ببینینەوە یا نە؟.

(٥) پووت: پووچەڵ. زیندە دڵ: ئەوەی دڵی زیندوو بێ. ژەندە: کۆن و رزیو.

مەبەستی لەوەیە عاشق لەپێناوی خۆشەویـستییەکەیدا دەست لە هەموو خێر و خۆشی دنیا هەڵدەگرێ.

لە نێوان هەردوو «ڕووت»دا جیناسی تەواو و، لە نـێوان «ڕووت» و «پـووت»دا جـیناسی موزارع و، لە نێوان «زیندە» و «ژەند»دا وشە ئاراییەکی جوان هەیە.

پووتن (ن): قووتن.

(٦) دورد: خڵتەی بنی پیاڵەی شەراب. خومار: ئەو ناڕەحەتی و سەرئێشەی پاش لاچـوونی سەرخۆشی بە مەی‌خۆرەوە دەمێنێتەوە. دۆشینە: شەوی رابوردوو، دوێ‌شەو.

**کوڕی بێ، تا سەر ئەم دایەی زەمانە مەمکی کەس نادا**
**کە سەعبە شیری شەفقەت «مەحویا» لەم شێرە دۆشینە (٧)**

**-١٠-**

**لە سەیری خەستەخانەی عیشق ئەوی سەوزەی کەوا شینە**
**لەسەر هەر خەستە دێ یا خوێندنی یاسینە، یا شینە (١)**

---

☞

واتە: خۆشی، باڵاوتەی لاوی و جوانییەکەی ڕۆیشتووە و بەسەرچووە و ئێستە سەردەمی خڵتەکەیەتی کە دەردی پیرییە. بەزمی بادە خواردنەوەی دوێشەو بەسەرچووە و تەنها خومار و سەرئێشەیەکی پاشماوەی ئەو بەزمەی دوێشەو لە کەللەماندا ماوە... مەبەستی ئەوەیە سەردەمی لاوی بە هەموو خۆشییەکیەوە بەسەرچوو، ئێستا تەنها بیرەوەرییەکەی ماوە کە ئەویش بووە بە مایەی دەردیسەر بۆمان.

سەفای (ن): سەفا.

(٧) سەعب، [«صَعب»]: زەحمەت. شەفقەت: شەفەقەت، بەزەیی هاتنەوە.

واتە: دایکی زەمانە تا سەر شیر تەنانەت بە کوڕی خۆیشی نادا، چونکە زەمانە شێرێکی دوڕەندەیە و شیردانیش نیشانەی بەزەیی و دڵ نەرمییە و زەحمەتە شیری بەزەیی هاتنەوە لە مەمکی دوڕەندەوە دادۆشرێ.

مەبەستی لەوەیە دنیا تا سەر بۆ کەس نابێ و باکەس پێی بایی نەبێ.

**-١٠-**

(١) ئەوی: ئەو. یاسین: سوورەتی «یاسین» لە قورئان کە بەسەر نەخۆشدا دەخوێنرێ لە حاڵی گیانەڵادا.

واتە: لەکاتی تەماشاکردنی خەستەخانەی عیشقدا کە یار دەیکا ئەو یارە سەوزە کەوا شینە بچێتە سەر هەر خەستەیەك، یا دەیخاتە حاڵی گیانەڵا و یاسین لەسەر خوێندن، یا دەس بەجێ ڕاستەوخۆ دەیکوژێ.

لە نێوان «سەوزە» و «شینە»دا تەناسوب و لە نێوان هەردوو «شینە»دا جیناسی تەواو و، لە نێوان «یاسینە» و «یا شینە»دا جیناسی لاحیق هەیە.

شەهیدی غەمزەیە بەعزێ، سەقیمی عیشوەیە جەمعێ
دیارە: سەرنویشتی ئەهلی دڵ یا شینە یا سینە(٢)

لە بەنگ ئەم بەنگییانە چی دەبینن، خۆ لە خۆ گۆڕان
لە دنیادا مەداری عەیش و خۆشی، خۆ نەناسینە(٣)

بەسەر دڵدا لە قاپی فەیزەوە دێ نەشئە پەیدەرپەی
چ غەمزەی دیدە مەخموورێکە ئەمشەو کون دەکا سینە(٤)

هەناسەم دا بە ناڵە عەرزی حاڵی کەم کە تاساوە
لە خوێناوی دڵ و جەرگم دەروونم کەیلە تا سینە(٥)

---

(٢) سەقیم: نەخۆش. سەرنویشت: چارەنووس. شین: ئیشارەتە بۆ وشەی شەهیدی. سین: ئیشارەتە بۆ وشەی سەقیمی.

(٣) بەنگ: رووەکێکی سەرخۆشکەرە یا دەیکەنە ناو ئاو و دەیخۆنەوە یا وەك جگەرە و قلیان دەیکێشن. بەنگی: بەنگکێش. مەدار: ئەوەی شتێکی لەسەر وەستابێ.

واتە: ئەم بەنگکێشانە چ قازانجێك لە بەنگکێشان دەکەن لەوە زیاتر کە خۆیان لێ دەگۆڕێ و خۆیان بە شتێکی زل دێتە پێش چاو... دیارە خۆشی و رابواردنی دنیا لای ئەم جۆرە کەسانە لەسەر ئەوە وەستاوە کە ئادەمیزاد خۆی نەناسێتەوە، کە دیارە واش نیە.

(٤) واتە: ئەمشەو پەیدەرپەی لە دەرگای لوتفی خواوە خۆشی روو دەکاتە دڵم. نازانم ئاخۆ تیری چاوی چ یارێکی چاو مەستە سینەم کون دەکا و دەیکا بە دەرگا و خۆشی لێوە دەنێرێ بۆ ناو دڵم!.

(٥) واتە: هەناسەم دا ویستم بناڵێنم و بە ناڵین حاڵی خۆم عەرزی یار بکەم کەوا ناڵەم لە گەروومدا خنکاوە و دەرنایەت، چونکە دەروونم تا سینگم هەمووی پڕ بووە لە خوێناوی جەرگ و دڵم.

ئەمەی کە مەحوی دەیڵێ گوایە ویستوویە بناڵێنێ و بڵێ دەنگم دەرنایەت، زۆر ناسك و وردە، چونکە مادەم ئەو دەزانێ دەنگی دەرنایەت، ئیتر چۆن دەناڵێنێ کەوا دەنگی دەرنایەت!؟...

له عالەمدا عەلامەی سوبحی حـەشر ئیمشەو بـەیانی دا
خودا عالم، له چاکـی ئـەو بـەرۆکـە دەردەخـا سینه (٦)

مەلا تەڵقینی «مـەحوی» دانـەدا، «حَبْلُ الْمَتِين»ی ئـەو
له جـێگـەی زەللـه زەیـلی رەئـفەتی تـاها و یـاسینه (٧)

-۱۱-

غـائیب له دیـده، چـاوی سـەرم، دڵمـه پـێتـەوە!
دەسـتم بـه ئـاسمانەوە، چـاوم بـه رێتـەوە (١)

جـان سـەختە، یـا له دەعـویی عـیشقا درۆزنـه؟
ئـەو زیـنده مـاوه تـا له سـەفەر یـاری دێتـەوە! (٢)

---

(٦) واته: ئـەمشەو نـیشانەی داهـاتنی رۆژی مـەحشەر دیـاری داوه و عـالەم هـەموو راست بووەتەوه. خودا خۆی دەزانێ چیه، بەڵام وادیاره یار سینەی سپی خـۆی لەودیـوی یـەخە و بەرۆکی رەشیەوه دەرخستووه.

(٧) زەلله: پێ هەڵکەوتن. رەئفەت: بەزەیی. تاها و یاسین: دوو ناون له ناوەکانی پێغەمبەر (د.خ) و ناوی دوو سوورەتیشن له قورئانی پیرۆزدا.

واته: به مەلا بڵێن که مردم با تەڵقینم دانەدا، پێویستم پێ نیه، چـونکه لەکـاتی مـەترسی کەوتن و پێ هەڵخلیسکانی سەر پردی سیڕاتدا دەست بەگوریسێکی ئەستووری واوه دەگرم نەیەڵێ بکەومە خوار بۆ ناو دۆزەخ. ئەوەش داوێنی لوتفی پێغەمبەره (د.خ).

-۱۱-

(١) واته: ئەی ئەوکەسەی له چاوی سەرم ونی، نەك له چاوی دڵم، من دڵم به تۆوه بەسراوه و هەمیشه دەستم پان کردووەتەوه، له خوا دەپاڕێمەوه و چاوم بـڕیـوەته رێگـات بـزانـم کـەی دێیتەوه بۆلام.

(٢) واته: نازانم گیان سەختە و دەرناچێ، یا له ئیدیعای دڵداریـدا راست نـاکـا، وا هـێشتا زیندووه و چاوەڕوانی گەڕانەوەی یاره له سەفەر و لەتاو دووری یار نەمردووه!.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیته له هەندێ نوسخەدا بەمجۆرەیه:

عاشق، که زینده مایەوه تا یاری دێتەوه.

جــانانه ڕۆی و جــان و دڵم هــەردو دووبــەدووی
یاڕەبــی چــی بکــەم بــه نــیساری کــه بـێتــەوە! (٣)

ڕۆشن کــه چــاوی مــونتەزیرانت بــه گــەردی ڕێت
تۆ دێیو، نووری دیــدەیی مــن دێ بــه پــێتــەوە (٤)

خــۆم و خــوێنــمت له فکــر چــوو، دوعــا دەکــەم
ڕەنگی خوێنــی مــن کــه له دەســتت نــەچێتــەوە (٥)

لەحزێکــی مــن له ســەومەعەدا دیــبوو، ئــەمری دا
ئەو هەرزە گــەردە لەم دەرە دەرکــەن، نــەیێتــەوە (٦)

ئــینسافی دا کــه دی تــەبی عــیشقم له شــیددەتا
حــەقیه وتــی: بــەم ئــاگــرە گــەر بشــتوێتــەوە (٧)

---

(٣)نیسار: شاباش.

واتە: یاری گیانی بەگیانیم ڕۆیشت و گیان و دڵیشم دوابەدوای ڕۆیشتن. خوایە! نازانم ئەگەر هاتەوە چی بکەم بە شاباشی ڕێی؟.

(٤)واتە: من لەتاو دووری تۆ ئەوەندە گریاوم کوێر بووم. ئەگەر بێیت بۆلام و تۆزی ڕێت بچێتە چاوم، ڕۆشنایی تێدەکەوێتەوە. سا توخوا بە هاتنت چاوی چاوەڕوانیکەرەکانت ڕۆشن کەرەوە.

(٥)مەبەستی لەوەیە تا نیشانەی تاوان بمێنێتەوە بۆ دوارۆژ.

(٦)لەحزێکی: لەحزەیێکی، تاوێکی. سەومەعە: پەرستنگا. هەرزەگەرد: ئەوەی بێکارە و لە خۆڕایی بسووڕێتەوە.

واتە: یار تاوێك منی لە بتخانەکەی خۆیدا دی، فەرمانی دا دەرمکەن و وتی: نەهێڵن جارێکیتر بچمەوە بەو ناوەدا.

لەحزێکی (ن): لەحزێ منی؛ تاوێ منی.

(٧)تەب: تا.

وەك شەو كشا بەسەر مەهی روخسارِیا خەتی
گیرا ئەم ئافتابە كە قەت بەر نەبێتەوە[٨]

«مەحوی» بە یادی تۆوەیە شوغڵی كە رۆیوی
غائیب لە دیدە بووا بە خودا دڵمە پێتەوە...[٩]

-١٢-

دەوای ئەم نەفسە مەلعوونەت دەوێ، هەر دەردە وەك جیوە
كە هاتی كوشتن، ئەو رۆحی مەحز، ئەم جەوهەری زیوە[١]

لە دنیا تا دەگاتە ئاخیرەت كاریگەرە تیری
وەكوو تیری تەهەمتەن زامی پاك ئەمدیوو ئەودیوە[٢]

---

(٨) واتە: كە زوڵفی وەك شەو رەشی بەسەر مانگی رووبا كشا، رۆژی رووی بەجۆرێ گیرا، هەرگیز بەربوونی نەبێ.

(٩) شوغڵ: كار، خەریكبوون.

واتە: مەحوی هەمیشە بەیادی تۆوە خەریكە كە رۆیشتووی و بەجێت هێشتووە، سا ئەی یاری لە دیدە ون بوو، بەخوا دڵم هەمیشە بە تۆوە بەندە.

شوغڵی (ن): شەغفی. شەغف: حەز و ئارەزوو.

-١٢-

(١) واتە: وەك چۆن جیوە تا لە جووڵە نەخرێ و نەمرێنرێ كەڵكی لێ وەرناگیرێ، نەفسیش تا نەكوژرێ چار ناكرێ. جاكە هاتی هەردوكیانت كوشت، جیوەكە وەك زیوی لێ دێ و نەفسیش دەبێ بە رۆحێكی پاك و بێ گەرد. بەشبەحاڵی مەسەلەی جیوەكە دەشگونجێ مەبەستی مەحوی ئیشارەتكردن بێ بەوە كە كیمیاگەرانی كۆن هەوڵی ئەوەیان دەدا زیو لە جیوە دروست بكەن.

(٢) تەهمتەن: ئازا و بەهێز، لەقەبی رۆستەمی زاڵە كە دەڵێن تیری بۆ هەركەس وەشاندبێ ئەمدیوو ئەودیوی كردووە.

واتە: تیری نەفس لە هەركەس بدا، لەم دنیایەوە دەڕوا و لەو دنیایەوە دەردەچێ و تووشی سزا و دەردی دنیا و قیامەتی دەكا، وەك تیری تەهمتەن كە لە هەركەسی دابێ ئەمدیوو ئەودیوی كردووە.

**لە ئـەحواڵ و مـەقامات ئـەر دوا خـۆ، خـۆ نـەگـۆڕێ لێت**
**هەر ئەو گورگە، «ئەبووزەیدی سورووجی» تەوری گۆڕیوە**(٣)

**عەلاوەی بوونە رۆح هەر بیکوژی، ئەعدا عـەدوو دەکـوژی**
**چ عەقڵە؟ دوشمنی وا پـەروەری، کـێ خـێری لێ دیـوە!**(٤)

**لە عیشوەی پـڕ فـەنی دنـیا مـەبە ئـەیمەن، کـە وەك نـۆشـی**
**بە تەفرەی مەی بە سەد دانـا قـەڕابـەی زەهـری نـۆشـیوە**(٥)

---

(٣) ئەحواڵ: ئەو حاڵەی بەسەر ئـەهلی تـەسەووفدا دێ. مـەقامات: لە ئیستیلاحی ئـەهلی تەسەووفدا بەو قۆناغانە دەڵێن کە دەبێ ساڵێك بیانبرێ کە بریتین لە «تـەوبە، وەرع، زوهـد، فەقر، سەبر، تەوەککول و رەزا». هەروا ئیشارەتیشە بو کتێبی مـەقاماتی حـەریری کـە پـەنجا پارچەیە قاسمی کوڕی عەلی بەسری دایناوە و یەکێکە لە شاکارەکانی ئەدەبی کۆنی عەرەب، خاوەنەکەی چەند رازێکی خەیاڵی بەدەمی ئەبووزەیدی سورووجییەوە تـیا دەگـێڕێتـەوە لە حاریسی کوڕی هومامەوە کە ئەوانیش دووکەسی خەیاڵین. لێرەدا مەبەست لە «مەقامات» ئەم مەعنایەیە هەرچەند بەهۆی بوونی «ئەحواڵ»ەکەوە ئیشارەت بۆ ئەو مەعناکەش کراوە. تەور: خوو و رەوشت.

واتە: خۆ ئەگەر هاتوو نەفست باسی ئەحواڵ و پایەی بەرزی کرد، نەکەی ئاگات لە خۆت نەبێ خۆیت لێ بگۆڕێ، چونکە لەڕاستیدا هەر نەفسە بەدەکەی جارانە و وەك ئەوگورگەیەکە ئەبووزەیدی سورووجی رەوشتی وای لە مەقاماتی حەریریدا بەدەمەوە دەگێڕێتەوە کە دوورە لە سروشتی گورگ.

(٤) پەروەری: پەروەردەکردن.

واتە: نەفس ئەگەر بیکوژی، جگە لەوەکە دەبێ بە رۆح، بەکوشتنی، دوژمن‌ترین دوژمنانی خۆیشت دەکوژی... تاد.

پەروەری (ن): پەروەردەکردن.

(٥) ئەیمەن: ئەمین. قەڕابە: کووپەی شەراب.

واتە: هەرگیز لە نازی فێڵبازانەی دنیا ئەمین مـەبە، چـونکە وەك قـومێ ئـاو دەرخـوازدی کەسێ بدا، کووپەی زەهری بەناوی شەرابەوە بە قورگی سەد کەسی تێگەیشتوودا کردووە و هەڵی خەڵەتاندوون.

**وەکوو «قەترینە» بەحرێ دین و دنیای پێشەکی لێ سەند**
**بە هەرکەس قەترەیە بەرماوە وەسڵێکی ڕەوا دیوە[٦]**

**وەکوو دێو ئیشی عەکسە، میهری قەهرە، شەربەتی زەهرە**
**فرییە، گەنمی هەر جۆ، شیری هەر دۆ، ڕۆنی هەر پیوە[٧]**

**کە دەستت بۆ لەسەر سەر نێ، سەر و ماڵت بە غارەت چوو**
**کە لێوی پێکەنێ، عالەم دەکا سەرشێت و کالیوە[٨]**

**لە مەکری ئەم عەجووزە و سیحری دێوی نەفس ئەمن «مەحوی»!**
**پەنا دەگرم بە زاتی ئەقدەسی بێچوونی نادیوە[٩]**

(٦) قەترینە: «کاترینا»ی دووهەم «١٧٢٩ ـ ١٧٩٦ ی. ز»، ئەمپراتوورەی رووسیاکە ئافرەتێکی بەئاڵ و داو بووە، «پەتروس»ی سێهەمی مێردی لە فەرمانڕەوایی دوورخستەوە و خۆی جێگەکەی گرتەوە، چەند جار لە شەڕدا بەسەر عوسمانییەکاندا زاڵ بووە و پشتی زانایان و فەیلەسووفانی گرتووە لە وڵاتەکەیدا...

واتە: دنیا وەك قەترینەی ئەمپراتوورەی رووسیا وایە، ئەگەر دڵۆپێك وەسڵی خۆی بە کەسێك ڕەوا بینیبێ، پێشەکی پری دەریایەك دین و دنیای لێ سەندووە.

(٧) میهر: خۆشەویستی: قەهر: قاروقین. فریب: هەڵفریواندن.

واتە: ئەم دنیا هەموو ئیشی پێچەوانەیە و خەڵك هەڵدەخەڵەتێنێ.

(٨) کالیوە: ئەوکەسەی لێوی باری گرتبێ و توێکڵ فرێدا. مەبەست دەردەدارە.

مەحوی لەم بەیتەدا بەراوردێکی ناسکی لە نێوان هەردوو شەرت و وەڵامی شەرتەکەدا کردووە، سەروماڵ بە تاڵانچوونی بەرابەر بە دەست بۆ لەسەر سەردانانی دنیا و سەرشێت و کالیوە بوونی بەرابەر بە پێکەنینی لێوی دنیا داناوە.

(٩) عەجووز: پیرەژن، مەبەست دنیایە. نادیوە: کەس نەدیتوو، مەبەست خوایە.

-١٣-

کـــە بـــێ لێوی لەســـەر لێوم بـــنێ، ڕۆحـــم لەســـەر لێوە
کـــە لێوی لابـــەرێ، ئـــەڵبـــەتتە ڕۆحـــم دەردەچـــێ پـــێوە (١)

شەکەرباری، نمەك پاشی، ئـەگـەر بـبوایـە مـن دەمـوت:
کە غونچەی تازە پشکووتوو دەشوبهێ بەو دەم و لێوە (٢)

دەڵێ هـــەرکەس بـــبینێ یـــار و ئـــەغیاری بـــە ئـــەترافـا
خودا چین ئەم هەموو دێوە لە دەوری ئەم پەری شێوە! (٣)

هەتا ڕۆژە دەبێ بـۆ شـامی شـەو هـەوڵێ بـدا هـەرکەس
ئەگەر شاهەنشەهە ئەو ڕۆژە ڕۆیـی شـەو بـەبێ شـێوە (٤)

بەهارێ بوو جوانـی، بـوو بـە سـوخرەی پـاییزی پـیری
بەسەرچوو باغ و باقی ماوەوەی مشـتێ چـڵ و چـێوە (٥)

---

-١٣-

(١) واتە: ئەگەر یار بێ لێوی بنێتە سەر لێوم، لە خۆشیاندا گیانم دێتە سـەر لێوم، ئـەگـەر لایشی بەرێ گورج لە تاوا گیانم پێیەوە دەردەچێ.

(٢) شەکەرباری: شەکر لێ بارین. نمەكپاشی: خوێ پرژاندن.

واتە: ئەگەر خونچەی تازە پشکووتوو قسەی شیرینی بکردایە و تامی لێوی مەیلە و سوێر بوایە دەموت: لە دەم و لێوی یار دەچێ.

(٣) ئەغیار: بێگانە.

واتە: یار ئەوەندە جوان و نازدارە، هەرکەس بیبینێ و خەڵکی تریشی بە دەوردا ببینێ، لە دڵی خۆیدا بەراوردیان دەکا بە یەك و دەڵێ: خوایە ئەم هەموو دێو و درنجانە چین بەدەوری ئەم یارە پەری شێوەدا؟!.

(٤) واتە: پێویستە هەموکەسێ بە درێژایی ڕۆژ هەوڵ بۆ خۆراکی شەوی بدا، ئەگینا ئەگەر شاهەنشایش بێ، مادەم ڕۆژەکەی بەخۆڕایی لێ ڕۆیـی، شـەو بـەبێ شـێو سـەر دەنـێتـەوە. مەبەست لە ڕۆژ ژیانی دنیا و لە خۆراك کردەوەی باش و لە شەو پاش مردنە.

(٥) سوخرە: مایەی گاڵتە پێ کردن.

مەگەر شاری عەدەم، جێی وا تیا سەرگەشتە بم قاتە
بیابانە بەشی مەجنوونە، خاسی کۆهکەن کێوە [٦]

ئەمینی شێتییە «مەحوی» لە مەکری نەفسی ئەممارە
مەگەر رەحمی خودا دەمبەستی کا ئەم مارە ئەنگێوە [٧]

-١٤-

سەر کە جۆشێکی نەبێ، من زرکە تالْم بۆچیە!
دڵ کە هۆشێکی نەبێ شیشەی بەتالْم بۆچیە! [١]

---

☞

واتە: جوانی وەك بەهار وابوو، بوو بە مایەی گاڵتە پێ کردنی پاییزی پیری. ئێستا کە باغی بەهاری جوانی بەسەرچووە، مشتێ چڵ و چێوی لێ ماوەتەوە، بای پاییز لەملا هەڵی دەگرێ فڕێی دەداتە ئەولا...

(٦)سەرگەشتە: سەرگەردان.

واتە: جێی وا قات بووە سەری خۆم هەڵگرم و بۆی بڕۆم، مەگەر شاری نەبوونی، واتە جیهانی مردووان، چونکە بیابانە هەر بەشی مەجنوون دەکا و شاخیشە تایبەتییە بۆ فەرهادی کۆهکەن و هیچیان ئیتر جێی منیان تێدا نابێتەوە.

(٧)ئەنگێو: گەزندە.

واتە: مەگەر رەحمی خودا دەمی ماری نەفسی بەدکار بگرێ کە هەرچی بگەزێ ژیرەی لێ هەڵدەستێنێ، ئەگینا ئەمین بوون لە نەفس شێتییە.

-١٤-

(١)زرکەتاڵ: کاڵەکی نەگەیشتوو کە هێشتا تاڵ و تفتە.

واتە: سەر ئەوکاتە بەڕاستی سەرە کە سەودای عیشقی تێدابێ. ئەگینا هیچی لە زرکەتاڵ زیاد نابێ کە کەڵکی هیچی پێوە نیە. دڵیش ئەوکاتە دڵی راستییە، کە هۆش و تێ گەیشتنی هەبێ، ئەگینا جیاوازی نابێ لە شووشەی بۆش.

زرکەتاڵ (ن): زرکەکاڵ.

**دەرد و داغێکی دەروونی گەر ببێ، با ڕەنگ و ڕوو**
**سیس و موغبەڕ بێ، کەماڵم بوو جەماڵم بۆچیە!**[٢]

**تەجرەبەی عاشق بە سووتانی دەکرد ئەو زاڵمە**
**سەیری کەن ئێستا دەڵێ: مشتێ زوخاڵم بۆچیە!**[٣]

**پێی بە سەرما ناکە بوومە خاکی ڕێی، گەردم شوکر**
**گەییە داوێنی، دەلالی بای شەماڵم بۆچیە!**[٤]

**داغی سینە و پێچ و تابی دوودی ئاهم خۆ هەیە**
**مۆر و تووڕڕەی ئینپەراتۆر و قەڕاڵم بۆچیە!**[٥]

---

(٢) موغبەڕ: تۆزاوی.

واتە: ئەگەر دەروونم دەرد و داخی دڵداری تیابێ مەبەستم نیە ڕەنگ و ڕووم سیس و وەك تۆزاوی زەرد بێ، چونکە دەردەداری عیشق نیشانەی پێگەیشتنە و مرۆی پێگەیشتوویش جوانی سەروسیمای مەبەست نیە.

دەشگونجێ «کەماڵم» بە «کە ماڵم» بخوێنرێتەوە. لەم حالەدا «ماڵ» دەبێ بە تێگەیشتن مەعنای لێ بدرێتەوە کە «کەماڵ» دەگرێتەوە.

(٣) واتە: ئەو یارە ستەمکارە ڕاستی خۆشەویستی دڵدارەکەی خۆی بەوە تاقی دەکردەوە کە ئاگری پێوە بنێ، کە لێیش دەبووەوە لە سووتاندنی، گوێی نەدەدایە و دەیوت ئەم مشتە خەڵووزەم بۆچیە؟!.

(٤) واتە: کە بووم بە خاك و لەسەر ڕێی یاردا کەوتم و پێی پیانام و تۆزەکەم گەیشتە داوێنەی، ئیتر تازە نامەوێ بای شەماڵ ببێ بە دەلالم و ڕێگام پێشان بدا بۆلای یار و تۆزم هەڵگرێ بیدا بە داوێنیا.

دەشگونجێ «دەلالی» نەبێ «دەلالەی» بێ، واتە ڕێگا پیشاندان. بەم پێیەیش مەعنا هەروەکوو مەعنا پێشووەکەیە.

(٥) پێچ و تاب: ئەڵقە و لوول خواردن. تووڕڕە: مۆری شاهانە. ئینپەراتۆر: ئەمپەراتۆر. قەڕاڵ: پادشا.

واتە: لە سایەی داخی خڕی سینەم و هەناسەی هەڵکشاوی پێچ و لوولمەوە بووم بە پادشا و هیچ پێویستم بە مۆری خڕ و توغرای پێچ پێچی ئەمپەراتۆر و قەڕاڵەکان نیە.

خەڵق ئەوا مەجبووری دوو خۆ خستنی خەڵقن بە جان
من بە دڵ مەنفوورمە، روتبەی جەجاڵم بۆچیە! (٦)

ماڵە پیتکێنێیە ماڵ و، گەینە حاڵی خۆیە حاڵ
من کەوا حاڵی بم، ئیتر ماڵ و حاڵم بۆچیە! (٧)

پڕ بە پێ زنجیری شێتی، داغی سەودا پڕ بە سەر
سەیری حاڵی خۆمە، سەیری زوڵف و خاڵم بۆچیە! (٨)

دەردەدار ئەڵبەت زوبانی دەرد و حەسرەت تێدەگا
چاوی بیماری دەزانێ، ناڵە ناڵم بۆچیە! (٩)

دڵ گلە و شەکوەی لە ئەشکەنجەی عەزابی زوڵفی یار...
کرد و ئەو فەرمووی: ئەدی زنجیری زاڵم بۆچیە! (١٠)

---

(٦) دوو: دوا، شوێن. مەنفوور: بێزراو. جەجاڵ: دەجاڵ.

واتە: خەڵك بە دڵ و بە گیان حەزیان لەوەیە خەڵکی‌تر بخەنە دووی خۆیان، بەڵام من ئەم خەڵك شوێن کەوتنەم وەك شوێن کەوتنی دەجاڵ دێتە پێش چاو و هیچ حەزم لێ نیە.

(٧) ماڵە پیتکێنێ: ماڵۆچکە کردنەوەی منالان.

واتە: ماڵی دنیا وەك ماڵەقوڵەی منالان وایە و چۆنیەتی وەزعیش ئەنجامەکەی مردنە، جا من کە لەمە گەیشتبم، ئیتر دەبێ ماڵ و حاڵم بۆچی بێ؟!.

(٨) واتە: لەبریتی سەیری زوڵفی یار، سەیری ئەو زنجیرانەی شێتی دەکەم کە لە پێمدان و لەبریتی سەیری خاڵی، سەیری ئەو داخانەی سەودا دەکەم کە بەسەرمەوەن.

(٩) واتە: چاوی نەرمی یار تێدەگا من بۆچی دەناڵێنم، چونکە چاوی نەرم پێیشی دەوترێ بیمار و، بیمار و دەردەداریش یەك مەعنایان هەیە و مەسەلەی کوردیش دەڵێ: دەردەدار ئاگای لە حاڵی دەردەدارە.

(١٠) ئەدی: ئەی کە واتە.

واتە: یار لە وەڵامی گلەیی و شکاتی سزای زوڵفی یاردا وتی: ئەی ئەگەر زوڵفم بۆ ئازاردانی دڵداران نەبێ، بۆچیمە!؟.

حـاڵە بـەدحاڵی لە شـوێن و، مـاڵە وێرانـی لە دوو
«مەحویا»!گەر ئەهلی حاڵی، حاڵ و ماڵم بۆچیە![١١]

---

(١١) مەعنای ئەم بەیتەش لە چەشنی مەعنای بەیتی حەوتەمە.

-١-

نـەڵێ مـەردم کـە دنـیا پشـتی لەو، ئـەو روو لە دنـیا بـێ
کـــە پـووری زاڵە، بـۆچـی پـیرە زاڵی پـێ رەزا نـابێ! (١)

لە دەروێش و لە شـــا ئـــەم فـاحیشە ئـاخر دەکـا حـاشا
گەر ئەهلی غیرەتی، بەر لەو لە خۆی و ئەهلی حاشا بێ (٢)

ئەگەر تاجت لەسەر کا، سـەرتی پـێوە قـووتئەدا ئـاخر
موبارەك كەی دەبێ ئەو خەلعەتەی وا خەلعی لەدوا بێ (٣)

سبەی، خاكت بەسەر، وەك من دەبێ «تَحْتَ الثَّرىٰ» بێ جێت
بڵا ئەمڕۆ کە خەوتی مەسنەدت تـەختی سـورەییا بـێ (٤)

-١-

(١) پوور: کوڕ. پیر زاڵ: پیری موو سپی، پتر بۆ ژنان بەکار دێ، لێرەدا مەبەست لێی دنیایە کە لەبەر کۆنی وای پێ وتراوە.

واتە: ئەوکەسەی کە رووی کردووەتە دنیا و کـەوتووەتە هـەڵپـە بـۆی، بـەڵام ئـەو پشـتی تێ کردووە و گوێی ناداتێ، بۆی نیە ئیددیعای مەردایەتی بکا، چونکە مەرد ئـەوەیە ئـەگـەر دنیایش رووی تێ بکا، ئەم گوێی نەداتێ. سەرەڕای ئەوە ئەگەر راست دەکا مەردە و لە چەشنی رۆستەمی کوڕی زاڵە، بۆچی پیرەژنێکی وەك دنیای پێ رازی نابێ.

(٢) فاحیشە: ئافرەتی خراپ، مەبەست لێی دنیایە.

واتە: دنیا وەفای بۆ کەس نیە و وەك ئافرەتی خراپ وایە لای کەس ئۆقرە ناگرێ. جا ئەگەر مەردی، بەرلەوەی ئەو لە تۆ حاشا بکا تۆ دەس لە خۆی و لە هـەموو ئـەوانـەی لەگـەڵینـی، هەڵگرە.

(٣) خەلعەت: خەڵات. خەلع: داکەندن و داڕنین.

(٤) «تَحتَ الثَّرىٰ»: ژێر گڵ. مەسنەد: پاڵپشت. سورەییا: ناوی ئەستێرەیەکە.

واتە: هەرچەند ئەمڕۆ کە ساغیت پایەت ئەوەندە بەرز بێ پاڵ بـە ئـەستێرەی سـورەییاوە بدەی، سبەینێ دەبێ وەك من بمری و بچیتە ژێر گڵ.

لەبـــەر هـــەر دادەڕنـــرێ جـل، چ پـیناوی، چ چـیناوی
دەبـــێتـــە لوقـــمە لوقـــمە پـــاقلە یـــا پـــاقلاوا بـــێ (٥)

بـــرا، فکـــری چـــرا، کـــیبریتی فـرسەت تـا لە دەسـتایە
شەوی یەلدا لەپێشە، رۆژی عومرت وەخـتە ئـاوا بـێ (٦)

بکـــەین ئـــاه و فـــوغان و ئـاگـرێ بـەردەینە خـانومان
خەراباتی مەحەببەت حەیفە بێ ئاشووب و غەوغا بێ (٧)

لەگـەڵ فـەریاد و گـریە حـازرە فـەریادڕەس «مـەحوی»
«لِـیَبْکُوا» رێ دەدا پـیری تـەریقەت تـیفلی سـاوا بـێ (٨)

---

(٥) پیناوی: جلی پینە کراو. چیناوی: قەیفەی تاقمەکار. لوقمە: پاروو.

واتە: بێنرخ و بەنرخ سەرەنجامی هەر فەوتانە.

(٦) کیبریت: شقارتە. یەلدا: تاریك.

واتە: برا! تا شقارتەی هەلت بەدەستەوەیە، بیر لە داگیرساندنی چرایەك بکەرەوە بۆ خۆت و کردەوەیەکی چاك بکە، چونکە ها نزیکە رۆژی عومرت ئاوا بێ و شەوی تاریکی ناو قەبر بگاتە بەرەوە.

(٧) خانومان: لە دوو وشەی «خان» و «مان» پێك هاتووە کە هەردوو واتە خانوو. بە مەعنای ژن و منداڵیش بەکاردێ.

واتە: نابێ کاولە مەیخانەی جێگەی خۆشەویستی کە ناو دڵمانە هەرگیز بێ‌هـەراو ئـاژاوە بێ، کەواتە با دەس‌کەین بە هاوار و ناڵەی بەسۆز و بە هەناسەی گەرممان ئاگر بەردەینە ماڵمان و هەرچی تیایە.

دەتوانرێ «خانومان» بە «خانوومان»یش بخوێنرێتەوە.

(٨) واتە: مەحویا، ئینسان کە گریا دەس‌بەجێ رەحمی خودا دەگاتە فریای. ئایەتی: ﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيراً﴾یش کەواتە با ئەم خەڵکـە کـەم پـێبکـەنن و زۆر بگـرین، ڕێگـای پـیری تەریقەت دەدا وەك منداڵ بگری، بۆیە بە ریشی سپیەوە دەست دەکا بە گریان.

-٢-

دڵم دەرهات و تۆ هەر دەر نەهاتی!
نەهاتی، هەر نەهاتی، هەر نەهاتی! (١)

کە ئەم خەندە و قسە و لێوەت هەیە تۆ
لەباتی شەککەر و نوقڵ و نەباتی (٢)

دەدەی وادەم بە قەتڵ ئەمڕۆ، سبەی هیچ
ئەتۆ شاهی، چیە وا بێ سەباتی! (٣)

لە دنیا جەننەتی خۆ دیوە هەرکەس
کە تۆ بی حازری وەختی وەفاتی (٤)

ئەگەر رۆژە، بتی من! هەر بتێ بێ
سەرەوژێرە کە تۆ وەك رۆژ هەڵاتی (٥)

---

-٢-

(١)ئەم چەند بارە کردنەوەی رستەی «هەر نەهاتی»یە جێگەیەکی زۆری گرتووە بۆ رێبڕین لەوە کە خوێندەوار وا تێبگا ئەم نەهاتنە تەنها بۆ ماوەیەکی کەم بووە و پاشان بڕاوەتەوە.

(٢)لەم بەیتەدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە، شەککەر بۆ خەندە و نوقڵ بۆ قسە و نەبات بۆ لێو دەگەڕێتەوە.

(٣)سبەی هیچ: کەچی سبەینێ جێبەجێی ناکەی. بێ سەباتی: زوو پەشیمان دەبیتەوە و لەسەر قسەی خۆت نامێنیتەوە.

(٤)واتە: ئەوەی تۆ لە سەرەمەرگدا لای بی، لە دنیای رۆشندا بەهەشتی بە چاوی خۆی دیوە.

(٥)واتە: ئەی بتەکەی من، هەرکە تۆ وەك رۆژ هەڵهاتی، هەر بتێکی تر لەو ناوەدا بێ سەرەوژێر دەبێ با وەك رۆژیش جوان بێ.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئەوە کە پێغەمبەر (د.خ)، پاش گرتنی مەککە چووە ماڵی حەرەم و بتەکانی هەموو خست و سەرەوخواری کردنەوە.

که خزر ئەو خاك و خۆڵی بەردەرەی دی
وتی: تۆ خاکی یا ئـاوی حـەیاتی؟! (٦)

روخـیشی کـردە ئـەولا، دەیشـیپرسی
بە شۆخی، شاهی من، تۆ بۆچی ماتی! (٧)

کە داغـی سـینەمی دی، دەردی دامـێ
وتی: مۆرت هەیە، ساحێب بـەراتـی (٨)

کـە شـیرین و تـەڕی دی شـیعرەکـانم
وتی: «مەحوی» کە میراوی فـوڕاتـی (٩)

-٣-

لە تــاو ئــەعدا عــەدوو بـەر نـیوە دوژمـن ئـیلتیجا بـارێ
لە چــنگی گـیانەلاوی فـیرقەتا مـاوم، ئـەجەل، چـارێ! (١)

---

(٦)واتە: خدری زیندە بە هەزار زەحمەت و دەردیسەر ئاوی حەیاتی دۆزییەوە.کـە پـاشانیش خاکی بەردەرگای تۆی دی پەشیمان بووەوە کەوا هەر لە سەرەتاوە نەهات لەباتی ئاوی حەیات لەو خاکە بخوا و سەری سوورِ ماکە ئاخۆ ئەو خاکە خاکی خاك ئاساییە یان ئاوی حەیاتە.

(٧)واتە: یار رووبشی دەکرد بەولاوە و بێپەروایش لێی دەپرسیم: بۆچـی مـاتم، وەك بـڵێی نەزانێ لەبەر دڵڕەقی ئەو ماتم.

(٨)واتە: کە یار داغی وەك مۆری سینەمی دی، ئەویش دەردی دامێ و وتی: مادەم مۆرت هەیە، با خاوەنی بەراتیش بی کە دەردەکانی منە، چونکە ئەوەی خاوەن مۆربێ دەبێ بەراتیشی بێ.

(٩)میراو: ئەوەی دابەشکردنی ئاوی بە سەر زەراعەتکاراندا بە دەستە.

واتە: کە یار شیعرەکانمی دی چەند تەڕ و شیرینن، وتی: بەڕاستی مەحوی میراوی ئاوی فوڕاتە.مەبەستی ئەوەیە شیعرەکانی مەحوی لە پاراوی و خۆشیدا لە ئاوی فوڕات دەچن کە «فوڕات» واتە سازگار و شیرین و، خۆیشی بەو پێیە کە خاوەنی ئەو شیعرانەیە لە میراو دەچێ.

-٣-

(١)بارێ: جارێ. گیانەلاو: گیانەڵا.

**بـــەڵا هـــەروەك كـــولە دابـارییە سـەر مـەزرەعەی ئـوممێد**
**مەگەر ئەو تـیپی مـوژگانە بکـەن وەك عـەینەمەل چـارێ (٢)**

**ئەسیری زوڵفـە دڵ، ئـەی بـازی غـەمزە، غـیرەتێ، حـەیفە**
**زەلیل ئەم عەندەلیبە کـەوتووە بـەردەستی قـەل، چـارێ! (٣)**

**نە پـێیـەك هـەڵگـرێ شـوێنـی، نـە دەسـتێ گـەییە داوێنـی**
**خودا! دەرحەق بە ئەحواڵی منی بێ پـاو و پـەل، چـارێ! (٤)**

---



واتە: جاری وا دەبێ ئادەمیزاد لە تاو دوژمنی بێئامان پەنا دەباتە بەر نیوە دوژمن. کەواتە ئەی ئەجەل وەرە بمکوژە و چارێکی دەردم بکە، چونکە لە دەستی گیانەڵای دووری یاردا گیرم خواردووە، نە ئەوەتە لێم لادا و بگەم بە یار و، نە ئەوەتە بە تەواوی بمکوژێ و رزگارم کا.

ئەم بەیتە لەف و نەشرێکی مورەتتەبی تیایە، «گیانەڵاوی فیرقەت» بۆ «ئەعدا عـەدوو» و «ئەجەل» بۆ «نیوە دوژمن» دەگەڕێتەوە.

(٢) عەینەمەل: باڵدارێکی رەشە لە چۆلەکەیەکی قەڵە و گەورەترە و زۆر دوژمنی کوللەیە و پۆل پۆلیش بە کۆمەڵ دەفڕن، زیانیشی بۆ مێوە زۆرە... هەر ساڵێك کوللە زۆر بێ دەنێرن لەو وڵاتانەی عەینەمەلیان تیایە، ئاوی کانی دەهێنن و بە دەغڵودان و ناوباخیدا دەپرژێنن، گوایە عەینەمەل بەدوای ئاوی وڵاتەکەی خۆیدا دێت و ئیتر دەست دەکا بە قەڵاچۆکردنی کوللە لەو شوێنەدا کە ئاوەکە کراوە بە دەغڵودان و ناوباخیدا.

واتە: بەڵا وەك کوللە بەسەر کێڵگەی هێوامدا داباریوە، مەگەر رزی برژانگی رەشـی یـار چارێکم بکا و بێ وەك عەینەمەل بدا بەسەر ئەو بەڵایەدا و بیفەوتێنێ.

(٣) عەندەلیب: بولبول.

مەحوی لەم بەیتەدا دڵی خۆی شوبهاندووە بە بولبول و، زوڵفـی یـاری شـوبهاندووە بـە قەلەڕەش و، غەمزەی چـاوی یـاری دانـاوە بـە بـاز و داوای لێ دەکـا بـێت بـولبولی دڵی لە قەلەڕەشی زوڵفی یار رزگار بکا.

(٤) واتە: نە پێیەك هەبوو، خواهگورجوگۆڵ بێ یا خاو و خلیچك، بـتوانـێ شـوێن پـێی یـار هەڵگرێ و بزانێ لەکوێیە و پێی بگات و، نە دەستێك هەبوو، خواهکورت بێ یـا درێژ پـێی بکرێ لە داوێنی گیر بێ... سا خوایە چارێکی منی بەستەزمانی بێ دەست و پێ بکە.

دەستێ (ن): دەستم.

عــیلاجی دەردی عــاشق بـۆتـە خـاسەی ئـەو دەم و لێوە
شیفای ئەمرازی سەودا خاسیەت، چەشمەی عەسەل، چارێ! (٥)

مــەگــەر قـەتعی نـەفەس چـاری بکـا، وەرنـا نـیە هـەرگیز
لە پێوەندی کەمەندی پـڕ خـەمی تـوولی ئـەمەل چـارێ (٦)

لەگەڵ ئەم عیلمە «مەحوی» داغداری جـەهلە، تـۆ تـەوفیق!
تەبیبی بـۆ مـەریزی دەردی عـیلمی بـێعـەمەل چـارێ! (٧)

-٤-

ســـــەروی رەوانـــە قـــامەتی لاوی رەوانـــدزی
ئـــافاتی جـــانە غـــەمزەیی چـاوی رەوان‌دزی (١)

---

(٥)چەشمە: کانی.

واتە: تەنها دەم و لێوی یار چاری دەردی دڵداری پێ دەکرێ، چونکە دەم و لێوی یار وەك سەرچاوەی هەنگوێن وایە و دەردی عیشقیش دەردی سەودایە و دەرمانی سەودایش هەنگوێنە.

(٦)پێوەند: ئەوەی پێی پێ دەبەسترێتەوە. پڕ خەم: پڕ لە پێچ و لوول و گرێ کوێرە.

واتە: لە گیان دەرچوون بەولاوە هیچ چاری نەفس ناکا و لە کـەمەندی ئـاڵۆزکـاوی هـیوا درێژی رزگاری ناکا.

(٧)واتە: مەحوی لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم هەموو راستییە دەزانێ، خۆی بـە دەردی نـەزانـی گرفتار بووە. سا ئەی تەوفیقی خوا چارێکی بکە چونکە هەرتۆ تیمارکەری دەردی زانینی بێ رەفتار پێ کردنی.

-٤-

(١)واتە: باڵای لاوی رەواندزی وەك داری سـەروی قـنج بـەرزە و نـاز و ئـیشارەتی چـاوی گیان‌دزی، دڵدار بەکوشت دەدا.

دیارە مەبەستی مەحوی لە «لاوی رەواندزی» شۆخێکی تایبەتی خەڵکی رەواندز بووە.

لەو نـــاسیحانی ئـــێمـــە کـــە بـــۆ دڵ دەدەن بـــە دز
دڵڕەنـــجە بـــوو نـــیگارم و دیـــنی لەوان دزی [٢]

مەجنوونی جیلوەی ئەو پەرییەم دیوە هەرچی دی
یەغماگـەرێکـە عـەقڵی لە پـیر و جـەوان دزی [٣]

وەك کـارەبا لە کـا کـەششی جـەزبی حـوسنی تـۆ
ســـەبری بـــەدزیەوە لە مـــنی نـــاتەوان دزی [٤]

لێشـــاوی بـەستووە بـەڕووا «مـەحویا»! سـروشك
داخـــۆ چـــبێ قـــەراری لە ئـــاوی رەوان دزی! [٥]

---

(٢) دڵڕەنجە: دڵ ئێشاو. نیگا: یاری وەك وێنە جوان.

واتە: یاری وەك وێنە جوانم دڵی لەو ئامۆژگاری‌کەرانە ئێشا کە لۆمەی ئێمەیان دەکرد و دەیانوت: بۆچی دێڵن یار دڵتان بدزێ و دینی ئەوان خۆیشیانی دزی و عاشق و گیرۆدەی خۆیی کردن.

(٣) یەغماگەر: تاڵان‌کەر.

واتە: ئەو یارە ئەوەندە جوانە عەقڵی پیر و لاوی هەموو بەتاڵان بردووە. هەرکەسم دیوە بە دەرکەوتنی ئەو شێت بووە.

(٤) کەشش: راکێشان. ناتەوان: بێ دەسەڵات.

واتە: وەك کارەبا چۆن کار دەکاتە کا و رای‌دەکێشێ بۆلای خۆی، جازیبەی جوانی یاریش ئاواکاری لە من کرد و رای‌کێشام بۆلای خۆی و بەدزییەوە سەبری لە منی بێ‌دەسەڵات دزی و ئۆقرەی لێ‌بڕیم.

(٥) سروشك: فرمێسك. قەرار: ئۆقرە. رەوان: جاری.

واتە: جاران فرمێسکی چاوم بە ئارام بـۆ خـۆی دەڕژا و بـە جـۆگـەلەی خـۆیـدا دەهـاتە خوارەوە، بەڵام ئێستا لێشاوی کردووە و بە هەموولایەکی رووومدا بڵاو بووەتەوە. نازانم دەبێ چی بێ جۆگەلەی ئەسڵی لەم ئاوە جارییە بڕیبێ و هەموو سەر و رووومی پێ گرتبێتەوە!.

-٥-

به نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نێشێ
بە دەردی دڵ بچم گەر بێ لە جەوری تۆ دڵم بێشێ (١)

بەوەم زانی لە باغا چقڵی گوڵ هەڵچەقیە داوێنی
کە لێرە دڵ لە سینەمدا برینی نەشتەری دێشێ (٢)

شوکر یار ئیزنی دام هەم گریە کەم هەم قوڕ بە سەردا کەم
بە جارێ شاهی من بەحر و بەڕی بەخشی بە دەروێشێ (٣)

لەمێ مەیدانی عیشقە، کلکە رێوی ریشی تۆ، زاهید
چ بێ قەدری؟ دەبێ گەر شێری بێتێ کلکی راکێشێ (٤)

---

-٥-

(١)نێش: ئازار.

واتە: پیاڵەی زەهری هەر ئازارێك کە بەهۆی عیشقەوە تووشم بێ، بە نۆشی گیانمی دادەنێم. خوایش بکا ئەگەر دڵم لە جەور و ستەمی یار بێشێ، بە دەردە دڵ بمرم.

(٢)واتە: بەوەدا زانیم کە دڕکی گوڵی ناوباخ بە داوێنەی یاردا چەقیوە، دڵم لە سینەمدا هاتە ژانی برینداربوونی نەشتەر لێدان.مەبەستی لەوەیە لەگەڵ یاردا بەجورێك بوون بە یەكدڵ و یەكگیان، هەرکامیان ئازارێکی تووش ببێ، ئەویشیان دەستبەجێ هەستی پێ دەکا.

مەحوی لەم بەیتەدا زیادەڕەوییەکی ورد و ناسکی کردووە کە ئەوەتە گوڵی بە چقڵ ناو بردووە. مەبەستی لەمە ئەوەیە یار ئەوەندە ناسکە تەنانەت گوڵ بچەقێتە داوێنی، کە گوڵ ناچەقێ بە مرۆدا و داوێنیش ئەندامی لەش نیە تا هەست بکا، وەك دڕك بە لەشیا چەقیبێ وایە...

(٣)گریە: گریان.

مەبەستی ئەوەیە کە یار رێگای گریان و قوڕ بە سەری خۆدا کردنی دام، ئیتر ئەوەندەی ئاوی دەریای هەموو جیهان دەگریم و ئەوەندەی خۆڵی هەموو جیهان قوڕ بە سەر خۆمدا دەکەم. بەمجۆرە منی هەژار دەبم بە خاوەنی بەڕ و بەحری هەموو جیهان.

(٤)لەمێ: لەم.

وتم: روخسەت دە جانا، دا بە قوربانی لەبت کەم جان
وتی: بەحرێکی شەهد ئەڵبەت دەنیشێ پێوە مێشێ(٥)

خودا گرتوو دڵم، چۆتن بەگژ شۆر و شەڕی عیشقا
بە نەسسی ئایە ئەفلاك و زەمین ئەم بارە ناکێشێ(٦)

سەنەد بێ مۆر و خەت دەعوی مەحەببەت کردنە «مەحوی»
تەعەششوق، بێ دڵێکی داغدار و سینەیی ڕێشێ(٧)

---



واتە: کاکەی بەدیمەن دەست لە دنیا داشۆردووا! دەبێ ریشی وەك کلکە ڕێوی تۆ قەدری لەم مەیدانی عیشقەدا چی بێ، کە ئەوەندە بە سام و شکۆیە تەنانەت ئەگەر شێریشی تێ بێ، دەبێ سەر شۆڕ کا و کلکی بەدوای خۆیدا بەکێش کا تیایدا. مەبەستی لەوەیە ریشی «زاهید» لە مەیدانی خواناسی ڕاستەقینەدا وەك کلکە ڕێوی وایە لەناو کۆمەڵی شێراندا.

(٥) جانا: گیانەکەم. دا: تا. شەهد: هەنگوێنی پاڵفتە.

واتە: بە یارم وت: گیانە ڕێگام بدە گیانم بکەم بە قوربانی لێوت. ئەویش لە وەڵامدا وتی: ڕێت لێ ناگرم گیانت بکەی بە قوربانی لێوم، چونکە لێوی من لە شیرینیدا وەك دەریای هەنگوێنە و گیانی تۆیش وەك مێشە و، دەریایەك هەنگوێنیش دەبێ مێشێکی هەر پێوە بنیشێ و کە پێیشیەوە نیشت پێیەوە دەرناکەوێ.

(٦) چۆتن: چووە.

واتە: دڵەی خوا گرتووم بەگژی شۆر و هەرای دڵداریدا چووە و خۆی خستووەتە ئەو مەیدانە، ئاگای لەوە نیە کە خوا خۆی لە قورئانا فەرموویەتی: ئەم بارە بارێکی ئەوەندە قورسە ئاسمان و زەوی پێیان هەڵناگیرێ.

مەحوی لەم بەیتەدا ئیشارەت بۆ ئایەتی: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمٰوٰتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَ أَشْفَقْنَ مِنْهَا وَ حَمَلَهَا الْإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ کردووە و ئەمانەتی بە عیشق مەعنا لێداوەتەوە. مەعنای ئایەتەکە ئەوەیە: ئێمە ئەمانەتمان دا بەسەر شانی ئاسمان و زەوی و شاخەکاندا، کەسیان هەڵیان نەگرت و سامیان لێ نیشت، ئادەمیزاد لە ئەستۆی خۆی گرت. بەڕاستی ئادەمیزاد ستەمی لە خۆی کرد و سوودی خۆی نەزانی.

(٧) سەنەد: قەباڵەی خاوەنێتی زەوی‌وزار و موڵك و شتی وا کە باسی ئەو خاوەنێتییەی تیا

-٦-

حەقی بوو دڵ لە کۆیا ما بە سینەی ئێمە ناڕازی
کە عاسی قەسری خولدی دی بە جێ ئەڵحەد نەما رازی [١]

چووە چوو، خۆ نەهاتوو نادیارە، حاڵە ماڵت بێ
بەس ئەم نەقدە بکە سەرفی غەمی موستەقبەل و مازی [٢]

ببینن گەر لە ساقی ناز و عیشوێك، ئێمە دەیبینین
بە مەی نۆشی دەدەن فتوا بە مەستی موفتیو قازی [٣]

---



نووسرابێ و پیاوانی باوەڕ پێکراو مۆریان کردبێ.

واتە: ئیددیعاکردنی دڵداری بێئەوەی ئەوکەسە دڵێکی داخدار و سینەیەکی بریندار بێ، وەك قەباڵەیەك وایە کە نە هیچی لێ نووسرابێ و نە مۆری هیچ کەسێکی پێوە بێ. دیارە قەباڵەی وایش هیچی پێ ئیسپات ناکرێ.

-٦-

(١) قەسری خولد: ئەوکۆشکەی دانیشتوانی هەرگیز نامرن، بەهەشت.

واتە: دڵەی یاخیبووم ناحەقی نیە سینەی وەك ئەڵحەدی قەبر تەنگمی بەجێهێشتووە و نایەوێ و لە بەردەرگای ماڵی یاردا ئۆقرەی گرتووە. کێ دیویە گوناهبار بەهەشتی دەسکەوێ و رازی بێ لە گۆڕی تەنگ و تاردا بمێنێتەوە.

(٢) نەقد: نەخت. موستەقبەل: دوارۆژ. مازی، [«ماضی»]: رابوردوو.

واتە: ماڵ ئەوەیە ئێستا بەدەستەوەیە و نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە، چونکە ئەوەی رۆیشتووە، تازە رۆیشتووە و بەسەر چووە و لەدەس چووە. ئەوەش کە هێشتا نەهاتووە، دیار نیە و کەس نازانێ چۆن دەبێ. کەواتە نەختینەی ئێستاکەت کەم خەرج بکە لە خەفەت خواردندا بۆ لەمەوپێش و لەمەوپاش.

نەقدە (ن): حاڵە.

(٣) عیشوێك: عیشوەیەك، نازێك.

واتە: موفتی و قازی کە ئێستا فتوای دارکاری کردنی سەرخۆشان دەدەن، ئەگەر ئەو ناز و عیشوەیە ببینن کە ئێمە لە دەستی پیاڵەگێڕی مەی دەیبینین، خۆیشیان سەرخۆش دەبن و بە سەرخۆشییەوە فتوا دەدەن کەوا خواردنەوەی مەی حەڵاڵە.

له نان و ئـاو ئـەوا ئـیمساکـیە مـردووش، ئـەرێ زاهـید
چ عوجبێکە، ئەمەندە بۆ دەنـازی تـۆ بـە مـورتـازی؟(٤)

قســـە و بـاست له عـیرفانە، کـەچی دنـیایە مـەنزوورت
لە عینوانـی جـەواهـیرجـۆییایی و روو له ئـەعرازی(٥)

قسە گەر عیقدی گەوهەر بێ، غەرەز دەیکا بە خـەرموهرە
چ تەئسیرێ لە وەعزتدایـە واعـیز، وا پـڕ ئـەغرازی!(٦)

مەبە «مەحوی» بە رووپێدانی یاری عیشوەگەر مـەغروور
وەکـــوو دنـــیا ســـەباتێکـــی نـیە ئـیقبال و ئـیعرازی(٧)

---

(٤) ئیمساك: خۆگرتن لە خواردن. عوجب: خۆ بە گەورە زانین. مورتازی: ریازەتکێشـان و خۆگرتن لە خواردن بۆ مراندنی نەفس.

واتە: زاهید خۆی هەڵدەکێشێ کەوا هیچ ناخوا و ریازەت دەکێشێ. بەڵام ئەمە هیچ سەیر و مایەی شانازیکردن نیە، چونکە مردوویش هیچ ناخوا. مەبەستی لەوەیە زاهید لە بێ کارەییدا هیچی لە مردوو زیاد نیە.

(٥) مەنزوور: مەبەست. جەواهیر: جـەمعی جـەوهەرە کـە لە ئـیستیلاحی فـەلسەفییەکاندا ئەوەتە بوونی بەسرابێ بـە خـۆیـەوە. ئـەعراز [«اعـراض»]: جـەمعی عـەرەزە کـە ئـەویش لە ئیستیلاحی فەلسەفییەکاندا ئەوەتە بوونی لەسەر شتێکی تر وەستابێ.

واتە: کاکەی بەدیمەن دەست لە دنیا داشۆردوو! تۆ بە دەم باسی خواناسی دەکەی، کەچی مەبەستی راستەقینەت دەستکەوتنی دنیایە و بەدیمەن بەدوای جەوهەردار دەگەڕێت، کەچی لە راستیدا رووت لە عەرەز کردووە.

(٦) عیقد: ملوانکە. غەرەز: نیاز، مەبەست لە نیازی خراپە. خەرموهرە: مووروەکەرانە.

واتە: قسە ئەگەر مەعناکەشی ئەوەندە ورد و جوان بێ وەك ملوانکەی گەوهەر وابێ، مادەم قسەکەرەکە غەرەزی لە دڵدا بێ، قسەکانی نرخیان نامێنێ و وەك مووروەکەرانە دیار دەدەن. کەواتە کاکەی ئامۆژگاریکەر، دەبێ ئامۆژگارییەکانی تۆ چ کارێك بکەنە سەر دڵ، مادەم خۆت دڵت ئەوەندە پیس بێ و پڕ بێ لە کینە؟!.

(٧) عیشوەگەر: عـەیار و بـەناز. مـەغروور: بـایی. ئـیقبال: رووتـێ کـردن. ئـیعراز: پشت تـێ هەڵکردن.

-٧-

پـیری نـوفووزی کـرده بـەدەن، بـەسیە تـەنبەڵی
دەرچۆ لە خـانویّ کـە خـەلەل گـەییە تـەنبەلی (١)

قـەیکردنی سـوراحـی ئـەگـەر تـێبگـەی، دەڵێ
دڵ تێکەڵ هاتنە لەگـەڵ ئـەم خـەڵکـە تـێکـەڵی (٢)

وا دڵ بە داغـم ئـەز لە رەقـیب، ئـەر سـەری بـڕن
بۆ ئەکلی لەحمی ئەو سەگە من دەبمە حەنبەلی (٣)

---

-٧-

(١) نوفووز: کار. خەلەل: زەدەیی. تەنبەل «ی دووهەم»: بنچینە.

واتە: لەشی ئادەمیزاد وەك خانوو وایە و خانوونشینەکە گیانیەتی. جا هەروەك چۆن ئەگەر خانوویەك بنچینەکەی زەدە بوو ترسی رووخانی لێ دەکرا، دەبێ ئەوەی تیایەتی بەجێی بهێڵێ، ئادەمیزادیش کە پیر بوو ئەوە بنچینەی لەشی زەدە بووە و دەبێ گیانی دەرچێ. کەواتە تۆیش ئەی مەحوی، کە پیری کاری تێ کردووی، با بەسی بێ تەمەڵیکردن لە فەرمانبەرداری خوا و روویەکی تێ بکە.

لە نێوان «تەنبەڵی» و «تەنبەلی»دا وشە ئارایییەکی ناسك هەیە.

(٢) قەیکردن: «قَیء»کردن، رشانەوە. سوراحی: ئەو قاپەی مەیی لێ دادەکەن.

مەحوی لەم بەیتەدا مرقەمرقی شەرابی لە کاتی داکردندا لە سوراحی، شوبهاندووە بە قلْپوقۆپی رشانەوە و دەڵێ: سوراحی کاتێ کە شەرابی لێ دادەکرێ، دەکەوێتە مرقەمرق... ئەوە ئەگەر لێی حاڵی ببی، دەڵێ: تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵك مایەی دڵ تێکەڵ هاتنە، ئەگینا ئەگەر من نەکەوتمایەتە دەستی کەس و شەرابیان لێ دانەکردمایە، ئەم مرقەمرقەم لەچی بوو؟.

(٣) ئەز: من. حەنبەلی: پەیڕەوەکانی ڕێڕەوی پێشەوا «ئەحمەدی کوڕی حەنبەل».

واتە: من داخی بەدکاری سەگ رەوشتم ئەوەندە لە دڵدایە، ئەگەر سەریبڕن دەبم بە حەنبەلی بۆئەوەی گۆشتی ئەو سەگە بخۆم.

دیارە مەحوی لەم بەیتەدا وای داناوە کە خواردنی گۆشتی سەگ لای حەنبەلییەکان حەلاڵە، بەڵام راستەکەی ئەوەیە نەك لای حەنبەلییەکان، بەڵکوو لای مالیکییەکان، سەگ دەمی نەبێ

تەرسا بە دینی ئەو یەدی بەیزایە بوونە جووی
بۆ کوشتنم کە دەستی دەرێنا لە باخەڵی[٤]

دنیا بەتەوسەوە دەمی مەرگی وتی کە «ذُوالْ
قَرْنَیْن»ی دی زەلیلە، لە کن خۆت ئەتۆ کەڵی[٥]

زاهید چیە، هەیە گەبەڵی ریش و تووکەسەر
ئاگر نەبێ، چ بێ سەری دەرکا لە جەنگەڵی![٦]

«مەحوی»! قەزا قسێکی خۆشی وت بە چاری رووس...
دوێنێ گەماڵە گەورەکە، ئەمڕۆ یەکێ دەڵی[٧]

---

☞

هەموو گیانی پاکە. قسەیەکیش بەدەم ئیمامی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە گوایە خواردنی گۆشتی سەگ حەلاڵە، بەڵام ئەو قسە ئیسپات نەبووە.

(٤) تەرسا: عیسایی. دین: دیتن.

واتە: کە یار دەستی لە باخەڵی دەرهێنا بمکوژێ، عیساییەکان بە دیتنی دەستی دەسبەجێ لێی ترسان و وەك جوولەکە چوونە سەر ئایینی ئەو، وەك چۆن ئیسرائیلییەکان بە دیتنی دەستە سپیەکەی حەزرەتی مووسا ئیمانیان پێهێنا و چوونە سەر دینی.

(٥) «ذُوالقَرنَین»: ئەسکەندەری زولقەرنەین.

واتە: دنیا کە ئەسکەندەری زولقەرنەینی لەکاتی گیانەڵادا دی زەلیل و کەلەلاکەوتبوو، بە تەوسەوە پێی وت: خۆ تۆ لای خۆت کەڵەمێرد بووی و جیهانت هەموو داگیر کردبوو، ئێستا بۆچ وات لێ هاتووە؟.

(٦) گەبەڵ: تۆپڵاخە گەمرە، ئەوەتە کە پاشەڵی رەشە وڵاخ و بزن و مەڕ ریتاڵی تیا وشك دەبێتەوە بە مووەوە. جەنگەڵ: دارستان.

واتە: کاکەی زاهید! ئەم هەموو ریش و تووکەسەرە پیسە چیە بە سەروچاوتەوە؟ کە دەڵێی گەمرەی پاشەڵی حەیوانە و بووە بە دارستانێکی چڕی وا ئاگر نەبێ دایمرێنێتەوە کەس سەری لێ دەرناکا، یا سەرتی لێ رزگار ناکا؟!.

(٧) قسێکی: قسەیەکی. چاری رووس: قەیسەری رووس.

☜

-٨-

«لا عـاشَ سِـوىٰ ذِكْـرِكَ قَـلْبي وَ لِسـاني»
«ای آنکـه بـه‌نام هـمچو مسـیحای زمـانی»[١]

هەر غەمکەش و حەسرەتبەشی فەرهادی حەزینم
لەو وەقتەوە تـۆ خـوسرەوی شـیرینی جـیهانی[٢]

«در آرزوی لعـل لبت اشك چـو لعـلم
ای لعـل دل از لعـل لبت لعـل یـمانی»[٣]

---



واتە: قەزاوقەدەر قسەیەکی خۆشی بە قەیسەری رووس وت، ئەوەبوو پێی وت: دوێنـێ گەماڵێکی گەورە بووی و ئەمڕۆکە بووی بە دەڵ...

مەحوی لەم بەیتەدا ئیشارەت بۆ لەسەر تەخت دانیشتنی شاژن «کاترینا»ی دووهەم دەکا کە پەتروسی مێردی لە فەرمانڕەوایی دوور خستەوە و خۆی لە جێگایدا دانیشت.

-٨-

خوالێخۆشبوو مەلا ئەسعەدی مەحوی ئەم پارچە شیعرەی لە ناو پەڕەی یەکێك لە کتێبەکانی کتێبخانەی مەحویدا دۆزیوەتەوە. لەوە زیاتر لە شوێنێکی تر نەبینراوە.

(١) واتە: ئەی ئەوکەسەی بە ناو وەك مەسیحی ئەم سەردەمەی، دڵ و زوبانی من هەر بە ناو هێنانی تۆوە ژیاوە و هەر بەوەوە خەریك بووە.

دوور نیە مەحوی ئەم پارچە شیعرەی بۆ «عیسا» ناوێك وتبێ.

(٢) واتە: لەوکاتەوە تۆ لە گەورەییدا بووی بـە خـوسرەو و لە نـازداریـدا بـووی بـە شـیرینی جیهان، منیش بەرابەر بەوە چارەڕەشییەکەی فەرهاد بووە بە بەشم و ئەو داخ و خەفەتەم پێ بڕاوە کە بەشی ئەو بوو.

لەکۆکردنەوەی «فەرهاد» و «خوسرەو» و «شیرین»دا تەناسوبێکی جوان و، لە مەعنایشیاندا تیباق هەیە.

(٣) واتە: ئەی ئەو کەسەی پارچە گۆشتی سووری دڵم لەتاو لێوی وەك لەعل سوورت، بووە بە لەعلی یەمانی وا پڕ بووە لە خوێن، فرمێسکم لەتاو سۆز و ئارەزووکردنی لێوی وەك لەعل سوورت، وەك لەعل سوور بووە و بووە بە خوێن.

رەحمێ کـە بـە حـاڵی دڵی غـەمکێشـی غـەریبان
جـانانەیی جـانی، چیە هـەر یـاری زوبـانی [٤]

عوششاقی جگەر سوختە هەر حـەسرەتە بـەشیان
لوتـفی نـیە مـەعشووقە لەبـۆ عـاشقی فـانی [٥]

«مـەحوی» بە غـم از یـار بـه هـجران جـفایش»
«لَـوْ أَهْـرُبُ مِـن حُـبِّهِ فَـاللّٰهُ جَـفَانِي» [٦]

-٩-

دەبێ دڵ ویسعەتێکی وەك فەلەك زیاتر وەکەف بـێنـێ
شەو و رۆژی فیراق و وەسڵی دولبەر تا بگونجێنـێ [١]

دەخیلت بم کوڕی ئەمڕۆ بـە، فـەردا وا دەکـەم هـیچە
چ فـەرداهـا تـیا نـەکـراوە کـارێك و بـووە دوێنـێ [٢]

---

(٤) جانانە: زێدە خۆشەویست. جان: گیان.

واتە: تۆ خۆشەویستی ئێجگار خۆشەویستی گیانمی، بەزەیییەکت بە حاڵی دڵی خەفەت بەکۆڵی غەریباندا بێتەوە، بۆچ هەر بە زوبان دۆستی؟.

(٥) جگەر سوختە: جگەر سووتاو.

(٦) مەحوی لەم بەیتەدا قسە لەگەڵ خۆیدا دەکاو دەڵێ: ئەگەر بەهۆی ئـەو هـەموو دەرد و خەمەوە کە لە یارەوە تووشم دەبێ و بەهۆی جەفا و بێوەفایی یارەوە، لە خۆشەویستنی ئەو یارە رابکەم و دەسبەرداری ببم، خوا بمخاتە ناو کۆڕی دەرد و مەینەتەوە.

-٩-

(١) کەف: دەست.

واتە: دڵ دەبێ فراوانییەکی لە ئاسمان گەورەتر دەستبخا تا جێی شەوی دووری و رۆژی وەسڵی یار لەناو خۆیدا بکاتەوە.

ئەم بەیتە لەف و نەشری مورەتتەبی تیایە، فیراق بۆ شەو و وەسڵ بۆ رۆژ دەگەڕێتەوە.

(٢) فەردا: سبەینێ. فەرداها: چەند سبەینێ.

زوبانی حاڵی پەروانە لە وەختی سووتنا دەیوت:
کەسێ واریسمە وەك من بێ، لە عیشقا خۆ بسووتێنێ [٣]

رەقیب ئەڵبەتە ئیمشەو شەق دەبا، جانانە ئێوارە
بە عوششاقی تەقەببول دا لەباتی سەد دوعا جوێنێ [٤]

بە غەیبەتکردنی ئەم بێنەوایە تووشی خەجڵەت دێ
بڵێ واعیز بەس ئەم مێرووڵە بخوا، وازی لێ بێنێ [٥]

---



واتە: دەسم دامێنت چی دەکەی و چی لە بارتدایە ئەمڕۆ تەواوی‌کە و بیکە و مەیخەرە سبەینێ، چونکە ئەگەر وا نەکەی رۆژەکانت تێدەپەڕن و سبەینێکان هەموو دەبن بە دوێنێ و تۆیش هیچت بە هیچ نەکردووە. مەبەست لەوەیە کەوا کردەوە شتە نەك قسە، نابێ بنیادەم کاری هیچ رۆژێکی بخاتە سبەینێ.

فەردا (ن): سبحەی. چ فەرداها (ن): چەها سبحەی.

(٣) واریس: میراتگر. وەك من بێ: وەك من وابێ؛ بێت وەك من.

(٤) تەقەببول دا: بەخشی.

واتە: دیارە بەدکار ئەمشەو لە داخا لەت دەبێ، چونکە ئێوارەی رابوردوو یار لەباتی سەد دوعای خێر کە دڵدارەکان بۆیان کرد لوتفی فەرموو جنێوێکی پێ بەخشین.

(٥) بێنەوا: هەژار. خەجڵەت: شەرمەزاری.

واتە: بە واعیز بڵێن من لەناو پۆلی دڵداراندا ئەوەندە ناچیزم وەك مێرولە وام، کەواتە با وازم لێ بینێ و لە پاشملە خراپەم نەڵێ و گۆشتم نەخوا، ئەگینا لە ئەنجامدا خۆی شەرمەزار دەبێ. مەشهوورە ئەوەی مێرووڵە بخوا خۆی پێ ناگیرێ هەر بای لێ دەبێتەوە.

مەحوی کە لە پاشملە خراپە وتنی بە گۆشت خواردنی خراپە وتراوەکە داناوە، ئیشارەتی بۆ ئەوە کردووە کە خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَ لا یَغْتَبْ بَعْضُکُمْ بَعْضاً أَیُحِبُّ أَحَدُکُمْ أَنْ یَأْکُلَ لَحْمَ أَخِیهِ مَیْتاً﴾ واتە: با هەندێکتان لە پاشملە خراپەی ئەوانتان نەڵێن. ئاخۆ کەستان حەزدەکا گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوا!؟.

دەنی تەبعی وەها غاڵب بووە، فیرعەونی ئـەم عـەسرە
نە وەك مووسا، لە کن جوو پارە بوو ئیمانی پێ دێنێ(٦)

مەبزوە «مـەحویا» لەم ڕێگـەدا تـا دەبـیە خـاکـی ڕێ
ئومێدە دەستی گەردت هەر دەگا ئـاخر بـە داوێنـێ(٧)

-١٠-

لە سایەی دەوری چەرخی سوفلە پەروەر لەك بە لەك دەدوێ
سەگی ئاواتـەخوازی ئـێسکـی وشـتر لە شـەك دەدوێ(١)

---

(٦) واتە: سووکی و پەستی بە چەشنێ لەم چەرخەدا پەرەی سەندووە، ئەگەر فیرعەون بەو هەموو دەسەڵاتەیەوە کە هەیەتی، نەك لەلای حەزرەتی مووسا، بەڵکوو لەلای جوولەکەیش پارەی دەستبکەوێ باوەری پێ دەکا و دەچێتە سەر ئایینی، بۆئەوەی پارە وەربگرێ. جا وەرە بەراوردی ئەمە بکە لەگەڵ ئەوەدا کە فیرعەونی سەردەمی حەزرەتی مووسا خۆی دا بـەدەم ئاوی نیلەوە و تیا خنکا و نەچووە سەر دینی مووسا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگەر ئیمانی بهێنایە بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر دەکرد.

دەشتوانین مەعنای بەیتەکە وا لێ بدەینەوە بڵێین: سووکی و پەستی فیرعەونی ئەم چەرخە گەییوەتە رادەیەك... تاد. بەم پێیە مەبەستی مەحوی بەیانی تەنها سووکی و پەستی فیرعەونی سەردەم دەبێ کە دەبێ کەسێکی تایبەتی بێ، نەك تێکڕای سووکی و پەستی.

(٧) واتە: مەجووڵێ و ئەم ڕێگایە بەرمەدە تا ئەوەندە پێت پیا دەنێن دەبی بە خۆڵی سەرەڕێ، بەڵکوو ئەمە خوایە ئەوکاتە دەستی تۆزەکەت لە داوێنی یارگیر بێ و پێیەوە بنیشی.

-١٠-

(١) سوفلە: کەسانی ناچیز و بێبایەخ. لەك «ی یەکەم»: هۆزێکن پایەی کۆمەڵایەتییان لەنـاو خەڵکدا سووکە، لێرەدا کینایەیە لە هەژار و دەست کورت. لەك «ی دووهەم»: هەزار. شـەك: بەرخی نێر یا مێ کە پێی نابێتە ساڵی دووهەم.

واتە: گەردوون کەسانی ناچیز و بێبایەخی بەجۆرێ پێش‌خستووە، کەسانی جاران هەژار و دەستکورت بە هەزار هەزار باسی پارە دەکەن. سەگیش کە جاران بە ئاواتەوە بوو ئێسقانی حوشتری دەستکەوێ و بیکرێنێتەوە، ئێستا قسە لەگۆشتی شەك دەکا و بەوە نەبێ دانامرکێ.

سایەی دەوری (ن): دەوری تەوری.

دەبینم، شێری شێر ئەفگەن دەڵەك كەوڵی دەكا، دەبیەم
بەكوڵێ كلكەوە رێوی لەگەڵ كەوڵی دەڵەك دەدوێ [٢]

دەبینی بایەزیدە، وەك یەزیدێكی دەبینن خەڵق
بەبێ پەردە شەیاتینی لە ئەحواڵی مەلەك دەدوێ [٣]

بە ناوی رۆژ و مەهـ بردن، نە باسی سەدر و شەهـ كردن
مووەححید هەر دەبێ هەر یەك بناسێ، هەر لە یەك دەدوێ [٤]

مونەججیم عومری زایع بوو لە بەحس و فیكری ئەفلاكا
كە پیرێژن هەمیشە هەر لە ئەحواڵی خەرەك دەدوێ [٥]

---

(٢) شێر ئەفگەن: ئەوەی شێر دەدا بە زەویدا. دەڵەك: گیاندارێكی ترسنۆكە، پێستی زۆر بەنرخە.
واتە: دنیا وای لێ هاتووە دەبینم دەڵەك بەو ترسنۆكییەكە هەیە و خەڵك خۆی كەوڵ دەكەن، شێری شێرڕمێن كەوڵ دەكا و پێستی دەگروێ... دەشبیسم رێوی بەو كلكە درێژەیەوە كە هەیە و بە دوایدا دەكشێ و كەڵكی هیچی پێوە نیە، باسی كەوڵی دەڵەك دەكا كە ئەوەندە گران بەهایە دەستی كەس ناكەوێ.
(٣) بایەزید: تەیفوور ئەبوو یەزیدی بەستامی، خواناسێكی بەناوبانگە لە ئەهلی تەسەووف، لە ٢٦١ ی. ك «٨٧٥ ی. ز» دا كۆچی دوایی كردووە، باپیری زەردەشتی بووە. وادیارە یەكەمین كەسێكە پێڕەوی یەكێتی بوون «وَحدة الوجود»ی داهێناوە. یەزید: یەزیدی كوڕی موعاویە، ئەوەی حەزرەتی حوسەینی كوڕی عەلی كوڕی ئەبووتالیب لە جەنگ لەگەڵ لەشكری ئەودا كوژرا. مەلەك: مەلائیكە، فریشتە.
(٤) مەهـ: مانگ. سەدر، [«صدر»]: سەرۆكی وەزیران. مووەححید، «مُوَحِّد»: ئەوەی خودا بە یەك بزانێ.
مەبەستی لەوەیە ئەوەی خوا بە یەك بزانێ، دەبێ بە هیچ جۆرێ نە كەس و نە هیچ نەكا بە هاوبەشی خوا و هیچ جۆرە دەورێكیان لە ژیاندا نەداتێ و ئەوەی بەڕاستی خوا پەرستە دەخڵی بەسەر هیچ جۆرە هۆیەكی وەك رۆژ و مانگ و پادشا و وەزیرەوە نیە.
(٥) مونەججیم: نجوومگەر. خەرەك: ئامێرێكی ناو ماڵە لۆكەی پێ دەڕێسن و دەیكەن بە دەزوو، دووخ.

**بە تاقە فەخری کیسرا، هەر خەوەرنەق فەخری نوعمانە**
**دەنی هیممەت وەهایە هەر لەگەڵ کوچك و کەڵەك دەدوێ (٦)**

**زەمانەی سوفلە پەروەر وا رەواجی سوفلەیی داوە**
**کە دایم ئەو دەمە سوێرە لەگەڵ نان و نمەك دەدوێ (٧)**

**پەکی تێدا رەقیب ئەو شۆخە کوشتنمی کە لێ پرسی**
**ئیرادەی کاری خێر ئەڵبەتە شەیتانی لە فەك دەدوێ (٨)**

---

☞

واتە: نجوومگەر بەخۆڕایی و لە هیچە ژیانی خۆی لە بیرکردنەوەدا لە ئەحواڵی ئەستێرە و ئاسمانەکان دا بە باکە دیارە هیچی لێ ناوەشێتەوە، کەچی پیرێژنیش هەر خەریکی قسەی بێهوودە کردنە و باسی خەرەکە تەقەتەقکەرەکەی خۆی دەکا.

مەبەستی لەوەیە هەرکەسێ بەجۆرێ خەریکی بەبادانی کاتی خۆیەتی.

(٦) تاق: تاقی کیسرا، لە «سەلمانپاك» لە نزیکی بەغدای ئێستا. کیسرا: ئەنەوشیرەوان، پادشای بەدادی بنەماڵەی ساسانی «٥٣١-٥٧٩ی.ز»، هەروەها خوسرەوی پەروێز، دوا پادشای بەهێزی بنەماڵەی ساسانی «٥٩٠-٦٢٨ی.ز». خەوەرنەق: شوێنێکە لە نزیکی نەجەفەوە، نوعمانی کوڕی مونزیری لەخمی کۆشکێکی تیا کردووەتەوە. نوعمان: نوعمانی کوڕی مونزیری لەخمی، دوا پادشای لەخمییەکانی حیرە، خوسرەوی پەروێز لەسەر تەخت لایبرد و لە تەیسەفوون خستیە زیندانەوە.

واتە: کیسرای ساسانی هەموو شانازییەکی بە تاقەکەی بوو کە لە تەیسەفوون دروستی کردبوو. نوعمانی کوڕی مونزیریش هەموو شانازییەکی بە کۆشکی خەوەرنەق بوو کە لە حیرە کردبوویەوە. ئەمە بۆیە وایە چونکە ئەمانە دووکەسی بێ هیممەت بوون و پیاوی بێ هیممەتیش لەجیاتی ئەوەی خەریکی دڵپەروەری بێ، خۆی بە بەرد و کەڵەکەوە خەریك دەکا...

(٧) واتە: زەمانەی سپڵە پەروەر بە رادەیێك بازاڕی سپڵەیی گەرم کردووە، دەبینی هەر دەمێك باسی نان و نمەك بکا پڕ کراوە لە خوێنی سوور و بێدەنگ کراوە.

(٨) فەك: هەڵوەشاندنەوە.

واتە: کە ئەو شۆخە نازدارە باسی کوشتنمی لە بەدکار پرسی کە ئاخۆ مەسڵەحەت وایە بمکوژن یا نە، ئەو پەکی پێدا و نەیهێشت خواستەکەی بهێنێتە دی. دیارە هەمیشە شەیتانی لەعین لە هەڵوەشاندنەوەی نیازی کاری خێر دەدوێ و دەبێ بە کۆسپ و تەگەرە لە رێیدا.

مومەییز چەرخی کەچڕەو بێ، نەکەی «مەحوی» کەماڵت خەرج
زوبانی تێغی ئەو دەرحەق بە حەرفی من لە حەك دەدوێ (٩)

-١١-

دڵی بردم بە شۆخی دولبەرێکی تازە، سەر لە نوێ
موبارەك بێ لە دڵ سەودایەکی‌کەی کەوتە سەر لە نوێ (١)

کەچ ئەبرۆ، دیدە ئاهوو، شۆڕشین خوو، فیتنەجۆ، تورکێ...
خورۆش و شۆر و شینی خستە ناو ئەهلی نەزەر لە نوێ (٢)

بە ناز و عیشوە پاك ئەڕواحی پاکانی موسەخخەر کرد
بە غەمزە خاترانی دایە بەر تیری نەزەر لە نوێ (٣)

سەبا کردوویە وەعدەی گەردی کۆیی، مەگری ئەی دیدە!
بە ئوممێدم جەواهێر سورمە بۆ نووری بەسەر لە نوێ (٤)

---

(٩) مومەییز: وادیارە لەو سەردەمەدا ناونیشانی وەزیفەیێکی میری بووبێ. حەك: کوژاندنەوە.

واتە: ئەگەر چەرخی بەدڕەفتار کاربەدەست بوو، نەکەی تێگەیشتوویی و پێگەیشتوویی خۆت بەکاربێنی و بیخەیتە بەرچاو، چونکە تێغی زوبانی ئەو بەرابەر بە ناوی نووسراوی تۆ هەر باسی کوژاندنەوە و کڕاندن دەکا و دەیەوێ ناوت لەناو ناوانا نەهێڵێ، کەواتە خۆتی مەخەرە بەرچاو.

-١١-

(١) واتە: وا سەر لەنوێ دڵبەرێکی تازە دڵی بردم بۆ خۆی و داگیری کرد. خوا لە دڵمی پیرۆزکا وا سەودای دڵدارییێکی نوێی دەکەوێتە سەر.

لە نێوان هەردوو «سەرلەنوێ»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٢) کەچ ئەبرۆ: برۆ لار، کەوانی، دیدە ئاهوو: چاو وەك چاوی ئاسك گەورە و جوان. شۆڕشین خوو: تووڕە. تورك: نازدار وەك شۆخانی تورك. ئەهلی نەزەر: دڵدارانی تەماشاکەر.

(٣) پاك: سەرپاك، سەرجەم. خاتران: خاتر، دڵ.

(٤) واتە: ئەی دیدە، مەگری... بای بەیانی گفتی داومەتێ کلەی نایابی تۆزی دەوروبەری ماڵی یارم بۆ بێنێ، تا تۆی پێ بڕێژم و بیناییت تێ بکەوێتەوە.

لەبــی لەعــلی شــیفابەخشی بـرینی دڵ دەکـا مـەرهەم
ئیشارەی چاوی، دەکولێنێتەوە داغــی جگـەر لە نـویٚ[٥]

بە شێوەی شکڵی شـیرینی، وەکـوو کـاکـۆڵی مـوشکینی
پەشێوی کردووە ئەحواڵی «مەحوی» دەربەدەر لە نویٚ[٦]

-١٢-

تـێدەگـا هـەرکەس بکـا فـەهمی رومـووزی مـەعنەوی:
هیجر و وەسڵە نار و جـەننەی ئـایەتی ﴿لَا يَسْـتَوِي﴾[١]

کێوی غـەم وادی جـەفا تـەی کـردنە ئـەشراتـی عـیشق
باکی هـەوراز و نشـێوت کـەی دەبـێ گـەر رەهـڕەوی[٢]

---

(٥) واتە: بە قسەیێك لە لێوی سووری شیفابەخشیەوە برینی دڵ تیمار دەکا و، بە ئیشارەتێکی چاوی سەرلەنویٚ زامی دڵ دەکولێنێتەوە.

(٦) وەکوو کاکۆڵی موشکینی: وەك بە قژی رەشی...

-١٢-

(١) واتە: هەرکەس لە مەبەستە نهێنییەکانی قورئان حاڵی بیٚ تێدەگاکەوا مەبەست لە «جەننە = بەهەشت» و «نار = ئاگر» لە ئایەتی: ﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ. أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ دا بریتیە لە گەیشتن بە دۆست و لە دووری لە دۆست. مەعنای ئایەتەکە ئەوەیە: بەهەشتی و دۆزەخی چوونیەك نین، بەختیار تەنها هەر بەهەشتییەکانن.

(٢) رەهڕەو: ریٚ تەیکەر، رێبوار. [ئەشرات، «اشراط»: مەرجەکان].

واتە: مەرجی دڵداری ئەوەیە کێوی خەفەت و شیوی نارەحەتی ببڕی، چونکە ئەوکەسەی رێبواری راستەقینە بیٚ لە هەوراز و لێژ ناترسیٚ.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەمجۆرەیە:

تف لە شادی، چونکە خۆشی دیٚ لە شیوەن خۆشەویست

ناوی هاڕوون، ئیسمی قاڕوون، ئیبتیدا ئیما دەکەن
سەرفەرازە سەرکز ئاخر، سەرنیگوونە سەرقەوی(٣)

ئەی لەسەر تەختی غینا ئەمڕۆ، سبەینێ تێدەگەی:
ئەو گەدایەی تۆ کەوا موحتاجی شێوی یەك شەوی(٤)

دەنگی پێی ئەحبابی ڕۆیـیو پڕ بە عالەم مەوج ئەدا
تۆ بە غەفڵەت موبتەلا، گەر نەیبییەی مەستی خەوی(٥)

تف لە چارەی خەندە، گریە و شیوەنی پێ‌خۆشە دۆست
داکە ئەی بارانی ئەشك! ئەی بەرقی ناڵە، نەسرەوی!(٦)

---

(٣) هاڕوون: یەکێکە لە پێغەمبەرانی «بەنی‌ئیسرائیل»، برای حەزرەتی مووسا بووە. قاڕوون: یەکێك بووە لە دەوڵەمەندانی بەنی‌ئیسرائیل لە سەردەمی مووسادا، دەستی لە ڕێ و شوێنی مووسا هەڵگرت و بوو بە دوژمنی، خوایش سامانەکەی نوغرۆ کرد. ئیما: ئیشارەت.

پیتی یەکەمی ناوی «هاڕوون» هێیە کە لە تیپە بێدەنگەکانە (حورووفی هەمس). پیتی یەکەمی ناوی «قاڕوون»یش قافە کە لە تیپە دەنگۆدەرەکانە (حورووفی قەلقەلە). مەحویش دەڵێ: ناوی هاڕوون و قاڕوون هەر لە پیتی یەکەمیاندا ئیشارەت بۆ ئەوە دەکەن کەوا هەرکەس سەری خۆی کز ڕاگرێ، لە ئەنجامدا سەرفراز دەبێ. هەرکەسیش خۆی بە زل و سەرگەورە دابنێ لە ئەنجامدا سەرەوخوار دەبێتەوە. ئەوەتە حەزرەتی هاڕوون لە هەژارێکی ئیسرائیلییەوە بوو بە پێغەمبەری خودا، قاڕوونی خاوەن دارایی و سامانیش خوا غەزەبی لێ گرت و گەنجینەکەی برد بە ناخی زەویدا، چونکە ئەویان خۆی بە کەم دانا و ئەمیان خۆیی لێ بایی بوو.

(٤) غینا: دەوڵەمەندی. سبەینێ: پاش مردن. شێوی یەك شەو: مەبەست توانای وەڵامدانەوەی پرسیاری مەلائیکەیە لە قەبردا.

(٥) واتە: ترپەی پێی دۆستانی کۆچی دوایی کردوو، پڕ بە دنیا شەپۆڵ دەداتەوە. تۆ ئەگەر نەیبیسی، تووشی دەردی بێ‌ئاگایی بوویی و مەستی خەوی بێ‌هۆشیت.

مەحوی لەم بەیتەدا دۆستانی مردووی شوبهاندووە بە ڕێبوار و، ترپەی پێی کە هی ڕێبوارە خواستووە بۆ ئەوان.

(٦) خەندە: پێکەنین. دۆست: مەبەست خوایە.

**باسی چ بکەم بێکەرانی بەحری پڕ تـەشویری عـیشق؟!**
**تاقە قـەترێکـی «فـوتووحات»ە، نـمێکـە «مـەسنەوی»(٧)**

**ساعیدی دەرکەوت و عـالەم بـوو بـە مـووسایی هـەموو**
**موعجیزەی لێوی کە دەرخا، جـوملە دەبـنە عـیسەوی(٨)**

**رامـــی عـاشق بـوونی ئـەو وەحشـی نـیگارە مـوشکیلە**
**مەبیە هەرگیز ئەم قسـە: عـەنقا دەبـێ وەك کـەو کـەوی(٩)**

---



ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيراً﴾ واتە: با ئەم خـەڵکـە کـەم پێبکەنن و زۆر بگرین.

(٧) بێکەرانی: بێلێواری. تەشویر: گەلێ مەعنای هەیە وەك شەرمەزارکردن و ئـاڵۆزانـدن و سەر لێشێواندن و خۆشی. لێرەدا بـۆ مـەعنای دوایـییان بـاشتر دەست دەدا. فـوتووحات: «الفتوحات المكّيّة في معرفة اسرار المالكيّة و الملكيّة»ی شێخ «محي‌الدّين محمّد ابن عربي» کە لە ٦٣٨ی. ھ «١٢٤٠ی. ز»دا مـردووە، بـەشێکـی زۆری بـابەتی تـەسەووفە، ٣٧ بـەرگە. مەسنەوی: کتێبێکی فارسییە لە بابەتی تەسەووفدا بە شیعر لە شەش بـەرگدا، «جـلال‌الدّیـن محمّد رومی» دایناوە کە لە ٦٠٤ی. ك «١٢٧٣ی. ز»دا لە «بەلْخ» لە ئێران لە دایك بووە و لە ٦٧٢ «١٢٧٣»دا لە «قۆنیە» لە تورکیا کۆچی دوایی کردووە، داهێنەری تەریقەتی «مەولەوی»یە.

واتە: چۆن دەتوانم باسی گەورەیی و بێلێواری دەریای پڕشۆری دڵداری بکەم کە کتێبی «فوتووحات» تاقە دڵۆپێکە لەو دەریایە و «مەسنەوی» نمێکیەتی.

(٨) واتە: کە باسکی سپی یار دەرکەوت، خـەڵکـی هـەموو وایـان زانـی دەسـتە سـپیەکـەی حەزرەتی مووسایە کە خوا کردبووی بە موعجیزە بۆی و دنیای پێ ڕۆشن دەکردەوە. لەبـەر ئەوە هەموو چوونە سەر ئایینی حەزرەتی مووسا. کە موعجیزەی لێویشی دەرکەوت کە ئەوەتە وتەیەکی لە دەم دەربێ. مردووی پێ زیندوو دەبێتەوە، عالەم هەموو دەبن بە عیسایی. وادەزانن ئەو لێوە لێوی عیسایە کە بە فەرموودەیەکی مردوو زیندوو دەبووەوە.

(٩) واتە: زۆر زەحمەتە ئەو یارە کە دەڵێی ئاسکی بیابانە رام و دەسەمۆ ببێ بۆ دڵدار. هەرگیز ئەو قسەیە نەچێ بە گوێتدا کە دەڵێ: لەوانەیە عەنقا وەك کەو ماڵی ببێ.

چــاوی بــیماری، بــە وەعـــدی تــیرە بـارانـی نـیگاھ
گفتی دا، جەھدێ کە ئەی دڵ، بەڵکی تۆشی بەرکەوی [١٠]

«مەحویا»! ھەر ئەشك و ئاھی تۆ لە جێ جوێ بوونەوەت
چــوونە بــەر بـادی فـەنایە دەرکــەوی یـا ســەرکەوی [١١]

-١٣-

گــوم کــە بــوو راھــی ھــودا شــاھڕەھــە گــومڕاھــی
«بـــعد درویشـــی اگـــر هـــیچ نـباشد شـاهی» [١]

ئەم مەجازە چــیە، روو کــەینە حــەقیقەت، ئــەوجا
«لا إلٰــە»ەت بــەسە گــەر تــالیبی «إلَّا اللّٰـهُ»ی [٢]

---

(١٠)نیگاھ: لاکردنەوە. جەھدێ کە: ھەوڵێك بدە.

(١١)واتە: مەحویا! لە فرمێسك و ھەناسەی گەرم بەولاوە ھیچت نەماوە. ھـەر کـە لە جـێی خۆت ھەڵکەنرای دەفـەوتێیت. چ بـە فـرمێسـکـی داوەرێـیتە سـەرزەوی و چ بـە ھـەناسەیی سەرکەوی بە ھەوادا.

-١٣-

(١)شاھڕەھ: شاڕێ.

واتە: ئادەمیزاد کە ڕێگای خواناسی لێ ون بوو، دەکەوێتە سەر چـەقی ڕێی گـومڕایـی و دەیکا بە شاڕێی خۆی، چونکە لەو دوو ڕێگـایە بـەولاوە نـیە. وەك چـۆن ئـەگـەر دەست لە ھەژاریی و سەرکزکردن ھەڵگرێ، جاڕی سەربەخۆیی دەدا و ترسی کەسی لە دڵدا نامێنێ.

خوالێخۆشبوو مەلا ئەسعەدی مەحوی نیوەی یەکەمی ئەم بەیتەی بەمجۆرە خوێندوەتەوە:

گومکە بۆ راھی ھودا شاھڕەھی گومڕاھی

لە سەری نووسیوە ئیشارەیە بۆ ئیبراھیمی ئەدھەم کە دەستی لە پادشاھی ھەڵگرت و بۆ عیبادەتی خوا تەرکی دنیای کرد.

(٢)مەجاز: ئەوەیە وشەیەك بۆ مەعنایەك غەیری مەعناکەی خـۆی بـەکـارھێنـرابـێ، بـەڵام پەیوەندی لە نێوان ھەردوو مەعناکەدا ببێ. حەقیقەت: بەکارھێنانی وشە بۆ مەعناکەی خۆی. ئەمە مەعنا ئیستیلاحییەکەی ئەم دوو وشەیە. مەعنا زمانییەکەشیان «ڕاست» و «ناڕاست»ە.

☜

ڕێ درابــێ بــە گــەدایــی نــەفەسێ لەو دەرەدا
هــەرکەسێ، تــا نــەفەسە عــاریە شــاهەنشاهی(٣)

دووکــەڵی ئــاهی دەبــێ دائیمە بگــرێ بــەری ڕۆژ
ڕۆژە ڕەش، غەمزەدەیی من بم و تۆ بــی مــاهی(٤)

لە دڵا بــوونمت ئــەر عــارە لەلا، وا بکــە فــەرز:
مــاهی کــەنعانیو ئــەم مــوددە مــوقیمی چــاهی(٥)

کوشتمی و ئەودەمە خوێنم بە ئەدەب دامەنی گرت
بــەسمەلی عــیشقم و کــارم بــە خــوێنــە ڕاهــی(٦)

---



واتە: ئەم دنیا مەجاز و نادروست و ناڕاستە، با ڕوو بکەنە حەقیقەت و ڕاستی و ڕێگای خوا بگرین و دەست لە هەموو شتێکی کە داشۆرین. جا ئەوکاتە ئەگەر بەڕاستی خــوات بــوێ و دەستت پێوە گرتبێ، پێویستت بە جیاکردنەوەی هیچ پەرستراوێ نابێ، لە جوملەی «لا اله» و مادام خوات هەر لە پێشاندا جوێ کردووەتەوە، ئیتر ئینکاری هەموو خوایەکی تر لە هــەموو شتێ چاترە...

(٣) واتە: هەرکەس ڕێی درابــێ مــاوەی هــەناسەدانێك لە بــەردەرگای یــاردا گــەدایــی بکــا، کارێکی بەسەر دێ هەتا هەتایە شەرم دەکا شاهەنشاهی بکا.

(٤) واتە: مادەم خەفەتباری دەستی ڕۆژی ڕەش من بم و تۆیش مانگی ئەو ڕۆژە ڕەشە بی، دەبێ دووکەڵی هەناسەی ئەو خەفەتبارە ـکە منم ـ هەمیشە بەری ئاسمان بگرێ. مــەبەستی لەوەیە وەك چۆن کە مانگ بکەوێتە نێوان ڕۆژ و زەوی ڕۆژ دەگیرێ، ئەگەر تۆیش لە بەرابەری منی بەدبەختا بی، دەبێ دووکەڵی هەناسەم هەمیشە بەری ڕۆژی ڕووت بگرێ.

(٥) ماهی کەنعان: حەزرەتی یۆسف کە لە وڵاتی کەنعاندا خرابووە ناو بیرەوە.

چاه: چاڵ، بیر.

واتە: ئەگەر لات شوورەییە لە دڵی مندا بی و من خۆشم بوێیت، وای دابنێ حــەزرەتی یووسفی کەنعانیت و کەوتوویتە چاڵەکەکە براکانی فڕێیان دایە ناوی.

(٦) بەسمەل: حەیوانی سەربڕاو. قوربانی کە لەکاتی سەربڕیــنیدا نــاوی خــوا دێنــن. ڕاهــی:



بێ‌خەتا ئەو شەهە لەو بەردەرە «مەحوی» دەرکــرد
بۆچ کەس سەرنەچووە شەوکەتی ساحێب جاهی [٧]

**-١٤-**

دڵفـــــریبی دڵبـــــەری دڵدار، هـــــەی!
فیتنەگەر، هەی! رەند هەی! عەییار هەی! [١]

بــوویە یــاری غــەیر و مــن بــێگــانە مــام
بێ‌وەفا، هەی! هەی جەفا کردار، هــەی! [٢]

خۆ موسوڵمانم، بە ناحەق خوێنــی مــن...
بۆ دەرێژی، کافری خــوونخوار، هــەی! [٣]

---



رایی، کاری مەیسەر بوو.

واتە: من شەهیدی عیشقم. کە یار کوشتمی دڵۆپی خوێنم کەوتە سەر داوێنی و کارم بەوە رایی بوو، چونکە مەبەستم هەر ئەوەندە بوو داوێنی بە خوێنم سوور بێ.

(٧) واتە: کەوتنم لە بەردەرگای یاردا وەك پایەی پادشایی وابوو بۆم. بەڵام تا سەر نـەبوو، لە ناحەق دەری‌کردم. دیارە پایەی بڵندی خاوەن شکۆیی تا سەر بۆ کەس نابێ، بۆیە بۆ منیش نەبوو.

**-١٤-**

ئـەم پـارچ شـیعرە لەو دەسنووسانەی شـاعیر و وەچـەکـانیدا نـیە کـە ئـێستا مـاون. لە کەشکۆڵێکی مەلا جەلالی مەلا ئەحمەدی خانەقای حاجی مـەلا عـەلی‌دا «لە سـولەیمانی» دۆزراوەتەوە. لەلایەن حاجی میرزا «عبدالله»ی کۆیی «خادیم»یشەوە کراوە بە پێنج‌خشتەکی. لە دیوانە چاپکراوەکەشدا نیە.

(١) هەی: ئامرازی بانگ لێ‌کردنە لە کوردیدا. فیتنەگەر: ئەوەی هەر خەریکی فیتنە نانەوە بێ. رەند: بێ‌ترس و کەمتەرخەم.        (٢) بوویە: بووی بە...

(٣) مەبەستی لەوەیە بەگوێرەی شەرع خوێنی موسوڵمان لە بەرابەری خوێنێکی‌تردا نـەبێ نارێژرێ.

چـــا نــیە رەفـــتاری وا بـــەد بـەس بکـە
دەرحەقی من، شۆخی بەدڕەفتار، هەی![٤]

تـــۆ دڵت دێوانـــە کـــردم، ئـێـستەکـەش
نانوێنـــی روو، پـەری روخســار هـەی![٥]

قەت لە تیری ئـاهی مـەزڵوومـانی عـیشق
تـــۆ نـــەترسی، زاڵمـــی غـەددار هـەی![٦]

غەیری بەد نەیدی لە تۆ «مەحوی»، ئەتۆش
هەر بەدت رێ بێ، بەدی بەدکار هـەی![٧]

## -١٥-

خـــەتتی دەوری لێوی ئـــاڵت ئـــەی مـەسیحا لام و بـێ
هەر لە جامەی سەبز ئەچێ بۆ غەین و نوون و چیم و هێ[١]

---

(٤) چا: چاك.

(٥) نانوێنی روو: رووم نادەیتێ و خۆتم پیشان نادەی.

(٦) واتە: هیچ رەوای حەق نیە لە تیری ئاهی ستەم لێکراوانی عیشق نەترسێ.

(٧) بەدت رێ بێ: بەدت بێتە رێ.

-١٥-

(١) لام و بێ: لب، لەب. جامە: کراس. غەین و نـوون و چـیم و هـێ: غُـنچە، غـونچە کـە لە سەرەتای بەیتی داهاتوویشدا نووسراوە. هەروەها بـەش بـەحاڵی دوایـی و سـەرەتای بـەیتە داهاتووەکانی تریش بە ریز.

واتە: ئەی ئەو یارە کە لێوت وەك لێوی حەزرەتی عیسا بە تاقە وشەیەك مـردوو زیـندوو دەکاتەوە، مووی تازە دەرهاتووی دەوری لێوت وەك بەرگی سەوزی دەوری گەڵای خونچەی نەپشکووتوو وایە.

غــونچە بــازاڕی نــەزاکــەتداریو تــەنگی شکــاند
هەر کە زاهیر بوو لە دەوری باغی حـوسنت لام و یـێ[٢]

لەب شەکەر تاکەی لە حەسرەت خاڵی موشکینت، دڵم...
داغدار و خەستە بـێ وەك لام و ئـەلف و لام و هـێ؟![٣]

لالە روخســارم لە سـایەی ئـەشکی خـوێنـین رەنگـەوە
چونکە رووسوورم لە قاپی عەین و شین و قاف و تـێ[٤]

عــیشقت ئـەی جـانا، مـنی ریسـوایـی عـالەم کـردووە
چاکە ئـینسافت بـبێ بـۆ ئـەلف و سـین و تـێ و هـێ[٥]

ئــێســتە بــۆ لاف و گـەزاف هـەرکەس دەبـینی عـاشقە
نەك هەمووکەس جان فیدا وەك میم و حێ و واو و یێ[٦]

---

(٢) واتە: هەرکە لە دەوری باخی جوانیتدا کە مووی دەم و چاوتە، خونچەی لێوت دیاری دا، بازاڕی ناسکی و تەنگی خونچە شکا و پشکووت و گەڵاکانی کەوتنە دەر و پیر بوون.

(٣) واتە: ئەی یاری لێو شیرین! تاکەی دڵم لە داخی خاڵی رەشـی تـۆ وەك لالە نـەخۆش و داخاوی بێ!.

(٤) واتە: لە سایەی فرمێسکی خوێنینەوە روخسارم وەك لالە سوور دەکاتەوە، ئەو فرمێسکە خوێنینەش لە خۆشی ئەوەدا دەڕێژم کە لە بەردەرگاتدا روو سوورم.

ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:

لالە روخسارم لە سایەی مەوجی خـوێنـی ئـەشکەوە
یەعنی روو سوورم لە قاپی عەین و شـین و قاف و تێ

(٥) بۆ: لە نوسخەکانی بەردەستماندا وا نووسراوە، بەڵام لامان وایە ئەوە هەڵەیە و راستەکەی «تۆ»یە.

(٦) واتە: ئێستا هەرکەس دەبینی بۆ فیشاڵکردن خۆی کردووە بە دڵدار، بەڵام کەسیان ئامادە نین وەك مەحوی گیانی خۆیانت بەقوربان بکەن.

**«مەحوی» ئەمڕۆ زۆر نەخۆشە قەت شیفای نایێ بە هیچ**
**گەر شیفای بێتن، بە بۆیی زوڵف و ئەو ئەگریجە دێ(٧)**

(٧) بێتن: بێ. بۆیی: بۆنی.
وەك دیمان، مەحوی لە زۆربەی نیوە دووهەمەکانی هەر بەیتێکی ئەم پارچە شیعرەدا وشەیەکی بە پیتی جیاجیا هێناوەتەوە، ئەو وشەیەی بە کۆمەڵکراوی لە نیوەی یەکەمی بەیتی پاشەوەیدا وتووەتەوە. دەبێ ئەوەشمان لەیاد بێ کەوا ئەو وشانەی بەپێی شێوەی نووسینی فارسی ئامێزی جارانی کوردی لە یەك و کۆ کردووەتەوە، بۆ نموونە «لەب»ی بە «لب» وەرگرتووە و هەروەها ئەوانی تریش.

-١-

ئـاوی عـەینم «روزاب»ە چـونکە نـەما
«إنَّ عَــــــيْنَيَّ تَسكُــــبانِ دَمــــا»[١]
نــەشئە بــەخشێك لێوی مــەیگوونت
هەر بە ناوی مەسیحی خستە سەما[٢]

-٢-

حەرامــە وا بــەرن نـاوی لەبـی مـەیگوونی تـۆ ئـەحباب
نەکەن تا شوستوشۆ سەد دەفعە لێو و دەم بە بادەی ناب[١]

---

-١-

(١) عەین: چاو. روزاب [«رُضاب»]: پرژی تف.

واتە: ئەوەندە گریاوم فرمێسك لە چاوم براوە و ئاوی چاوم وەك پرژی تـفی لێ هـاتووە، ئێستا ئەگەر بگریم چاوەکانم خوێنیان لێ دەڕژێ.

(٢) سەما: سەماکردن یا ئاسمان.

واتە: من کە وام بەسەر هاتووە هیچ مایەی سەرسامی نیە، چونکە لێوی مەیڕەنگـی تـۆ بەجۆرێ خۆشی دەگەیەنێ بە دڵ، حەزرەتی عیسا هەرکە ناوی تۆی بیست کـە لە ئـینجیلا موژدەی پێغەمبەرێتی تۆی پێ درا، لە خۆشییاندا کەوتە سەماکردن، یا لە خۆشییاندا فڕی بۆ ئاسمان.

مەحوی لەم چوارخشتەکییەدا قسە لەگـەڵ پێغـەمبەر دەکـا، دروودی خـوای لێ بـێ، و ئیشارەت دەکا بۆ ئـایەتی ﴿وَ مُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِـنْ بَـعْدِي اسْـمُهُ أَحْـمَدُ﴾ واتـە: مـوژدەی پێغەمبەرێکم پێیە پاش خۆم دێت ناوی ئەحمەدە.

-٢-

ئەم چوار خشتەکییە لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) شوستوشۆ: شتن. ناب: پاك و بێگەرد.

واتە: حەرامە دۆستان ناوی لێوی سووری تۆ بەرن تا سەد جار دەم و لێویان بە شەرابی پاك و بێگەرد نەشۆرن.

مەپرسن بـۆچـی ئـیمشەو زوڵفـەکـەی جـانانە پـڕ تـابە
هەر ئەو زوڵفە نەبوو ئەمڕۆکە کردی عالەمێ بـێ تـاب[٢]

-٣-

ئەو دەووت بابەی کە خەڵقـی نـاوی نـابەن بـێ جـەناب
ئەسڵ و فـەسڵی گـەر بـزانـی، واجـبە لێی ئـیجتیناب[١]
ئەکدەشی خـینزیر و سەگ مەعجوونی بەنگ و خەندەریس
داکـــــی دایـــە ڕێزبـــاری بـــابی بـــابیی قـــەحبەباب[٢]

---

(٢) تاب «ی یەکەم»: پێچ و لول. تاب «ی دووهەم»: توانا.

واتە: مەپرسن بۆچی ئەمشەو زوڵفی یار ئەوەندە پێچ و لوولە، هەر ئەو زوڵفە نەبوو ئەمڕۆ توانای لە عالەم بڕی؟ مەبەستی لەوەیە زوڵفێك ئەوەندە کاریگەر بێ بە ڕۆژ هێزی لە عـالەم بڕیبێ، دەبێ بە شەو ئەوەندە ڕازاوە و جوان بێ. یان بۆیە بە شـەو ئەوەندە پێچ و لوولە چونکە بە ڕۆژ بە بێ‌هێزکردنی عالەمەوە خەریك بووە و ماندوو بووە و ئێستا لە تاو ئازاری ماندوویەتی خۆی پێچ دەخوا.

-٣-

ئەم چوار خشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) دەووت: دەویت. ئیجتیناب: خۆپاراستن.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی دووهەمەوە.

(٢) ئەکدەش: دوو ڕەگ. خینزیر: بەراز. مەعجوون: شێلراو. خـەندەریس: شـەرابـی کـۆن، وشەیەکی عەرەبییە. دایە ڕێزباری: کاکەیی. بابی: ئەوەی شوێن پەیڕەوی موحەممەد عـەلی شیرازی داهێنەری ڕێ و شوێنی بابییەتی کەوتبێ.

واتە: ئەو دەویت‌بابە کە خەڵك بە قەدر و حورمەتەوە نەبێ ناوی نابەن و کە قسەی لەگەڵ دەکەن بە «جەناب...» بانگی لێ دەکەن یاکە باسی دەکەن دەڵێن «جەنابی...»، ئەگەر بزانی ڕەگ و ڕیشەی چیە و دەچێتەوە سەر کێ، تێدەگەی کە دەبێ بنیادەم خۆی لێ بپارێزێ و خۆی لێ دوور بگرێ تا بە هۆیەوە گڵاو نەبێ، یەکەم لەبـەر ئـەوە کـە دوو ڕەگـە و لە سـەگ و بـەراز کەوتووەتەوە کە هەردووکیان گڵاون... دایکی لە کاکەییە بەرازخۆرەکانە و باوکیشی کابرایەکی

-٤-

دەمێ بە وسیعەتی کورسی کەرەمکە پێم ئەی رەب!
زوبانی پێوە روابێ بە قەد هەموو کەوکەب(١)
بە عومری نووحەوە تەوفیقی تۆ بکا ئیمداد
لە بەحری شوکرەوە یەك قەترە بێنمە سەر لەب(٢)



بابییە. دووهەمیش چونکە خۆراکی هەمیشەی ئەوەیە بەنگ و شەرابی کۆن تێکەڵی یەك دەکا و پێکەوە دەیانخوا.

بەیتی یەکەمی ئەم چوار خشتەکییە لە پاکنووس نەکراوێکی شاعیر خۆیدا بەمجۆرەش نووسراوە:

ئەو قورومساغەی کە خەڵقی ناوی نابەن بێ «جەناب»
ئەسڵ و فەسڵی شارەزا بی، نیتە غەیری ئیجتیناب

-٤-

(١) کورسی: لە عورفی ئایینی ئیسلامدا ئەسیرێکی وایە هەموو ئاسمانەکان و ئەرزی تیا جێبووەتەوە. کەوکەب: ئەستێرە.

مەعنای هەردوو بەیتەکە پێکەوە لێك دەدەینەوە.

(٢) نووح: یەکێکە لە پێغەمبەران، مەشهوورە پتر لە هەزارساڵ ژیاوە.

واتە: خوایە دەمێکم بدەرێ ئەوەندەی کورسی گەورە بێ و ئەوەندەی هەموو ئەستێرەکانیش زمانی لێ روابێ و، ئەوەندەی حەزرەتی نووحیش عومرم درێژ کە و یارمەتیم بدە بەڵکوو لە دەریای سوپاسکردنی تۆ دڵۆپێك بخەمە سەر لێوم وکەمێك سوپاست بکەم، یا دڵۆپێك بێنمە کەناری دەریا و لێومی پێ تەڕکەم. مەبەستی لەوەیە مەگەر ئەم مەرجانە بێنە دی، ئەوجا ئادەمیزاد بتوانێ کەمێك سوپاسی خوا بکا، ئەگینا حەقی خوا بەسەر بەندەوە ئەوندە زۆرە، بەندە لە عۆدەی نایەت تۆزێکی بداتەوە.

لە دەسنووسە پاکنووس نەکراوەکانی شاعیر خۆیدا ئەم چوارخشتەکییە بەم دوو جۆرەی خوارەوەش نووسراوەتەوە:

☜

-٥-

ئەهلی عیبرەت ماوە گەر، بێ سەیری «ناسر شا» بکات
دوو لە دوو سی کەم شەهی کرد و «کش»ێکی رێ نەهات(١)
هاتی وا سەیری نەهاتی کەن کە سەد تیپان سوار
پاسەوانی بوون، لەناو بەستا پیادێ کردی مات(٢)

---

☞

«١»

دەمێ بە ویسعەتی کورسی مەگەر عەتا کا رەب
زوبانی پێوە روابێ بە قەد هەموو کەوکەب
بە عەونی ئەو بە هەموو دەم لە شوکری ئەودا بن
لە قولزومێ بە نمێ بەڵکی ئاشنا بێ لەب

❋❋

«٢»

دەمێ بە ویسعەتی کورسی عەتا بکا مەر رەب
زوبانی پێوە روابێ بە قەد هەموو کەوکەب
هەموو لە شوکری ئەوا بن بە عەونی ئەو هەردەم
لە قولزومێ بە نمێ بەڵکی ئاشنا بێ لەب

-٥-

مەحوی ئەم چوار خشتەکییەی بە بۆنەی کوشتنی «ناصرالدّین شاە»ی قاجارەوە وتووە.

(١) ناسر شا: «ناصرالدّین شاە»ی قاجار «١٨٣١-١٨٩٦ ی. ز»، یەکێکە لە پادشاکانی بنەماڵەی قاجار، لە زیارەتگای حەزرەتی «عبدالعظیم»دا بە دەستی میرزا رەزای کرمانی کە یەکێك بووە لە قوتابییەکانی «جمال‌الدّین»ی ئەفغانی کوژرا. شەهی: پادشایەتی. کش: یەکێکە لەو دەورانەی لە یاری شەترنجدا دەبینرێن و پادشای پێ دەخورێ.

مەعنای هەردوو بەیتەکە پێکەوە دێت.

(٢) هات: بەختیاری. بەست: قەڵا، ئەو شوێنە پیرۆزەی دەستی تێدا نابرێ بۆ تاوانبار. بە پەیوەندیشی لەگەڵ «کش»ی پێشوو و «پیادە»ی هاتوودا، ئیشارەتە بۆ «قەڵا» لە یاری

☜

-٦-

تێگەیشتن مەغزە، ئەم ئـینسانە پـۆست
خۆ مەکە بێ تەجرەبە قوربانی دۆست[١]
تۆ مەڵێ یـەك مـەرتەبە، سـەد مـەرتەبە:
«دشـــمن دانـا بـە از نـادان دوست»[٢]

---



شەترنجدا. پیادێ: پیادەیەك، ئیشارەتیشە بۆ «سەرباز» لە یاری شەترنجدا.

واتە: ئەگەر کەس ماوە لەم جیهانەدا بیەوێ پەند لە کارەساتی زەمـانە وەربگـرێ، بـا بـێ سەیری ئەو کارەساتە بکا لە «ناصرالدّین شا»ی قاجار رووی دا کە ٥٨ ساڵ حوکمڕانی کرد و لە کاروباری گەردوونا کە وەك یاری شەترنج وایە کەس «کش»ێکی لێ نـەکـرد، کـەچی کـە نەهاتی و نەگبەتی رووی کردە ئەم بەختیاری و بۆ هاتنەی، بە جۆرێ رووی تێ کرد لەگـەڵ ئـەوەشدا کـە سـەد ریـزە سـوار پـاسەوانـی بـوون و لە پـەنای قـەڵایـەکـی وەك زیـارەتگای «عبدالعظیم»دا بوو، پیادەیەك خپی کرد و لە پەلوپۆی خست.

لەم بەیتەدا ئیسـتیعارەیەکی «مَکنیّە» هەیە، ئەوەتە «ناصرالدّین شا» شوبهێنراوە بە «مەلیکی شەترەنج» و ئەو شتەش کە پەیوەندی بە پێ شوبهێنـراوەکـەوە هـەیە «کش»ە و «بـەست» و «پیادە». هەروەها لە کۆکردنەوەی «کش» و «بەست» و «پیادە»دا تەناسوب هەیە.

وشەی «تیپان» لە هەموو نوسخەکانی بەردەستماندا بە «تیپەن» نووسرابوو. ئێمە ئەوەمان لا هەڵە بوو و گێڕامانەوە سەر شێوە راستەکەی کە «تیپان»ە.

-٦-

(١) مەغز: کاکڵە. پۆست: توێکڵ.

واتە: قەوارەی ئادەمیزاد وەك توێکڵ وایە و تێگەیشتنیشی وەك کاکڵەی ناو توێکڵەکە وایە. ئەوەش کە تێگەیشتنی نەبێ وەك بەری پووچەڵ وایە. کەواتە تۆیش تێگەیشتنت بێ و دۆست تاقی بکەرەوە و بزانە تێگەیشتووە و پشتی پێ دەبەسترێ یا نە، ئەوجا خۆت بکە بە قوربانی، نەوەك پاشان بە هەڵەدا بچی و پەنجەی پەشیمانی بگەزی.

(٢) مەرتەبە: جار.

واتە: نەك تاقە جارێ، سەد جار بڵێ: دوژمنی تێگەیشتوو لە دۆستی نەفام چاترە.

ئەم نیوە بەیتە فارسییە لە بەیتێکی سەعدی شیرازی وەرگیراوە.

-٧-

«از دیـــــر مـــغان آمــد یــارم قــدحی در دست»
خۆ فیتنە بوو، پیرایەیی فیتنەیشی بە خۆیا بـەست[١]
وا هــاتەوە ئــەی یــاران، ئــاشووبی دڵ ئـەفگاران
«مست از می و، می‌خواران از نرگس مستش مست»[٢]

-٨-

چـــیە ئـــەم هــەموو تــەنتەنەو مــن ـ مــنت
ئـــەمەندە چـــیە فـــەخر و بــەخ کــردنت[١]

---

-٧-

(١) پیرایە: کەرەستەی خۆڕازاندنەوە. وشەیەکی فارسییە.
مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دێت.
(٢) ئەفگار: زویر و زیز.

واتە: یار لە پەرستشگای ئاگرپەرستانەوە هاتەدەر، پیاڵەیەکی شەرابی بەدەستەوە بوو. خۆی لە خۆیدا دڵی دڵداری دەبرد، کەچی ئەوەندەی‌تریش مایەی دڵبردنی دابوو لە خۆی. برادەرینە! وریای خۆتان بن، وا ئەو یارە گەڕایەوە کە مایەی نارەحەتی گیانی دۆستانی دڵ زویرە، خۆی بە خواردنەوەی مەی مەست بووە و دڵدارانیشی بە نێرگسی چاوی مەستی سەرخۆش کردووە.

دوو نیوە فارسییەکەی ئەم چوارخشتەکییە هی حافیزی شیرازین. ئەم جۆرە لە یەکدانەی دوو بەیتی جیاجیا پێی دەڵێن «تَضمین».

-٨-

(١) تەنتەنە: دەنگی ساز و سەمتوور و شتی وا. مەبەست تێکڕای جەنجاڵ و هەراهەرایە. بەخ کردن: شانازی بە خۆوە کردن و خۆ بە شایانی شتی گەورە زانین.
لە دەسنووسەکەی مەحوی خۆیدا وشەی «بەخ» بە «بەغ» نووسراوەتەوە.

بـــە ڕۆچـــوونی ئـــاوێ دەكـــەی زیـــندەگـــی
بـــە دەرچـــــوونی بـــایەك دەبـــێ مـــردنت(٢)

-٩-

شەوێ لەیلا بە مەجنوونی دەوت: بنوارە حاڵی خۆت
بە خۆڕایی کە چۆنت دا بە با عەقڵ و کەماڵی خۆت؟(١)
جوابی دایەوە مەجنوون: ئەگەر تاقەت بـبێ لەحـزێ
لەناو ئاوێنەدا بنوارەوە حوسن و جـەماڵی خـۆت(٢)

---

(٢) زیندەگی: ژیان.

واتە: ئەی ئادەمیزاد! ئەم هەموو فیز و خۆ بە زل زانینەت لە چیە، تۆ بە چوونە منداڵدانـی دایکت و چۆڕێ ئاوی باوکت هاتوویتە دنیاوە و بە دەرچوونی هەناسەیەك لە دەمـی خـۆت دەمری، ئیتر شانازی بە چیەوە دەکەیت و بایەخت چیە؟

-٩-

(١) مەعنای چوارخشتەکییەکە پێکەوە دێت.

(٢) لەحزێ: لەحزەیەك، تاوێك.

واتە: شەوێکیان لەیلا بە مەجنوونی دڵداری خۆی وت: تەماشایەکی حاڵی خـۆت بکـە بزانە چۆن لە خۆڕایی عەقڵی خۆت داوە بە با و شێت بووی. ئەویش لە وەڵامدا وتی: من لە خۆڕایی شێت نەبووم و عەقڵی خۆم نەداوە بە با. بەڵام ئەگـەر تـۆ دەتـوانـی هـەناسەیەك لە ئاوێنەدا تەماشای جوانی شێوەی خۆت بکە، جا بزانە چۆن شێتی خۆت دەبی، چونکە رووی تۆ وەك رۆژ وایە و عەقڵیش وەك شەونم وایە و شەونمیش هەرکە رۆژ هەڵات دەبێ بە هەڵم و دەچێ بە هەوادا. جا لە حاڵێکدا کە تۆ بۆ ماوەیەکی کەم نەتوانی تەماشای خۆت بکەی، من چۆن بەم هەموو تەماشاکردنەت شێت نابم.

-١٠-

**نەسیمی سوبحدەم! شەبگیریێ تا ئەسکەلەی بێرووت**
**بلێ بەو ئاشنایە: بێ چرایە شامی من بێ رووت [(١)]**
**بە هیچ ئینسانی کامیل هیچ نیە سەربەستەو و پابەند**
**خەلاتی عیشقە «مەحوی» من کە سەرقۆتینم و پێ رووت [(٢)]**

---

-١٠-

سەیید ئەحمەدی کوڕی شێخ ئەوڕەحمانی عازەبانی دەیگێڕایەوە کەوا مەحوی کاتێ لە ئەستەموولْ دەبێ، دەبێ بە ئاشنای «بدرالدّين كامل» ناوێك کە پیاوێکی بە قەدر و حورمەت و ئەدەب‌دۆست بووە. پاشان ئەم پیاوە دەگوێزرێتەوە بۆ بێرووت و لەوێ دەکرێ بە کاربەدەستی بەندەر. مەحویش ئەم چوارخشتەکییەی بۆ دەنووسێ، بەلام نەیدەزانی ئاخۆ هەر لە ئەستەموولەوە بۆی نووسیوە یا لە سلێمانییەوە.

(١) سوبحدەم: دەمی بەیانی. شەبگیری: ڕۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ لە بەرەبەیاندا کە هێشتا دنیا تاریك و لێلە بێ. ئەسکەلە: بەندەر، میناء، شارێ کە لە کەناری دەریادا بێ. بێرووت: پایتەختی لوبنانی ئێستا. شام: ئێوارە. بە پەیوەندی لەگەلْ «بێرووت» مەعنای شاری «شام»یش دەگەیەنێ.

مەعنای چوارخشتەکییەکە تێکڕا پێکەوە دێ.

(٢) سەربەستە: سەربەسراوە. پابەند: زنجیر لە پێ کراو. هەردوکیان کینایەن لە خاوەن پەیوەندی. سەرقۆتین: سەرپەتی.

واتە: ئەی بای بەرەبەیان، لەگەلْ تاریکە و لێلەی بەیاندا بکەوە رێ، بچۆ، مەوەستە تا دەگەیتە بەندەری بێرووت، لەوێ بەو ئاشنایەم بلێ کەوا شەوانی مەحوی، یا شاری شامی دلی، بێ چرای رووی تۆ تاریکە... هەروەها پێی بلێ پیاوی پیاوانە هەرگیز تەوقی دنیا لە مل ناکا و زنجیری پەیوەندی بە هیچەوە ناکاتە پێی خۆی، چونکە دنیا شتێکی هیچ‌وپووچ و بێ‌سوودە، بەلکوو ڕوودەکاتە رێگای عیشق، وەك مەحوی کە خەلاتی عیشقی وەرگرتووە و هەموو پەیوەندییەکی بە دنیاوە لە خۆی داڕنیوە و بە سەری رووت و پێی خاوسەوە دەگەڕێ...

لە نێوان «بێرووت» و «بێ رووت» و «پێ رووت»دا جیناسی موزاریع و لە نێوان «بێرووت» و «شام»دا تەناسوب و، لە «شام» و «كامیل»دا لەتافەت هەیە.



ئەم چوارخشتەکییە بەمجۆرەی خوارەوەش بیستراوە. سەیید ئەحمەدی عازەبانیش هەر بەمجۆرەی دەخوێندەوە:

نەسیمی سوبحدەم! گەر گەیییە خزمەت نازری بێرووت
بڵێ: ئەی بەدری کامیل، بێ چرایە شامی من بێ رووت
چیە تۆ ماهی من بی، پڕتەوت هەر بۆ ئەم و ئەو بێ!
وەفا، وەقتی وەفاتە، چاوەکەم، تیری لە من بێ رووت

جێی خۆیەتی لێرەدا تێکستی نامەیەك بڵاو بکەینەوە کە «ئەحمەد کامیل» یا «کامیل ئەحمەد» ناوێك لە وەڵامی نامەیەکدا لە ٢٢ ی مایسی ١٣١٩ ی رۆمیدا لە بێرووتەوە بە فارسی بۆ مەحوی نووسیوە. دەبێ خاوەنی ئەم نامەیە هەر ئەو «کامیل»ە بێ کە لە چوارخشتەکییەکەدا ئیشارەتی بۆ کراوە و لەوانەیە ئەم چوارخشتەکییەش هەر لەگەڵ ئەو نامەیەدا نێررابێ. ئەوەش کە سەیید ئەحمەدی عازەبانی ناوی ئەم شەخسەی بە «بدرالدّین کامل» تۆمار کردووە، رەنگبێ لەوەوە بێ کە ئەو «ئینسانی کامیل»ی لە چوارخشتەکییەکەدا بە «بەدری کامیل» وەرگرتووە و لەوەوە وای بۆ چووە کە دەبێ ناوی «بدرالدّین کامل» بووبێ. ئێمەش کە دەڵێین «ئەحمەد کامیل» یا «کامیل ئەحمەد» و نازانین کامیان راستە، هی ئەوەیە مۆرەکەی وا هەڵکەنراوە دروست بێ بە هەردووکیان بخوێنرێتەوە. ئەمەش تێکستی نامەکە:

«سرورا، تاج سرا، مولانا!
من چه باشم که برآن خاطر عاطر گذرم
لطف‌ها می‌کنی، ای خاك درت تاج سرم!

سرافراز نامچه‌ای که به تاریخ ٢٨ نیسان ٣١٩ تسطیر و تسیار فرموده بودند، رسیده‌ی دست مباهات گردیده، از مضامین دلنشین و عبارات شیرین و ابیات نمکین آن مبارك‌نامه، دیده‌ی رمد دیده را نور، و دل هجران کشیده را سرور بخشید.

ای وقت تو خوش، که وقت ما کردی خوش

از عرض و اشعار تشکرات تبریکات رتبه‌ی فقیر، زبان قلمم قاصر، و قلم زبانم فاتر است. همان جناب خالق بیچون عمر و عافیت آن فخر دودمان روزافزون فرماید آمین. نسخه‌ی اهدا فرموده‌ی مبارک را هم با دیگری تعویذ بر دوش مفخرت و مسعدت نمودم.

-١١-

## شێخێ هەمەوەندێکی دەدا پەند و نەسیحەت
## ئەو قوڕبەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەزیحەت (١)



احوال بنده را سؤال می‌فرمایند، الحمدللّٰه صحت وجودی دارم. با کاروبار مأموریت را مشغولم. از همت پیر و مساعده‌ی تقدیر و حسن تدبیر، توجهات و محبت و اعتماد و امنیت عموم را تحصیل کردەایم.

با این احوال به مصداق کلام مرحوم و مغفور حضرت مولوی:

بریان تای روباب قافیه خوانیم — نەمەندەن تاقەت عیبارەت زانیم
بڵێسەی کوورەی هیجران باڵات — گەرمی مەحروومی تۆزەکەی پاڵات
ئایر دان بەو تەور مۆبەت سەرای دڵ — مەیلەکەت مەندەن بێ مەسکەن خجڵ
یاد لوولی زوڵف شیرین نیگاران — خەیاڵ ئەبرۆی نازك نازاران
ئەو بیەن وە چین سەفحەی پێشانیم — ئێد خەم چەمەکەی باڵای کەمانیم

مع مافیه

گر سر ببری به تیغ تیزم
از کوی وفات برنخیزم
ور زانکه کنند ریزه ریزم
من مهره‌ی مهر تو نریزم
الا که بریزد استخوانم

حاصل کلام، تا حیات مستعار در کالبد بدن باقی و برقرار باشد، از دور و نزدیك به دعای خیر آن پیر وفادار والا تبار محتاجم. امید واثق است که انشاءاللّٰه تعالی از خاطر عاطر بیرونم نخواهند فرمود. باقی به هزار لب ادب و اشتیاق دو دست مبارکتان را بوسیده، به استرحام بقای توجهات فوآدیه و قدسیه‌ی آن سرور مطاع را ختم تصدیعات نمودم. السلام علیکم و رحمة اللّٰه و برکاته».

بیروت ٢٢ مایس سنة ٣١٩

-١١-

(١)[هەمەوەند:]هۆزێکی کوردە لە شارستانی سلێمانی دەژی لەکوردستانی عێراق، ناوبانگی ئازایەتی بڵاوە. جاران دەستێکی لە رێ گریدا بووە.
مەعنای چوارخشتەکییەکە پێکەوە دێ.

خۆش هاتە جواب و وتی: تۆ حەقتە، فەقەت من
قوتتاعی تەریقم، نەکوو قوتتاعی تەریقەت(٢)

-١٢-

بە تەرەف ئەم نەخۆشی بێچارەت
«نگهی کن به چشم بیمارت»(١)
بۆیە دەتنێمە پەردەکەی چاوم
«که بپوشم ز چشم اغیارت»(٢)

---

(٢) قوتتاعی تەریق [قطاع الطّریق]: چەتە، ڕێگر. «قُطّاع» جەمعی «قاطِع»ە.

واتە: شێخێك کابرایەکی هەمەوەندی ڕاگرتبوو ئامۆژگاری دەکرد کە بێتە سەر ڕێگەی ڕاست و قسەی خراپی پێ دەوت لەسەر ئەوکردەوە خراپانەی دەیکرد. کابرای هەمەوەندیش وەڵامێکی جوانی دایەوە، وتی: یا شێخ! تۆ حەقتە ئامۆژگاری من دەکەی و ئەو ڕێگایە بە خراپ دادەنێی کە من گرتوومەتە بەر، بەڵام بیشزانە هەرچۆن بێ هەر من لە تۆ باشترم، بەس نیە من بە ئاشکرا جەردەیی دەکەم و ڕێ دەگرم، خۆ تۆ بە ناوی ئایینەوە جەردەیی دەکەی و ڕێگای تەریقەت دەبڕی و لە سەرەڕێی تەریقەتدا دانیشتووی هەر دەروێشێکت بێتە بەردەست رووتی دەکەیتەوە.

-١٢-

(١) واتە: بە چاوە ناسکەکانت لایەك بە لای ئەم نەخۆشە بێچارەی گرفتاری دەستی خۆتەدا بکەرەوە با چاك ببمەوە.

نیوە فارسییەکەی ئەم بەیتە هی کەمالی خوجەندییە.

(٢) واتە: بۆیە لەناو پەردەی چاومدا دەتشارمەوە، تا لە چاوی پیس بتپارێزم و تووش نەبی. مەبەستی لەم شاردنەوەیە ئەوەیە کە هەمیشە وێنەکەی لەبەرچاویەتی.

نیوە فارسییەکەی ئەم بەیتەیش هی سەعدییە.

بە هەرکام لەم دوو بەیتە دەوترێ «مُلَمَّع»، مولەممەع لە ئیستیلاحی عیلمی بەدیعدا ئەوەیە بەیتێك نیوەکانی هەریەکێ بە زمانێ بن.

-١٣-

ئەو مەسخەرەی زەمانە بە شاه و وەزیری کرد
ئەو کەتنە قەت مەڵێ بە گەداو و فەقیری کرد [١]
کلکێکی پێوە کرد و بەرەوژووری ژووری برد
تێی هەڵدەدا شەقێك و سەرەوژێری ژێری کرد [٢]

-١٤-

زاڵمی دڵ رەقی روو گرژی موسوڵمان ئازار
هەر بە ئیزایە کە رەنگی بگەڕێتە روخسار [١]
بەرد ئەگەر سەر نەشکێنێ، بە چی روو رەنگین کا؟
کە لە پێ هەڵچەقی ئەوسا روخی گوڵنارییە خار [٢]

---

-١٣-

(١) مەسخەرە: گاڵتە پێ کردن.
مەعنای چوارخشتەکییەکە پێکەوە لێك دەدەینەوە.
قەت مەڵێ (ن): کێ دەڵێ.
(٢) کلك: پەنجە.
واتە: ئەو کەتن و گاڵتەپێکردنەی گەردوون بە پادشایان و وەزیرانی دەکا هەرگیز بە هەژارانی ناکا. پەنجەیەکیان پێوە دەکا و بەرزیان دەکاتەوە بۆ ئاسمانی گەورەیی، کەچی لە ناکاو شەقێکیان تێ هەڵدەدا و دەیانخاتە خوار و سەرەوژێریان دەکاتەوە و تاج و تەخت و کورسییان نێ وەردەگرێتەوە و گەلێ جار بەوەندەشەوە ناوەستێ، بە کوشتیشیان دەدا.

-١٤-

(١) واتە: یاری ستەمکاری دڵڕەق و ئازاردەر، هەر بە ئازاردانی دڵدارەکانی شادمان دەبێ و رەنگ دەکەوێتە رووی و ئەگەر ئازاریان نەدا وەك نەخۆش رەنگ زەرد دەبێ.
(٢) گوڵناری: وەك گوڵە هەنار سوور. خار: دڕك.
واتە: ناهەقیشی ناگرم. ئەو دڵی وەك بەرد وایە و سروشتی وەك دڕکە. بەرد ئەگەر سەری کەسێك نەشکێنێ و بە خوێنی ئەو سەرە خوێناوی نەبێ، رووی خۆی بە چی رەنگین بکا و، دڕك ئەگەر بە پێی کەسێکدا نەچەقێ، بە چی رووی خۆی وەك پەردەی گوڵ سوور بکا؟.

-١٥-

ڕۆڵە! گەر حەز دەکەی بیە شاکوڕ
پەندی «مەحوی» لەگوێ گرە وەك دوڕ(١)
مەردی ئازادە قەت مەڕەنجێنە
«کُلُّ شَيْءٍ وَ لٰا شَتِيمَةُ حُرٍّ»(٢)

-١٦-

دڵشەکەتی تیری کێم؟ چاوی بزانێ مەگەر!
تۆهمەتە هەرکەس بڵێم، «عِنْدَ جُهَيْنَه الْخَبَر»(١)
دولبەر و بێداد و ناز، عاشق و دادی نیاز
خاڵە: بە ڕوومەت درا، داغە: نرایە جگەر(٢)

---

-١٥-

ئەم چوارخشتەکییەیش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) بیە: ببی بە. وەك دوڕ: وەك چۆن گوارەی دوڕ دەکرێتە گوێ.

(٢) واتە: هەرچی دەکەی بیکە، بەڵام قسەی سووك لە ڕووی ئینسانی مەرددا مەکە.

-١٦-

(١) واتە: خۆم نازانم دڵم بە تیری کێ ماندوو بووە، مەگەر چاوی یار بزانێ... بڵێم بە تیری هەرکەس ماندوو بووە، قسەکەم بوختان و بێبەڵگە دەبێ...کەواتە مەگەر عەرەب واتەنی بڵێم: «خەبەری ڕاست بە لای جوهەینەوەیە و مەگەر ئەو بزانێ». مەبەستی لە «جوهەینە» یار خۆیەتی.

(٢) واتە: دولبەر و بێدادی و نازکردن هەرگیز لە یەك جوێ ناکرێنەوە، هەروەها دڵدار و شکاتکردن و داواکردنیش... هەرکەسێ ئەرکێکی لەسەرە و هەرکەسێ خاوەنی شتێکە. خاڵ بەشی ڕوومەتی یارە و، داخی ئەو خاڵەش بەشی جگەری دڵدارە.

-١٧-

ئـەم ڕۆژهـەڵاتـە نـوکتەیەکـی خـۆش و دڵپـەزێر
دەرچوو لە دەم گەدایەکی میسکینی سەر بە زێر [(١)]
دی نـوێژ ئـەکـا غـەنی، وتـی: هـەر بـۆ ئـەمانەیە
چی نوێژی سەر بە زێڕ و چ نیسکێنی سەر بە زێڕ [(٢)]

-١٨-

دڵ فکـری کـردەوە: چـیە قـیرم بـووە بـە شـیر؟
پـیرانـی بـردەوە کـە جـوانـیمی کـەوتە بـیر [(١)]
قامەت نەمام و پشتی وەکـوو مـێو و ڕۆنـی نـەرم
چەوتاوە، ڕەق هەڵاتووە، وەك چەوتە مێوی پیر [(٢)]

---

-١٧-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) ڕۆژهەڵات: بەیانی. دڵپەزێر: دڵگیر. میسکین: هەژار. سەربەزێر: سەر دانەواندوو بۆ خوارەوە، سەرکز.

مەعنای هەردوو بەیتەکە پێکەوە دێ.

(٢) غەنی: دەوڵەمەند.

واتە: ئەم بەیانییە پیاوێکی هەژاری سەرکز چاوی بە کابرایەکی دەوڵەمەند کەوت پاش خۆرکەوتن نوێژی سبەینێی دەکرد، بەوبۆنەیەوە قسەیەکی دڵپەسەندی کرد، وتی: خوا بەمانەی داوە، نوێژی بەیانی کاتێ بکەن کە خۆر بەسەر سەریانەوە بێ و پێش چاییش نیسکێنەی زەردی ڕۆن بەسەردا کراو بخۆن...

-١٨-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) قیر: مەبەست لە مووی ڕەشە. شیر: مەبەست لە مووی سپیە. پیران: پیران بردنەوە ئەوەیە بنیادەم لەبەر پێکەنینی زۆر یا لەبەر گریانی زۆر هەناسەی ببڕێ و دەنگی لێ دەرنەیەت.

مەعنای چوارخشتەکییەکە پێکەوە دێت.

(٢) چەوتاوە: چەوت و لار بووە، چەمیوەتەوە.

-١٩-

تەبخاڵەیەکی جوان و لە غایەت بەدەر لەزیز
دەرکەوتووە بە تەب لە چەنەی دولبەری عەزیز (١)
وەك سێوی زیوی لەعل تیا تەعبیە کراو
یا تۆپی گوڵ کە غونچەیەکی دەربچێ لە ریز (٢)

-٢٠-

ئەهلی فەزڵ ئارام و رووناکی نە شەو ئەسڵا نە رۆژ
بۆ نیە و نابێ، کە ئەمڕۆ رۆژی نائەهلانە رۆژ (١)

---

☞

واتە: دڵ بیری لەوە کردەوە کە بۆچی ریشی وەك قیر رەشی جارانم وەك شیر سپی بووە. کە سەردەمی جوانیمی کەوتەوە بیر، ئەوەندە گریا چوو بە تاسەوە، حاڵی بوو کەوا بۆیە مووم سپی بووە چونکە باڵای وەك نەمام قنجی سەردەمی لاویم چەمیوەتەوە و پشتی وەك مێو و رۆن نەرمی جارانم رەق هەڵاتووە و هەردووکیان وەك دار مێوی لاری پیریان لێ هاتووە.

-١٩-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) تەبخاڵە: وردە تلۆقی سەر لێوی هەڵزراوی تادار. تەب: تا. چەنە: چەناکە.

مەعنای هەردوو بەیتەکە پێکەوە دێ.

(٢) تەعبیە، «تَعبِئة»: پڕکردن.

واتە: بەهۆی تاوە تلۆقێکی لە رادەبەدەر جوان کە لە چەناکەی یار دەرچووە، چەناکەی یار بەو تلۆقە سوورەوە لە سێوێکی زیوین دەچێ کە لەعل ڕێژ کرابێ، یا لە چەپکەیەك گوڵ دەچێ کە خونچەیەکی تیا لە ریز دەرچووبێ.

-٢٠-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) ئەسڵا: [«اصلاً»].

واتە: لەبەر ئەوە کە ئەمڕۆ رۆژ رۆژی نامەردانە، ئەوەی پیاو بێ، نە بە شەو و نە بە رۆژ حەسانەوە و رووناکی نیە و نابێ.

فەزڵ و جەوهەر بۆتە نەقس، ئەم ئەهلە بۆیەم فەسڵ ئەکەن
سەگ زوبانی دەردەکێشێ، چ بووە، چی تاوانە رۆژا![٢]

-٢١-

حەققی بەدەستە گەر رقی هەستێ رەئیسی جاف
شەئن و شکۆهی بوو بە کەواێکی بێ سیجاف[١]
من بم لەباتی ئەو لە رقانا سبەی کەوا
ماهی سیامە تۆبە دەکەم دەچمە ئیعتیکاف[٢]

---

(٢) واتە: بۆیە ئەم خەڵکە جیام دەکەنەوە و دوورم دەخەنەوە چونکە زانا و تێگەیشتووم. زانست و تێگەیشتنیش لەم سەردەمەدا عەیب و شوورەییە، چونکە رۆژ رۆژی نەفام و نەتێنەگەیشتووانە، بەڵام هەرچیم پێ بڵێن وەك ئەوەتە سەگ بە رۆژدا زمانی خۆی دەردەکێشێ کە دیارە ئەوەش هیچ خەتایەکی رۆژی تیا نیە.

-٢١-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) سیجاف: پەراوێز.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەیەکدا بەمجۆرەیە:

حەیف و ئەسەف دەبێ بکرێ بۆ رەئیسی جاف

(٢) ماهی سیام [«صیام»]: مانگی رۆژوو، رەمەزان. ئیعتیکاف: ئەوەتە رۆژووەوان لە مانگی رەمەزاندا دەچێتە مزگەوت بۆ خواپەرستی و قسە لەگەڵ کەس ناکا و بۆ ناچارییەکی وەك چوونە سەرئاو و خۆ شتن و دەستنوێژ گرتن و نان خواردن نەبێ نایەتە دەر.

لە نێوان «کەواێکی» و «کەوا»دا وشەئاراییەکی جوان هەیە.

-٢٢-

نیه بـه غـەیری ئـەمەم هـیچی‌تر ئـومێد و ئـەمەل
لە بـــارەگـاهی جـەلیلی جـەلیلی «عـزَّ و جـلّ»(١)
بە جاهی رۆحی «مـحمّد» لەوانـه بـیّ «مـەحوی»
جـــەمالی پـیّ بـنوێنـیّ ئـەوانـی «جـاءَ اَجَـل»(٢)

-٢٣-

پـــەروازی جـــانه، رۆیـــنی جـانانه، وەرنـه بـۆچ
تۆ گۆڕەوی لە پیّ دەکەی و من لە دەستئـەچم(١)
هـــەستانت ئـــەر قـــیامی قـــیامەت نـــیه، چـــیه
بیّ دەخڵی چەنگ و نەی و مەی لە مەست ئەچم!(٢)

---

-٢٢-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) جەلیل «ی یەکەم»: زاتی خوا. جەلیل «ی دووهەم»: پایە بڵند.

مەعنای چوارخشتەکییەکە پێکەوە دیّ.

(٢) ئەوان: سەردەم.

واتە: بە تەمای هیچ نیم لە بارەگای خوا، لەوە بەولاوە کە لەبەر خاتری شکۆی پێغەمبەر (د.خ)، یەکێك بم لەو کەسانە کە پێغەمبەر لەکاتی سەرەمەرگیاندا جوانی خۆیان پیشان دەدا و دێتە سەریان تا ئیمان دەرکەن و بە باوەڕەوە بڕۆن. مەشهوورە ئیسنانی موسوڵمان لەکـاتی سـەرە مەرگیدا پێغەمبەر (د.خ) بە رۆحیانەت دێتە سەری و ناهێڵیّ شەیتان بیّ‌ئیمانی بکات.

-٢٣-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) پەرواز: فڕین. جانانە: یاری وەك گیان خۆشەویست. وەرنە: ئەگینا.

واتە: رۆیشتنی یار مایەی هەڵفڕین و دەرچوونی گیانمە، ئەگینا بۆچی هەر کە ئەو گۆڕەوی لە پیّ دەکا و ئامادە دەبیّ بۆ رۆیشتن، من گورج دەفەوتێم و لە دەست دەردەچم؟.

(٢) قیام: بەرپابوون.

☜

-٢٤-

ئەیا مارف بەگی عالەم لە بەردەستا هەموو مەزڵووم
لە حەققی خۆی ئەتۆ ئەم خانەقایەت کرد ئەوا مەحرووم[١]
بەکول دنیا بەکامت بێ هەتا هەی سادە، رۆژی حەشر
خودای ئەم عالەمە «بِالکلّ» لە غوفرانت بکا مەحرووم[٢]

---

☞

واتە: ئەگەر راست بوونەوەی تۆ بۆ رۆیشتن، بەرپابوونی رۆژی قیامەت نیە، بۆچی من بێ ئەوەی کۆڕی خواردنەوە و رابواردن ئامادە بێ، سەرخۆش دەبم؟.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿وَ تَرَی النّاسَ سُکٰاریٰ، وَ مٰا هُمْ بِسُکٰاریٰ﴾ لە باسی رۆژی قیامەتدا کە واتە: خەڵکت بە سەرخۆش دێتە پێش چاو و سەرخۆشیش نین...

چەنگ و (ن): بەنگ و.

وا بڵاوە مەحوی بەم چوارخشتەکییە قسە لەگەڵ «سەیید ئەحمەدی نەقیب» دەکا.

-٢٤-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەی مەحویدا نیە.

(١) مەحوی بەم چوارخشتەکییە قسە لەگەڵ سندووق ئەمینییەکی ئەو سەردەمەدا دەکا کە ناوی «مارف بەگ» بووە و وادیارە مانگانەی خانەقای مەحوی بڕیوە کە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆی برابووەوە.

مەعنای چوارخشتەکییەکە پێکەوە دێ.

(٢) بەکول: بە تەواوی. کام: ئارەزوو.

واتە: ئەی ئەو مارف بەگەی دنیا هەموو بەدەستتەوە دەناڵێنێ و تەنانەتماڵی خوایشت وەك خانەقای مەحوی بێ لە مافی خۆی بێبەش کردووە... خوا بکا تا لە دنیادای، دنیا هەمووی بە ئارەزووی خۆت بێ و بە سادەیی و بێ هیچ جۆرە ئاڵۆزییەك رابوێری... لە رۆژی حەشریشدا خوا لە لێخۆشبوون لەگوناه بێبەشت بکا و فڕێتداتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

-٢٥-

هـەر گـفتوگۆمـە، کـەچی هـەر دەڵێم و تـێ نـاگـەم
هەر جوستوجۆمە، کەچی هەر دەڕۆم و پێ ناگەم [١]
چـاوم رواو و گـۆشـەیی ئـەو ئـەبروەم نـەدی
دڵ بوو بە بەحری عولووم و لە ئەلف و بێ ناگـەم [٢]

-٢٥-

(١) جوستوجۆ: گەڕان.

مەعنای چوارخشتەکییەکە تێکڕا پێکەوە دێ.

(٢) واتە: چەند ساڵە گفتوگۆمە و لە باسی ناسینی زاتی خوا و سیفەتەکانیدا خەریکی دەرس وتنەوەم، کەچی خۆم لە قسەکانی خۆم ناگەم، هەرچەند بۆ فەقێکانیشمی روون دەکەمەوە، چونکە ئەم مەسەلەیە لە چوارچێوەی تێگەیشتنی راستی بەدەرە. چەند ساڵیشە بەدوای گەیشتن بەم تێگەیشتنەدا دەگەڕێم، کەچی هەر ناگـەمە جێ. ئەوەندەم چاو ورد کردەوە بۆئەوەی چاوم بە ناوچاوی یار بکەوێ کە ناسینی راستەقینەی زاتی خوایە، چاوم وەك داری سەوز بوو وشك راوەستا، کەچی گۆشەیەکی برۆی یارم هەر نەدی و شتێکی بەکەڵکم لێ حاڵی نەبوو... ئەوەندەم خوێندەوە و ئەوەندە دەرسم وتەوە دڵم وەك دەریای زانستی لێ هات، کەچی هێشتا لە سەرەتای زانستی راستەقینە نەگەیشتووم.

ئەم چوارخشتەکییە ئیشارەتێکی تیایە بۆ ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت:

«وَ مٰا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلّٰا قَلِيلاً» واتە: لە زانستێکی کەم زیاترتان پێ نەدراوە، چونکە بەری زانست ئەوەندە پانە ئەوبەری دیار نیە.

شیعری لەم جۆرە لای ئەهلی تەسەووف زۆرە. نموونەیەکی شیعرەکەی سەیید شەریفی عەللامەیە کە دەفەرموێت:

هفتاد و دو سال سعی کردم، پس از آن
معلوم شد که هنوز هیچ مـعلوم نشـد

واتە: حەفتا و دوو ساڵ هەوڵم دا و خوێندم، کەچی پاشان تێگەیشتم کەوا هێشتا هیچ فێر نەبووم.

-٢٦-

وەکوو مەحروومی نۆشینی مەیی ئەو لەعلی نۆشینەم
لە زەوقی چەشتنی نێشی موژەیشی بێبەشە سینەم[١]
گەهێ دەردێ دەکا دەرمان، بە قەتڵێ گەهـ دەدا فەرمان
«منم کز غایت حرمان نـه بـا آنـم، نـه بـا ایـنم»[٢]

---

-٢٦-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) نۆشین «ی دووهەم»: نووشین، ئەوەی بە ئاسانی قووت بچێ. نێش: چزوو.

واتە: نە ئەوەتە یار بە پێ چەشتنی شەرابی گەوارای لێوی لەعلڕەنگی شادمانم بکا و، نە ئەوەتە بە ئازاری برژانگی سینەم لەت بکاو بمکوژێ.

(٢) گەهێ: جارێك.

واتە: جارێك دەرمانی دەردی دڵدارێکی دەکا و جارێکی‌تر فەرمانی کوشتنی دڵدارێکی‌تری دەدا. بەڵام من لەوپەڕی بێبەشیدام، نە لەگەڵ ئەوانەم کە دەرمانی دەردیان دەکا و، نە لەگەڵ ئەوانەم کە فەرمانی کوشتنیان دەدا.

ئەم بەیتی دووهەمە هی موفتی زەهاوییە.

جەنابی شێخ موحەممەدی خاڵ لە کتێبەکەیدا «موفتی زەهاوی» دەیگێڕێتـەوە کـەوا «لە ساڵی «١٢٩١ هـ» مەحوی لەگەڵ چەند مەلایەکی‌تر لە سلێمانی نەفی ئەکرێن بۆ بەغدا، لەوێ ئەچێ بۆ دیدەنی موفتی. زەهاوی لەبەر پیری و چاوکزی مەحوی ناناسێتەوە، وە لە مـیانەی قـەدا ئەم شیعرەی خۆی ئەخوێنێتەوە. مەحویش ئەڵێ: قـوربان! ئـەم شـیعرەت روبـاعییە، شیعرەکەی پێشووی ئەمەیە:

وەکوو مەحروومی نوشینی مەیی ئەو لەعلە نۆشینەم
لە زەوقی چەشتنی نێشی موژەیشی بێبەشە سینەم

ئەنجا موفتی ئەیناسێتـەوە، ئـەفەرموێ: ئـافەرین مـەحوی! بـەخوا وابـزانـم دوایـیمە کـە نەمناسیتەوە. ئەنجا مەحوی کوتووپڕ ئەڵێ:

جەنابی موفتی ئەفەندی! رشـێنـەیەك بـاران لە دڵتی ششتەوە نەقشی مـەحەبـەتی یـاران
خەیاڵی ئێوە بە لێشاوی توندو تیژی سروشك نـەچۆتـەوە لە عـەقیقی دڵی وەفـاداران[*]

---

(*) محمدی خاڵ، مفتی زەهاوی، ل ٢٧، بەغدا، ١٩٥٣.

-٢٧-

ئـــەو شـــەڕانـی، مـن ئـومێدی ئـاشتیم
«پر غـلط بـود آنـچه مـا پـنداشـتیم» (١)
کێ لە باغی قودسی هەڵکەندم، هەر ئەو...
نـــاشتی لەم شــۆرەزارەم نــاشتیم (٢)

---

-٢٧-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١)واتە: دۆست شەڕانییە لەگەڵمدا و دەیەوێ لە ژێر باری تەکلیفدا بمکوژێ کە ئاسمان و زەوی پێیان هەڵنەگیرا، ئیتر چۆن بە من هەڵدەگیرێ. هەرچیم کرد تەکلیفی لەسەر شان هەڵنەگرتم، دەرکەوت ئەوەی ئێمە بەتەمای بووین بە هەڵە دەرچوو، وامان دەزانی کە هاتینە دنیاوە بە خۆشی رادەبوێرین، بەڵام وانەبوو. کەوتینە ژێر باری تەکلیف.

نیوە فارسییەکەی ئەم بەیتە، نیوەی ئەم بەیتەیە:

ما ز یاران چشم یاری داشتیم
پر غلط بود آنچه ما پنداشتیم

واتە: ئێمە چاوەڕوانی یارمەتی بووین لە دۆستانەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە بە خەیاڵماندا دەهات پڕ بوو لە هەڵە.

ئەو شەڕانی (ن): جەنگجۆ ئەو. ئومێدی (ن): بە ئومێد.

(٢)شۆرەزار: بەردەڵانێ کە هیچی تیا نەڕوێ. ناشتیم: ناچیزیم.

واتە: من کە هێشتا لە عالەمی ئەرواحدا بووم و نەهاتبوومە دنیاوە، بۆ خۆم سەربەست بووم و تەکلیفی هیچم لەسەر نەبوو. ئەو خوایەی لەو باخە پیرۆزەی هەڵکەندم، هات ناچیزی و بێقابیلەتی منی لەم زەوییە بێپیتەی لەشمدا ناشت. جا دەبێ تۆوێکی ناچیزی وەك گیانم کە لە زەوییەکی بێپیتی وەك لەشمدا نێژرابێ، چ بەرێك بدا؟.

-٢٨-

جـــەنابی مـــوفتی ئـــەفەندی! رشـــێنـەیەك بـاران
لە دڵتـــی ششـــتەوە نـەقشی مـەحەبەتی یـاران (١)
خەیاڵی ئێوە بە لێشـاوی تـوندو تـیژی سـروشك
نـــــەچۆتـــــەوە لە عـــــەقیقی دڵی وەفـــادارن (٢)

-٢٩-

بـــرینانی دەروونـم، چـاوەکـەم! وەك چـاومە وێران
لە وێرانی مـەپرسە، هـەم دەر و هـەم نـاومە وێران (١)
بە دڵ رازی نەبوو رۆیی، لە حوجرە هەم لە بەرچاوم
بە جاریٰ ماڵی دڵم و خۆم و هەردوو چاومە وێران (٢)

---

-٢٨-

ئەمە ئەو چوارخشتەکییەیە کە لە پەراوێزی چوارخشـتەکـی ژمـارە «٢٦»دا لێی دوایـن و وتمان مەحوی بۆ موفتی زەهاوی وتووە.

(١)رشێنە: بارانێکی کەم کە هەر ئەوەندە بێ ئاوڕشێنێکی زەوی بکات.

ششتەوە: شۆردەوە.

مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دێ.

(٢)واتە: جەنابی موفتی ئەفەندی، ئەو فرمێسکانەی بە هۆی پیرییەوە لە چاوت دادەوەرێن، نەخشی خۆشەویستی دۆستانیان لە دڵت شتوەتەوە، بەڵام بەش بە حاڵی ئێمە ئەو فرمێسکە توندو تیژەی دەرد و مەینەت کە بەچاوماندا لێشاوی کردووە، یادی ئێوەی لە دڵی خوێناوی وەك عەقیقی ئێمەی بە وەفا هەڵنەگرتووە.

-٢٩-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١)مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دێ.

(٢)واتە: ئازیزا! دەر و ناوم وێرانە؛ برینی دروونیشم وەك چاوەکانم ناڕەحەتە، چونکە یار نە بە دڵم رازی بوو و نە لە ژوورەکەمدا دانیشت و نە لەبەرچاویشم مایەوە. لەبەر ئەوە دڵیشم و گیانیشم و هەردوو چاویشم هەموو بە هۆی دوورکەوتنەوەی یارەوە وێران بوون.

-٣٠-

چوو ئەو فیرعەونە حیزە بۆ جەهەننەم، قوڕ بە سەر هامان
دەبێ ئەسبابی زووتر چوونە خزمەت ئەو بدا سامان (١)
لەوانە و هەم لە ئەمسالی ئەوانە، یارەبی هەر ئان
جەهەننەم پڕ بکەن، جەننەت تەهی بێ بۆ موسوڵمانان (٢)

-٣١-

چوتە چم سروی چمان اشکم چمان
چم لچم جاری نبی بو چم چمان
چم لە بیداری چمی بختی چمی
چم دکا دیوت لچم کمتر چمان (١)

---

-٣٠-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) واتە: فیرعەونی حیز مرد و چوو بۆ جەهەنم. قوڕ بەسەر هامانی وەزیری کە پاش مردنی ئەو ناتوانێ وەك جارانی بژی و دەبێ دەستوبرد بکا خۆی کۆکاتەوە تا زوو بگاتە خزمەتی فیرعەون لە جەهەننمدا، چونکە پاش فیرعەون ئیتر دنیا جێگەی ئەوی تیا نابێتەوە.

ناوبردنی فیرعەون بە حیز ئیشارەتە بۆ ئەوە کە مەشهوورە فیرعەون حیز بووە و هامانیش بەوەی زانیوە و، کە فیرعەون ویستوویە ئیددیعای خوایەتی بکا، پرسی بە هامان کردووە. ئەمیش وتوویە ئەگەر نیازی وات هەیە راوەستە تا هیچ نەبێ ئاوەڵەکانی منالیمان دەمرن کە ئاگایان لە حالت هەیە، با ئابڕووت نەبەن...

(٢) ئان: کات. تەهی: چۆڵ.

دیارە مەحوی ئەم چوارخشتەکییەی بەبۆنەی مردنی گەورەیەکی واوە وتووە کە خۆشیان لەیەك نەهاتووە و مەبەستی لە هامانیش بەردەستێکی قسە رەوای بووە و پلاری ئەوەی تێ گرتووە کەوا بە مردنی ئاغەی ئیتر سەردەمی ئەویش بەسەرچوو...

-٣١-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

-٣٢-

بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیتاعەم کرد
لە ئیبتیداوە کە بەیتێ موناسبی دیوان [١]
گەدایەکی وەکوو «مەحوی»، قەلەندەرێکی کورد
میسالی پادشەهی فورسە، ساحێبی دیوان [٢]

-٣٣-

ئەربابی غینا ئەوەندە غەڕڕە بە زەڕن
بێ بۆنی بەهار و دیتنی جۆ دەزەڕن [١]

---

☞

(١) هەرچەند بەشێکی ئەم چوارخشتەکییەمان بۆ راستکراوەتەوە و بۆچوونێکی تایبەتیشمان بۆ ئەو بەشەکەی هەیە، لەبەر بێ‌متمانەییمان بە تەواوی راستکردنەوە و بۆچوونەکەمان، وامان بە باش زانی هەر بە رێنووسە کۆنەکەی خۆی بینووسینەوە و هیچی لەسەر نەنووسین و بەجێی بهێڵین بۆ لێکدانەوەی خوێندەواران و دوارۆژ.

-٣٢-

مەحوی ئەم چوارخشتەکییەی بۆ سەرەتای دیوانەکەی داناوە. لە نوسخە چاپکراوەکەشدا، لە لاپەڕەی یەکەمدا لەپاش ناوی دیوانەکەوە نووسراوەتەوە.

(١) واتە: دڵم کە پیر و مورشیدمە فەرمانی دامێ کەوا لە سەرەتای دیوانەکەمەوە شیعرێکی وا بنووسم بۆ شوێنەکە دەست بدا. منیش بەگوێم کرد و وتم... تاد.

(٢) قەلەندەر: دەروێش، کەسێ هیچ شتێک نەبا و دەستی لە دنیا داشتبێ. فورس: فارس.

واتە: کوردێکی قەلەندەری هەژاری وەک مەحوی بەم دیوانە شیعرەیەوە وەک شاهەنشای خاوەن دیوەخانی ئێران وایە، چۆن خەڵک لە نان و خوانی شای ئێران دەخۆن، ئەدیبانیش خۆراکی شیعر و ئەدەب لەم دیوانە شیعرە کوردییەی مەحوی وەردەگرن.

ئەم چوارخشتەکییە نیشانەی ئاشکرای شانازی کردنی مەحوییە بە کوردایەتی خۆیەوە.

-٣٣-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

ئـــــەمیانە مـــــەقام و، بـــــەستەیان نـــاشکورییە
یـــەعنی دەوەڕن ئـــەگـــەر دەمـــێ بـــێ نـــەزەڕن (٢)

-٣٤-

ئەگەر لەیلا، ئەگەر فەرهادە، تا حەشر هەر بین مـەمنوون
لە یومنی عیشقە، فەیزی حوسنە، وا بەم روتبە نائیل بوون (١)
دەکەن رەشتاڵەیەکـی دەشـتەکـی بـاسی لەگـەڵ شـیرین
دەبەن بەرد هەڵکەنێکی کێزری ناوی لەگەڵ مـەجنوون (٢)

---



(١) ئەربابی غینا: دەوڵەمەندان. غەڕڕە: مەغروور و بایی بوو.

واتە: دەوڵەمەندەکان ئەوەندە بایی بوون بەو زێڕ و زێوەی هەیانە، سروشت و رەوشـتی نێرەکەری دابەسراویان وەرگرتووە، بێ ئەوەی بۆنی بەهاریش بکەن یا دەنکە جۆیەکیان چاو پێ بکەوێ هەمیشە لە خۆیانەوە دەزەڕێنن.

(٢) واتە: زەڕینەکەیان لەباتی مەقام وتنیانە و بەستەی پاش مـەقامەکـەشیان ئـەوەتە دەست دەکەن بە ناشوکری کردنی ئەو ناز و نیعمەتەی خوا پێی داون و بە کەمی دەزانن و زیـاتریان دەوێ. بە کورتی ئەمانە ئەگەر دنیا بە ئارەزووی دڵیان بێ، دەزەڕن و خۆیانیان لێ بایی دەبێ، ئەگەر کەمێکیش بە ئارەزووی دڵیان نەبوو، تووڕە دەبن و دەست دەکەن بە ناشوکری وتن و کوفرانی نیعمەتکردن.

مەحوی لە بەیتی دووهەمدا ناشوکری کردنی شوبهاندووە بە وەڕین و ناشوکریکەرانیشی شوبهاندووە بە سەگ.

-٣٤-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە. ·

(١) یومن: پیت و بەرەکەت.

مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دێت.

(٢) کێزری: هەڵەشە و خودسەر.

واتە: لەیلای دولبەری مەجنوون و فەرهادی دڵداری شیرین پێویستە تا رۆژی قیامەت هەر

-٣٥-

**لەوساوە، نووری دیدە! کە چاوم بڕیوە مـن**
**بۆ هاتنت لە ڕێگەکـە چـاوم بـڕیـوە مـن** (١)
**حائیل نەما لە بەینی بـەری پـێت و دیـدەما**
**فەرموو کە پەردەکەی سەبەلم هەڵبڕیوە من** (٢)

---

☞

مەمنوونی دڵداری بن کەوا پایەیانی بەرزکردەوە کە ئێستا ناوی ئەویان لەگەڵ ناوی شـیرینی ئەرمەن دەبرێ و ناوی ئەمیان لەگەڵ ناوی مەجنوونی عـامیری. ئـەگینا ئـەگـەر لە سـایەی عیشقەوە نەبوایە و مەجنوون دڵی لە لەیلا نەچوایە، کێ ناوی ئەم کچە دەشتەکییە ڕەشتاڵەی دەکرد بە هاوناوی شۆخێکی وەك شیرینی ئەرمەن؟. ئەگەر شیرینیش دڵی لە فەرهاد نەچوایە کێ ناوی بەردهەڵکەنێکی هەڵەشەی وەك ئەمی دەخستە پاڵ ناوی بۆ عیشق سووتاوێکی وەك مەجنوونی عامیری؟.

-٣٥-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

مەحوی ئەم چوارخشتەکییەی پاش بڕینی چاوی بۆ شێخ موحەممەدی موفتی وتووە کە چاوەڕوانی بووە بچێ بەبۆنەی چاوبڕینەکەیەوە سەری لێ بدات.

(١)واتە: بینابییەکەی چاوم! لەوکاتەوە کە چاوم بڕیوە و توانای ڕوانـینم پـەیداکـردووەتەوە، چاوم بڕیوەتە ڕێگا چاوەڕوانی هاتنت دەکەم.

لە نێوان هەردوو «بڕیوە»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٢)حائیل: پەردە، دیوار. سەبەل: یەکێکە لە نـەخۆشـییەکـانی چـاو و نـیشانەکـەی ئـەوەیە شتێکی وەك پەردە بەسەر چاودا دێ ڕێگای دیتنی لێ دەگرێ.

واتە: پەردەی سەبەلم بەسەر چاومەوە هەڵبڕیوە و پەردە لە نێوان دیدەم و بەردی پـێتـدا نەماوە، فەرموو دەرکەوە.

-٣٦-

ئەشكم قەتاری بەست و هەناسەم سـوار بـوو
ڕۆحم چووە، بە قەسدی سەفەركەی سوار بوو[(١)]
لەو سەرگرانی نازە بپرسن لەسەر چی، بۆچ...
بێگانە بوو لە یار و بـە بـێگـانە یـار بـوو؟[(٢)]

-٣٧-

ئەم پارەپەرستانە لە خـۆیـان كـە دەچـن زوو
دەخڵی نە پەلی دێوە، نە بای باڵی پەری بوو[(١)]
عـاقڵن و فـەقەت فـێ لەگـەڵی دیـتنی پـارەن
ماهی نەوی ئەم قەومە هیلالی قەمەری بوو[(٢)]

---

-٣٦-

ئەم چوارخشتەكییەش لە دیوانە چاپكراوەكەدا نیە.

(١) واتە: فرمێكسی چاوم دڵۆپ لەدوای دڵۆپ دێتە خوار و هەناسەم سواربووە و گیانم بـە نیازی دەرچوون ڕێی گرتووەتەبەر. ئەوەش بە هۆی ئەوەوەیە كە یارم بە نیازی سەفەر سوار بووە و كەوتووەتە ڕێ.

(٢) واتە: لەو یارە بپرسن كە ئەوەندە ناز بە چاویەوەیە سەری قورس بووە، كەی بوو بە بێگانە لە دۆستان و بوو بە دۆستی بێگانان؟.

-٣٧-

(١) مەعنای چوارخشتەكییەكە هەمووی پێكەوەدێ.
باڵی (ن): دەستی.

(٢) نەو: نوێ، تازە. قەمەری: دراوێكی عوسمانییە وێنەی مانگی یەكشەوەی پێوەیە.

واتە: ئەم پارەپەرستانە كە زوو عـەقڵیـان لا نـامێنـێ و تـێك دەچـن، نـە دێو دەسـتیان لێ دەوەشێنێ و نە بای باڵی پەری لێیان دەدا. ئەمانە لە ڕاستیدا عەقڵیان تێك نەچووە، بەڵام هەر كە پارە دەبینن فێیان لێ دێ، وەك چۆن فێدار كە مانگ نـوێ بـووەوە فـێكـەی لێ دێتـەوە، ئەمانیش كە وێنەی مانگی سەر قەمەریان دی، وەك فێدار عەقڵیان لا نامێنێ.

-٣٨-

رەشێ، بۆ کوشتنی، یەك ڕووڕەشێ بەدەستەوە بوو
بە دزییەوە وتی: فتوا دە، روخسەتم فەرموو(١)
وتم: کە دەردەکەوێ زوو کە ئەم غەزاکەرە تۆی
بە دەستی سەوز و سپی بوونەوەی جەمال و روو(٢)

-٣٩-

شەمبە بۆ راو و، بە یەكشەمبە بینا دانێ، بە دوو
شەمبە ریحلەت کە، حەجامەت بگرە گەر سێشەمبە بوو(١)

---

-٣٨-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.
(١) مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دێ.
(٢) واتە: کابرایەکی رەش خۆی ئامادە کردبوو بۆ کوشتنی کابرایەکی خراپی ڕووڕەش. بە دزییەوە داوای لێ کردم فتوای بۆ بدەم بیکوژێ. منیش پێم وت: ئاخر دەردەکەوێ کە تۆ کوشتووتە و دەستبەجێ پێت دەزانن، چونکە دەستت سەوز دەبێ و رووت سپی دەبێ.
مەحوی لەم چوارخشتەکییەیدا، لە کاتێکا کە ئەو پیاوە رەشە لە ئەنجامی کوشتنی پیاوخراپەکە دەترسێنێ. هانیشی دەدا بۆ کوشتنی بەوەکە دەڵێ دەستت سەوز دەبێ و رووت سپی دەبێتەوە.
ئەم چوارخشتەکییە لە دەسنووسە پاکنووس نەکراوەکەی شاعیردا بەمجۆرەیە:
رەشێ کە کوشتنی ئەو ڕووڕەشەی بەدەستەوە بوو
بە دزییەوە وتی: من دەیکوژم، وتم: هێندوو!
چ مومکینە کە نەزانن کە ئەم غەزاکەرە تۆی
بە دەستی سەوز و سپی بوونەوەی جەمال و روو؟!

-٣٩-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.
(١) ریحلەت: سەفەر. حەجامەت: کەڵەشاخگرتن.

چوارشەمبە بـۆ دەوا نـۆشـین و، شـەمبەی پـێنـجەمین...
بۆ موناجات و دوعـایە، جـومعە بـۆ تـەزویج و شـوو[٢]

-٤٠-

لە دەوری دڵمی کە دی ئەم هەموو غـەم و تـەعەبە
دەروونی کەیلە لە زووخاو و دەرد و تا بـە لەبـە[١]
وتـــی: بـبێ دڵە! وەك تـۆ خـراپ و شـیفتە حـاڵ؟
بــەڵێ هـــەیە لە مـــن ئـاشوفتەتر: وڵاتـی بـەبە[٢]

---

(٢) تەزویج: ژن بە شوودان. لەوانەشە مەبەستی چوونە لای ئافرەت بێ. ئەمەی مەحوی لەم چوارخشتەکییەدا دەیڵێ، گوایە تاقیکردنەوەی پێشینانە و هەر کارێ لەم کـارانـە لە رۆژە بـۆ دیاری کراوەکەیدا باش و بەبەرەکەتە...

-٤٠-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) هەموو: دەتوانرێ بە «هەم و»یش بخوێنرێتەوە. کەیل: پڕ.
مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دی.

(٢) خەراب: وێران. شیفتەحاڵ: سەرلێ‌تێکچوو. وڵاتی بەبە: ئەوناوچەیەی لەژێر دەسەڵاتی میرنشینی باباندا بووە.

واتە:کە ئەم هەموو دەرد و مەینەت و ماندوویەتییەی لە دەوری دڵمدا دی و دیتی ناوی دڵم پڕە لە دەرد و زوخاو و گەیشتووەتە سەر لێو، لە دڵی پرسی ئاخۆ ئەی دڵ لە تۆ ویرانتر و حاڵ تێکچووتر لە دنیادا ببێ؟ دڵیش وەڵامی دایەوە وتی: بەڵێ، وڵاتی بابان لە من وێرانتر و پەشێوترە.

ئەم چوارخشتەکییەی مەحوی پریشکێکە لەوگیانی کوردایەتییەی لە پارچە شیعری:

قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مروور!
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور!

ی «نالی» و لە پارچە شیعری:

جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکـەی سـەحەر!
ئەی پەیکی موستەعید لە هەموو راهی پڕ خەتەر!

-٤١-

**دڵم وەك غــونچە پــڕ خــوونی «فـیراقـی» سـەبز پـۆشـێکـە**
**وەکوو سونبول حەواسم تـەفرەقەی کـاکـۆڵ بـە دۆشـێکـە[١]**
**کــە شــایەد بــێتــەوە بــۆ ســەیری شـینی ئـەم سـیابەختە**
**بە مەرگی «مەحوی» ئەی نەی ناڵەیێ، وەی دەف خورۆشێ کە![٢]**

---

☞

ی «سالم»دا تیشك دەداتەوە و، دەنگێکی زوڵاڵی دەربڕینی بێزارییە لەو جەور و ستەمەی داگیرکەرە عوسمانییەکان لە وڵاتی بابان و تێکرای کوردستانی رۆژاوادا بەرپایان کردبوو.

-٤١-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) سەبزپۆش: بەرگی سەوز لەبەرکەر. لەوانەیە مەبەست سەیید، یا کەسێك بێ لە بنەماڵەی «سەبزەپۆشی» کە لە بنەماڵە مەشهوورەکانی کوردستانە، یاخود کچێك بێ کە بەرگی خامەکی سەوزی لەبەرکردبێ.

دۆش: کۆڵ.

واتە: وەك چۆن خونچەی بەرگ سەوز پڕە لە گەڵای سووری نەکراوە، دڵی منیش پڕە لە خوێنی دەردی دووری دۆستێکی جل سەوز، یا سەبزە پۆشی، یا سەیید و، بە هۆی یارێکی قژ بەسەر شانا بڵاوبووەوە، هەستم پرژ و بڵاو بووە وەك سونبول کە گەڵاکەی بڵا و دەبێتەوە.

لە دەسنووسەکانی بەردەستمانا، تەنها یەکێکیان نەبێ، جیگەی وشەی «فیراقی» بە بۆشی هێڵراوەتەوە. وەختی خۆی مامۆستا گۆران و شێخ موحەممەدی مەحوی و کـاکـەی فـەلاح، پشت بەو تاقە نوسخەیە، وشەی «فیراقی»یان لەو بۆشاییەدا داناوە کە زۆر لەبارە بۆی. بۆیە ئێمەیش هەر بە شوێن پێی ئەواندا چووین.

(٢) واتە: ئەی شمشاڵ با ناڵەیەکت لێ بەرز بێتەوە و تۆیش ئەی دەف هاوارێك بکە، بڵێن مەحوی مردووە، بەڵکوو یار بگەڕێتەوە بۆ سەیری شینی منی چارەڕەش.

لە کۆکردنەوەی «سەبزە» و «شین» و «سیا»دا تەناسوب و وشە ئاراییەکی ناسك هەیە.

-٤٢-

يەكێ پرسی: كە پێغەمبەر لەگەڵ ئەم شەوكەت و شانە
چ موجيب موتتەسيل پڕ فيكرەت و دائيم بە ئەحزانە؟(١)
لەپاش «ئەلف و ئەوەند» ئەم جوابە جوانەی دايەوە شەيتان
ئەمەی ديوە كە ئوممەت وا ئەسيری نەفس و شەيتانە(٢)

-٤٣-

«مەحوی» كە غەيری دەستی دوعا هيچیكەی نيە
مەعزوورە، پێ شكستە نەهاتۆتە تەعزيە(١)
ئەو ئەجرە گەورەيەت كە لەبەر چاوی ئەو هەيە
مەجبووری كردووە كە بە سەر بێتە تەهنيە(٢)

---

-٤٢-

ئەم چوارخشتەكييەش لە ديوانە چاپكراوەكەدا نيە.

(١) چ موجيب: لەبەرچی، هۆی چيە؟ موتتەسيل [«مُتَّصِل»]: هەميشە. ئەحزان: خەم و خەفەت.

(٢) ئەلف و ئەوەند: هەزار و ئەوەندە ساڵ. ئەفسانەيەك لەناو كوردانـدا بـاوە گـوايـە لە پێغەمبەريان (د.خ) پرسيوە: كەی دنيا ئاخر دەبێ؟ ئەويش فەرموويە: پاش ئەلف و ئەوەندە ساڵ.

-٤٣-

(١) مەعزوور: ئەوەی بيانووی هەبێ. پێ شكست: قاچ شكاو.
مەعنای چوارخشتەكييەكە هەمووی پێكەوە دێ.

(٢) تەهنيە: پيرۆزبايی.

واتە: من كە لە دەستی بۆ دوعای خێر پانكراوە بەولاوە هيچیتر شك نابەم، عوزرم هەيە كە نەهاتوومەتە پرسە و سەرخۆشی لێكردنتان، چونكە قاچم شكاوە. بەڵام ئێستا كە دەزانم خوا چ جەزايەكی خێرتان دەداتەوە بەرامبەر بەوكۆسەی لێتان كەوتووە، ناچارم ئەگەر بە پێيش ☞

-٤٤-

مـــەیلی تـــیباع و دڵ بـــە جـونوونە و بـە هـارییە
نـــەشئەی نـــەسیمی ســوبحدەمی نـەوبەهارییە[١]
بـەم زاریـیە كـە ئـاتەشی بـەردایـە جـەرگی گـوڵ
بـــولبول، مـــەگـــەر زوبـــانەیی دڵیـــە لە زاریـە[٢]

-٤٥-

زەمـــانە بـــەعزە كـــەسانێ لەپـــڕ كـە هـەڵدەبـڕێ
ئـەوەندی هـەڵدەبـڕێتـن هـەتا لە كـەل دەبـڕێ[١]

---

☞

نەتوانم بێم لەسەر سەر بێم بۆ پیرۆزبایی لێ‌كردنی ئەو جەزای خێری گەورەیە كە خوا بۆی د ناون.

دیارە مەحوی ئەم چوارخشتەكییەی بۆ پرسەی كۆچی دۆستێكی خاوەن ڕێ و شوێن و لە شوێندا دانیشتنی دۆستێكی‌تر وتووە كە ئەویش هەر لە بنەماڵەی كۆچ كردووەكە بووە.

-٤٤-

ئەم چوارخشتەكییەش لە دیوانە چاپكراوەكەدا نیە.

(١) واتە: دڵ و سروشت ئارەزوویان لە شێتی و هارییە، چونكە شـنەی نـەسیمی بـەیانیانی بەهار دێت و هەموو شتێ لە خۆشییاندا دەكەوێتە سەما كردن.

(٢) واتە: وادیارە بولبولیش كەوا بە كوڵ دەگری، ئاگری بەرداوەتە جەرگی گوڵ و سـووری هەڵگێڕاوە و، بڵێسەی ئاگری دڵی بە سۆزیـەتی لە دەمـیدا زوبـانەی كـێشـاوە. مـەبەست لە ئاگربەردانە جەرگی گوڵ ئەوەتە گوڵەكان ـلەبەرئەوە كە بەهارە ـگەش و سوورن و پەڕە پەڕەی گوڵە سوورەكان وەك ئەوەیە ئاگر لە هەمولایەكەوە بڵێسەی بەرز بێتەوە.

-٤٥-

ئەم چوارخشتەكییەش لە دیوانە چاپكراوەكەدا نیە.

(١) لە كەل دەبڕێ: قاچی لە لوتكەی شاخیش بەرز دەبێتەوە.

كەسانێ (ن): زەواتێ.

**بــە یــەك دوو کــلکە بــەرەو ژووری بــردەوە دنــیا**
**بــە تــاقە نــووکە شــەقێکــی فــڕێ دەدا لە پــڕێ** (٢)

**-٤٦-**

**ڕێی خســـتە خــەستەخانە کــە یــاری خــوجەستە پــەی**
**جێی چاوەزارە «مــەحوی»! ئــەم ئــەسرارە دەرنــەخەی** (١)
**ســـایەی هــومایی دەوڵەتــە کــەوتۆتــە ســەر ســەرت**
**داوێنـــی هــەوری ڕەحــمەتە، مــفتی لە دەست نــەدەی** (٢)

---

(٢) کلکە: پەنجە پێوەکردن و ختەدان.

مەعنای ئەم چوارخشتەکییە لە مەعنای چوارخشتەکی ژمارە «١٣» دەچێ.

**-٤٦-**

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) خوجەستەپەی: پێ و قودووم خێر.

مەعنای چوارخشتەکییەکە هەمووی پێکەوە دێ.

(٢) هوما: باڵدارێکە دەڵێن بە سەر هەرکەسێکەوە سێبەر بکا، دەبێ بە پادشا.

واتە: دۆستی پێ و قودووم خێر هات بۆ ماڵی مەحوی نەخۆش. دەخیلە دەنگوباسی ئەو هاتنەی نەزڕێنی و بۆ کەسی نەگێڕیتەوە، چونکە ئەگەر خــەڵك بـزانـن ئـەو سـەربەرزییەت دەسگیر بووە و دۆست هاتووە بۆ هەواڵ پرسیت، دەتکەن بە چاوەوە. سێبەری دۆست کـە هاتووە بۆلات وەك سێبەری هومایە کەوتووەتە سەر سەرت و دەبی بـە پیاوێکـی گـەورە و داوێنی کە بە ژوورەکەتدا کشاوە هەوری ڕەحمەتە و بارانی بەرەکەتت بەسەردا دەبـارێنـێ، نەکەی بە خۆڕایی لە دەستی خۆتی بدەی، یا نەکەی «مـوفتی» لە دەست بـدەیت و بـهێڵی بگەڕێتەوە، ئەگەر «موفتی» بووبێ چووبێ بۆ سەر لێدانی.

-٤٧-

هەی لە ژن کەمتر! موعەتتەل بۆچی؟ نەی‌ژەن! لێدە نـەی
ساقیا! سـاقت شکـێ، بـەس رابـووەستە، بـێنـە مـەی [١]
ئـەو قـــوڕومســـاغە دەڵێن پـیری مـوغانە، پـێی بـڵێن...
پیری ئاخر شەڕ! دەری مەیخانە تاکەی دادەخەی؟! [٢]

-٤٨-

بـە بـێ بـەزمی حـوزووری تـۆ حـەرامـم کـردووە بـادە
نەوەك بشکێ بە نەشئەی مەی خوماری دەردی بێ تۆیی [١]
لە مـــیحنەت‌خانەکـــەی مـندا، بـەبێ تـۆ هـەر بـراڕۆیـە
کە جـارێ ئـێوە نـاپرسن لە مـن بـۆچـی بـرا رۆیـی! [٢]

---

-٤٧-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) موعەتتەل بۆچی: بۆچی ماتڵی؟.

(٢) دەر: دەرگا.

مەبەستی لەوەیە پیری موغان دەبێ هەمیشە دەرگای مەیخانەی کراوە بێ.

لەم بەیتەدا «ژن» بووە بە قوربانی دروست‌کردنی وشەئاراییەك بۆ هاوسەنگ‌کردنی لەگەڵ وشەی «نەی‌ژەن»دا، لەکەی کـۆنـەپەرستانەی ژن بـە سـووك زانـینیش هـەر لەپـێناوی ئـەو وشەئاراییەدا نووساوە بە ناوچاوی ئەم چوارخشتەکییەی مەحوییەوە.

-٤٨-

ئەم چوارخشتەکییەش لە دیوانە چاپکراوەکەدا نیە.

(١) بادە: مەی. خومار: سەرئێشە و ناڕەحەتی پاش سەرخۆشی.

واتە: لەوکاتەوە کە لە تۆ جوێ بوومەتەوە شەرابم لە خۆم قەدەغە کردووە، چونکە ئەگەر بخۆمەوە خەفەتی دەردی بێ‌تۆییم لەبیر دەچێتەوە. منیش ئەوەندە بـەوەفام نـامەوێ تـاوێك یادت لە دڵمدا نەبێ و خەفەتت بۆ نەخۆم.

(٢) واتە: ماڵە پڕ لە دەرد و مەینەتەکەی من، یا ماڵی دڵم هەمیشە پڕە لە شین و براڕۆکـردن



لەبەر ئەوە کە ئێوە ناکەن جارێك بپرسن بڵێن ئەم برایەمان بۆچی ڕۆیشت.

وشەی «میحنەت‌خانە» یا «بیت‌الأحزان»ی عەرەبی لە ئەدەبیاتی کلاسیکیدا بە ماڵی حەزرەتی یەعقووب دەڵێن کە حەزرەتی یووسفی لێ ون بووبوو کە براکانی بردبوویان و خستبوویانە ناو بیرێکەوە. پاشان لەو مەعنایەوە وەرگیراوە بۆ دڵی خەمگین.

وشەئارایییەکی ناسك لە نێوان «برارۆیە» و «برا ڕۆیی»دا هەیە.

-۱-

لەم ئەهلەدا کە ئیشی کـەسی پـێ بـبێ ڕەوا:
یا پێیە، یا نە دەستە، وە یاخۆ بە دەست و پا[(١)]

-۲-

لەم ســەرایــە حـاجەتی پـێ بـێ ڕەوا
یا بە پێ، یا دەستە، یاخۆ دەست و پا[(٢)]

-۳-

دڵم بێ تابە، ئـەحواڵم خـرابـە
هەتا تۆمی دڵ‌ئارام و دڵ‌ئارا[(٣)]

---

-۱-

ئەم تاکە بەیتانە هیچکامیان لە دیوانە چاپ دراوەکەی شاعیردا نین.

(١) واتە: لەناو ئەم خەڵکەدا کاری کەسێك بـەڕێوە دەچـێ، یـا خـۆی شـوێنـی بکـەوێ، یـا دەسەڵاتی هەبێ و پارە بدا، یا گەورەیەکی خاوەن دەست و پێ بێ، یا بکەوێتە دەست و پێی کەسێك و بیکا بە تکاکار.

-۲-

(٢) مەعنای ئەم بەیتەش وەك مەعنای بەیتی پێشوو وایە.

دیارە مەبەستی مەحوی لەم بەیتە و لە بەیتی پێشوویش ڕەخنەگرتنە لە نەریتی کۆمەڵ کە مافی بنیادەمی بێ‌دەسەڵاتی تێدا خوراوە.

-۳-

(٣) واتە: تا تۆ مایەی ئارامی دڵم بیت و دڵخۆشکەرم تۆ بیت، دڵم بێ هـێز و حـاڵم خـراپ دەبێ.

-٤-

کەوا ئەو شۆخە تیرێکی بە «عَمداً» گرتە من «مەحوی»
«نمی‌دانم چ سان آرم بە جا شکـرانـەی خـود را»(٤)

-٥-

بکە سەیری «فوتووحات» ئەر گەرەکتە تۆ فوتووحی رۆح
کـتێبـی دڵ مـوتاڵاکـردنە، بڕوانـە «مـەکـتووبات»(٥)

-٦-

تاجی سەری شاهانە خاکی دەری سەی ئـەحمەد
سەر رشتەیی ئیمانە رشتەی سەری سەی ئەحمەد(٦)

---

-٤-

(٤) واتە: نازانم چۆن ئەو سوپاسە بەجێ‌بهێنم کە پێویستە لەسەرم بەرابەر بەوە کە یار بە دەسەنقەست تیرێکی تێ‌گرتم و کوشتمی، چونکە کوژراوم و مەودای سوپاس‌کردنیم نەما.

-٥-

(٥) فوتووحات: «الفتوحات المكيّة» کە شێخ «محي‌الدّين ابن عربي» دایناوە.

مەکتووبات: کتێبی بەم ناوە زۆرە، بەناوبانگترینیان لە کوردستاندا مەکتووباتی ئیمامی رەببانی و مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخە. ئێمە لامان وایە مەحوی یەکەمیانی مەبەست بێ.

واتە: ئەگەر دەتەوێ گیانت بکرێتەوە بۆ بەرەکەتی خوا، کتێبی «الفتوحات المكيّة»ی «ابن عربي» بخوێنەوە. ئەگەر دەشتەوێ تەماشای کتێبی دڵدارانی راستەقینەی عیشق بکەی، موتاڵای مەکتووبات بکە.

-٦-

(٦) واتە: خاکی بەردەرگایماڵی سەیید ئەحمەد وەك تاجی سەری پادشاهان بەشکۆیە. تاڵی سەرووی بنەماڵەیشی سەرەتاڵی ئیمانە. مەبەست لەم تاڵی سەرووە پێغەمبەرە (د.خ) کە باپیرە گەورەیەتی.

-٧-

وەقــتی هـەموو کـە کـردووە هـەر بـۆ وزووو زایـع
زاهید، بە بایەك ئەو هەموو سەعیەیشی چوو زایع(٧)

-٨-

مونەووەر نەبووە لەو «والشّمس»ی پـاری تـەلعەتەت خـۆ دڵ
موعەتتەر بێ دە لەم «واللّیل»ەکەی ئەمساڵی خەتت و خاڵ(٨)

-٩-

چاو و گوێ بخوازە بۆ ئیشی موهیم
«حُبُّكَ الأَشْـياءَ يُـعْمِي وَ يُـصِمّ»(٩)

---

☞

دیارە مەحوی ئەم بەیتەی بۆ سەیید ئەحمەدی نەقیب وتووە کە زۆر دۆستی بووە.

لە یەکێ لە دەسنووسەکانی بەردەستماندا لەسـەر ئـەم بـەیتە نـووسراوە «مـعمّا»، بـەڵام نەنووسراوە بە ناوی کێوە، تا هەوڵی راستکردنەوەی بدەین.

-٧-

(٧) [وزوو «وضو»: دەسنوێژ] ئەم بەیتە لەبارەی مەعناوە لە بەیتی یەکـەمی پـارچـە شـیعری یەکەمی «پیتی عەین» دەچێ.

-٨-

(٨) ئەم بەیتەیش لەبارەی مەعناوە لە بەیتی دووهەمی پارچە شـیعری یـەکـەمی «پـیتی لام» دەچێ.

-٩-

(٩) واتە: کەسێك شتێك یا کەسێکی خۆش بوێ، چاوی لە ئاستیا کوێر و گوێی لە ئاستیا کەڕ دەبێ و عەیبی نابینێ و خراپەی نابیسێ. لەبەر ئەوە گەلێ جار لە هەڵویستیدا بەرامبەر بەو شتە یا بەو کەسە دەکەوێتە هەڵەوە. بۆیە پێویستە لە کاری گرنگدا هەرکەس چاو و گوێی تر بۆ خۆی بخوازێ تا باش ورد بێتەوە یا گوێ شل بکا.

-١٠-

هەرچەندە تۆ «ئەمین»ی بەڵێ، مـا دڵی ئـەمن
نابێ لە سیحری نێرگسی فەتتانی تۆ ئەمین (١٠)

-١١-

نـــاوی زەنـــەخدانت لەنـــاو بـــاغی بـەهەشتا بـێـتـە نـێو
سەر وەردەگێڕێ باخەوان هەر جێبەجێ بۆ تف لە سێو (١١)

-١٢-

درۆیە مەنعی جەمعی «ضِد»، نەزەر کەن
لە بـــەزمی ئـــەمشەوا رۆژێ دیـارە (١٢)

---

-١٠-

(١٠)ما: ئەمما، بەڵام. نێرگسی فەتتان: مەبەست لە چاوە.

بۆمان راست نەکرایەوە ئەم «ئەمین»ە کێیە وا مەحوی باسی لێ دەکا.

-١١-

(١١)زەنەخدان: چەناکە.

واتە: لەناو باخی بەهەشتدا ناوی چەناکەی تۆ بێتە ناوناوان، باخەوانی بـاخی بـەهەشت دەستبەجێ روو وەردەچەرخێنێ بۆ تفـکردن لە سێو، چونکە سـێوی بـاخی بـەهەشت لە ئاست چەناکەی تۆدا هیچ نانوێنێ.

ئەم بەیتە موعەممایە بە ناوی «فتاح»ەوە. لێکدانـەوەکـەشی بـەمجۆرە دەبـێ: «سـێو» بـە عەرەبی پێی دەڵێن «تُفّاح». سەری «تفاح» کە «تف»ەکەیەتی وەردەگێڕێ و جێگۆڕکـێ بـە وشەکانی دەکرێ و دەبێ بە «فت»، جا «تفاح» دەبێ بە «فتاح».

-١٢-

(١٢)واتە: کە مەنتیقییەکان دەڵێن دوو شتی دژ پێکەوە کۆنابنەوە، راست ناکەن، ئەوە نیە لە کۆڕی تاریکی ئەمشەوی ئێمەدا رۆژی رووی یار دیارە؟.

-١٣-

تۆ بە کەرەم تیرەکەی گرتە «مەحوی» شوکر
ئەو ئە کەرەم کەوتووە، ئەم لە کەرەم کەوتووە(١٣)

-١٤-

مـن رۆژ رەشـم و فـەرقی نـیە رۆژی مـن لە شـەو
سەد رۆژ ئەگەر هەڵێ لە سەرم، رۆژم هەر شەوە(١٤)

-١٥-

وەکوو سەروت دەوێ لەم باغەدا بێ هەر بە سەربەرزی
وەکوو دانەی لە بن خاکا «دو روزی خاك بر سر زی»(١٥)

---

-١٣-

(١٣) واتە: کە تۆ بە پیاوەتی خۆت تیرێکت گرتە من، من لە سایەی خواوە تیرەکەتم بۆ کەوتە کەرەم و منی لە کەرەم خست و کوشتمی.

-١٤-

(١٤) واتە: من ئەوەندە بەدبەخت و سیا رۆژم، ئەگەر سەدجاریش رۆژی رووناکم لەسەر هەڵبێ، بەهۆی دووکەڵی رەشی هەناسەمەوە کە لە سینەی سووتاومەوە دەردەچێ، رۆژی رووناکم هەر شەوی تاریکە.

-١٥-

(١٥) دو روزی خاك بر سر زی: رستەیەکی فارسییە، واتە: یەك دوو رۆژ وا بژی خاك بەسەر سەرتەوە بێ.

واتە: ئەگەر دەتەوێ وەك دار سەروی ناوباخ بە سەربەرزی بژیت، یەك دوو رۆژ وەك تۆوی ژێر گڵ لەناو خاکدا بژی. مەبەستی لەوەیە پایەی بڵند لە ئەنجامی مەینەتکێشان و قوبوولکردنی نارەحەتی و خۆ بە کەم زانینەوە دەستگیر دەبێ.

-١٦-

**نیگاری دیدە بازی من ئەگەر راوی هەوەس بێنێ**
**بە عاشق دیدە دەنوێنێ، لە نێچیری دڵ ئەڕفێنێ(١٦)**

---

-١٦-

(١٦) دیدە باز: چاو وەك چاوی باز، یا چاوکراوە. هەوەس بێنێ: ئارەزوو بکا.

ئەم بەیتە موعەممایە بە ناوی «صادق»ەوە. لێکدانەوەکەشی بەمجۆرەیە: «دیـدە» چـاوە، «چاو»یش لە ئیستیلاحی ئەهلی ئەدەبدا بە «صاد» تەعبیری لێ دەدرێتەوە، چونکە وێنەی چاو لە وێنەی «ص» دەچێ. «نێچیر»یش بە عەرەبی پێی دەڵێن «صید». «صید»یش کە دڵەکەی فڕێنرا کە «ی»کەیەتی «صد»ی دەمێنێتەوە. «صد»ی ژمارەیش [١٠٠] بە حورووفی ئەبجەد بەرابەر بە «ق»ە، لەبەرئەوە دایدەنێین بەرابەر بە «ق»، کەواتە وا لە «صاد» و لە «ق» وشەی «صادق» پێك هات.

دەتوانین ئەم موعەممایە بە جۆرێکی‌کەش لێك دەینەوە، بڵێین کە یار چاوی بازی خۆی پیشانی «عاشق» دا، «عاشق» وەك پەلەوەری راوی کە باز ببینێ، هێلانە «عش»ی خۆی بەجێ دێڵێ و تەنها «اق»ی دەمێنێتەوە. کە دڵی نێچیریشی فڕاند کـە «ی»ی «صـید»ە -چـونکە بـە عەرەبی بە «نێچیر» دەڵێن «صید»ـ «صـد»ی دەمـێنێتـەوە. ئـەوکاتە لە «اق» کـە لە «عـاشق» ماوەتەوە و، لە «صد» کە لە «صید» ماوەتەوە، «صادق» پێك دێ.

## عقد العقائد

بسم اللّٰه الرحمن الرحيم

مـــەسئوولمە ئـــیعانە لە وەهـــهابی مـــوستەعان
هەر لەو دەکەم سوئال و دەکەم حەمدی ئەو بە جان[١]

تـــەوفیقی لێ تـــەڵەبـــمە بکـــەم خـــدمەتێ بـــە دیـــن
مـــەئموولمە خـــولاسەی «أمـــالي» بکـــەم بـــەیان[٢]

چـــەند گـــەوهەرێ لە «جـــوهرة» زەم بـــەو لەئـــالییە
نەزمی بکـەم بـە کـوردییەکـی سـیرفی جـوملە زان[٣]

---

ئەم قەسیدە درێژە باسی بیروباوەڕی موسوڵمـانان دەکـا بـەگـوێرەی پـەیڕەوی «ئـەهلی سوننەت و جەماعەت» و لەسـەر ڕێ و شـوێنـی «ئـەشاعیرە»، مـەحوی لە سـاڵی ١٣٢٢ ی هیجرەت «١٩٠٤ـ١٩٠٥ ی . ز»دا دایناوە. هەرچەند لە دەسنووسەکاندا لەسەر ئەم قەسیدەیە نووسراوە «عقدالعقائد» واتە «ملوانکەی باوەڕ» بەڵام بەیتێکی لە ئاخرەوە تیایە وا دەگەیەنێ ناوی «نوريّة» واتە «القصيدة النّوريّة» بێ.

(١) مەسئوول: خواست. ئیعانە: یارمەتی‌دان. وەههاب: بەخشندە. موستەعان: داوای یارمەتی لێ‌کراو. سوئال: داوا. جان: گیان.

واتە: یارمەتی‌دانم داوایە لەو خودای بەخشندەیەکە داوای یارمەتی لێ دەکرێ. من تەنها لەو داوای یارمەتی دەکەم و بە دڵ و گیان سوپاسی ئەو دەکەم.

(٢) مەئموول: هیوا. أمالي: گەلێ کتێب بەم ناوەوە هەیە. دیارە ئەمەی مەحوی مـەبەستیەتی کتێبێکە لە ئوسووڵی دیندا.

واتە: داوام لێی ئەوەیە سەرم بخا بتوانم خزمەتێ بـە دیـن بکـەم. خـزمەتەکـەش ئـەوەیە هیوایەکم هەیە بیهێنمە دی کە ئەوەتەکورتە و پوختەی کتێبی «أمالي» بە شیعر روون بکەمەوە بۆ نەخوێندەوارانی کورد و بەو جۆرە شارەزای ئوسووڵی دینیان بکەم.

(٣) [زەم = ضَم. سیرفی = صِرفی] جوهرە: گەلێ کتێب بەم ناوەوەش هەیە. لەوانەیە ئەوەی

هـــەم یـــادگاری ئـــەهلی کـــەماڵ و ئـــەحیببە بـــێ
هـــەم رەهـــنوما بـــەوانـــە کـــە بـــێ عـــیلمن و نـــەزان(٤)

یـــا رەب قـــوبووڵی کـــەی لە کـــەم، ئـــەم خـــدمەتە کـــەمە
لەم زەڕڕە مـــوورە لاقـــە کـــولێ زۆرە ئـــەرمەغان(٥)

بـــــەم لاقـــە کـــوللە بـــۆیـــە تـــەماداری جـــەننەتم
بـــۆ خـــۆم و بـــۆ ئـــەوانـــە بـــە دڵ لەم عـــەقیدەدان(٦)

---

☞

مەحوی مەبەستیەتی کتێبی «جوهرةالتّوحید» بێ کە کتێبێکە لە ئوسووڵی دیندا شێخ ئیبراهیمی لەقانی مالیکی دایناوە بە شیعر. لەئالی: جەمعی «لُؤلُؤ»ە، واتە مرواری. لەوانەیشە مەبەست کتێبێك بێ، چونکە گەلێ کتێب بەم ناویشەوە هەیە و شوێنەکەیش بۆ ئەمە دەست دەدا. زەم: لکاندن، خستنە پاڵ. سیرف: رووت. جوملە زان: ئەوەی هەموو کەس بیزانێ و تێی بگا.

واتە: ئەمەوێ چەند گەوهەرێکیش لە کتێبی «جوهرە» وەربگرم و بیخەمە پاڵ مرواریيە بە کوردی کراوەکانی «أمالي» و بە کوردییەکی رووت و پوختی وا بیهۆنمەوە ئەوەندە سادە و ساکار بێ هەمووکەس تێی بگا و بیزانێ.

لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە بەم جۆرەیش نووسراوە:

نەزمی بکەم بە کوردیو خدمەت بە هەم زمان

(٤) ئەحیببە: جەمعی «حەبیب»ە واتە خۆشەویست. رەهنوما: رێگا پیشاندەر.

(٥) موور: مێرووله. کولێ: کولەیەك. ئەرمەغان: دیاری.

واتە: خوایە! ئەم دیارییە کەمە لە منی کەم و ناچیز قوبووڵ بکەی و بە کەمی نەزانی بیدەیتە دواوە، چونکە لاقە کولەیەك بە دیاری لە مێروولەیەکەوە زۆرە و دیاری شوان یا شنگە یا هاڵەکۆك.

لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا «زەڕڕە» بە «نەختە»یش نووسراوە.

(٦) مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

کـــارم لەگـەڵ کـەریم و، کـەریمە بـەها نـەجۆ
دا هـەوری رەحـمەت و کـەرەمی بـێتـە دارژان[٧]

لەو هـەورە هـەڵڕژێ بـە ئـەبەد لێزمـەی سـەلات
سەر قەبر و جـیسم و رۆحـی نـەبی «آخـرالزّمـان»[٨]

ئـەمما لە بـەعدی حـەمد و سـەلات، ئـیکە نـەوبەتی
مـــەتڵەب ئـیفادەکـردنە بـۆ جـەمعی تـالیبان[٩]

واجب لەسـەر جـەمیعی مـوسوڵمـان و مـوئمینە
بـاوەڕ بکـەن بـە دڵ، چ خـەواس و چ عـامییان...[١٠]

زاتـی خـودا کـە خـالیقی ئـەکوانـە، هـەر بـووە
یـەعنی قـەدیمی مـوتڵەقـە «بِـالذّات»و «بِـالزّمان»[١١]

---

(٧) کەریم: بەخشندە. مەبەست خودایە. بەها نەجۆ: ئەوەی داوای نرخ ناکا. دا: تاوەکو.

واتە: بۆیە من بەم دیارییەکەمەمەوە بە تەمای چوونە بەهەشت و داباریني رەحمەتی خوام، چونکە کارم لەگەڵ خوای بەخشندەدایە و خوای بەخشندەیش رەحمەتی خۆی بەرابەر بە شت بەسەر کەسدا ناباڕێنێ.

(٨) بە ئەبەد: هەمیشە. لێزمە: بارانی توند، شەست و رەهێڵە. سەلات. رەحمەت. جیسم: لەش. نەبی: پێغەمبەر.

لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا «هەڵڕژێ» بە «دارژێ»یش نووسراوە.

(٩) بەعد: دوا. ئیکە: ئیتر. نەوبەت: نۆبە، کات.

(١٠) موئمین: خاوەن ئیمان، خاوەن باوەڕ. خەواس [«خَواص»]: جەمعی «خاصّە»یە، واتە کەسانی تایبەتی. مەبەست لەگەورە گەورانە. عامییان: عاممەی خەڵك، رەشە خەڵك.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە مەعنای بەیتە داهاتووەکانەوە.

(١١) ئەکوان («اَکوان»): جەمعی «کَون»ە واتە گێتی. قەدیمی موتڵەق: ئەوەیە بە زاتیش و بە زەمانیش قەدیم بێ. قەدیمی بە زات ئەو زاتەیە هیچ شتێکی لێ پێش نەکەوتبێ، وەکوو زاتی خودا کە نە نەبوونی لێ پێشکەوتووە و نە شتێکی واکە کاری تێ بکا. قەدیمی بە زەمانیش ☜

**واجب بــە زاتــە، بــوون و وجــوودی لە خــۆوەیـە**
**فــەردێکـی مـونفەرید بـە بـەقاو و هـەمیشە مـان**[١٢]

**رێگـــەی نــیە بــەسەریەوە «قــطعاً» فــەنا، عــەدەم**
**شەو قەت دەگاتە خـدمەتی شـەمسی زیـا فشـان!**[١٣]

**خــۆی و هــەموو ســیفاتی کــەمالی بــووە و هـەیە**
**دەشــــبێ ئــەزەلیەتی ئــەبەدییەت دەدا نــیشان**[١٤]

---



ئەوەیە نەبوونی لێ پێش نەکەوتبێ، ئەگەرچی کار تێ‌کەری لێ پێش کەوتبێ وەکوو سیفاتی خوا. ئێستا ئەم سیفەتانە نەبوونیان لێ پێش نەکەوتووە و لە ئەزەلەوە لەگـەڵ خـوادا بـوون و سیفەتی ئەون، بەڵام زاتی خودایان بە زات لێ پێش‌کەوتووە نەك بە زەمان چـونکە سـیفەت پێویستی بە زات هەیە.

(١٢) مونفەرید بە بەقا: ئەوەی تەنها هەرخۆی بمێنێتەوە.

واتە: پێویستی بوونی لە زاتی خۆیەوەیەتی، نەك لەبەر هۆیەکی دەرەکی، چونکە ئەگـەر لەبەر هۆیەکی دەرەکی بێ ئەوە وا دەگەیەنێ پێویستی بەو هۆیە دەرەکییە هەیە و، ئـەوەش لەگەڵ پێویستییەکانی خوایەتیدا ناکەوێتە یەك. تاقە زاتێك کـە خـاوەنی سـیفەتی مـانەوەی هەمیشەیی بێ، هەر ئەوە.

(١٣) «قطعاً»: هەرگیز. زیا [«ضیا»] فشان: ئەوەی تیشکی رووناکی بڵاو بکاتەوە.

واتە: خوایەکە هەرگیز فەوتان و نەبوونی رێی تێ‌ناکەوێ، وەك چۆن هەرگیز تاریکایی شەو ناتوانێ بەسەر قورسی رۆژدا بێت و لە هەر کوێ رۆژ هەبێ هەر تیشك دەداتـەوە و لەگـەڵ تاریکاییدا کۆ نابێتەوە.

(١٤) ئەزەلیەت: بێ‌سەرەتایی. ئەبەدییەت: بێ‌پایانی.

واتە: خوا خۆی و سیفەتەکانی کە نیشانەی تەواوینی، هەر بوون و ئێستاش هەن و هـەر دەشمێننەوە. بەڵگەی دوایی نەهاتنی ئەم سیفەتانەش ئەوەیە کە سەرەتایان نیە و لە نەبوونەوە پەیدا نەبوون. باوەڕی موسوڵمانانی ئەهلی سونەت کە لەسەر پێڕەوی ئەشعەرین ئەوەیە لە خوا بەولاوە کەس قەدیمی بە زات نیە و لە سیفەتەکانیشی بەولاوە هیچ قەدیمێکـی‌تری بـە زەمان نیە و، هەرچی‌تر هەیە هەموو نەبوون و پەیدا بوون.

کەس پرسی ئەو سیفاتە، بڵێ تۆ: حەیات و عیلم
سەمع و بەسەر، ئیرادەو قودرەت، کەلام دان(١٥)

ئیدراکی زەوق و لەمس و شەمی بۆ قەرار ئەدەن
بەعزێك و، بەعزە مونکیر و، بەعزێ لە وەقفەدان(١٦)

زید و مونافی ئەم سیفەتانە مەحاڵە بۆ...
ئەو خالیقە کە راگرە بۆ مولکی «کُن، فَکان»(١٧)

---



لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا لەسەر نیوە بەیتی دووهەم ئەم پەراوێزە عەرەبییە بە خەتی خۆی نووسراوە: «ما ثَبَتَ قِدَمُه، اسْتَحالَ عَدَمُه» واتە: ئەوەی ئیسپات بێ کەوا قەدیمە، فەوتان و نەبوونی مەحاڵە.

(١٥) دان: بزانە. وشەیەکی فارسییە. دەشگونجێ «دان»ی کوردی بێ و مەعنای «کەلامدان» وای لێ بێتەوە: قسەکردن.

واتە: ئەگەر کەسێ لێی پرسیت سیفەتەکانی خوا کامەن، تۆ لە وەڵامیدا بڵێ: سیفەتەکانی خوا حەوتن: ژیان و زانین و بیستن و بینین و خواست و توانا و گفتوگۆ.

(١٦) ئیدراك: تێگەیشتن. زەوق: چەشتن. لەمس: لێ کەوتن. شەم: بۆنکردن. وەقفە: دامان.

واتە: زاناکانی ئوسووڵی دین بەش بەشن لەوەداکە ئاخۆ خوا سیفەتی چەشتن و لێ کەوتن و بۆنکردنیشی هەیە یا نە. هەندێکیان دەڵێن ئەم سیفەتانەشی هەیە چونکە هەموویان سیفەتی کەماڵن و خوایش هەموو سیفەتێکی کەماڵی هەیە. هەندێکیشیان دەڵێن نیەتی چونکە بوونی ئەم سیفەتانە پێویستی بە بوونی هەندێ ماددە و ئەسباب هەیە کە بوونیان بۆ خوا نەقس و ناتەواوییە. هەندێکیشیان داماون و هیچیان نەوتووە.

ئەمە مەعنای بەیتەکە بوو. ئێمەیش دەڵێین ئەوەی زانایانی ئوسووڵی دین پاش لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە پێی گەیشتوون ئەوەیە کەوا خوا هەموو سیفەتێکی کەماڵی هەیە و بوونی ئەم سیفەتانە بەوجۆرە نیە کە ئێمە لە مەعنای سیفەت و مەوسووف دەگەین و، لەناو هەموو سیفاتی کەماڵدا، لە قورئان و حەدیسدا تەنها باسی حەوتیان کراوە، بۆیە ئێمەیش باسی هەر ئەو حەوتەیان دەکەین.

(١٧) زید [«ضِدّ»]: دژ. مونافی: ئەوەی مەعنای نەبوون بگەیەنێ. «کُن فَکان»: ببە و بوو.

ئـەو حـەیی و ئـەو عـەلیم و سـەمیع و بـەسیرە، ئـەو
قـادر، مـورید و هـەم مـوتەکـەللیم «بِلا لِسان»(١٨)

زیـنـدوو و بـە دانش و شـنەواو و بـە بـینشە
ساحێب تەوان و خواهیشە، گۆیـا بـە هـەر زوبـان(١٩)

بشـزانـە خـێر و شـەڕ بـە ئیرادەی ئـەوە هـەموو
رازی نـیە فـەقەت بـە خـراپـە و شـەڕ و زیـان(٢٠)

بـۆ عـەبد و بـۆ عـەمەلیەتی خـولقندە ئـەو، ئـەوە
تـەوفیقی دا بـە ئـێمـەو و خـەزلانی دا بـەوان(٢١)

---



مەبست ئەوەیە کە خوا بەم دنیایەی فەرموو: ببە و ئەویش دەستبەجێ پەیدا بوو.

واتە: سیفەتی پێچەوانەی ئەو سیفەتانەی خوا کە باسمان کردن، وەك مردن و نەزانین و نەبیستن و نەبینین و نەویستن و نەتوانین و ناگۆیایی. مەحاڵە بىن بۆ خوا.

(١٨) ئەم بەیتە مەعنای بەیتی پێشوو روونتر دەکاتەوە. دەڵێ مادەم سیفەتی پێچەوانەی سیفەتە باسکراوەکانی خوا مەحاڵ بن بۆ خوا، دیارە خوا زیندوو و زانا و خاوەن بیستن و بینین و توانا و بێ هاوتا و قسەکەری بێ زوبانە...

(١٩) دانش: زانست. شنەوا: ئەوەی ببیسێ. بینش: بینین. تەوان: توانا. خواهیش: خواست، ئیرادە. گۆیا: قسەکەر.

ئەم بەیتەش هەر لە جۆری بەیتی پێشووە.

(٢٠) واتە: چاکە و خراپە، هەرچی لە دەستی ئادمیزاد روو بدا، هەمووی بە ویستنی خوا روو دەدا و ئەگەر ئەو نەیەوێ روو بدا روو نادا. بەڵام تەنها بە کردەوەی چاکە رازییە و، ناڕازییە لە خراپە و زیان گەیاندن...

(٢١) خولقندە: خالیق، دروستکەر. خەزلان: یارمەتی نەدان و بەزاندن و سەر پێ شۆڕکردن.

واتە: خوا خۆی خالیقی کاری بەندەیە و هەر ئەوە تەوفیقی ئێمەی موسوڵمانی داوە کەوا موسوڵمان بین و کافرانی بەرەڵلا کردووە و پشتی نەگرتوون.

خـــالیق یـەکـێکـە، کـاسیبە عـەبد، ئـەمپەڕ ئـەوپەڕە:
ئـــیفراتـــی ئـیعتیزالیو تـــەفریتی جـــەبرییان[٢٢]

واریـــد بـــووە لە شـــەئنی قـــەزاو و قـەدەر حـەدیس
بـــاوەڕ دەبـــێ بـــبێ بـە وجـووبی بـە هـەردووان[٢٣]

زاتـــی خـــودا ســـیفاتی نـــە عـەینە نـە غـەیری زات
بێ ئەم سیفاتە قـەت نـەبووە و قـەت نـیە بـە ئـان[٢٤]

---

(٢٢) ئیفرات: پەڕگرتنی ئیجابی. تەفریت: پەڕگرتنی سەلبی. ئیعتیزالی: موعتەزیلە، تاقمێکن لە زانا فەلسەفییەکانی ئیسلام لە لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی عیلمی کەلامدا پتر پشت بە عەقڵ و مەنتیق و قیاس دەبەستن. گرنگترینی بیروباوەڕەکانیان ئەوەیە کەوا ئادەمیزاد لە کاری خۆیدا ئازادە و هەرچی دەکا بە ئارەزووی خۆی دەیکا و خۆی دروستکەری کرداری خۆیەتی. لایشیان وایە موسوڵمانی گوناهبار نە موئمینە و نە کافر و لە پایەیەکدایە لە نێوان ئەو دوو پایەدا. هەروا لایشیان وایە قورئان مەخلووقە و باشتر و دادپەروەری لەسەر خوا پێویست وگەلێ بیر و باوەڕی فەلسەفی تریشیان هەیە. جەبری: جەبریە تاقمێکن لە زانا فەلسەفییەکانی ئیسلام، دان بەوەدا نانێن کە ئادەمیزاد ئازادە لە کار و کردەوەی خۆیدا و دەڵێن هەرچی دەکا بە زۆر پێی دەکرێ و وەك پووشێك وایە بەدەم باوە. جوهەمییەیشیان پێ دەڵێن.

واتە: باوەڕت وابێ لەم جیهانەدا دروستکەر هەر خوایە، وەك بەندەی دروستکردووە کردەوەکانیشی دروست دەکا، بەڵام بەندە خۆیشی بێپەیوەند نیە. ئەم خۆی ئارەزووی هەر ئیشێك دەکا خوایش بۆی دروست دەکا. ئەمەتە پەیڕەوی میانە و ئەمپەڕ و ئەوپەڕگرتنی موعتەزیلەکان و جەبرییەکان راست نیە.

(٢٣) شەئن: بارە. قەزا: ئەوەتە خوا لە ئەزەلا عیلمی بووە بە هەر شتێ کە لە جیهانا روو دەدا. قەدەر ئەوەیە خوا ویستویەتی ئەو شتانە روو بدەن، یا دروستکردنی ئەو شتانەیە هەرکام لە کاتی خۆیدا.

واتە: لە حەدیسی پێغەمبەردا، درورودی خوای لێ بێ، باسی قەزا و قەدەر کراوە و دەبێ باوەڕمان بە هەردووکیان بێ.

(٢٤) ئان: کات.

واتە: سیفەتەکانی خوا عەینی زاتی خوا نین چونکە ئاشکرایە سیفەت لە ئاساری خاوەن ☜

نـــاوی خــودا بــە شــەیء و بــە زات ئــەر دەبــەی بـبە
ئەو زاتە نا کە دەوری گرێ شەش جـیهە و زەمـان(٢٥)

وەقت و زەمان و حاڵ و جـیهەت «حـادیسن» هـەموو
خـــالیق قـــەدیمە ئــەڵبـــەتە، مــوستەغنییە لەوان(٢٦)

غـــەیری نـــیە، بـــە عـــەینی مـوسەمما بـزانـە ئـیسم
بـا ﴿سَبِّحِ اسْمَ﴾ قـەومی مـوعانید بکـەن رەوان(٢٧)

زاتی خودا نە جـەوهەر و جـیسمە، نـە کـولل و بـەعز
بێچوون و بێ‌چگـۆنـە، مـونەززەهـ لە ئـەین و ئـان(٢٨)

---



سیفەتە و عەینی نیە. هەروەها غەیری زاتیش نین بەو مەعناکە غەیری شتێك ئەوەیە لەو شتە جوێ ببێتەوە و بێ ئەو تەسەوور بکرێ، چونکە مەحاڵە ئەو سیفەتانە لە خوا جیا ببنەوە و خوا هەرگیز بێ ئەو سیفەتانە نەبووە و نابێ.

(٢٥) واتە: قەید ناکا ئەگەر خوا بە «شت» و بە «کەس» ناوبەرین، بەڵام نەك بەو مەعناکە ماددە بێ و سەر و خوار و پاش و پێش و راست و چەپی ببێ و شەو و رۆژی بەسەرا بێ، چونکە ئەمانە نەبوون و خوا دروستی کردوون و شتێ کە نەبووبێ و پەیدا بووبێ بڕیار نادرێ بۆ کەسێ کە هەر بووبێ و سەرەتای نەبێ.

(٢٦) ئەم بەیتە مەعنای بەیتی پێشوو روونتر دەکاتەوە.

(٢٧) موعانید: ئەوەی عەناد و کەللەڕەقی بنوێنێ.

واتە: کە ناوی خوات بیست وەکوو «اللّٰه» لە شوێنێکی وەکوو: «بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ»دا، بزانە مەبەست لەو ناوە زاتی خوایە، چونکە ئەو حوکم و سیفەتانە کە لەگەڵ ئەو ناوەدا باس دەکرێن بۆ ناوەکە دەست نادەن، بەڵکوو بۆ زاتی خوا خۆی دەست دەدەن. کـەواتـە بـا ئـەو کەسانەی کەللەڕەقی دەکەن و دان بە راستیدا نانێن و باوەڕیان بەم قسەیەی ئێمە نیە، ئایەتی: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَىٰ﴾ رەوان بکەن کە دەلیلە لەسەر ئەوە کەوا مەبەست لە ناو خاوەن ناوە چونکە تەسبیحات بۆ زاتی خوا دەکرێ نەك بۆ ناوەکەی.

(٢٨) جەوهەر: ئەو ماددەیەیە کە بۆ دابەشکردن نەشێ و دەست‌نەدا. جیسم: ئەو ماددەیەیە کە



حـــادیس نـــیە، قـــەدیمە، کـــەلامی خـــودا بـــە حـــەق
دەم بۆ حەدەس بە ناحەق ئەبەن «ضالّ» و گومڕەهان (٢٩)

بـــاوەڕ بـــبێ خـــودا کـــە لەســـەر عـــەرشە مـــوستەوی
ئەمما بە ئیستیوایەکـی بـێ چـوون و کـەس نـەزان (٣٠)

هـــــەر ئـــایەت و حـــەدیسێ شـــتێکـــی تـــیا بـــبێ
بـــتخاتە شـــوبهە، جـوابـتە بـێ چـوونی و چـونان (٣١)

وەك عەین و وەجهـو سوورەت و ئەنگوشت و دەست و پێ
وەك نەفس و وەك نزوولی هەموو شەو لە ئـاسمان (٣٢)

---



بۆ دابەشکردن بشێ. چوون: وێنە. چگۆنە: چۆنیەتی، «کَیْفِیَّة». مونەززەه: پاك و خاوێن. ئەین: بوون لە جێگادا، لە «اَین»ەی عەرەبی وەرگیراوە. ئان: بوون لە کاتدا، لە «آن»ی عەرەبی وەرگیراوە.

(٢٩) حەدەس: ڕووداو. «ضالّ»: گومڕا.

واتە: بەپێی بیروباوەڕی ئێمە کەلامی خوا قەدیمە و سیفەتی خـوایـە و لەگـەڵـیا بـووە و هەمیشە دەمێنێ و بریتی نیە لە دەنگ، بەڵکوو هۆی گفتوگۆی خوایە لەگەڵ پێغەمبەران بە هەر زەمانێ کە هەر پێغەمبەرێك بوویێتی لەناو هەر کۆمەڵە خەڵکێدا. ئـەو کـەسانەیش کـە دەڵێن کەلامی خوا نەبووە و پەیدا بووە. گومڕان و سەریان لێ شێواوە.

(٣٠) موستەوی: جێ گرتوو. ئیستیوا: جێ گرتن.

واتە: بەپێی ئایەتی: ﴿الرَّحْمٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوىٰ﴾ کە واتە: خوا لەسەر عەرش جێگـەی گرتووە، ئێمە لامان وایە خوا لەسەر عەرشی خۆی جێی گرتووە، بەڵام جێ گرتنێکی واکە ئێمە جۆرەکەی نازانین، چونکە ئەگەر بڵێین جـێ گـرتنی خـوا لەسـەر عـەرش وەك جـێ گـرتنی ئادەمیزادە لەسەر کورسیەك، دەبێ بڵێین خوا ماددەیەکە وایش نیە و ئەوە بۆ ئەو دەست نادا.

(٣١) بێ چوونی: بێ وێنەیی. چونان: وەك.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی دواییەوە.

ببێ (ن): ببێت.

(٣٢) واتە: هەر ئایەتێك یا هەر حەدیسێك کە لەوانەبێ دوودڵت بکا و سەرت لێ بشێوێنێ ☜

**تەنزیھ ئەکەن سەلەف، خەلەف ئەمما دەکەن تەویل**
**بۆ هەرچی ناسزایە بە زاتی عەزیمە شان(٣٣)**

**نەیگرتووە شەریك و موعین و ژن و وەلەد**
**بۆ ئێمەیە لە ئایەتی «عزّ» ئەم قسە عەیان(٣٤)**



بەوجۆرە کەوا بگەیەنێ خوا چاوی هەیە یا رووی هەیە یا وێنە و پەنجە و دەست و پێی هەیە یا نیسبەتی «نەفس»ی دەدرێتە پاڵ یا بە شەو لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە خوار بۆ سەر زەوی وەك ئایەتی: ﴿وَ لِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي﴾ کە واتە: لەبەر چاوی من دروست بکرێی، یا ئایەتی: ﴿وَ يَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُوالْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ کە واتە: تەنها رووی خاوەن شان و شکۆی خوای تۆ دەمێنێتەوە، یا حەدیسی: «قَلْبُ الْمُؤْمِنِ بَيْنَ أَصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمٰنِ» کە واتە: دڵی موسوڵمان لەنێوان دوو پەنجەدایە لە پەنجەکانی خوا، یا ئایەتی: ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ کە واتە: دەستی خوا باڵا دەستیانە، یا ئایەتی: ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ کە واتە: بۆ خۆمم دوروست کردووی، یا هەر ئایەت و حەدیسێکی تری لەم چەشنە، تۆ باوەڕت بە راستی ئەو ئایەت و حەدیسانە ببێ، بەڵام بڵێ من نازانم شتەکە چۆنە و بە ئێمە دەرك ناکرێ و لە عیلمی خوا خۆیدایە.

ئەم جۆرە ئایەت و حەدیسانە لە ئیستیلاحی ئوسوولی دیندا پێیان دەوترێ «مُتَشابِه».

(٣٣) تەنزیھ: بە دوورگرتنی خوا لە ناتەواوی. سەلەف: زانایانی پێشوو. خەلەف: زانایانی پاشەوە. تەویل: تەئویل، وەرگێرانەوەی مەعنا بەجۆرێ کە راستی بکاتەوە. ناسزا: ناشایان. عەزیمە شان: «عَظيم‌الشّأن»، پایە بڵند، خوا.

واتە: سەبارەت بەو ئایەت و حەدیسانەی کە موتەشابیهن و مەعنا دیارییەکەیان شتی وا دەگەیەنێ بۆ خوای گەورە دەست نەدا، زانایانی پێشوو دەڵێن خوا بەرییە لەو شتانە و مەعنای ئەو ئایەت و حەدیسانە حەواڵەی عیلمی خوا دەکەن. زانایانی پاشەوەیش مەعنایان هەڵدەگێڕنەوە بەجۆرێ کە دەست بدا. بۆ نموونە دەڵێن مەبەست لە دەستی خوا هێزی و لە رووی خوا خۆی و لە چاوی خوا ئاگادارییەتی... تاد.

(٣٤) موعین: یارمەتی‌دەر. وەلەد: مناڵ، کوڕ بێ یا کچ. ئایەتی «عزّ»: دوا ئایەتی سوورەتی «الاسراء» کە پێی دەڵێن ئایەتی «عزّە». عەیان: ئاشکراو دیاری.

واتە: خوا هاوبەش و یارمەتی‌دەر و ژن و مناڵی بۆ خۆی رانەگرتووە. ئەمەیش بە ئاشکرا لە

ئــەم خــەڵقــە جــوملە دەمـرن و هـەموانـیان ئـیلاه
زیـــندوو دەکــاتەوەیش و دەبــینێ حــیسابیان(٣٥)

کــافر کــە خــارە، بــابەتی نــارە، جـەحیمە جـێی
مـوئمین گـوڵە، کـە زیـنەتی بـاغە چـووە جـینان(٣٦)

دیــنی خــودا کــەرامـەتە دەرحــەق بـە ئـەهلی دیـن
لەو نــەشئەدا کــە یــارەبـی بـیکەی بـە رزقـمان(٣٧)

هەرکەس بە نەشئەی ئەو مەیی بێچـوونە فـەوزی بـوو
جەننەت لە فکری چوو لە نیشات و لە خۆشـییان(٣٨)

---



ئایەتی «عزّە»وە دەردەکەوێ کـە دەڵێ: «قُلِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً وَ لَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَ كَبِّرْهُ تَكْبِيراً». واتە: بڵێ سوپاس بۆ ئەو خوایە کە نە منالّی راگرتووە و نە هاوبەشی هەیە لە دەسەڵاتیدا و نە لەبەر بێ‌کـارەییش سـەرپەرشتی‌کەری بـۆ خۆی داناوە و، هەمیشەیش هەر ئەو خوا بە گەورە بزانە.

(٣٥) ئیلاه: خوا. حیساب: لێ‌پرسینەوە.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٣٦) خار: درك. نار: ئاگر. جەحیم: دۆزەخ. جینان: بەهەشت.

واتە: ئەم خەڵکە هەموویان دەمرن و خوا لەو دنیا هەموویان زیندوو دەکاتەوە و حسێبی کردەوەی دنیایان لەگەڵ دەکا. کافرەکان دەخرێنە دۆزەخ و دەسووتێن چونکە لە کردارياندا وەك درك زیانبەخش بوون و هەر بۆ سووتان باشن. موسوڵمانەکانیش دەنێررێنە بـەهەشت، چونکە لە کردەوە باشیدا وەك گوڵی بۆنخۆش وابوون و جێگەی گوڵیش باخچەیە.

«مەحوی» لەم بەیتەدا لەو وشەی «جینان»دا هونەری «تَوریە»ی بەکـار هـێناوە، ئـەوەتە مەبەست لێی بەهەشت و خۆیشی بەمەعنا باخچەیە.

(٣٧) دین: دیتن، بینین. نەشئە: دروستکردنەوەی ئادەمیزاد لەو دنیا.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٣٨) واتە: دیتنی خوا بۆ موسوڵمانان پاش زیندووبوونەوەیان لەو دنیا، مـایەی سـەربەرزییە

واجب نــــیە لەســـــەر مـــەلیکی «واجبالوجـــود»
ئەسڵەح وەیا مـەسڵەحـە دەرحـەق بـە بـەندەگـان[٣٩]

زوبـــدەی ئـیلاهیاتی عـــەقیدەم کـــە گـــرتە نـــەزم
«لابــدّ» دەبـــێ بکـــەم نـــەبەوییاتەکـــەش بـەیان[٤٠]

***

وەك واجـــــبە بـــە زات و ســـیفاتی خـــودا یـــەقین
بـــاوەڕ دەبـــێ بـبێ بـە مـەلائیك، بـە مـوڕسـەلین[٤١]

حـەق بـوون و هـەم بـە حـەق بـووە دیـن و کـیتابیان
هــەریەك هــەتا زەمـــانی یـــەکـێکـــی دواتـرین[٤٢]

---

☞

بۆیان خوا بەشمانی تێخا. هەرکەسیش بە چەشتنی شەرابی بێمانەندی بینینی خوا سەرخۆش بێ، لە خۆشیاندا بەهەشتی لەیاد نامێنێ.

(٣٩) واتە: بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت وایە کەوا پێویست نیە لەسەر خوای گەورە تەماشای سوودی بەندەگان بکاو چی باشتر بێ بۆ ئەوان یا چی سوودی گشتی تیابێ ئەوە بکا. ئەگەر وابوایە کافرێکی لات و دەردەداری دروست نەدەکرد لە دنیاشدا بێبەش و هەناسە سارده و لە قیامەتیشدا دۆزەخ جێیەتی.

(٤٠) زوبدە: پوختە. ئیلاهییات: ئەو بابەتانەی پێوەندیان بە خواوە هەیە. «لابدّ»: بە ناچاری. نەبەوییات: ئەو بابەتانەی پێوەندیان بە پێغەمبەرەوە هەیە.

***

(٤١) مەلائیك: مەلائیکە، جسمێکی نوورانین دەتوانن خۆیان بخەنە قاڵبی هەر شێوەیەکی جوانەوە. موڕسەلین: ئەوانەی خوا ناردوونی بۆ سەر ئادەمیزاد و ئایینێکی پێسپاردوون بە خەڵکی بگەیەنن، یا داوای لێ کردوون ئایینی پێغەمبەرێکی پێش خۆیان بگەیەنن. ئەمانە خوا لە ڕێگای جوبرەئیلەوە نامەی خۆیان پێ دەگەیەنێ، کە مەلائیکەیەکە خوا بەتایبەتی ئەم کارەی پێ سپاردووە.

(٤٢) واتە: ئایینی ئەم پێغەمبەرانە و ئەو کتێبانەی خوا بۆی ناردوون فەرمانڕەوا بوون، تا خوا پاش مردنی هەرکامێکیان پێغەمبەرێکی تری ناردووە و ئایینی ئەوی پێشوویانی هەڵوەشاندووەتەوە.

ئـــەم ئــاڵوگــۆڕی دیــنە لە کــارا بــووە هــەتا...
دەوری یەکێ بە دینی ئەوە نـەسخی جـوملە دیـن[٤٣]

یـــەعنی پــەیەمبەری عــەرەبی، هــاشمی نــەسەب
ئەحمەد لە ئـاسمان و، مـوحەممەد لە سـەرزەمین[٤٤]

دیـــن و کـــوتوب نـــەما، بـــووە دیـــن و کـیتابی ئـەو
باقی دەبێ شـەریعەتی ئـەو تـاکـوو یـەومی دیـن[٤٥]

عـــیسا کـــە دێتـــە خـــوارەوە بـــۆ کـوشتنی جـەجاڵ
خۆی و ئـەوانـە تـابیعی ئـەو بـن، مـوحەممەدین[٤٦]

---

(٤٣) نەسخ: هەڵوەشاندنەوە. جوملە: هەموو.
واتە: هەڵوەشاندنەوەی ئایینی کۆن بە ئایینی تازە هەر لە کارا بووە تا زەمانی ئەو پێغەمبەرە کە پاش ئەو پێغەمبەری‌تر نایەت و ئایینی ئەو هەموو ئایینێکی هەڵوەشاندووەتەوە کە ئەویش پێغەمبەری ئیسلامە دروودی خوای لێ بێ، وەك لە شیعرەکانی پاشەوەدا باسی لێ دەکا.
(٤٤) ئەحمەد لە ئاسمان: ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿وَ مُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَد﴾ کە خوا لە قورئانا بە زوبانی حەزرەتی عیساوە دەیگێڕێتەوە، واتە: موژدەی هاتنی پێغەمبەرێك دەدەم لەپاش خۆم دێ ناوی «ئەحمەد»ە، یا مەبەست ئەوەیە پێغەمبەری موسوڵمانان لەناو مەلائیکەتاندا بە «ئەحمەد» ناوبانگی دەرکردووە. موحەممەد لەسەر زەمین: واتە لەناو خەڵکا «موحەممەد»ی بانگ دەکەن.
(٤٥) کوتوب «کُتُب»: جەمعی «کیتاب»ە، بەو کتێبانە دەڵێن کە خوا ناردوونی بۆ پێغەمبەران.
یەومی دین «يوم‌الدِّين»: ڕۆژی تۆڵە سەندنەوە و پاداش دانەوە، ڕۆژی قیامەت.
(٤٦) جەجاڵ: دەججال. بەگوێرەی حەدیس کابرایەکە بەر لە دنیا ئاخر بوون پەیدا دەبێ و خەڵك گومرا دەکا. هەر لەو سەردەمەدا حەزرەتی عیسایش کە ئێستا لە ئاسمانە، دێتە خوارەوە موسوڵمانانی شوێن دەکەون و دەجاڵ دەکوژێ. ئەوکاتە حەزرەتی عیسا کە خۆی پێغەمبەر بووە و بەر لە پێغەمبەری ئێمە هاتووە، ئایینەکەی خۆی ڕاناگەیەنێ بە خەڵك، بەڵکوو لەگەڵ شوێن‌کەوتووانی، شوێنی ئایینی ئیسلام دەکەون. موحەممەدی: موسوڵمان.

**سەرداری ئەنبیایە بە کول، خاتەمی روسول**
**ساحێب لیوایە، پێشڕەوە، رۆژی واپەسین**[٤٧]

**رۆژێ کە مەککە مەشریق و، مەغریب مەدینە بوو**
**سەیری کە شەرق و غەربە بە نووری مونەووەرین**[٤٨]

**میعراجی سابیتە بە نوسووس و، بە خەو نەبوو**
**تەشریفی ئەو بە جیسمی شەریفە سواری زین**[٤٩]

**بۆ ئەنبیا لە مەسجیدی ئەقسا بووە ئیمام**
**نۆبەی عورووجە یەعنی لە نۆ قوببە تێپەڕین**[٥٠]

---

(٤٧) لیوا: ئاڵایی. واپەسین: دوایی، قیامەت.

(٤٨) واتە: سەیر کە چۆن رۆژهەڵات و رۆژاوا تیشك دەدەنەوە بەهۆی ئەو رۆژەوە کە مەککە رۆژهەڵات و مەدینە رۆژاوای بوو کە بریتیە لە پێغەمبەری ئیسلام دروودی خوای لێ بێ.

رۆژێ کە: لە دەسنووسەکانی بەردەستمانا بەمجۆرە نووسراوەتەوە: «روژێك = رۆژێکی». ئێمە ئەوەمان لا هەڵە بوو. شایانی وتنە ئەم بەیتەمان بە دەسنووسی «مەحوی» خۆی لانەبوو تا بزانین ئەو خۆی چۆنی نووسیوەتەوە.

(٤٩) میعراج: سەرکەوتن بۆ ئاسمان. زین: مەبەست لێی «بوراق»ە.

واتە: بە نەسسی ئایەت ئیسپات بووە کەوا پێغەمبەر (د.خ)، بە شەو لە مەککەوە چووەتە «قُدس» و بە نەسسی حەدیس ئیسپات بووە کە لەوێشەوە چووە بۆ ئاسمان. ئەم میعراجەیش لە حاڵەتی هۆشیاریدا بووە نەك لە خەودا، وەك هەندێ کەس دەڵێن، وە پێغەمبەر بە لەش، نەك بە رۆح وەك هەندێك دەڵێن، سواری وڵاخێکی تایبەتی بووە کە ناوی «بوراق» بووە. ئەم میعراجە لە ٢٧ی مانگی رەجەبی ساڵی ١١ی پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا رووی داوە.

(٥٠) مەسجیدی ئەقسا «مسجدالاقصی»: مزگەوتێکە لە قودس. عورووج: سەرکەوتن. قوببە: گومەزی.

واتە: پێغەمبەر لە مەسجیدی ئەقسادا بوو بە پێش‌نوێژ بۆ پێغەمبەران و ئیتر لەوێ بەولاوە نۆبەی سەرکەوتنە لە هەر حەوت ئاسمان و لە عەرش و لە کورسی.

تــا ســیدرە جــوبرەئیلە ئــەمین، ئــیکە رەفــرەفــە
خــدمەتچی ئــەم ئــەمانەتە تـا رەبـبی عـالەمین[٥١]

دەعوەت کرایـە قـەسری «أَوْ أَدْنـیٰ» لە «قـابَ قَـوس»
زیــافەت لیــقایە، زاتـی خـودایـە بـە دیـدە دیـن[٥٢]

تـەعزیم و ئـیحتیرام ئـەمە بـیٚ، بـەخشش و خـەڵات
داخــۆ چــیە و چـەها بـووە یـا واهـیبی مـوبین![٥٣]

---

(٥١) سیدرە: درەختێکە لای راستی عەرشەوە مـەلائیکە لێی لانـادەن. رەفرەف: فـەرش و شینایی و هەرچی رابخرێ. لێرەدا مەبەست شتێکە پێغەمبەر لای سیدرەوە سواری بووە و پێی چووەتە حوزووری خوا...

واتـە: ئـەمینداری پـێغـەمبەر تـا لای داری «سـدرةالمـنتهی» حـەزرەتی جـوبرەئیل بـوو. لەوێیشەوە تا حوزووری خوا رەفرەف بوو بە پێش‌خزمەتی و ئەو ئەمانەتەی گەیاندە جێ.

(٥٢) مــەحوی لەم بــەیتەدا لە ئـایەتی: ﴿فَكَـانَ قَـابَ قَـوْسَيْنِ أَوْ أَدْنـىٰ﴾وە کـە هـەندێ لە تەفسیرکەرەوەکانی قورئان وایان مەعنا لێداوەتەوە کە واتە ئەوەندەی دوو کەوانی تیر یا کەمتر لە خواوە دوور بوو، «قابَ قَوْس»ی خواستووە و کردوویە بە ناوی شوێنێك و «أو أدنی»یشی خواستووە و کردوویە بە ناوی کۆشکێك کە خوا پێغەمبەری بانگ کـردبێ لەوێ بـیبینێ، وە بینینەکەی خوایشی داناوە بە خۆراکی ئەو زیافەت و میواندارییەی خوا بۆ پێغەمبەری ئامادە کردبوو. دیارە ئەم نزیکییەی ئەم بەیتە باسی لێ دەکا کینایەیە لە نـزیکی مـەعنەوی، ئـەگینا وەنەبێ خوا ماددە و جیسم بێ تا بوترێ پێغەمبەر ئەوەندە مەسافەی مابوو بگاتە حوزووری خوا یا ئەوەند لێیەوە دوور بوو. ئەم ئیستیعارەیە، لەوەوە هاتووە وەختی خۆی دوو سەرکردەی عەرەب پەیمانیان لەنێوانی خۆیاندا ببەستایە بۆ دۆستایەتی ئەوەندە دەهاتنە نزیکی یەکـەوە بەقەدەر دوو کەوانی تیر ماوەیان لەنێواندا بمێنێ. جا لێرەشدا ئەم تەعبیرە بەکار هێنـراوە بـۆ گەیاندنی مەعنای نزیکی پێغەمبەر لە خواوە.

(٥٣) واهیب: بەخشندە. موبین: روونکەرەوە.

واتە: مادەم خوای گەورە بەم هەموو رێز لێ گرتنەوە پێغەمبەری بانگ کردبێ بۆ خزمەتی خۆی، دەبێ چ خەڵات و بەرات و بەخششێکی گرانبەهای دابێتێ!.

روخسەت درا گەڕایەوە پڕبار و پڕ نەسیب
دا پڕ بکا لە نووری خودا، وەك سەما، زەمین(٥٤)

هەر چاوی سەر بوو هەرچی غەرایب کە دیویە
وەك عەرش و کورسی و حەمەلە و وەك موقەڕڕەبین(٥٥)

وەك ئەنبیا، مەقامی هەموو لا لە ئاسمان
دۆزەخ بەهەشت ئەوانە بەهەشتین و دۆزەخین(٥٦)

ئەم چوون و سەیر و هاتنەوە سەیرە، موددەتی
سەر هەڵبڕین و خستنەوەی باز ئەسەر سەرین(٥٧)

---

(٥٤) دا: تا.

واتە: پاش ئەوە ڕێگای درا هەر بەو شەوە بگەڕێتەوە، تا وەك ئاسمانی پڕ کرد لە نووری خوا، زەویشی لێ پڕ بکا. کە گەڕایشەوە بە بار و بەهرەیەکی زۆرەوە گەڕایەوە. مەبەست لەم بار و بەهرەیە ئەو هەموو قەدر و ڕێز لێ گرتنەیە کە لە حوزووری خوادا پێشوازی پێ لێ کرا...

(٥٥) غەرایب: جەمعی «غەریب»یە واتە شتی سەیر. حەمەلە: جەمعی «حامیل»ە واتە هەڵگر. مەبەست لەو مەلائیکەتانەیە کە عەرشی خوایان هەڵگرتووە. موقەڕڕەبین: ئەو مەلائیکەتانەی زۆر لە بارەگای خواوە نزیکن.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوە.

(٥٦) واتە: پێغەمبەر هەر شتێکی سەیری دیوە لەو سەفەری میعراجەیدا هەمووی بە چاوی سەر دیوە. ئەو شتانەش وەك عەرش و کورسی و مەلائیکەتە عەرش هەڵگرەکان و ئەو مەلائیکەتانەی لە بارەگای خواوە نزیکن و پێغەمبەرەکان و پایەیان لە ئاسماندا و ئەو کەسانەی دەچنە بەهەشت و ئەوانەی دەچنە دۆزەخ، وەك لە چیرۆکی میعراجدا بەدرێژی باسی لێ کراوە.

(٥٧) باز: دیسانەوە. ئەسەر: لەسەر

واتە: ئەم چوون و تەماشاکردن و هاتنەوەیە هەر ئەوەندەی پێ چووە سەرێك هەڵبڕی و دیسانەوە بیخەیتەوە سەر سەرین.

یـا رەب بـە حـەق شـەرافـەتی ئـەو وەقت و سـاعەتە
لەو رەحمەتی عوموومییە ئێمـەش بـەشێ بـەرین![٥٨]

مەجمووعی ئـەنبیا کـە سـەد و بـیست و چـار هـەزار
مەعسوومن و لە ئیرتیکابی مەعاسی هەموو بەرین[٥٩]

عـــەزلی نـــیە پـــەیەمبەر و قـــەت نـــەبوەتە نـــەبی
عــەبد و ژن و پـیاوی دەنـی خـەسڵەت و مـیهین[٦٠]

لوقـــمان ئـــەوا دیـــارە حـــەکـیمێکـی پـاکـە، «ذو الْ
قَرنَین»ە شـاهی چـاکـە، بـە قـەتعی مـەڵێ نـەبین[٦١]

ئـــیعجازی ئـــەنبیاو و کـــەرامـــاتی ئـــەولیا
بـــێ شـــوبهە سـابیتن، بـە سـوبووت بـبێ یـەقین[٦٢]

---

(٥٨) بە حەق: بۆ خاتری.

(٥٩) چار: چوار. مەعسووم: بێ گوناھ. ئیرتیکاب: تووش بون: مەعاسی [«معاصی»]: جەمعی «معصیت»ە واتە گوناھ بەری: بێ بەش و پاك.

واتە: تێکڕای پێغەمبەران کە ژمارەیان ١٢٤ هەزار کەسە، پێش پێغەمبەریەتی و پاش پێغەمبەریەتییان لە کوفر و لە گوناهی گەورە پاك بوون و چ بە دەستەنقەست و چ بە هەڵە رووی نەداوە لێیان، هەروەها لە هەر گوناهێکی بچووکیش کە پەستی و نزمی بگەیێنێ.

(٦٠) نەبی: ئەو پێغەمبەرەی فەرمانی ئەوەی نەدرابێـتێ پـەیامی خـوا بگـەیەنێ بـە خـەڵك. خەسڵەت: رەوشت. میهین: سووك.

واتە: پێغەمبەر هەرگیز لە پێغەمبەریەتی لانابرێ و بەندە و ئافرەت و پیاوی سووك نابن بە پێغەمبەر.

(٦١) لوقمان: حەکیمێکی ئەفسانەییە رێگای چاکـەی پیشانی خـەڵك داوە. سـوورەتێکـی قـورئان بـە نـاوی ئـەوەوەیە. «ذُوالقـرنین»: لەقـەبی ئـەسکەندەری مـەکـدۆنییە. هـەندێ لە تەفسیرکەرەوەکانی قورئان دەڵێن ئەو «ذُوالقَرنَین»ەی نـاوی لە قـورئاندا هـاتووە هـەر ئـەمە. هەندێکیشیان دەڵێن یەکێکی ترە.

(٦٢) ئیعجاز: موعجیزە، ئەو شتە لە عادەت بەدەرەیە کە خوا بۆ پێغەمبەرانی دەکا بۆ بەریەرج دانەوەی قسەی ئەوانەی باوەڕیان پێ ناکەن. کەرامەت: ئەو شتە لەعادەت بەدەرەیە کە خوا بۆ دۆستانی خۆی دەکا بۆ بەرزکردنەوەی پایەیان. ئەولیا: جەمعی «وەلی»یە واتە دۆستی خوا.

هـــیچ ئـــەولیا بـــە مـــەرتەبە نـــاگـــاتە ئـــەنبیا
«إذْ هُـــمْ مُـــفَضَّلُونَ عَـــلىٰ جَـــمْعِ عـــالَمِين»(٦٣)

بەعدی نـەبی چ شـەك و چ شـوبهەت نـەبێ لەسـەر
تـەرتیبی ئـەفزەلی خـولەفای ئـەڕبـەعەی گـوزین(٦٤)

«صدّيق»ە ئـەفزەل ئـەووەل و، «فـاروق»ە سـانی ئـەو
«ذِى النُّور»ە نووری سییوم و، «کـرّار»ە چـارەمین(٦٥)

«صـــدّيقه» زاتـــو فـــەزڵە لە بـــەعزێ خـــوسووسەوە
«زهرا» ئـەگـەرچـی زوهـرەیە بـۆ ئـاسمانی دیـن(٦٦)

---

(٦٣) واتە: هەرچەند ئەولیایش خوا شتی لە عادت بەدەریان بۆ دەکا، بـەڵام نـاگـەنە پـلەی پێغەمبەران، چونکە پێغەمبەران لە هەمووکەس گەورەترن.

(٦٤) بەعد: پاش. خولەفای ئەڕبەعە: «ئەبوبەکر» و «عومەر» و «عوسمان» و «عەلی». گوزین: هەڵبژاردە.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٦٥) سییوم: سێهەم. چارەمین: چوارەم.

واتە: باوەڕت وابێ ئەبوبەکری سددیق و عومەری فـاروق و عـوسمانی «ذیالنّـورین» و عەلی کوڕی ئەبوتالیب، لە پاش پێغەمبەر (د.خ)، بەڕیز لە هەموو موسوڵمانانیتر گەورەترن و پایەیان لای خوا لە هەموان بڵندترە.

بۆیە بە «ابوبکر» دەڵێن «سددیق» چونکە لە پیاوانا بەر لە هەمووکەس باوەڕی بە پێغەمبەر کردووە. «عمر»یش بۆیە پێی دەڵێن «فاروق» چونکە گەلێجار بیروڕای ئەو راست و چەوتی لەیەك جوێ کردووەتەوە و ئایەت بەگوێرەی رای ئەو هاتووە. «عوسمان»یش بۆیە پێی دەڵێن «ذیالنّورین» چونکە دوو کچی پێغەمبەری (د.خ) هێناوە. «علی»یش بۆیە پێی دەڵێن «کرّار» چونکە گەلێجار لە غەزادا دووبارە و سێبارە هێرشی بردووەتە سەرکافران.

(٦٦) «صدّيقه»: لەقەبی حەزرەتی «عائشە»ی کچی «ابوبکر»ە کە خێزانـی پـێغـەمبەر بـووە. «زهرا، زَهراء»: لەقەبی حەزرەتی «فاطمە»ی کچی پێغەمبەرە. زوهرە: ئەستێرەی زوهرە.

واتە: هەرچەند «فاطمە» وەك ئەستێرەی زوهرە وابووە بە ئاسمانی دینەوە، بەڵام «عائشە» لە هەندێ رووەوە لەو پایە بڵندترە.

ئەم شەش کەسە حەبیبی حەقن بە حەق
هەرکەس کە مونکیرە لە خیتامی مەبە ئەمین[٦٧]

ئەفزەل لەپاش ئەمانە شەشەی باقییە لە دە
هەر ئەو دەیە موبەششەرەن ئەمڕۆ کە جەننەتین[٦٨]

وەك «بوعُبَیْدَە»، «طَلحة»، «زُبَیْر» و «سَعید» و «سَعْد»
هەم «ابْنُ عَوف»ە «بَعْدَهُم» ئەسحاب و تابیعین[٦٩]

یا ڕەب لە تۆوە ڕەحمەت و ڕیزوانی بێ درێغ
نازڵ ببێ هەمیشە «عَلیٰ کُلٍّ اجمَعین»![٧٠]

---

(٦٧) واتە: ئەم شەش کەسە خۆشەویستی پێغەمبەرن کە خۆشەویستی خوایە. هەرکەسیش ئینکاری ئەم ڕاستییە بکا، نابێ لەوە ئەمین بین کە دەردەبا و لەو دنیا بێ ئیمان نابێ.

لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا لە بەرابەری «مونکیرە»دا «باغیضە»یش نووسراوە.

(٦٨) موبەششەرە: موژدە پێدراو بە بەهەشت، «العشرة المبشرة».

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٦٩) واتە: لەپاش هەر چوار خولەفای ڕاشیدین و حەزرەتی «عائشە» و «فاطمە»ی زەهرا، گەورەترینی موسوڵمانان ئەو شەش کەسەن و دەمێننەوە لەو دە کەسەی کە پێغەمبەر موژدەی بەهەشتی داونەتێ کە «ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح» و «زوبەیری کوڕی عەوام» و «تەلحەی کوڕی عوبەیدیللاهـ» و «سەعیدی کوڕی زەید» و «سەعدی کوڕی ئەبووەققاس» و «عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف»ن. ئەو چوار کەسەکەی‌تر خولەفای ڕاشیدینن کە باسمان کردن. پاش ئەم دوازدە کەسەیش باقی ئەسحابەکانی پێغەمبەر و تابیعین کە ئەوانەن ئەسحابەیان دیوە، لە هەموو موسولمانانی‌تر گەورەترن.

لەم بەیتەی مەحوییەوە وادەردەکەوێ «عائشە» و «فاطمە» کە لە عەشەرەی موبەششەرە نین، لەم شەش کەسەی دوایی دە کەسەکە گەورەتر بن، بەڵام ئەوەی لە ئوسووڵی دیندا باس کراوە وا نیە.

(٧٠) ڕیزوان [«رِضوان»]: ڕەزامەندی. «علی کلٍّ اجمعین»: لەسەر هەموان بە تێکڕا.

لەعـــــنەت مــــەكـــــە بــرا لە يــەزيد و ڕەوا نـــيە
«شَرعاً» كـە ئـێمـە مـلكەچی شیری شـەریعەتین(٧١)

ئـــــيمانی مـــــوعتەبەر بگــــــرە، ئــــەو مــــوقەلليدە
تـــەقليدی فـــەيزيابە بـــە جـــەزمييەت و يـــەقين(٧٢)

هـــەركەس كـــە ژيـــر و عـــاقڵە عـــوزری نـيە و، نـيە
عيلمی نەبێ بە خاليقی چـەرخ و كـورەی زەمـين(٧٣)

(٧١) یەزید: کوڕی موعاویە، ئەوەی حەزرەتی حوسەین لە شەڕی ئەودا کوژراوە.

واتە: مادەم ئێمە ملکەچین بۆ شمشێری شـەریعەت، نـابێ لەعنەت لە یـەزیدی کـوری مـوعاویە بکـەین، هـەرچـەند سـوپای ئـەو حـەزرەتی حـوسەین و ژمـارەیەکـی زۆریـان لە موسوڵمانان کوشتووە، چونکە ئێمە لامان وایە موسوڵمان بە گوناهـ کافر نابێ و لەعنەتیش لە ئەهلی قیبلە دروست نیە. زیاد لەوە کە ئیسپات نەبووە ئەو فەرمانی ئەو کارەساتەی دابێ و بە حەڵاڵی زانیبێ و، پاش ئەوەیش بینراوە لەناو موسوڵماناندا نوێژی کردووە. ئەگـەر بـیشڵێین فەرمانی ئەو کارەساتەی دابێ و بە حەڵاڵی زانیبێ، دوور نیە پاشان پەشیمان بوویێتەوە و تۆبەی کردبێ...

(٧٢) موعتەبەر: بۆ حسێب کراو. موقەللید: ئەوەی چاو لە کەسێکی تر بکا. فەیزیاب: بەختەوەر. جەزمییەت: بێ دوودڵی.

واتە: ئەو کەسەیش کە لە ڕێگای زانایی و تێگـەیشتنی خـۆیـەوە نـا، بـەڵکـوو لە ڕێگـای چاولێگەری موسوڵمانانی ترەوە باوەڕی بەخوا کردبێ، ئیمانی بە دامەزراو دادەنرێ و گومانی تێدا نیە کەوا چاولێگەرییەکەی دەیگەیەنێتە بەهەشت...

مەحوی بەم بەیتە ئیشارەت بۆ ئەو خیلافە دەکا کە لەنێوان زانایانی ئوسووڵی دیندا هەیە کەوا ئاخۆ ئیمانی موقەللید دادەمەزرێ یا نە.

(٧٣) واتە: مەسەلەی باوەڕ بە خوا ئەوەندە ئاشکرایە لەوانەیە بڵێین کەس بە چـاولێکـەری موسوڵمان نەبووە، چونکە هەرکەسێ ژیر و عاقڵ بێ و تۆزێ ورد بیێتەوە خوا دەدۆزێتەوە و ئیمان دەهێنێ و، کەسێ نیە نەزانێ ئەم دنیایە کەسێك لە نەبوون دروستی کردووە...

تەوبەی بە وەقتی غەرغەرە، ئیمانی حاڵی یەئس
مەردوودە، بەو رەویە خودا موبتەلا نەبین![٧٤]

ئەعمالی چاکە دەخڵی بە ئیمانەوە نیە
ئەمما کەمالی هەر بەوە ئیمانی موتتەقین[٧٥]

موئمین نەبۆتە کافر و مورتەد بە فیعلی بەد
گەر قەتڵ، ئەگەر زینایە، ئەگەر زوڵم، ئەگەر دزین[٧٦]

ئەمما بە دڵ بکا نییەتی کوفر و عەزمی شیرك
کافر دەبێ هەر ئەو نەفەسە و دەردەچێ لە دین[٧٧]

---

(٧٤) غەرغەرە: گیانەڵا. یەئس: ناچاری. مەردوود: دراوە دواو پەسەند نەکراو. رەویە: رێباز و رەوشت.

واتە: پەشیمان بوونەوە لەکاتی گیان دەرچووندا یا لەبەر ناچاری و لە ترسدا بایەخی نیە، خوا تووشی شتی وامان نەکا!.

(٧٥) موتتەقین: ئەوانەی خۆیان لە گوناهـ دەپارێزن.

واتە: کرداری چاك نە بەشێکە لە باوەڕ و نە مەرجی باوەڕە، چونکە باوەڕ باوەڕکردنە بە دڵ بەو ئایینە کە خوا بە پێغەمبەردا بۆ ئادەمیزادی ناردووە و هەرکەس ئەم باوەڕەی هەبوو بە خاوەن باوەڕ دادەنرێ با پێویستییەکانی باوەڕیش جێبەجێ نەکا یا کردەوەی خراپی لێ بوەشێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی تەواو بەوە دەبێ کە خاوەن باوەڕ چاکە بکا و خۆی لە خراپە دوور بگرێ.

(٧٦) مورتەد: ئەوەی لە موسوڵمانەتی وەرگەڕابێتەوە.

واتە: موسوڵمان بە کردەوەی حەرام کافر نابێ و لە دین دەرناچێ، هەرچەند کردەوە حەرامەکە لە گوناهە گەورەکانیش بێ.

(٧٧) شیرك: هاوڕێ بۆ خوا دانان.

واتە: ئەگەر موسوڵمان بە دڵ نیازی کافر بوون و هاوبەش بۆ خوا دانان بکا، دەسبەجێ بەو نیازەی لە دین دەردەچێ.

گـــەر لەفـزی کـوفری بـێ بـە زوبـانا لەپـڕ بـە تـەوع
کـافر بـووە ئـەگـەرچـی هـەموو حـەقیە دڵنشـین[(٧٨)]

سەرخۆش ئـەگـەر قسـە و هـەزەیاناتی کـوفری کـرد
کـــافر دەبـــێ بـــە مـەزهەبی ئـێمـە کـە شـافیعین[(٧٩)]

ئەمما بە مەزهەبی حـەنەفی کـەین ئـەگـەر روجـووع
تـەکـفیری نـاکـرێت و بـە مـورتـەددی نـاگـرین[(٨٠)]

مـــەعدووم ئـــەوا دیـــارە نـــە شـــەیئە و نـە مـەرئییە
مـەبیە قسـەی ئـەوانـە کـە هـەمکێشـی فـەلسەفین[(٨١)]

---

(٧٨) تەوع: ئارەزوو. دڵنشین: ئەوەی لە دڵدا بێ.

واتە: ئەگەر کوفریش بە ئارەزووی خۆی بێ بە زوبانیا، هەروا کافر دەبێ، هەرچەند بە دڵیش باوەڕی بەو کوفرە نەبێ کە بە زوبانیا هاتووە.

(٧٩) هەزەیان: قسەی پڕوپووچ.

مەعنای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پاشەوەیدا دێ.

(٨٠) واتە: بەپێی مەزهەبی شافیعی موسوڵمان بەوە کافر دەبێ کە لە حاڵەتی سەرخۆشیدا کوفر بکا، چونکە مادەم بە دەستی خۆی کارێکی وای کردووە سەرخۆش ببێ، هەموو ئەنجامێکی ئەو سەرخۆشییەی دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام بە مەزهەبی حەنەفی کافر نابێ چونکە لەبەر هەر هۆیەك بێ، خۆ دیارە سەرخۆشە و عەقڵی لای خۆی نیە.

لە نوسخەیەکی دەستنووسی مەحوی خۆیدا نیوەی دووهەمی بەیتی پێشوو و نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە نیە و لە هەردوو نیوەکەی‌تریان تاقە بەیتێك پێك هاتووە.

(٨١) مەعدووم: نەبوو. شەیء: شت. مەرئی: بینراو. هەمکێش: هاومەزهەب.

واتە: ئەهلی سونەت لایان وایە کەوا ئەوەی ئێستا نەبێ، بەڵام لەوانەبێ پەیدا ببێ، نە بە «شت» و نە بە «بینراو» دانانرێ، چونکە شتێ کە نەبێ، ئاساری لێ پەیدا نابێ. بەڵام هەندێ لە موعتەزیلە و فەیلەسووفەکان بە «شت»ی ناودەبەن. راستەکەی ئەگەر مەبەستیان لەو شتیەتییە بوون بێ لە زیهنا، ئەوە دیارە هەیە، ئەگینا قسەکەیان بێ‌شوێن و ناڕەوایە.

غەیری یەکن موکەووەن و تەکوین «إِلَی الأَبَد»
مومکین نیە سەبەب بە موسەبیەب بڵێ یەکین[(٨٢)]

رزقە وەکوو حەڵاڵەکە، شوبهە و حەرامی سیرف...
بەحسێکەیە کە زەهرە ئەم، ئاخر، ئەو ئەنگەبین[(٨٣)]

---

(٨٢) موکەووەن: دروستکراو. تەکوین: دروستکردن. موسەببەب: ئەوەی بەهۆی شتێکەوە پەیدا بووبێ.

مەبەست لەم بەیتە ئەوەیە بەپێی مەزهەبی ئیمام «ئەبوو مەنسووری ماتوریدی» خوای گەورە بێجگە لەو حەوت سیفەتەی باسمان کردن سیفەتی «تەکوین»یش هەیە کە بریتیە لە دروستکردن و، دروستکردنی هەر شتێ بە سیفەتی «تەکوین» دەبێ. جا هەندێ لە زانایان رەخنەیان لەمە گرتووە و وتوویانە ئەگەر دروستکردن سیفەتی خوا بێ و، دیارە سیفەتەکانی خوایش قەدیمن و دروستکردنیش بێ دروستکراو نابێ، دەبێ ئەم عالەمە قەدیم بێ کە ئەمەیش پێچەوانەی باوەڕی کۆمەڵی موسوڵمانانە. وەڵامی ئەم رەخنەیەیش ئەوەیە دروستکردن سیفەتی خوایە و هۆی پەیدابوونی عالەمە و، دروستکراو مەخلووقی خوایە و موسەببەبە، دیارە سەبەب و موسەببەبیش جیان لەیەك. کەواتە ئەگەر دروستکردن سیفەتێکی تایبەتی بێ غەیری توانین، پێویست ناکا دروستکراوەکان قەدیم بن و، هەر دروستکراوێك لەکاتی خۆیدا پەیدا دەبێ. بەڵام ئەشعەرییەکان لایان وایە دروستکردن سیفەتێکی سەربەخۆ نیە، بەڵکوو بریتیە لە پەیوەندبوونی توانای خوا بە هەر دروستکراوێکەوە و توانای خوا دوو پەیوەند بەستنی هەیە بە هەر دروستکراوێکەوە، یەکێکی کۆن کە پێش دروستکردنی ئەو شتەیە و یەکێکی تازە و پەیدا بوو کە لەگەڵ دروستکردنی شتەکەدا پەیدا دەبێ و، لەم توانا بەولاوە بۆ دروستکردنی هەر شتێ هیچ سیفەتێکی تر پێویست نیە.

(٨٣) ئەنگەبین: هەنگوێن.

واتە: بەپێی پێڕەوی ئەهلی سوننەت هەرچی بخورێ و بپۆشرێ بە رۆزی دادەنرێ، حەڵاڵ بێ یا حەرام بێ و حەڵاڵی و حەرامی ئەو رۆزییە باسێکی ترە. بەڵام موعتەزیلەکان ئەوەی حەرام بێ بە رۆزی دانانێن.

لەم نـــۆش و نـێشـە حـینی سـوئال و جـوابـی قـەبر
وەقتی حیساب و وەزنی عـەمەل بـاخەبەر دەبـین(٨٤)

مــردوو کـە گـەییە قـەبر و مـەقەڕڕی، سـوئالی لێ...
دەکرێ لە رەبب و بەڵکـی لە پـێغـەمبەر و لە دیـن(٨٥)

هــەرکەس جــوابــی دا بــە جــوابێکـی بـاسەواب
خـــێراتـــنی دەکـــەن لە تــەرەف «خَـیْرَ مُـنْزِلینَ»(٨٦)

گـــەر وا نـــەبوو جـــوابـی ـ خـودایـا بـە تـۆ پـەناه!ـ
زنجیر و تـەوق و رەوق و عـەزابـی بـووە قـەرین(٨٧)

---

(٨٤) نۆش: خۆشی، خواردنەوە. نێش: چزوو، ئازار. حین: کات. وەزن. کێشان.

واتە: پاش چوونە قەبر و لە رۆژی قیامەت و کاتی کێشانەکردنی کردەوەی چاکە و خراپەی بنیادەمدا دەردەکەوێ رزقی حەڵاڵ نۆشی گیان بووە و رزقی حەرام مایەی ئازار و سزای گیانە. مەحوی لەم بەیتەدا ئەوەیشی گەیاندووە کـەوا لە قـەبریشدا سـزای ئـەو کـەسانە دەدرێ کـە کردەوەیان خراپ بووە، وەك لە حەدیسدا هەیە.

(٨٥) مەقەڕ: جێگا. رەب: خوا.

واتە: مردوو کە نرایە قەبر و گەیشتە جێی حەقی خۆی، مەلائیکە دێنە سەری لەبارەی خوا و پێغەمبەر و ئایینەوە پرسیاری لێ دەکەن.

(٨٦) «خیر منزلین»: باشترین کەسێك کە خەڵك لای خۆی راگرێ، مەبەست خوایە. ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿وَ قُلْ رَبِّ أَنْزِلْنِي مُنْزَلاً مُبارَكاً وَ أَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ﴾ کە خوا بە حـەزرەتی نـووح دەفەرموێ: بڵێ خوایە لە کەشتییەکە بمهێنە خوارەوە و لە شوێنێکی پیرۆزدا دامبەزێنـە، تـۆ چاکترین کەسێکی کە خەڵك لای خۆت دابگری و گلیان بدەیتەوە.

واتە: ئەگەر باشی وەڵام دایەوە لەلایەن خواوە بەخێرهاتنی لێ دەکرێ.

(٨٧) رەوق: بە وردی مەعنایمان بۆ ساغ نەکرایەوە. تەنها ئەوەندە هەیە بە عەرەبی بـەمەعنا «لافاو» هاتووە کە لەوانەیە بۆ ئەو شوێنە دەستبدا.

ئەگەر وابێ «رەوقی» بێ. [بە رای من ئەو «رەوق»ە هەڵەیە و ئەبێ «رق» بێ بە مانا «رق و قین و غەزەب» کە باشتر بۆ ئەم جێگایە دەست دەدا. والله اعلم. «ع.ح»] قەرین: هاودەم.

تـــا «يَـــوْمَ يُـــبْعَثُ» کـــە بـــەپاکـــردنە لە قـــەبر
بـــۆبـــردنە حـــوزووری شـــەهەنشاهی رۆژی دیـــن(٨٨)

دیـــــوانـــــی گـــــیروداری حـــیسابی عـــوموومییە
حەیوان و جینن و ئینس و مەلەك، تا موقەڕڕەبـین(٨٩)

چەپڕەو کوتوب بە دەستی چەپ، ئەمما «وَ راءَ ظَـهر»
بـــــۆ راســـــتانی کـــــارە، لە کـــارایـــە راســـتین(٩٠)

وەزنـــی عـــەمەل، چ زەڕڕە، چ کـــۆهـ و چ بـــەد، چ نـــێك
بـــێ شـــوبهەیە هـــەموو بـــە تـــرازوو دەکـــێشـــرێن(٩١)

---



واتە: ئەگەر ـپەنا بە خواـ نەیشیزانی وەڵامی مەلائیکەی پرسیار بداتەوە، دەس دەکرێ بە سزادانی.

(٨٨) «یوم یُبعَث»: ئەو رۆژەی زیـندوو دەکـرێتـەوە، مـەبەست رۆژی قـیامەتە. بـەپاکـردن: هەڵساندنەوە. رۆژی دین: رۆژی تۆڵە و پاداشدانەوە.

(٨٩)گیرودار: بگرە و رابگرە. مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٩٠) چەپڕەو: ئەوەی رێی راستی نەگرتبێتەبەر. «وراء ظهر»: لە پشتەوە.

واتە: رۆژی قیامەت دیـوانـی مـوحاکـەمەکـردنی ئـادەمیزاد و گـیانلەبەران و جـنۆکـە و مەلائیکەتەکانە. ئەوەی کردەوەی چاك بووبێ و رێگای راستی گرتبێتـەبەر، نـامەی کـرداری خۆی لە پشتەوە دەدرێتە دەستی راستی. ئەوەیش کردەوەی بـەد بـووبێ و رێگـای چـەوتی گرتبێەبەر، نامەی کرداری خۆی دەدرێتە دەستی چەپی.

(٩١) زەڕڕە: تۆسقاڵ. کۆهـ: کێو. نێك: چاك.

واتە: کردەوەی چاك و خراپی هەرکەس کێشانە دەکرێ، چ تۆسقاڵێك بێ و چ ئەوەندەی کێوێك.

«مَـــنْ خَـــفَّت»ە لە هـاوییە دەخـوا بـە مـەن خـەفەت
عەیش و نیشاتی «مَنْ ثَقُلَتْ» وەسڵی حووری عین(٩٢)

«حَـــتْماً» دەبـــێ گـــوزەر بـە «سـیرات»ا بکـەن هـەموو
چاك و خراپ و، مـوئمین و کـافر، کـیهـ و مـیهین(٩٣)

پـــــردێکـــــە راکشــــاو بـــەسەر بـــانی دۆزەخـــا
بـــاریك و تـــیژە وەك دەمـــی تـیغێکی ئـاهینین(٩٤)

هەرکەس کـە خـوارە، وەیـلییە، زوو کـەوتە خـوارەوە
«طُـــوبیٰ» لەبـــۆ ئـــەوانـە کـە ئـازانـە تـێپـەڕیـن!(٩٥)

---

(٩٢) «مَن خفَّت»: ئەوەی سەنگی کردەوەی چاکی سووك بێ. ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿وَ أَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوٰازِينُهُ، فَأُمُّهُ هٰاوِيَةٌ﴾ واتە: ئەوەی تای تەرازووی کردەوەی چاکی سووك بێ، ئاگری گەرمی دۆزەخ جێیەتی. ﴿مَنْ ثَقُلَتْ﴾: ئەوەی سەنگی کردەوەی چاکی قورس بێ. ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوٰازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رٰاضِيَةٍ﴾ واتە: ئەوەی تای ترازووی کردەوەی چاکی قورس بێ، ئەوە بە خۆشی بۆ خۆی رادەبوێرێ.

واتە: ئەوەی تای ترازووی کردەوەی چاکی سووك بێ، لە ناخی دۆزەخدا بە مەن خەفەت دەخوا. ئەوەیش تای ترازووی کردەوەی چاکی قورس بێ خەریکی رابواردن دەبێ بە گەیشتن بە حۆرییە جوان و سپیەکانی بەهەشت.

لە نێوان «مَنْ خَفَّتْ» و «مەن» و «خەفەت»دا جیناسێکی تەواوی جوان هەیە.

(٩٣) سیرات [«صراط»]: پردێکە لە موو باریکتر و لە ئەڵماس تیژتر بەسەر جەهەننەمەوە. کیهـ: بچووك. میهین: گەورەتر.

(٩٤) ئاهینین: ئاسنین.

ئەم بەیتە «سیرات»مان بۆ روون دەکاتەوە کە چیە و، پەیوەندی بە بەیتی پێشووەوەیە.

(٩٥) خوار: ئەوەی کردەوەی خراپ و چەوت بێ. وەیلی: دانیشتووی وەیل کە شیوێکە لە دۆزەخدا. «طوبیٰ»: خۆزگە. ئازانە: ئازایانە.

لە دەستخەتێکی مەحوی خۆیدا لە بەرابەری «طوبی لەبۆ ئەوانە»دا «طوبیٰ لهم ئەوانە»یش نووسراوە.

ڕێی سـی هـەزار سـاڵە، وە یـا پـازدە هـەزار
موحتاجی عەونە ئوممەتی بێچـارە، یـا مـوعین![96]

لەو ڕۆژەدا شـەفاعەتی چـاکـانە جـێی ئـومێد
بـۆ عـاسییان و ئـەهلی کـەبائیر لە مـوئمینین[97]

بـێ‌شـوبهە ئـەنبیا، عـولەما، ئـەولیا، شـەهید
مـەقبووڵە بـۆ شـەفاعە پـەنایان ئـەبەر بـەرین[98]

تـەئسیری قـەتعییە بـە دوعـا بـاوەڕت بـبێ
«اُدْعُوني اسْتَجِبْ» وەکوو گەوهەر لە گـوێ گـرین[99]

---

(٩٦) عەون: یارمەتی. موعین: یارمەتی‌دەر.

واتە: پردی باریك و لە تێغی ئاسن تیژتری «سیرات» ئەوەندە درێژە هەندێك دەڵێن بە سی هەزار ساڵ و هەندێکی‌تر دەڵێن بە پازدە هەزار ساڵ دەبڕێ... ئەگەر خوا بە لوتفی خۆی یارمەتی بەندە نەدا هەرگیز ناتوانێ بەسەریا گوزەر بکا...

(٩٧) شەفاعەت: تکا. کەبائیر: جەمعی «کبیرە»یە واتە گوناهی گەورە. موئمینین: موسوڵمانان.

واتە: ئەوەی جێگای هیوا و ئومێد بێ لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی لە دنیادا گوناهی گەورەیان کردووە، تەنها هەر تکای پیاوچاکانە لای خوا.

(٩٨) واتە: پەنابردنە بەر پێغەمبەران و زانایان و دۆستانی خوا لەو ڕۆژەدا بۆ تکاکردن لای خوا شتێکی پەسەندە و گومانی تێدا نیە.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەم‌جۆرەیش نووسراوە:

بێ شوبهەیە نەبی و وەلی، عالم و شەهید

(٩٩) «ادعوني استجب»: داوام لێ بکەن بەدەنگتانەوە دێم.

واتە: باوەڕت بە دوعای خێر هەبێ چونکە کارکردنی دوعای خێری خاسانی خوا شتێکی ڕستە و خوا خۆی فەرموویەتی داوام لێ بکەن بەدەنگتانەوە دێم و، دەبێ ئێمەیش ئەو قسەی خوایە هەمیشە لە گوێماندا بزرنگێتەوە وەك بڵێی گوارەی گەوهەرە و لە گوێمان کردووە.

خـــالیق وتـــوویە: حـــادیسە عـــالەم، قســـەی «هـەیوو-
لي» توڕڕەهـــاتە، گـــوێ لە پـــڕوپـــووچی نـــاگـــرین(١٠٠)

جەننەت، جەهەننەم ئێستە کە هەن، زۆریـــان بـەسەر...
دا ڕۆییوە شوهوور و دوهوور، ئەزمینە و ســـینین(١٠١)

ئـــــەم دۆزەخ و بـــەهەشتە دەمـــێنـــن «إِلَــی الأَبَـــد»
هـــەم تـــێشـــیا دەمـــێنـــنەوە ئـــەهلی ئـــان و ئـــین(١٠٢)

ئـــیمانی بـــوو، نـــەجاتی دەبـــێ، هـــەر ببێ، لە نـــار
قوربانی لوتف و مـەرحـەمەتی «خَـیْرِ راحِـمِین»(١٠٣)

---

(١٠٠) هەیوولی: ئەوەی باوەڕی بە «هەیوولا» هەیە. هەیوولا: ماددەی یەکەم کە سـەرەتای هەموو ماددەکانە.

واتە: خوا فەرموویەتی ئەم دنیایە نەبووە و من لە نەبوون دروستم کردووە. کە واتە قسەی فەیلەسووفەکان کە دەڵێن ماددەیەکی کۆن سەرەتای هەموو ماددەکانە. قسەیەکی توڕڕەهاتە لای من و، ئێمە گوێ بۆ شتی وا شل ناکەین...

(١٠١) شوهوور: جەمعی «شَهر»ە بەمەعنا مانگ. دوهوور: جەمعی «دَهر»ە بەمەعنا چەرخ. ئەزمینە: جەمعی «زَمان»ە. سینین: جەمعی «سَنة»یە بەمەعنا ساڵ.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(١٠٢) ئان: بە فارسی واتە «ئەو». ئین: بە فارسی واتە «ئەم».

واتە: بەهەشت و دۆزەخ لە مێژە دروست کراون و ئێستا هەن و هەمیشەیش هەر دەمێننەوە و بڕانەوەیان نیە و ئەوانەی دەچنە ناویان لێیان ناچنە دەرەوە، موسوڵمانی گوناهبار نەبێ کـە پاش بەسەربردنی ماوەی سزاکەی دەردەچێ و دەچێ بۆ بەهەشت...

(١٠٣) واتە: ئادەمیزاد هەر ئەوەندە باوەڕی بووبێ بەو شتانەی کە پێویستە باوەڕی پێیان بێ، با گوناهیشی لە ڕادەبەدەر بێ لە دۆزەخ دەردەچێ و دەچێتە بەهەشت...

هــەرچــی وتــوومە حــەققە، هـەموو «مُـجْمَعٌ عَـلَیْه»
مەنسووسی ئـایە، یـا خـەبەری سـادیقی ئـەمین(١٠٤)

***

تــەسدیق و بــاوەڕت بــە دڵ ئــەوجا بـەمانە بـوون
ئـیمانە، هـەر بـەوە دەگـەیێ ئـەوجی «یـؤمِنون»(١٠٥)

ئــــیقراری دەم خـــیلافە تـــیا شــەرتە وەك عــەمەل
یا شەترە؟ موتتەفیق کە لەسەر شەرتن ئەکسەروون(١٠٦)

---

(١٠٤) مەنسووس: بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا وتراو. خەبەر: حەدیس. سادیقی ئەمین: مەبەست لێی پێغەمبەرە (د.خ).

واتە: ئەمەی کە وتم هەموو راستە و ئەهلی سوننەت هاودەنگن تیایدا و بـەپێی نـەسسی ئایەت و فەرموودەی راستی پێغەمبەرە (د.خ).

***

(١٠٥) واتە: ئەگەر بە دڵ باوەڕت بەم شتانە ببێ کە من وتنم، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئیمانت هەیە و هەر بەم باوەڕەت دەگەیتە پلەی ئەوکەسانەی لە قورئاندا لەبارەیانەوە وتراوە: ﴿ یُؤْمِنُونَ بِالْغَیْبِ وَ یُقیمُونَ الصَّلٰوةَ وَ مِمّا رَزَقْناهُمْ یُنْفِقُونَ وَالَّذینَ یُؤْمِنُونَ بِما أُنْزِلَ إِلَیْكَ وَ ما أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَ بِالْآخِرَةِ هُمْ یُوقِنُونَ. أُولٰئِكَ عَلیٰ هُدیً مِنْ رَبِّهِمْ وَ أُولٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾واتە: ئیمانیان بە خوا هەیە و نوێژ دەکەن و لەوەی خوا پێی داون خەرج دەکەن بۆ هەژاران و باوەڕیان بەوکتێبانە هەیە کە خوا ناردوونی بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ و دڵنیان لە رۆژی قیامەت. ئەوانە خوا رێگای پـیشان داون و هەر ئەوانەن لەو دنیا رزگاریان دەبێ.

(١٠٦) شەتر «شطر»: نیوە. ئەکسەروون [«اکثرون»]: زۆربە.

واتە: زانایانی ئوسووڵی دین خیلافیان لەنێواندایە ئاخۆ بە دەماهاتنی شایەتیمان، ئەویش وەك ئەوکردەوانەی پێویستە لەسەر موسوڵمان بیانکا، مەرجی ئیمانداریـیە، یـا بـەشێکـە لە ئیمانداری؟ زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن بەشێك نیە لێی، بەڵکوو مەرجیەتی.

**ئــــیسلامت ئــینقیادە بــە «مــا جــاء بِــهِ النَّــبیّ»**
**ئــەعمالی ســالیحە کــە ئـەساسی سـیان و دوون**[(١٠٧)]

**قــودرەت بــبێ تــەلەففوزە ئــەووەڵ بـە «اَشْـهَدَین»**
**نوێژ و زەکات و ڕۆزە، لەبۆ حەج بە کەعبە چوون**[(١٠٨)]

**ئــیمان ئــەگــەر زیــادەت و نــوقسانی بــۆ بــبێ**
**وەك ئەکسەری ئەشاعیرە قــائیل بـوون بــە بـوون**[(١٠٩)]

---

(١٠٧) ئینقیاد: مل شۆڕکردن، جڵە وکێش بوون.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوە پێکەوە دێ.

(١٠٨) «اَشهدین»: هەردوو «اَشهدُ»وەکە. ڕۆزە: ڕۆژوو.

واتە: وتمان ئیمان باوەڕە بە دڵ بە خوا بە مەلائیکە و بەو کتێبـانەی خـوا ناردوونی بـۆ پێغەمبەران و بە ڕۆژی قیامەت و بە قەزاوقەدەر کە هەمووی لە خواوەیە. ئیسلامەتیش ئەوەتە سەر دانەوێنی بۆ ئەو فەرمانانەی کە پـێغـەمبەر هـێنـاونی لە خـواوە. کـرداری چـاکـەش کـە بنچینەییەکانیان پێنجن، یەکەمیان «أشهد أن لا إله إلّا اللّه و أشهد أنّ محمّداً رسول اللّه» وتنە بۆ ئەوانەی بتوانن بیڵێن و توانای وتنیان ببێ و، پێنج فەرزەی نوێژ و زەکاتدان. حەج کردن بۆ ماڵی کەعبە بۆ ئەوانەی دەسەڵاتیان ببێ و ڕۆژووگرتن.

داڕشتنی مەعنای ئەم دوو بەیتە بەمجۆرە لەسەر بناغەی ئەوەبووکە وشەی «ئەساسی» لە بەیتی پێشوویاندا ڕاست بێ وابێ وەك لە دەستنووسەکانی بەردەستماندا وا نووسراوە. بەڵام ئێمە لامان وایە ڕاستەکەی «ئەساسی» نیە و «ئەساسن»ە. ئەگەر وابێ مەعنای هەرکام لە دوو بەیتەکە بە جیا دێ و ڕەوانتریش دەبێ.

(١٠٩) ئەشاعیرە: ئەوانەی لەسەر پێڕەوی ئیمامی ئەشعەری بەڕێوە دەچن.

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

لە نوسخەیەکی دەستنووسی مەحوی خۆیدا نیوەی دووهەمی ئـەم بـەیتە بـەمجۆرەیش نووسراوە:

جومهووری «اشعریّة» وەکوو قائیلن بە بوون

نـــەقسی بـــە نـــەقسی تـاعەتە، زیـادی بـە دوو شـتە:
یا تاعە، یـا تـەجەللییەکـی بـێچـلۆن و چـوون (١١٠)

بـــەعزێ دەڵێ زیـــادەت و بـــەس، نـــەقسی بـــۆ نـیە
بەعزێکی‌کە موسیڕڕە لەسـەر هـەردوولا نـەبوون (١١١)

بشـــزانـــە هـــیچ و بـــێعـــەمەلە وەك هـــەبا عـــەمەل
بێ نـیەتێکـی خـالیس و ئـیخلاسی ئـەندەروون (١١٢)

بـــــبیەن بـــــە «إِنَّـــــما» وە «اَلإِخـــلاص بِـــالنِّیّات»
هەم نەسسی ﴿مُخلِصِینَ لَهُ الدِّینَ﴾ یا ئـەخوون! (١١٣)

---

(١١٠) تەجەللی: دەرکەوتن. مەبەست لە دەرکەوتنی نووری راستییە بۆ ئینسان بە لوتفی خوا خۆی.

(١١١) موسیڕڕ: سوور.

واتە: خیلاف هەیە لەناو زانایانی ئوسووڵی دیندا. ئاخۆ ئیمان زیـاد و کـەم دەکـا یـا نـە؟ هەندێکیان دەڵێن زیاد و کەم ناکا. هەندێکیشیان دەڵێن تەنها زیاد دەکا. ئەشعەرییەکانیش دەڵێن زیادیش و کەمیش دەکا. کەمکردنی بە کەمکردنی فەرمانبەرداری خوایە و زیادکردنی بە دوو شتە: یا زۆرکردنی فەرمانبەرداری خوا، یا روون بوونەوەی دڵ بە رەحمەتی خـوا کـە ئـێمـە شارەزای چۆنیەتییەکەی نین.

(١١٢) بێ عەمەل: بێ‌کەڵك. هەبا: پڕوپووچ. ئەندەروون: ناودڵ.

واتە: کردەوەی بێ‌نیازی پاك بە هیچ دانانرێ.

وردەکارییەکی جوان لەم بەیتەدا هەیە لە وەسفـکردنی «عەمەل»دا بە «بێ‌عەمەل».

(١١٣) ئەخوون: جەمعی «اخ»ە، بە مەعنا برا.

واتە: براینە! بۆ ئیسپاتی قسەکەمان ئایەتی: ﴿وَ مٰا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللّٰهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ و حەدیسی «إِنَّمَا الأَعْمٰالُ بِالنِّيّاتِ» ببیسن کە یەکەمیان واتە فەرمانی ئەوەیان درابـوویە کـە بـە دڵێکی پاك و خاوێنەوە خوا بپەرستن و دووهەمیان واتە پاداشی کردەوە بە گوێرەی نیازی دڵی خاوەنەکەیەتی.

ئــیخلاس ئــەگــەر ببێ «فَبِها»، گـەر نـەبێ، دەبـێ
کەسبی بکەی بە تەزکییەی ئەخلاق و نەفسی دوون(١١٤)

وابــــەستەیە بــە ســـوحبەتی کــامیل تریٚ لە خــۆت
زیکری دەوام و تـابیعی سـونەی سـەنییە بـوون(١١٥)

هــەر ئـەم خـیسالەیە کـە سـەحابەی کـیرامـی پـێ...
فــائیز بـە مـەرتەبەی «رَضِـيَ اللّـهُ» و «رَضُـوا»ن(١١٦)

هـــەر بـــەم تــەریقە پــێ گــەییون، گــەیونە خـــودا
ئــەو زاتــە عــاریفانە کـە دانـاو و تـێ گـەیوون(١١٧)

روو کـــەینە ئــەم تــەریقە، بــە ئــازانــە مــەش بـرا
تاکەی ئەسیری مەغڵەتەی ئـەفسانەو و فسـوون!(١١٨)

---

(١١٤) «فَبِها»: زۆر چاکە. دوون: سووك و پەست.
مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

(١١٥) وابەستە: بەسراو. سوننە: سونەت. سەنییە: پیرۆز.
واتە: سەیری دڵی خۆتان بکەن، ئەگەر پاك و خاوێن بوو زۆر چاکە. ئەگینا پاکی بکەنەوە و رەوشتی خۆتان چاك بکەن، ئەوەش بە بیرکردنەوە لە خوا و بە شوێنکەوتنی رەوشت و کردەوەی پێغەمبەر و هاورێیەتی پیاوانی خواناس.

(١١٦) خیسال [«خِصال»]: جەمعی «خصلة»یە واتە رەوشت. فائیز: بەختەوەر.
واتە: بەم رەوشتانەیە یارانی پێغەمبەر (د.خ) گەیشتوونەتە ئەو پایەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا لەبارەیانەوە بفەرموێت: ﴿رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَ رَضُوا عَنْهُ﴾، واتە: خوا رازییە لێیان و ئەوانیش لە خوا رازین.

(١١٧) عاریف: خواناس، وەلی.
واتە: ئەولیای خوایش هەر لەم رێگایەوە پێگەیشتوون.

(١١٨) ئازانە: ئازایانە. مەش: ئێمەیش. مەغڵەتە: جێی هەڵەکردن. ئەفسانە: سەرگوزەشتە، زیاتر بۆ پڕوپووچیش بەکاردێ. فسوون: ساختە و جادووگەری و شتی وا.

ڕێگـــەی ســـەعادەتی ئـــەبەدی تـــۆ لەســـەر مـــنە
بیدەم نیشان و، دام و، لەســەر تـۆ بـەڕێوەچـوون (١١٩)

ئـــەم نـــەختە نـەزمە نـوسخەیی ئـیکسیری ئـەعزەمە
حـــیفزی بکـــە، دڵی بـدەرێ، بـیکە ئـەزدەهوون (١٢٠)

بـــیکەیتە بـــەر، دەکـــەیتە بـەر ئـیستەبرەقی بـەهەشت
مەحزووز ئەبی بە حیفزی لە هەولی عەزابی هوون (١٢١)

---



واتە: برادەرینە! تاکەی دیلی هەڵە و قسەی پڕوپووچ بین؟ با ئێمەیش ئازایانە ڕوو بکەینە ئەم ڕێگا ڕاستە.

مەش برا (ن): وەرنەوە.

(١١٩) واتە: پێویستە لەسەر من ڕێگای ڕاست پیشان بدەم و، وا پیشانم دا و پێویستە لەسەر تۆیش بەگوێرەی بجووڵێیتەوە.

(١٢٠) ئیکسیری ئەعزەم: بە قسەی پێشینان گوایە ماددەیەکە تێکەڵی مس بکرێ دەیکا بە زێڕ یا تێکەڵی جیوە بکرێ دەیکا بە زیو. شتی وا تا ئێستا بە زانستدا نەدۆزراوەتەوە. دەهوون: دەهان، دەم، وشەیەکە لە دیالێکتی کوردی «لوڕ»دا.

واتە: ئەم چەند شیعرەی من وەك نوسخەیەکی ئیکسیر وانە، دڵیان بدەرێ و لەبەریانکە و بیانکە بە ویردی سەر زمانت.

(١٢١) ئیستەبرەق: جۆرە کوتاڵێکە تانوپۆی لە تاڵی ئاوریشم و زێڕە. لە قورئانیشدا هەیەکەوا ئەهلی بەهەشت ئیستەبرەق لەبەر دەکەن. مەحزووز [«محظوظ»]: بەختەوەر. هەول: تـرس. هوون: سووکی و سەرشۆڕی.

واتە: ئەگەر ئەم شیعرانـە لەبـەربکەی، دیـارە بـۆیـە لەبـەریان دەکـەی کـە بـەگـوێرەیـان بجووڵێیتەوە. کە بەگوێرەیشیان جووڵایتەوە، بەهەشت جێت دەبێ و پـۆشـاکـی ئـیستەبرەق لەبەردەکەی و بەختەوەر دەبی بەوەکە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزرێی.

وشە ئاراییەکی جوان لە کۆکردنەوەی «بیکەیتەبەر» و «دەکەیتەبەر»دا هەیەکە هەریەکێ مەعنایەکی جیا لە هی ئەویانیانی هەیە.

**یـا رەبـبی ئـەو کـەسانە کـە ئـەمڕۆ لە عـیشقی «مـیم»**
**لەم بەحری «نوون»ەدا وەکوو من غەرقە دەبن و بوون**[(١٢٢)]

**غــەرقی مــوحیتی رەحــمەتی عــوزماتیان بکــەی**
**ئێمەش لەگەڵ ئەوانـە، سبەی «یَـوْمَ یُـحْشَرُون»!**[(١٢٣)]

**«مـەحوی»! خـیتامی بـێنـە بـەیاناتەکـەت بـە مـیسك**
**حەمدی «بِلا خِـتام» و سـەلاتی لە حـەد فـزوون**[(١٢٤)]

---

(١٢٢) لە دیوانە شیعرە کۆنەکاندا هەر کۆمەڵە قەسیدەیەك کە دوا پیتەکانیان یـەك بـوونایە، کۆدەکرانەوە سەرەتایەکیان بۆ دادەنرا و دەیاننووسی «بەحری ئەلف» یا «بەحری بێ».. تـاد. هەروەها بە هەرکام لە ئاوازە جیاوازەکانی شیعری عەرەبیش دەڵێن بەحری فڵان وەك «بەحری رەجەز» و «بەحری رەمەل» و... تاد. میم: مەبەست «محمّد»ە واتە پێغـەمبەر (د.خ). بـەحری نوون: ئەو قەسیدەیەی کـە ئـاخری هـەر بـەیتێکـی پـیتی «نـوون» بـێ وەك ئـەم قـەسیدەیە. ئیشارەتیشە بەو بەحرەی کە ماسی حەزرەتی یۆنسی تیا قووت دا، چونکە «نون» بە عەرەبی بە ماسیش دەڵێن. غەرقە: نوقم.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا لە بەرابەری «نوونەدا»، «نوورەدا»یش نووسراوە.

(١٢٣) موحیت «محیط»: دەریای گەورە. عوزما [«عُظمیٰ»]: گەورە.

واتە: خوایا ئەو کەسانەی ئەمڕۆ وەك من لە عیشقی پێغەمبەردا لەم بەحری «نوون»ەدا نوقم بوون یا دەبن، غەرقی دەریای رەحمەتی خۆتیان بکەی و سبەی لە رۆژی حەشردا ئێمەیش بکەوینە تەکیان.

مەبەست لە «غەرق بوون لە بەحری نوون»دا خەریكبوونە بە نووسین و بڵاوکـردنەوەی ئوسووڵی دینەوە وەك «مەحوی» لەم قەسیدەیەدا کردوویەتی.

(١٢٤) فزوون: زیاد.

واتە: مەحوی! ئەم قسانەت بە قسـەیەکی وەك میسك بۆنخۆش دوایی پێ بێنە. ئەو قسـە وەك میسك بۆنخۆشەیش بریتی بێ لە سوپاسی نەبڕاوە و دوایی نەهاتووی خوا و سەڵاواتدانی لە رادەبەدەر لە دیداری پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێ بێ.

بەراوردێکی جوان لە نێوان «خِتام» و «بِلا خِتام»دا هەیە.

***

***

شوکری خـودا کـە لوتـفی خـودا بـوو بـە رەهـنموون
ئەم گەوهەرانـە مـونتەزەمی نـەزمی رشـتە بـوون(١٢٥)

هەر گەوهەرێکی مەهری کورووریکـی حـووری عـین
هەر گەوهەرێکی سەد سەمەنی جەننەت و عویوون(١٢٦)

نــەزمێکــی جــانفزاو و ســەفابەخشی دیــن و دڵ
نەزمێکـی تـەرزی ئـاوی حـەیاتە رەوان و روون(١٢٧)

لەم ئــاوە هــەر بــخۆنــەوە تــا خـوشکلەب نـەبن
رۆژێ بــووە زوبــانەکـەشی «العـطش» دەروون(١٢٨)

---

(١٢٥) رەهنموون: رێگا پیشاندەر. مونتەزەم: هۆنراوە. نەزم: هۆنینەوە. رشتە: بەنی هۆنینەوەی ملوانکە و شتی وا.

«مەحوی» لەم بەیتەوە دێ بە شان و باڵی ئەم قەسیدەیەدا و تەعریفی دەکا و سوپاسی خوا دەکا کەوا یارمەتی دا بۆ تەواوکردنی.

(١٢٦) مەهر: مارەیی. کوروور: پێنجسەد هەزار. حووری عین: حۆرییە سپیەکانی بەهەشت. سەمەن [«ثمن»]: نرخ. عویوون [«عیون»]: جەمعی «عَین»ە بەمەعناکانی.

واتە: هەریەکێ لە مەسەلەکانی ئەم باسە وەك گـەوهەرێك وایـە و، هـەر گـەوهەرێکـیان مارەیی نیو ملێون حۆری جوانە لە حۆرییەکانی بەهەشت و نرخی سەد بەهەشت و کانیاوی بەهەشتە. مەبەستی لەوەیە بنیادەم بە شوێنکەوتنی رێ و شوێنی ئەم قەسیدەیە کە بریتیە لە خواپەرستی، دەچێتە بەهەشت و لە کانیاوی بەهەشت دەخواتەوە و دەبێ بە هاورێی حۆرییە جوانەکان.

(١٢٧) جانفزا: مایەی بەهێزکردنی گیان. تەرز: وەك.

(١٢٨) خوشکلەب: لێو وشك. زوبانەکەش: زوبان دەرکێش.

واتە: ئەم شێعـرانـە وەك ئـاوی حـەیات وان، لێی بـخۆنـەوە تـا لەو رۆژەدا کـە دەروون لە تینوویەتیدا زوبان دەردەکێشێ و هاوار دەکا، لێوتان وشك نەبێتەوە.

لەم عــەینی نــەزمە هــەڵدەقــوڵێ ســەلسەبیلی دیـن
وەك ئاگری حەسەد لە دەروونی حەسوودی دوون(١٢٩)

مـــەنزوومەیێکـــی مــوختەسەر و پــڕ لە فــائیدە
زوبدەی گەلێ شورووح و خولاسەی گەلێ موتوون(١٣٠)

«نــوریّە»یــە بــە مــەعنی و، «نــونیَّە»یــە بــە لەفــز
خەتمی بە دڵ بە نوورە، ئەگەرچی بە دەم بە نوون(١٣١)

بــیکە بـە دڵ بـە ویـردی هـەموو دەم، کـە هـەر بـەمە
قووەی دڵ ئەو دەمە کـە زوبـانت دەبـێ زەبـوون(١٣٢)

---

(١٢٩) سەلسەبیل «سلسبیل»: ئـاوی رەوان و خـۆش قـووتچوو. نـاوی جـۆگـایەکـیشە لە بەهەشتدا.

واتە: جۆگای ئاوی سازگاری بەهەشت لەم شیعرانەوە هەڵدەقوڵێ، وەك چۆن ئاگری کینە لە دڵی کینەکارانی نامەردەوە زوبانە دەکێشێ.

(١٣٠) زوبدە: پوختە. شورووح «شروح»: جەمعی «شَرح»ە. موتوون «متون»: جەمعی «متن»ە. شێوەی زۆربەی کتێبی جاران کە لە حوجرەکاندا دەخوێنران، وابوو کتێبێکی پوختە و کورت لە باسێکدا دەنووسرا، بەوە دەوترا «مەتن». ئەنجا بە کتێبێکـی‌تر وشـە بـە وشـەی مـەتنەکـەش لێك‌دەدرایەوە و بەوەش دەوتـرا «شـەرح». وادەبـوو سـەرەڕای ئـەوە لەسـەر مـەتنەکـەش و شەرحەکەش دەنووسرا و بەوەش دەوترا «حاشیە».

(١٣١) «نوریّة»: ئەوەی بدرێتە پاڵ «نوور» واتە رووناکی. «نونیّة»: ئەوەی بدرێتە پاڵ «نوون» واتە قەسیدەیەك کە دوا پیتی بەیتەکانی «نوون» بێ.

واتە: ناوەڕۆکی ئەم قەسیدەیە «نوریّة»یـە، چـونکە دڵ روون دەکـاتەوە و شـێوەکـەشی «نونیّە»یە چونکە دوا وشەی هەر بەیتێکی «نوون»ە و، دواییەکەی لە دڵدا رووناکی و لە دەمدا پیتی نوونە.

(١٣٢) ویرد: ئەو دوعایەی بنیادەم هەمیشە بیخوێنێ. دەم: کات.

واتە: با هەمیشە مەعنای ئەم شیعرانەت لە دڵدا بێ و ئەگەر شتێ هەبێ هەمیشە ببێ بە ویردی سەر زمانی دڵ، با ئەو شتە ئەم شیعرانە بێ، چونکە لەو کاتەدا کە زمان لاڵ دەبـێ و ☞

وەك ســـوندوسی لەبـەركە، وەكـوو رۆحـی بگـرە دڵ
پـــیرایشـــی زوهـووره، هـەم ئـارایشـی بـوتوون(١٣٣)

هـــەركەس بـــە جـــان و دڵ لەبـەری بـێ، لەبـەریەتی
روحێكی واكە غەیبی نەكا رەیبی سـەد مـەنوون(١٣٤)

---

☞

بنیادەم دەكەوێتە حاڵی سەرەمەرگ و زمانی ناچەرخێ هیچ بڵێ و ناوێكی خوا بێنێ، ئا لەو كاتەدا ئەم شیعرانەن دەبن بە مایەی هێزی دڵ و بەفریای دەگەن و ناهێڵن بەبێ باوەڕ ئەم دنیایە بەجێ بێڵێ.

لە كۆكردنەوەی «دڵ» و «دەم» و، «دەم» و «زوبان» و، «وـرد» و «دەم»دا تـەناسوب و، لە نێوان «زوبان» و «زەبوون»یشدا جۆرە جیناسێكـی كـوردی هـەیە. لە بـەكـارهێنـانی «دەم»ی یەكەمیشدا بەمەعنا «كات» لەكاتێكا كـە لەگـەڵ وشـەی «وـرد» بـەكـارهێنـراوە و مـەعنای موناسبتری شوێنەكە دەبوو «دەم»ی ئەندامی لەش بێ ـ تەوریە هەیە.

(١٣٣) سوندوس: پارچەی ئاورێشمی بە تاڵی زێڕ تەنراو. پیرایش: ئارایش. رازانەوە. زوهوور [«ظهور»]: جەمعی «ظَهر»ە واتە پشت، یاخود هـەر بـەمەعنا دەركـەوتنە. بـوتوون [«بـطون»]: جەمعی «بَطن»ە بەمەعنا سك، یاخود هەر بەمەعنا ناوەوەیە.

واتە: وەك سوندوس بیكەرەبەرت و وەك رۆح بـیگرەرە دڵ، چـونكە مـایەی رازانـەوەی دەرەوە و ناوەوەیە، وەك چۆن قوماشی سوندوس كە بنیادەم بیكاتەبەری، پشتیشی و سكیشی دەرازێنێتەوە.

لە بەكارهێنانی «لەبەركە»دا بەمەعنا «یادداشت كردن لە دڵدا»، كە دەبوو بەهۆی یەكخستنیەوە لەگەڵ «سوندوس» بەمەعنا «پۆشین» بێ، هونەری «تَوریە» هەیە. لە كۆكردنەوەی «زوهوور» و «بوتوون»یشدا تیباقیش و تەناسوبیش هەیە. لە بەرابەركێ پێ كردنی «لەبەركە» و «بگرە دڵ» و «زوهوور» و «بوتوون»یشدا لەف و نەشری موڕەتتەب هەیە.

(١٣٤) رەیبی مەنوون: وەرچەرخانی گەردوون كە ببێ بەهۆی فەوتانی شتێ.

واتە: ئەوەی بەگیان و دڵ ئەم شیعرانەی لەبەر بێ، رۆحێكی بەرزی وا دەكرێ بە بەریا سەد گۆڕانی چەرخی زەمانە لەناوی نەبات.

لە نێوان «لەبەری بێ» و «لەبەریەتی»دا جۆرە جیناسێكی كوردی هەیە.

بەو ڕۆحەوەم، خـودا، بـبەیە بـەر حـوزووری خـۆت
هەم خۆم و هەم ئەوانە کە خۆن و کە نێك خوون![١٣٥]

بـاقی لە فـەزڵی خـۆتـەوە سـەر ڕۆحـی ئـەحمەدی
نازڵ بکەی سەلات و سـەلامی لە حـەد فـزوون![١٣٦]

(١٣٥) خۆ «ی دووهەم»: خۆیی. نێك‌خوو: ڕەوشت‌باش.

(١٣٦) باقی: ئیتر. ئەحمەدی: پێغەمبەر (د.خ). فزوون: زیاد و تێپەڕکردوو.

## ستایشی خودا

«سُبحانَ» ئەو خودایە کە عەقڵی پەیەمبەران
دەرکی نیانە غەیری بە بەردەرکیا گەڕان[(١)]

«سُبحانَ» ئەو خودایە کە داناتری زەمان
دێوانەیە و، لە مەعریفەتی کونهیا نەزان[(٢)]

«سُبحانَ» ئەو خودایە کە کەڕڕوبیانی عەرش
وەك ناسی قوڕ بەسەر بە نەناسینی موبتەلان[(٣)]

---

(١) «سبحان»: پاکی و بێ گەردی. پەیەمبەر: پێغەمبەر. دەرك «ی یەکەم»: تێگەیشتن. دەرك «ی دووهەم»: دەرگا.

واتە: پاکی و بێعەیبی بۆ ئەو خودایەیە کە تەنانەت عەقڵی پێغەمبەرانیش لێی تێ ناگا و پێغەمبەران چارێك شك نابەن لەوە بەولاوە کە بە بەردەرگایا بسووڕێنەوە و هەوڵ بدەن ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ لێ حاڵی بوونی.

دەشکرێ مەعنای «دەرك»ی یەکەمیش هەر «دەرگا» بێ و مەعنای بەیتەکە وای لێ بێتەوە کە: عەقڵی پێغەمبەرانیش دەرگایەك شك نابا لێیەوە بچێتە ژوورەوە، واتە بەتەواوی لێی حاڵی ببێ و تێی بگا و ئەوانیش هەر ئەوەیان پێ دەکرێ بە دەوریا بسووڕێنەوە و هەوڵ بدەن شتێکی لێ تێ بگەن.

بە هەردوو مەعناکە لە نێوان مەعنای «پەیەمبەران» و «بە بەردەرکیا گەڕان»دا تەناسوب هەیە. لە نێوان هەردوو وشەی «دەرك»یشدا جیناسی تەواو هەیە. ڕستەی «بە بەردەرکیا گەڕان»یش کینایەیە لە تەقەلادان بۆ حاڵیبوون و تێگەیشتن.

(٢) داناتر: بەوێڵ و ماریفەتترین کەس. دێوانە: شێت. کونه: بنچینە و ڕاستی و گەوهەری هەر شتێ.

واتە: پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەیە کە بەوێڵ و ماریفەتترین کەس لە تێگەیشتنی حەقیقەتی ئەودا وەك شێت وایە و هیچ نازانێ.

(٣) کەڕڕووبی: تاقمە فریشتەیەکن لە خواوە زۆر نزیکن، هەمیشە بە دەوری عەرشی خوادا خەریکی عیبادەتن. ناس: خەڵك. موبتەلا: گیرۆدە.

واتە: پاکی و بێعەیبی بۆ ئەو خودایەیە کە تەنانەت فریشتەکانی دەوری عەرشیش کە

زەڕڕێکــی چــون ئــیحاتە چـیە نـیسبەتی لەگـەڵ
ڕۆژێکی بێ نیهایەت و بێ چـوون و بـێ چـونان(٤)

تــا بــۆ قســێکـی دەرخـۆری تـەنزیهی دەم دەبـەم
هەر بـەو دەم ئـەو دەمـە دەبـمە لێوی خـۆ گـەزان(٥)

زاتــم نــیە تــوخن بــە ســیفاتی کـەوم بـە عـەقڵ
ڕۆحم چووە تەسەووری زات ئەر بکەم بـە جـان(٦)

---



دەبوو بەهۆی نزیکییەوە لێی زۆر باشی بـناسن، وەك خـەڵکـی قـوڕبـەسەر تـووشی دەردی نەناسینی بوون.

لە نێوان «ناس» و «نەناسین»دا وشـەئاراییەکی جوان هەیە.

(٤) زەڕڕێکی: زەڕڕەیێکی. ئیحاتە: دەورەدان. مـەبەست لە تـێگـەیشتنی بـابەتە لە هـەموو سەرێکەوە. چوون: وەك. چونان: وەها.

واتە: عەقڵی ئادەمیزاد وەك تۆسقاڵێك وایە و زاتی خوایش وەك ڕۆژێکی بێپایان کە کەس بەدەوروبەریا ناگا و چەندوچوونی نازانێ. جا بەراورد لە نێوان ئەم دوانـەدا چـۆن دەکـرێ و عەقڵی ئادەمیزاد چۆن دەتوانێ لەکونهی زاتی خوا بگات!؟.

(٥) قسێکی: قسەیێکی. دەرخۆر: شایان. تەنزیه: بە بێعەیب زانین. دەم «ی دوایـی»: کـات. گەز: گازگر.

واتە: کە دەم بەدەم قسەیەکی وا بکەم شایانی بێعەیبی ئەو بێ، گورج هەر لەو کاتەدا بەو دەم و ددانەی خۆم دەست دەکەم بەگەستنی لێوی خۆم و پەشیمان دەبمەوە، چونکە تێدەگەم قسەی وام بۆ نادۆزرێتەوە.

لە نێوان هەر سێ وشەی «دەم»دا جیناسی تام و، لە نێوان «دەبەم» و «دەبمە»دا جـیناسی «مُحَرَّف» و، لە نێوان «دەم» و «لێو»دا تەناسوب هەیە.

(٦) زات: جورئەت و وێران.

واتە: ناوێرم بە بیر و خەیاڵی عەقڵم توخنی لێکدانەوەی سیفەتەکانی خوا بکەوم و، ئەگەر بەگیان لە باسی زاتی ورد ببمەوە لە ترسانا گیانم دەردەچێ.

مەحوی لەم بەیتەدا وردەکارییەکی جوانی بەکارهێنـاوە، ئـەوەتە دەڵێ زاتـی ئـینسان کـە



دڵ بوو بە دوودی مەحز و، جگەر بوو بە عەینی ئـاو
ئــــاهم نــیە دەوانــە، ســروشکم نــیە رەوان؟(٧)

تــا هــەبووە، تــا دەبــێ مـوتەنەففیس لە سـینەیەك
بێ ئیزنی ئەو نەسیمی نـەفەس کـەی دەبـێ وەزان(٨)

مســــقاڵە زەڕڕە چــۆنــە لە بــەردەستی قــودرەتی
هەر وا بزانە وایـە کـورەی مـوڵکـی «کُـنْ فکـان»(٩)



سەرچاوەی سیفاتە و «قائم بالذّات»ە مەیدانی نیە توخنی باسی سیفاتی خوا بکەوێ و، ئەگەر بەگیان لە زاتی ئەو ورد ببمەوە گیانم دەردەچێ. چونکە ئەو ـ واتە خوا ـ رۆحی موتڵەق و جانی جانانە. دیارە ئەم وردەکارییە لەسەر بناغەی ئەوە دامەزراوە کە «زات» و «ذات» لە کـوردیدا وەك یەك دەخوێنرێنەوە و «زات»یش بـەم پـێیـە هـەر بـەمەعنا «ذات» بـەکـار بـێ. لە رووی وشەئارایيشەوە کۆکردنەوەی «زات» و «سیفات» و «ذات» و. کۆکردنەوەی «رۆح» و «جـان» ناسکییەکی دیاری تیایە.

(٧) دوود: دووکەڵ. مەحز [«محض»]: رووت. عەین: کانی. یاخود وشەی تـەئکیدە بـەمەعنا «خۆی». دەوان: هەڵاتوو. سروشك: فرمێسك. رەوان: جاری.

واتە: ئەوەندە هەناسەم هەڵکێشا دڵم بوو بە دووکەڵی رووت و لە داخانیش جگەرم بوو بە ئاو و توایەوە. نیشانەی راستی ئەم قسەیەشم ئەوەتە هەر هەناسە هەڵدەکێشم و فرمێسك بە خوڕ لە چاوانم دەڕوا... هەناسەکە دڵمە بووە بە دووکەڵ و سەرکەوتووە و، فرمێسکی خوێنینی چاویشم جگەرمە تواوەتەوە و لە کانیاوی چاومەوە سەری کردووە و داپەڕیوە.

(٨) موتەنەففیس: هەناسەدەر. دەشگونجێ «موتەنەففەس» بێ واتە: هەناسەدان یا جێگـای هەناسەدان. نەسیم: شنەی با. وەزان: باکە بوەزێ.

واتە: لەو کاتەوە هەناسەدەر پەیدابووە و تا لە دنیایشدا بمێنێ، شنەی هـەناسەیەك چیە، بێ ئیزن و رێگادانی خوا لە سینەی کەسەوە نـاوەزێ و کـەس بـێ رەزامـەندی ئـەو نـاتوانـێ هەناسەیەك بدا.

(٩) مەبەست ئەوەیە لە بەردەستی توانای ئەو خوایەدا کە ئەم جیهانەی تەنها بە فـەرمووونی «ببە»یەك دروست کردووە، دروستکردنی شتێکی ئـەوەندەی مسـقاڵە زەڕەیـەك و هـەموو جیهان چوون یەکە.

عیلمی بە حەببەیێ کە بە سەد قەڕنی کە دەبێ
وەك عیلمییە بە قوببەیی شەمسی زیافشان (١٠)

ئەو زەڕڕەیە کە ئەووەڵی زەڕڕاتی عالەمە
بۆ عیلمی چۆنە، زەڕڕەیی ئاخریەتی چونان (١١)

هەرچی ببینرێت و بڵێن و ببیسترێ
«ما هو» خودا، خودا بە خودا «برتر است از آن» (١٢)

تەقریری چی بدەم، کە زوبانن بە کول زەبوون!
تەحریری چی بکەم، خەت و مەت یەك قەڵەم خەتان (١٣)

---

(١٠) حەببە: دانە. قەڕن: سەد ساڵ. قوببە: گومەزی. زیا [«ضیا»] فشان: تیشك دەرەوە.

واتە: دەنکی دانەوێڵەیەك کە سەد ساڵ لەمەویاش پەیدا ببێ و تۆپی ڕۆژی تیشك هاوێژ لە بەردەمی زانستی خوادا چوون یەکن و وەك یەك پێیان دەزانێ...

(١١) چونان: هەروەها.

واتە: وەك یەك ئاگادارە لە یەکەمین و دوا تۆسقاڵێکی ئەم جیهانە.

(١٢) «ما هو»: ئەو نیە. برتر است از آن: ڕستەیەکی فارسییە واتە لەوەگەورەتر و لە پێش‌ترە.

واتە: ئەوەی بە چاو ببینرێ و بە دەم بوترێ و بە گوێ ببیسترێ خودا نیە. بەخودا قەسەم خودا لە هەموو ئەوانە بەرزترە.

لە نێوان هەر سێ وشەی «خودا»دا جیناسی تام هەیە.

لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا «ما هو» بە «نبود»ی فارسیش نووسراوە. بەم پێیە نیوە بەیتەکە تێکڕا دەبێ بە فارسی و وای لێ دێتەوە:

«نبود خدا، خدا به خدا برتر است از آن»

(١٣) واتە: چی بڵێم لە باسی زاتی خودادا مادەم هەرچی زوبان هەیە هەموو لەم مەیدانەدا زەبوون و کولن... چی لەبارەی زاتی خواوە بنووسم مادەم هەرچی نووسین لەم بارەوە نووسراوە هەمووی شتێکی بێبایەخ و بێ‌قابیلەت و هەڵەیە.

وشەی «کول» هەرچەند بەمەعنا «گشت»ە، ئەوەیشی لێ ویستراوە کە بۆ لەتافەت مەعنای «کول‌بوون»یش بگەیەنێ.

شــەممێکــی بــادی ســوبحدەمی لوتــفییە بــەهار
زەڕڕێکی گەرد و بادی شــەوی قــەهرییە خــەزان(١٤)

دووری لەو، ئاگــرێکــە بــە جــەننەت دەکــا جــەحیم
ڕەوحــــێ لە قــوربیایە بــە دۆزەخ دەکــا جــینان(١٥)

دووری ئــــەگــــەر بــەڵایــە، نــزیکییشە ئــیبتیلا
دوورن لە حــــەسرەتان و نــــزیکن لە حــیرەتان(١٦)



تەئکیدکردنەوەی «خەت»یش بە وشەی «مەت» کە شێوەی تەئکیدی کوردییە وەکوو «نان و مان» و «چێشت و مێشت» و شتی وا، بۆ گەیاندنی مەعنای سووکی و ناچیزی تەئکید کراوەکەیە. لە کۆکردنەوەی «خەت» و «قەڵەم»یشدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە «قەڵەم» لێرەدا بەمەعنای قەڵەمی پێنووسین نیە، جۆرە تەناسوبێك هەیە. هەروەها لە نێوان «خەت» و «خەتا»یشدا جیناسی ناقیس هەیە.

(١٤) شەممێکی: شەممەیەکی، تۆسقاڵێکی. باد: با. سوبحدەم: کاتی بەیانی. زەڕڕێکی: زەڕڕەیێکی. قەهر: قین. خەزان: پاییز.

واتە: بەهار بەو هەموو هەوای خۆش و سازگار و گوڵ و گوڵزار و ڕۆژی درێژەیەوە کە هەیە، تۆسقاڵێکە لە بای بەرەبەیانی لوتفی خوا. پاییزیش بەو هەموو تۆز و با و گەڵاڕێزان و شەوگاری درێژەیەوە کە هەیە، نموونەیەکە لە شەوی قارهەڵگرتن و تووڕەبوونی ئەو.

(١٥) جەحیم: دۆزەخ، جەهەنمم. ڕەوح: خۆشی و کرانەوەی دڵ. جینان: بەهەشت.

واتە: دووری لە خوا ئاگرێکی ئەوەندە بەتین و تاوە، بەهەشت بەو هەموو خۆشییەوە کە هەیە. لە ئادەمیزادی دەکا بە دۆزەخ. لێ نزیك بوونیشی ئەوەندە خۆشە بەهەشت لەچاویا ئەوەندە ناخۆشە دەڵێی دۆزەخە.

(١٦) ئیبتیلا: تاقیکردنەوە بە بەڵا بەسەرادان. حەسرەت: داخ. حیرەت: سەرسامی.

واتە: بەڵام عاشقی ئەو نە کە دوور بێ لێیەوە بێدەرد و مەینەت دەبێ و، نە کە نزیك بێ لێیەوە... چونکە دوورییەکەی دەبێ بە مایەی بەڵا بۆ گیانی و نزیکییەکەشی دەبێ بەهۆی ئازاری تاقیکردنەوە، ئاخۆ سەری لێ تێك دەچێ و ڕێگای ڕاست ون دەکا یا نە؟.

**هـــەرکەس بــە بــارەگــاهی جــەلال ئــاشناترە**
**زیاتر قسەی لە وەحشەت و دەهشەت دەدا نیشان[١٧]**

**گــویٚ کــەڕ دەبــیٚ لە غــولغولی «سُبْحانَ مـا عَـرَفْـ**
**نـــاكَ»ەی عــەنادیلی چــەمەنستانی ئــاسمان[١٨]**

**«ئــەحمەد» کــە ئــەکـمەلی بـەشەرە، لەم مـەقامەدا**
**روتبەی کەمالی عیجزی لە «لا أُحْصِي»یە عـەیان[١٩]**

**پــەس مــن کــە کــەمترینی دوا ئــوممەتی ئــەوم**
**چیم و، چ قوڕ بکەم بە سـەرا، چـی بکـەم بـەیان[٢٠]**

---

(١٧) جەلال: گەورەیی خوا. وەحشەت: نامۆیی. دەهشەت: سەرسامی.

واتە: ئەوەی ئاشناتر بیٚ بە بارەگای خودا، زیاتر لە دنیا دوور دەکەویٚتەوە و قسەی وا دەکاکە نیشانەی نامۆیی و بیٚ ئاگایی بیٚ لە دنیا و خەڵك سەرسام بین لیٚی. بۆیەش زیاتر سۆفییە جەزبە لیٚ هاتووەکان قسەی وا دەکەن لەگەڵ قسە و بیروباوەڕی خەڵکدا نەگونجیٚ. مەحوی بەم بەیتە ئیشارەت بۆ ئەو پیاوانەی خوا دەکا کە دەوتریٚ «فناء فِي اللّٰه» بوون واتـە لە خـوادا فـەوتاون ئەوەندەیان بیر لیٚ کردووەتەوە.

(١٨) غولغول: دەنگی قەرەباڵغ. دەنگی کـۆمـەڵی پـەلەوەر، قـوڵەقـوڵی ئـاوی هـاتووەکـوڵ. عەنادیل: جەمعی «عندلیب»ە واتە بولبول. چەمەنستان: شویٚنیٚ وەك چیمەن و گوڵزار وابیٚ.

واتە: بولبولەکانی چەمەنستانی ئاسمان کە بریتین لە مەلائیکەکان، هەموو بە یەك دەنگ هاوار دەکەن دەڵیٚن «سُبْحانكَ، ما عَرَفناكَ حَقَّ مَعرِفَتِكَ» واتە: خوایە پاکی و بیٚعەیبی بۆ تۆیە، ئیٚمە وەها کە شایان بیٚ تۆمان نەناسیوە. لە دەنگە دەنگی ئەم مەلائیکەتانە گویٚی گویٚدار کەڕ دەبیٚ.

(١٩) عەیان: ئاشکرا و دیاری.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پیٚکەوە دیٚ.

(٢٠) پەس: کەواتە.

واتە: پیٚغەمبەر (د.خ) لە هەموو ئادەمیزادیٚك پیٚگـەیشتووترە لە مـەیدانـی خـوانـاسین و تیٚگەیشتنی کونهی ئەودا، خۆی بە دەمی خۆی دەری بڕیوە کەوا لەم مـەیدانـەدا بـە تـەواوی

☜

«مەحوی»! ئەدەب خەمۆشیو مەحوییەتە، لەگەڵ
نەسرەوتنێکی، یەعنی بە دەم دەردەوە گلان (٢١)

گریەی بە کوڵ، بە دڵ لە خەرافاتی خۆ خەجڵ
ناڵەی دڵی شەوان و هەناسەی سەحەرگەهان (٢٢)

هەر ئەو هەناسەیە کە بدا فێنکی بە دڵ
بەو تاقە ناڵەیە کە بگا گەرمیێ بە گیان (٢٣)

***

---

☞

بێ دەسەڵاتە. ئەوەتە فەرموویەتی:«لا أحْصِي ثَناءً عَلَيْكَ، أنتَ كما أَثْنَيْتَ على نَفْسِكَ» واتە: خوایە من ناتوانم واکە شایان بێ باسی تۆ بکەم و تەعریفت بکەم. تۆ وایت کە خۆت تەعریفی خۆتت کردووە، کەواتە من کە بێبایەخترینی دوا وەچەی ئوممەتی ئەو پێغەمبەرەم، چیم تا بتوانم باسی خوا بکەم! من قوڕی کوێ بە سەردا بکەم کەوا لەم مەیدانەدا هیچم پێ ناکرێ و، باسی چی بکەم؟!.

(٢١)خەمۆشی: بێدەنگی. مەحوییەت: مەحوبوونەوە.

مەحوی لەم بەیتەوە تا دوایی رووی دەمی دەکاتە خۆی و قسە لەگەڵ خۆی دەکا.

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٢٢)خەجڵ: شەرمەزاری و رووزەردی. سەحەرگەهـ: بەرەبەیان.

(٢٣)واتە: مەحوی! ئەدەب بۆ تۆ لەم مەیدانەدا ئەوەیە بێدەنگ بی و لەم جۆرە باسانە نەدوێی و وات لێ بێ وەك نەبی، بەڵام نەك بەمەعنای ئاگا نەبوون لە خوا، بەڵکوو بەو مەرجە کە نەسرەوێیت و بەم دەردەوە بتلێیتەوە و بە کوڵ بگریت و بە دڵ خەجاڵەت بی لە کردەوەی هیچ‌وپووچی خۆت و شەوان ناڵەی دڵت بێت و دەمەوبەیانەکان هەناسەی بەسۆز هەڵکێشی... تەنها بەو هەناسە بەسۆزە فێنکییەك دەگا بە دڵت و بەو ناڵەی شەوانە گیانت کەمێك بە تیشکی خواناسین تینێکی گەرمای پێ دەگا.

***

## پاڕانەوە لە خودا

خـــودایـــا! ئـــیرادەی مـــوناجاتمە
نـــیازی دوو ســێ عــەرزی حــاجاتمە[(١)]

بــە دەربــاری هــەر فــەزڵتــە ئــیلتیجام
بە ڕەحمەت نـیشانم دە ڕێگـەی نـەجام[(٢)]

بـــــە «وَالذّاریـــــات»ی هـــەناسان و ئـــاه
کـــە بـــەر بـــا دەدەن کـێوەکـانی گـوناه[(٣)]

---

مەحوی لەم پاڕانەوەیەدا دەیەوێ هەندێ لە سوورەتەکانی قورئان بکا بە تکاکار لای خوا کەوا لێی ببوورێ و لەگوناهەکانی خۆش ببێ. لە هەمان کاتیشدا مەعنای ناوی ئەو سوورەتانەی بەکار هێناوە بۆ تەواوکردنی مەعنای بەیتەکانی. وەك پاشانیش دەردەکەوێ پاڕانەوەکەی تەواو نەکردووە.

(١) ئەم بەیتەیش نیشانەیەکی تری تەواونەکردنی پـاڕانـەوەکـە، واتـە نـاتەواوی ئـەم پـارچـە شیعرەیە، ئەوەتە مەحوی خۆی دەڵێ نیازم وایە دوو سێ پێویستی خۆم لە بارەگـای خـوادا دەربڕم، کەچی لە یەك پێویستی زیاتری دەرنەبڕیوە و ئەویشی تەواو نەکردووە.
خودایا (ن): ئیلاهی.

(٢) دەربار: کۆشکی شاهانە. لێرەدا مەبەست بارەگای خوایە. ئیلتیجا: پەنا. نەجام: نەجاتم.
واتە: تەنها پەنا بەر کۆشکی شاهانەی فەزڵ و گەورەیی تۆ دەبەم کە بە ڕەحمەت ڕێگای ڕزگاریم پیشان بدەی.

(٣) «الذّاریات»: ئەوانەی شەن دەکەن، شتێك دەدەن بە دەم باوە، شتێك پرژ و بڵاو دەکەنەوە. ناوی سوورەتێکیشە لە قورئان.
واتە: سوێندت دەدەم بەوانەی هەناسەی ساردی پەشیمانی هەڵدەکێشن و بەو پەشیمان بوونەوەیە تۆبە دەکەن لە گوناه و بەو تۆبە کردنە کێوی گوناهی خۆیان دەکەن بە تۆز و دەیدەن بەدەم باوە، یا سوێندت دەدەم بە سوورەتی «والذّاریات».

بـــە «والطّـــور»ی قـــەلبی تـــەجەللا قـــەرین
بە «والنّجم»ی پڕ ورشـە ورشـی جـەبین (٤)

بـە دوو «والسّـما»، یـەعنی دوو مـەرتەبەت
یەکێ مەرتەبەی عیشق و یەك مەعریفەت (٥)

بە «والفَجر»ی رووناکـی بـن چـینی زوڵف
کە فەجرێکە سادیق، بە بێ کیزب و خولف (٦)

---

(٤) «الطّور»: کێوی «توور» کە رووی تیشکی تەجەللای خوای تێ کرا و پێی سـووتا. نـاوی سوورەتێکیشە لە قورئان. تەجەللا قەرین: هـاوشانی بـەرەکـەت. «النّـجم»: ئـەستێرە. نـاوی سوورەتێکیشە لە قورئان. جەبین: تەوێڵ، ناوچاو.

واتە: سوێندت دەدەم بە کێوی توور کە بە تەجەللای خوا سـووتا، یـا بـە دڵی پێغـەمبەر دروودی خوای لێ بێ کە وەك کێوی توور تەجەللای نووری تۆ رووی تێ کردووە و هەمیشە بەرەکەتی تۆی لەگەڵە. یا بە سوورەتی «الطّور». هەروەها سوێنـدت دەدەم بـە ئـەستێرە کـە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی گەورەییت، یا بە ناوچاوی وەك ئەستێرە پرشنگداری پێغەمبەر (د.خ) کە هەمیشە ورشەی دێ، یا بە سوورەتی «النّجم».

(٥) «السّما»: ئاسمان. ئیشارەتیشە بۆ دوو سـوورەتی قـورئان کـە سـەرەتای هـەردوکیان بـە «والسّماء» دەست پێ دەکا، یەکەمیان سوورەتی «البروج» کـە سـەرەتاکـەی ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾یە و، دووهەمیان «الطّارق» کە سەرەتاکەی ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ﴾یە. مەرتەبە: پایە، پلە. مەبەست لە پلەکانی خواناسییە.

واتە: سوێندت دەدەم بە دوو پایەی بەرزی خواناسی کە یەکەمیان پایەی عیشقی ئیلاهییە و ئەویشیان پایەی لە خوا گەیشتنە کە لە ئەنجامی دەستگیربوونی پایەی یەکـەمەوە دەسـتگیر دەبێ. یا سوێندت دەدەم بە دوو سوورەتی قورئان کە هەردوکیان بە رستەی «و السّماء» دەست پێ دەکەن. وەك روونمان کردەوە.

(٦) «الفَجر»: بەرەبەیان. ناوی سوورەتێکی قورئانیشە. فـەجری سـادیق: سـبەینان دوو جـار کەناری ئاسمان رۆشن دەبێتەوە، جارێکیان بۆ تەنها ماوەیەکی کەم رۆشـن دبـێتـەوە و ئـیتر دیسانەوە تاریك دایێت. ئەوە پێی دەڵێن «فەجری کازیب» واتە بەیانییە درۆزنە. ئـەمەیان لەو

**بە «والشّمس»ی پڕ نووری روخساری یـار**
**بە «واللّـيل»ی خـاڵ و خـەتی مـوشكبار (٧)**

**بە «والتّين»ی عـوششاقی دڵ پـڕ لە خـوون**
**كـــە بـــێ تـينن و زەرد و زار و زەبـوون (٨)**

---



كاتەدايە كە ئەستێرەی «كاروانكوژە» هەڵدێ و كەمێك كەناری ئاسمانی پێ رۆشن دەبێتەوە و كاروانی ناشارەزا وادەزانێ رۆژ بـووەتەوە، كـەچی هـێشـتا شـەوە، چـونكە كـە ئـەستێرەكـە بەرزبووەوە ئیتر دیسانەوە كەناری ئاسمان تاریك دەبێتـەوە. جـارەكـەیكەشیان ئـاسمان بـە تەواوی دەست دەكا بە رۆشن بوونەوە و تاریك داهاتنەوەی بەدواوە نیە. ئەمەیان كاتی نوێژی سبەینانە. خولف: پێچەوانەیی كردن لەگەڵ راستی.

واتە: سوێندت دەدەم بە بەرەبەیان. یا بەگۆنای وەك بەرەبەیان رووناكی پێغەمبەر (د.خ) كە دەكەوێتە بن چینی زوڵفی وەك شەو تاریكیەوە و لە تاریكستانی ئـەو زوڵفـەدا وەك فـەجری سادیق رووناك و رۆشنە درۆ و ناڕاستی تیا نیە، یا سوێندت دەدەم بە سوورەتی «والفجر».

(٧) «الشّمس»: خۆر، یا رۆژی رووی پێغەمبەر (د.خ). ناوی سوورەتێكیشە لە قورئان. «اللّـيل»: شەو، یا شەوی «خەت و خاڵی» پێغەمبەر. ناوی سوورەتێكی قورئانیشە. موشكبار: ئـەوەی ئەوەندە بۆنخۆش بێ وەك باری موشكی بەكوڵەوە بێ. موشك: یا مـوشگ كـە بـە عـەرەبی پێی دەڵێن «مِسك» مایەیێكی بۆنخۆشە لای ناوكی جۆرە ئاسكێكی تایبەتییەوە پەیدا دەبێ.

واتە: سوێندت دەدەم بە خۆر یـا بـە رووی وەك رۆژ روونـاكـی پـێغـەمبەر (د.خ). یـا بـە سوورەتی «الشّمس». هەروەها سوێندت دەدەم بە شەو یا بە سوورەتی «اللّيل» یا بە خەت و خاڵی وەك موشگ بۆنخۆش و وەك شەو رەشی پێغەمبەر (د.خ).

(٨) «التّين»: هەنجیر، مەبەست لە زەردی و فلیقانەوەیە. ناوی سوورەتێكی قورئانیشە.

واتە: سوێندت دەدەم بە زەردی سیمای دڵدارە دڵ پڕ لە خوێنەكـان كـە بـەهۆی دەردی دڵدارییەوە تینیان تیا نەماوە و زەرد و زار و زەبوون هەڵگەڕاون. یا بە سوورەتی «والتّين».

شوبهاندنی دڵداران بە هەنجیر، وەك لە بەیتەكەوە دیارە، لەوەوەیـە كـە وەك هـەنجیر بـە دیمەن زەرد و، لەناوەوە وەك خوێن سوورن.

لە نێوان «و التّين» و «بێ تين»دا جۆرە جیناسێكی ناتەواو و، لە نێوان «والتّين» و «زەرد»دا تەناسوب هەیە.

بـــە «والعـادیات» ئـەسپی هـیممەت دەوان
بە ڕێی عیشقدا تـا سـەحەر شـەبڕەوان[٩]

بە «والعَصر»ی ئەو عەسرە فـەڕڕوخ زەمـەن
کە ناوی بە عەسری سـەعادەت دەبـەن[١٠]

---

(٩) «العادیات»: وڵاخە غارکەرەکان. ناوی سوورەتێکی قورئانیشە. دەوان: ئـەوەی بـە غـار بڕوا. شەبڕەوان: ئەوانەی بە شەو ڕێ دەکەن.

واتە: سوێندت دەدەم بەو شۆڕە سوارانەی بە ڕێی عیشقدا شەو تا بەیانی ئەسپی غیرەت تاو دەدەن، یا بە سوورەتی «العادیات».

(١٠) «العصر»: چەرخ، زەمانە. ناوی سوورەتێکی قورئانیشە. فەڕڕوخ: پیرۆز. زەمەن: سەردەم. عەسری سەعادەت: چەرخی بەختەوەری، چەرخی پاش هاتنی ئایینی ئیسلام. بەرابەرەکەی چەرخی نەزانی «جاهلیّت»ییە.

واتە: سوێندت دەدەم بە چەرخی پیرۆزی هاتنی پێغەمبەر (د.خ) کە پێی دەڵێن چەرخی بەختەوەری، یا بە سوورەتی «والعَصر».

وەك لە سەرەتاوە وتمان مەحوی ئەم پارچە شیعرەی تەواو نەکردووە. ئەوەی بـە خـەتی خۆی یا بە خەتی کەسێکی تر لێی بەجێ‌مابێ تەنها ئەم دە بەیتەیە. لەوانەیشە تەواوی کردبێ و فەوتابێ. هەرچۆن بێ شاعیری پایە بڵند حاجی «میرزا عبدالله»ی کۆیی کە نازناوی «خادم»ە بە ناوی «مەحوی» خۆیەوە ئەم چەند بەیتەی خوارەوەی خستووەتە سەر و پارچەکـەی پـێ تەواو کردووە:

بـە «سَـبع المَـثاني»و «فـتح الکـتاب»
بکـە ڕێی نـەجات و ڕجـام فـەتحی بـاب

بە ئەسراری «کاف ها» و «یا عەین» و «صاد»
بەسە ڕەحمی تـۆ بـێ سـەبەب بـۆ عـیباد

بە «والنّـازعات» نـەزعی ڕۆحـی عـەدوو
لە حـــاڵاتـــی نـەزعا پـەناهم بـە تـوو

بـە «والمرسلات» پـەیکی خـۆش نـامەبەر
لە مـــەعشووقە بـــۆ عـــاشقی ڕاهـبەر

بـە «والصّـافات» سـەفکەشی ئینتیزار
مـــوتیعی ئـــەوامـــیر پـــەیی کـارزار

بـە ئـەسراری «قـل فـاضْرِبُوە» لە ڕوو
حـەیاتی دوبـارەم بـە دڵ نـەخشە، تـوو

بە سیڕڕی «أَلَم نَشرح»ی شـەرحی یـار
بکــە ســەیقەلی دڵ لە تـۆز و غـوبار

بە داوی قەسەم «والضّحی»ی شـوعلەوەر
لە تـاریکی جـەهلام و بـەمهێنـەدەر



بە ئەسرارى «أسرىٰ بِعبدِه» لە شەو — شەوى وەسڵە عاشق کە هەڵسا لە خەو
بە سیڕڕى «على حبّه»ى «هل أَتىٰ» — کە وەسفێکە بۆ عائیلەى «لا فتىٰ»
بە قەولى «تعالوا» و هەم «سارعوا» — ئیتاعەتمە هاتوومە دەرگاهى توو
ئومێدم هەیە من بە «لا تقنَطوا» — کە دووبارە فەرمووتە «لا تیأَسوا»
بە کڵپەو گڕى عیشقى وەحدەت ئەسەر — بسووتێنە خاشاکى کەسرەت سەمەر
بە ئاهى دڵى شەونشینانى شەو — لە خەوفى تۆ ناکەن ئەبەد ساتێ خەو
بە سۆزى دڵى عاشقان تا سەحەر — بە ئاهێ کە ئەڕوا هەتا جێى ئەسەر
نەمێنێ لە دڵما بە «لا»ى نافیە — بە جوز تۆ کە بۆ من بەسە و کافیە
ببەخشە زوبانێ لە رووى مەکرەمەت — تەڵەب کا بە دایم لە تۆ مەغفیرەت
لە دەرگاهى تۆ دانەنێم گەر سەرم — شەوان ئاه و ناڵەم لەبۆ کێ بەرم
بە زارىو گریان و هاوار و ئاه — تەڵەبیە لە تۆ «مەحوى» مەحوى گوناه

## قەسیدەی بەحری نوور

«وَ صَلّی اللّٰه عَلی» ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە
کە دەرکی غەوری ناکا «غَیْرُ عِلْمِ اللّٰهِ سبحانَه»[1]

«و صَلّی اللّٰه عَلی» ئەو زاتی پاکی قودسی ئایاتە
کە ئەخلاقی پەسەندیدەی جەنابی حەیی مەننانە[2]

«وَ صَلّی اللّٰه عَلی» ئەو حەزرەتەی ساحێب کەمالاتە
کە ئەعلا موعجیزەی، قوربانی بم من، نووری قورئانە[3]

---

(١) غەور: قووڵی.

واتە: خوا رەحمەت بڕێژێ بەسەر ئەو دەریای نووری زانست و تێگەیشتنەدا کە لە خوا خۆی بەولاوە کەس نازانێ چەند قووڵە. مەبەست پێغەمبەرە دروودی خوای لێ بێ.

(٢) قودسی ئایات: ئەوەی نیشانەکانی پیرۆزن. پەسەندیدە: پەسەندکراو. مەننان: نیعمەت دەهندەی بێ ماندووکردن.

واتە: خوا رەحمەت بڕێژێ بەسەر ئەو زاتەدا کە نیشانەکانی پێغەمبەرێتی ئەو هەموو بەرز و پیرۆزن و رەوشتی لای خوای زیندووی بەخشندە پەسەندە. ئەم رستەی دواییە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿وَ إِنَّكَ لَعَلىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾.

لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا «زاتی یەزدانە»یش لە پاڵ «حەیی مەننانە»دا نووسراوە.

(٣) موعجیزە: ئەو کردارە لە عادەتبەدەرەیە لە کەسێکەوە روودەدا کە ئیددیعای پێغەمبەرێتی دەکا و کەسی تر ناتوانێ بیکا.

مەبەست ئەوەیە قورئان بەرزترین موعجیزەیەکی پێغەمبەرە (د.خ) چ لە رووی ئەوەوە کە کەس ناتوانێ شتێکی وا بڵێ و ئەوەیش یەکێکە لە نیشانەکانی ئەوەکە قورئان کەلامی خوایە و پێغەمبەر راست دەکا لە ئیددیعای پێغەمبەرێتیدا و، چ لە رووی بەرزی ئەو پەیڕەو و رێ و شوێنانەوە کە قورئان دایناون بۆ موسوڵمانان.

لە تـــاریکی شـــەوی کـــوفرا بـــە یـــەك دەم لەمـــعەیێکـــی دا
هـــەزار و ســـێســـەد و بـــیست و دووە، دنـــیا چـــراخـانە(٤)

چـــرایەك نـووری بـێچـوونی مـومیدی بـێ، دەبـێ وا بـێ
چرایەك دەسـتی قـودرەت خـۆشـیکا، بـۆ تـا ئـەبەد مـانە(٥)

«تَعالَی اللّـە» بـە دوو دەهـ بـوو کـە هـەردوو عـالەمی داگـرت
بـــنازم بـــەم کـەماڵی عـەزم و حـەزم و شـەوکەت و شـانە(٦)

---

(٤) لەمعە: تیشك دانەوە، بریقە. چراخان: کۆڕی شایی کە چرای زۆری تیا هەڵکرابێ.

واتە: لە شەوی تاریکی خوانەناسینی خەڵکی بتپەرستی عەرەبستاندا، پێغەمبەر (د.خ) لەپڕ لە مەککە تیشکی دایەوە و کۆچی کرد بۆ مەدینە. لەوکاتی کۆچ کردنەیەوە تا ئێستا ئەوە ١٣٢٢ ساڵە دنیا بە نووری موسوڵمانەتی رۆشن بووەتەوە و وەك چراخانی لێهاتووە.

بۆیە سەرەتای ئەم بە چراخان بوونەی دنـیامان بـە کـۆچکـردنی پـێغـەمبەر (د.خ) دانـا لە مەککەوە بۆ مەدینە، چونکە ئەگەر مەبەست لەدایك‌بوونەکەی بوایە‌وەك بەیتەکەوادەگەیەنێ ـ دەبوو پەنجا و دوو ساڵی‌تر بخرێتە سەر ١٣٢٢وەکە، لەبەر ئەوە کە یەکەم پێغەمبەر لە تەمەنی چل ساڵیدا بووە بە پێغەمبەر و دونزە ساڵیش بە پێغەمبەرێتی لەوێ ماوەتەوە، ئەنجا کۆچـی کردووە بۆ مەدینە و، دووهەمیش لەبەر ئەوە کە بڵاوبوونەوەی راستەقینەی ئایینی ئیسلام لە کۆچ‌کردنی پێغەمبەرەوە (د.خ) دەستپێ‌دەکا بۆ مەدینە. بۆیەیش وتمان دەبوو پـەنجاو دوو ساڵی‌تر بخرایەتە سەر ١٣٢٢وەکە، چونکە دیارە مەحوی لە ١٣٧٤ی کۆچـیدا ئـەم پـارچـە شیعرەی دانەناوە و، وەك خۆی دەڵێ لە ١٣٢٢ی. ك «١٩٠٤ـ١٩٠٥ی. ز»دا وتوویەتی.

(٥) بێچوونی: بێ‌هاوتایی. مومیدد: یارمەتی‌دەر. مان: مانەوە و نەکوژانەوە.

(٦) حەزم: توندی. شەوکەت: هێز و توندی. شان: پایە.

واتە: ماشەڵڵا لە گەورەیی خوا! پێغەمبەر تەنها بە بیست ساڵ توانی دەسەڵاتـی ئـایینی و حوکمڕانی خۆی بڵاو کاتەوە و دەست‌بەسەر جیهانی ئایینی و حوکمداریدا بگرێ. بنازم بەو نیازی بەتین و بەو توندی و هێز و پایەیەی کە ئەو هەیبوو و توانی ئەم کارە گەورەیەی پێ بە ئەنجام بگەیەنێ.

پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ بیست و سێ ساڵ پێغەمبەرێتی کردووە. بەڵام پاش هاتنی

لەگـــەڵ ئـــەم ئـــیحتیشامە زوهـــدی دنـــیایی تـــەماشا کـــە
کە یەك لەت نانی جۆ بوو قووتی، یا خورما دووســێ دانــە[٧]

فــەلەك جــاهێ ســەری خــەرمانی تــا عــەرش، ئــەڵبــەتە نــابێ
تـــەنەززولکا عـــولووی هـــیممەتی بـــۆ دەنکـــە زیـــزانــە[٨]

مـــوهیممێ غـــەیری زاتـــی حـــەی لە هـــیممەتیا نـــیە، ئـــیللا
لەبـــەر ئـــەم ئـــوممەتە بـــێ هـــیممەتە دائـــیم بـــە ئـــەحزانــە[٩]

---

☞

یەکەمجاری وەحی بۆی تا سێ ساڵ وەحی‌تری بۆ نەهاتووە. بۆیەش مـەحوی لێرەدا تـەنها بیست ساڵەکەی ژماردووە.

لە دەسـتنووسێکـی مـەحوی خـۆیـدا رسـتەی «دوو دە» بـە «دودی»یش نـووسراوە کـە دەگونجێ بە «دوو دێ»ی بخوێنینەوە کە مەبەست لە «دوو دێ» کە مەککە و مەدینە بێ. یا بە «دوودێ» بەمەعنا دووکەڵێك واتە هەناسەیەك و کینایە بێ لە سەردەمێکی کورت.

(٧) ئیحتیشام: دەست و پێوەند زۆرێ. زوهد: خۆگرتنەوە لە هەرچی نیشانەی دنـیاپەرستی بێ.

واتە: لەگەڵ ئەم هەموو شان و شکۆیەیشدا کە بووی، سەیری‌کە چۆن خۆی لە دنیا دوور دەگرت... خۆراکی رۆژانەی لە لەتێ نانی جۆ و دوو سێ دەنك خورما پتر نەبوو.

لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا «ئیقتیدارە»یش بەرابەر بە «ئیحتیشامە» نووسراوە.

(٨) زیزانە: دانەیەکی وردی رەشە لەناو دەغڵا دەڕوێ.

واتە: زاتێکی وا کە پایەی ئەوەندە بەرز بێ لووتکەی خەرمانی حورمەتی بگاتە عەرشی خوا، دیارە قەدری بەرزی خۆی دانانەوێنێ بۆ دنیا کە ئەوەندەی دەنکە زیزانە بێ‌نرخە.

(٩) واتە: ئەوەندە خاوەن هیممەتە لەخوا بەولاوە هیچ شتێکی لا گرنگ نیە. داخ و خەفەتی دڵیشی لەبەر ئەوەیە کە بیر لەم ئوممەتە بێ‌هیممەتەی خۆی دەکاتەوە کە رۆژی گەیشتووەتە ئەم رۆژە.

لەوە دەچێ ئەم بەیتە رەنگدانەوەی باری دواکەوتووی جیهانی ئیسلامی ئەوڕۆژە بێ لە شیعری «مەحوی»دا، کە دەوڵەتە ئەمپریالیستییەکان لە هەموو لایەکەوە دەمیان تێ‌ژەندبوو. شتی وا لە

☜

چ مـــەدحێکت بکـــەم لائـــیق بـــە تـــۆ «یـا خَـیْرَ خَـلْقِ اللّـهِ»
مـــنی بـــێ خـــێری نـالائیق کـە جـیبریلت سـەناخوانە [(١٠)]

بـــەیانی گـــەورەیی خـــولقی کـــەسێ ئـایەت لە شـەئنی بـێ
نە مەقدووری من و تۆیـە، نـە ئـیشی «قِسّ» و «سَـحبان»ە [(١١)]



چەند شوێنێکی‌کەیشدا لە شیعری «مەحوی»دا خۆی پیشان دا، وەك لەو شوێنانەیشدا باسمان لێ‌کردن. ئەم جۆرە بیرە لەو سەردەمەدا لەناو کۆمەڵێ لە رۆشنبیرانی ولاتە موسوڵمانەکاندا باو بوو.

(١٠)واتە: تۆیەك کە فریشتەیەکی وەك حەزرەتی جوبرەئیل سەناخوانت بێ و تەعریفت بکا و چاترینی ئەوکەسانە بی کە خوا دروستی کردوون، دەبێ منێکی ناچیز چ تەعریفێك بدۆزمەوە شایانی تۆ بێ!

مەبەست لەوە کە «جیبریل سەناخوانی پێغەمبەرە» ئەوەتەکە جیبریل ئایەتی قورئان بەسەر پێغەمبەردا (د.خ) دەخوێنێتەوە و ئایەتی قورئانیش هەندێکیان سەنای پێغەمبەریان تیایە وەك ئایەتی: ﴿وَ إِنَّكَ لَعَلىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾.

لە نێوان «لائیق» و «نالائیق» و، «خیر خلقِ اللّه» و «بێ خێر»دا تیباق هەیە.

(١١)قِس: قیسی کوڕی ساعیدە، لە دەوروبەری ٦٠٠ی زایینیدا مردووە، خۆش‌گوفتارێکی سەردەمی جاهیلییەتە. گاوری نەجران بووە، هاتووەتە ولاتی عەرەبستان. هەندێکیش دەڵێن یەکێك بووە لە قەشە گەورەکانی نەجران. هەموو جارێ لە بازاڕی عوکازەدا وتاری دەدا. لەبارەی خۆش‌گوفتاری و وردی قسەوە ناوی بە نموونە دەهێننەوە. سەحبان: سەحبانی وائیل، خۆش‌گوفتارێکی دەم‌ودوو رەوانی‌تری عەرەبە، بووە بە نموونە لە مێژووی ئەدەبی عەرەبدا، لە ٦٧٤ی زایینیدا مردووە.

ئەم بەیتە وەك درێژە پێدانی بەیتی پێشوو وایە. واتە: کەسێك خوا لە قورئاندا باسی کردبێ و پێی وتبێ: ﴿وَ إِنَّكَ لَعَلىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ کە واتە تۆ بەڕاستی رەوشتێکی بەرزت هەیە، نە من و نە تۆ و نە قیسی کوڕی ساعید و نە سەحبانی وائیل ناتوانن باسی گەورەیی ئەو بکەن.

لە ئــادەم تـا مـەسیحا، ئـەنبیبا یـەك یـەك بـە قـەومی خـۆی
خەبەرداوە: لەپاش ئێمـە کـە دێ ئـەو فـەخری ئـەکـوانـە[١٢]

نوعووتی خۆی و نەعتی ئال و سـەحبی وەك گـوهەر دەرجـە
لە دورجــا، یــەعنی کــوتبی مــونزەلەی ئـەو ئـەنبیایانە[١٣]

چــەها روهــبان و کـاهین، هـاتیفی غـەیبی بـە یـەکـتریان...
دەدا مـوژدە، کــە جــەننەت دێتــە دنــیا بــەم نـزیکانە[١٤]

کــە تــەشریفی قــودوومی هــاتە دنــیا، بــارشێکـی فـەیز
لە هــەوری مــەرحــەمەت بـاری، کـە ئـاساری نـومایانە[١٥]

---

(١٢) مەسیحا: مەسیح، حەزرەتی عیسا. ئەکوان: جەمعی «کَون»ە بەمەعنا گێتی.
واتە: پێغەمبەران، لە ئادەمەوە بیگرە تا مەسیح، هەموو خەبەریان بە پەیڕەوانی خۆیان داوە کەوا پێغەمبەرێکی وا دێت و داوایان لێ کردوون کە ئەگەر لە سەردەمی ئەواندا هات باوەڕی پێ بکەن و شوێنی بکەون.

(١٣) نوعووت «نعوت»: جەمعی «نَعت»ە بەمەعنا سیفەت. ئال: موسوڵمانانی بەنیهاشم و بەنیموتتەلیب. سەحب: جەمعی ساحیبە بەمەعنا هاوڕێ، بەوکەسانە دەڵێن بە موسوڵمانەتی پێغەمبەریان دیبێ و بـە مـوسوڵمـانەتی مـردبن. گـوهەر: گـەوهەر. دەرج: نـووسراوە. دورج: سندووق، مەبەست لەو کتێبانەیە خوا ناردوونی بۆ پێغەمبەران، وەك لە بـەیتەکـەدا روون کراوەتەوە. مونزەلە: نێرراو لە خواوە.

(١٤) روهبان: جەمعی «راهِب»ە، بەو پیاوە ئایینییە مەسیحییانە دەڵێن کەوا بە نیازی خواپەرستی کەنار دەگرن لە خەڵك. کاهین: ئەو پیاوە ئایینییەی کە ئیددیعای زانینی غەیب دەکا. هاتیفی غەیبی: ئەو دەنگەی کەس سەرچاوەکەی نازانێ.
واتە: ئەوانە هەموو موژدەیان دەدا بە یەکتر کەوا بەمونزیکانە پێغەمبەر (د.خ) سەر هەڵدەدا و تاریکستانی دنیا دەکا بە بەهەشت. مەبەستی لەوەیە ئەمانە دەیانزانی کـەوا پێغـەمبەر پـەیدا دەبێ، چونکە لە کتێبە ئایینییەکانی خۆیاندا نووسرابوو، یا لە غەیبەوە دەیانزانی.

(١٥) قودووم: هاتن: بارش: بارینێکی باران. فەیز: بەرەکەت. نومایان: ئاشکرا و دیاری.
واتە: کە لەدایك بوو «مەبەستی پێغەمبەرە» (د.خ)، لە هەوری مەرحەمەتی خواوە بارانێکی



رشێنەی، ئاگری بەردایە عومری ئاگری «زەردەشت»
بە بەرقی بوو کە شەق بوو تاقی «کیسرا»، بوو بە وێرانە(١٦)

---

☞

بەبەرەکەتی وا باری، ئێستاش نیشانەکەی هەر دیارە. لە بەیتە داهاتووەکاندا باسی ئەو نیشانانە دەکا.

کە «ی یەکەم» (ن): بە. بەڵام مەعنا نادا بەدەستەوە.

(١٦) رشێنە: پرژ. زەردەشت: پێغەمبەرێکی ئێرانی بووە لە دەوروبەری سەدەی حەوتەمی بەر لە هاتنە دنیای مەسیحدا پەیدابووە و خەڵکی بانگکردووە بۆ خواپەرستی. لەم ئایینەدا سەرچاوەی کاری چاك بە «ئەهورا مەزدا» و سەرچاوەی کاری خراپ بە «ئەهریمەن» دەناسرێ. زەردەشتییەکان ئاو و خاك و ئاگر و بایان زۆر لا بەرێز بووە و لەبەر ئەو هەموو قەدر و حورمەتەی هی ئاگریان گرتووە و ئاتەشگایان بۆ کردووەتەوە، بە ئاگرپەرست ناوبانگیان دەرکردووە. ناوی کتێبە ئایینییەکەیان «ئاوێستا»یە. ئەم ئایینە لە دوادوایی سەردەمی هەخامەنوشییەکاندا پەیدا بووە و لە سەردەمی ساسانییەکاندا بووە بە ئایینی دەوڵەتی ئێران. پاش هاتنی ئایینی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی بە ئێران و کوردستاندا رووی کردووەتە کزی و ئێستا لە هەندێ شوێنی ئێران و هیند و پاکستاندا چەردەیەکی ماوە. بەرق: تیشکی هەورە برووسکە. تاقی کیسرا: کۆشکەکەی ئەنووشیرەوان لە تەیسەفوون کە ئێستا پێی دەڵێن سەلمان پاك. کیسرا: لەقەبی ئەنووشیرەوان و خوسرەوی پەروێز بووە کە دوانن لە پادشاهانی بنەماڵەی ساسانی، یەکەمیان لە ٥٣١ی ز-وە تا ٥٧٩ و دووهەمیان لە ٥٩٠وە تا ٦٢٨ فەرمانڕەوایی کردووە.

واتە: پرژی ئەو بارانە ئاگری بەردایە عومری ئاگرەکەی زەردەشت کە ساڵەها بوو لە ئێرانا دەسووتا و کوژاندیەوە. برووسکەی ئەو هەور و بارانەیش دای لە تاقی کیسرا و درزێکی گەورەی تێ کرد. لە کتێبەکانی سیرەتی پێغەمبەردا نووسراوە کەوا لە شەوی لەدایك بوونیا ئاگری ئاتەشگای فارس کوژاوەتەوە و تاقی کیسرا درزی تێ بووە.

لەم بەیتەدا دوو «استعارە»ی مەکنییە هەیە ئەوەتە تەشبیهی «ئاگر» کراوە بە «باران» و مولائیمی «باران» کە «رشێنە»یە ناوی هێنراوە. «ئاگری زەردەشت»یش شوبهێنراوە بە «ئادەمیزاد» و مولائیمی «ئادەمیزاد» کە «عومر»ە ناوی هێنراوە. وردەکارییەکی جوانیش لەوەدا هەیە کە «بەرق» رووناکی دەدا و روناکیش بە عادەت نیشانەی ئاوەدانییە. کەچی لێرەدا تاقی کیسرای کردووە بە «وێرانە» و وێرانەیش تاریکە.

دڵی سـووتا بـە زەردەشت و بـە کـەسری کـیسرەوی گـریا
ئـەوەندە بـەحری «سـاوا» نـم لە چـاویدا بـووە تـانە[١٧]

ئەتۆش ئـەی نـەفسی بـەد تـینە، بـەبێ جـێ دڵ مـەسووتێنـە
لەبـەر کـەسر و کـەمی دنـیا، بـەسە ئـەم شین و گـریانە[١٨]

هـەموو کـارت بـە حـیلە خـزمەتی فـیکری عـەزازیـلە
عـەزا وەك پـیرەژن مـەگـرە، دیـارە کـاری مـەردانـە[١٩]

بـە زیکـر و فـیکری شـیمەی مـوستەفا وەقـتت مـوسەففا کـە
کـە بـاسی ئـەو سـەفابەخشە، تـەرەبـخێزە، دورڕئـەفشانە[٢٠]

---

(١٧) کەسر: شکان. کیسرەوی: کیسرایی. بەحری ساوا: دەریاچەیەك بووە لە فـەلەستین. لە کتێبەکانی سیرەتدا نووسراوە کەوا لە شەوی لەدایكبوونی پێغەمبەردا وشك بووە.

واتە: ئاوی ساوە ئەوەندە دڵی بۆ کوژرانەوەی ئاگرەکەی زەردەشت و درز تێبوونی تاقی کیسرا سووتا و بەسەریانا گریا، تەڕایی لە چاویا بڕا و بوو بە قوڕە ڕەشە وەك تانەی سەرچاو.

لەم بەیتەیشدا ئیستیعارەیەکی «مَکنیّە» هـەیە. ئـەوەتە «بـەحری سـاوا» شـوبهێنـراوە بـە «بنیادەم» و مولائیمەکەی کە «دڵ سووتان» و «گریان» و «چاو» و «تانە»یە ناویان هێنراوە.

(١٨) تینە، «طین»: قوڕ. مەبەست ئەو مایەیە نەفسی لێ دروستکراوە. کەسر: ناتەواوی.

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

بەجێ غەم مەخۆ، غەم ئەتخوا ئەی نەفسی بێ جا_کار

لەبەر کـەسر و کـەمی دنـیا چـیە ئـەم شـین و ئـەفغانە؟!

لەبەر (ن): لەسەر. (١٩) عەزازیل: شەیتان. عەزا: پرسە. تەعزیە.

(٢٠) شیمە: ڕەوشت. موسەففا: پاڵفتەکراو و پاككراوە. تەرەبخێز: ئەوەی خۆشی و شادمانی لێ بەرز ببێتەوە. دورڕئەفشان: ئەوەی دوڕ بە جیهاندا بڵاوبکاتەوە.

مەحوی لەم سێ بەیتەدا ڕوودەکاتە نەفسی خۆی و پێی دەڵێ: هەی بەدڕەگەز، بەس لە خۆڕایی خەفەت بخۆ و بۆ کەم و کورتی دنیات بگری. بەس فڕوفێڵ بکە و کـەم خـزمەتی شەیتان بکە. وەك پیرەژن دۆژ دامەمێنە. کاری مەردانە دیارە. ئەوەتە مێژووی خۆت خـاوێن

«مــحمّد» ئــیبنی «عــبدالله»ی «عــبدالمــطّلِب»، «هــاشم»
سەفاوەی ولدی «اسماعیل» و سـەفوەی ولدی «عـدنان»ە(٢١)

ئــەوە هـادی سـوبول، تـەنیا ئـەوە مـەبعووسە بـۆسـەر کـول
بەوە خەتمی روسـول، خـاتەم ئـەوە، تـاجی رەسـوولانە(٢٢)

شــەفیعی رۆژی رەســتاخێزە، بــۆ هــەموانــە دەســتاوێز
ئــەوە ئــەو رۆژە وەك خــۆ، «مـا بَـقی صُـمّا و عُـمْیانە»(٢٣)

---

☞

کەیتەوە و دەس بکەی بە بیرکردنەوە لە رەوشتی پێغەمبەر، چونکە هەر بـەوە دڵ خـۆش و دەروون خاوێن دەبێتەوە.

مەحوی لەپاش ئەم بەیتەوە دێتە سەر باسی پێغەمبەردروودی خوای لێ بێ.

(٢١) سەفاوە: سەفوە، پوختە. «وُلد»: جەمعی «وَلَد»ە بەمەعنا رۆڵە و نەوە.

(٢٢) هادی سوبول: رێگا پیشاندەر. سوبول [«سُبُل»]: جـەمعی «سَبیل»ە بـەمەعنا رێگـە. مەبعووس [«مبعوث»]: نێرراو. کول: هەموان. خەتم: دوایی. خاتەم: دوایی پێ هێنراو.

لە نوسخەیەکی‌تردا لەجیاتی «مەبعووسە بۆ سەر کـول» نـووسراوە «مـەبعووسەتە سـەر کول». دیارە ئەمە هەڵەیە چونکە ئەو «تە»یە هیچ مەعنایەك نابەخشێ. لە نوسخەیەکی‌تریشدا نووسراوە «مەبعووس بۆ سەر کول». بەپێی ئەم نوسخەیە نیوە بەیتەکە لەنگییەکی تیا دەبێ و بۆ راستکردنەوەی ئەو لەنگییە پێویست دەبێ تۆزێ لەسەر «ث»ی «مبعوث»ەکە بوەستین. ئێمە لامان وایە مەبەستی «مەحوی» هەر «مەبعووسە» بووبێ لەسـەر شـێوەی نـووسینی فـارسی ئامێزی ئەوسا «هێ»ی سەر «ث»کەی دانەنابێ و تەنها بە زیرەکی خوێندەواران خۆیان پشت ئەستوور بووبێ.

تاجی (ن): فەخری.

(٢٣) شەفیع: تکاکار. رەستاخێز: راستبوونەوە. مەبەست رۆژی قیامەتە کە هەموو مـردوو زیندوو دەبنەوە. دەستاوێز: ئەوەی دەستی پێوە گیر بکرێ.

واتە: هەر ئەوە تکاکاری رۆژی قیامەت و خەڵك تەنیا دەستەوداوێنی ئەو دەبن لەو رۆژەدا و هەر ئەو لەسەر حاڵی خۆی دەمێنێ و سەری لێ ناشێوێ. لەوبەولاوە هەرچی هەیە لەبەر سامی ئەو رۆژە کەڕ و کوێر دەبن.

☜

لە زیکری ئەو دەجۆشێ رەئفەت و، رەحمەت دەبارێ هەم
«رَءُوفٌ» هەم «رَحیمٌ» وەسفی ئەو وەك وەسفی رەحمانە[٢٤]

خودا لەو زیکر و فیکرەم قەت نەکا غافڵ زوبان و دڵ
هەتا غونچە دڵ و، سۆسەن زوبانی باغ و بوستانە[٢٥]

لەگەڵ مەحزی خەیاڵی، دڵ بە جارێ بۆتە کێوی توور
لە کن وەسفی جەماڵی، لێوی واسیف گوڵ بە دامانە[٢٦]

---



حەسرکردنی تکاکاری لە رۆژی قیامەتدا لە پێغەمبەردا (د.خ)، بە مەبەستی باسکردنی بایەخی پایە و شوێنی پێغەمبەرە، ئەگینا بەپێی ئەوەی لە کتێبەکانی ئایینیدا نووسراوە پێغەمبەرانی تر و بەڵکوو پیاوچاکانیش لە رۆژی قیامەتدا تکا بۆ گوناهباران دەکەن.

(٢٤) رەئفەت: بەزەیی.

واتە: رەحم و بەزەیی دەبارێ لە هێنانی ناوی پێغەمبەر (د.خ) ، ئەمەیش شتێکی سەیر نیە، چونکە خوا لە قورئاندا بە «رەوف» و «رحیم»ی ناوبردووە، وەك خۆیشی وا ناوبردووە، ئەوەتە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ جاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ ما عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ واتە: ئەی دەستەی ئادەمیزاد، پێغەمبەرێکتان لە خۆتان بۆ هاتووە، نارەحەتی ئێوەی لا گرانە و، سوورە لەسەرتان، بەزەیی بە موسوڵماناندا دێتەوە و بە رەحمە.

(٢٥) واتە: تا لە باغی ژیاندا دڵ وەك خونچە وایە و زوبان وەك گوڵی سۆسەنە، خوا هەرگیز زوبان و دڵم لە باسکردنی پێغەمبەر و بیر لێ کردنەوەی بێ ئاگا نەکا.

مەحوی ئەم بەیتەی زۆر جوان دارشتووە کە دڵی تیا شوبهاندووە بە خونچە و زوبانی تیا شوبهاندووە بە گوڵی سۆسەن، چونکە شێوەیان لەیەك دەچێ.

(٢٦) توور: کێوێکە لە سینا لە فەلەستین، نووری خوا لێی دا بۆئەوەی حەزرەتی مووسا بیبینێ، بە دەرکەوتنی ئەو نوورە کێوەکە سووتا. واسیف: ئەوکەسەی وەسفی شتێ دەکا. دامان: داوێن.

واتە: بە تەنها بیرکردنەوە لە پێغەمبەر، دڵ لە سۆزدا وەك کێوی توور دەسووتێ و بە تەنها باسکردنی جوانی ئەو لێو ئەوەندە بۆنی خۆش دەبێ وەك گوڵی پیا داهێڵرابێ.

جەلال و شەوکەتی: ئەستۆ شکێنی سەرکەشانی عەسر
جەمال و تەلعەتی: جەوهەرگودازی زوڵمەتستانە(٢٧)

تەماشاکردنێکی: رۆحبەخشی عالەمی مردوو
نیگاهێکی بەتوندی: رەستخێزی عالەمی جانە(٢٨)

لە رۆژی حەرب و زەربا روعب و سامی رۆح ئەکا سەرسام
ئەگەر شێری ژیانی رووبەڕوو بێ، چاری نەژیانە(٢٩)

---

(٢٧) جەلال: شکۆ. سەرکەش: یاخی، ئەوەی سەر بۆ کەس دانانەوێنێ. گوداز: سووتێن. زوڵمەتستان: تاریکستانی.

واتە: شان و شکۆی پێغەمبەر (د.خ) ئەستۆی هاوچەرخە سەرکێشەکانی خۆیی شکاند و جوانی و دیمەنی مایەی تاریکستانی سووتاند.

مەحوی ئەم بەیتەی زۆر هونەرمەندانە هێناوەتەوە کە لەکاتێکدا ئەسپی سەرکێش ئەستۆی سوار دەشکێنێ، دایناوە شان و شکۆی پێغەمبەر ئەستۆی ناودارە سەرکێشەکانی سەردەمی خۆیی شکاندووە و، لەکاتێکدا کە تاریکی تێکڕا ئەنجامی سووتان و رەش بوونەوەیە، ئەو دایناوە جوانی سیمای پێغەمبەر (د.خ) ئاگر بەردەداتە مایە و ناوکورۆکی تاریکی.

(٢٨)نیگاه: لاکردنەوە. رەستخێز: رەستاخێز، راست بوونەوە. جان: گیان.

واتە: بە تەماشاکردنێك گیان دەکاتەوە بە بەری جیهانی مردوودا و، بە لاکردنەوەیەکی توند هەموو جیهانی گیانی بێئاگا هۆشیار دەکاتەوە و دەیانخاتە سەر رێگای راست.

(٢٩)زەرب: لێدان، شەڕەشێر. روعب: ترس. شێری ژیان: شێری تووڕە و رقاوی.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پەیوەندیان بەیەکەوەیە و پێکەوە دێن.

ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

لە رۆژی حەرب و زەربا کێیە راوەستێ لەبەر حەملەی؟!
ئەگەر شێری ژیانە، هەر فیرارە، چاری نەژیانە

رۆح (ن): عەقڵ.

کــە وەقــتێ ئــاڵ و یــارانــی لە خــدمەتیا دەبــن وەك ڕۆح
حەیاتە، نووری چاوە، ئونسی جــانە، مــەحزی ئـیحسانە (٣٠)

گـــەهی دانــیشتنی، کــێوێکــی تــەمکینت لە بــەرچــاوە
لە وەقـــتی ڕۆیــنیدا، هــەر دەڵێی ســەروە خــەرامــانە (٣١)

لە ڕوخســـاری لەتــیفی: گــوڵ، لە جــەعدی عــەنبەرینی دڵ
دەجــوشێت و دەبــارێ، ئــەو گــولستان، ئـەم دلستانە (٣٢)

---

(٣٠) ئونس: هۆی ئولفەت پێوە گرتن.

واتە: لە ڕۆژی شەڕ و هەڵلا و بگردا ئەوەندە بەسامە گیان لێی سەرسام دەبێ، تەنانەت ئەگەر شێری ڕق هەستاو و تووڕەیش ڕووبەڕووی بێ چاری هەر ئەوەیە نەژێ و بکوژرێ. لەکاتێکیشدا کە هاوڕێ و خزمە موسوڵمانەکانی لە دەوری خڕ دەبنەوە، وەك گیان لەناو لەشدا دەبێ بە مایەی ژیان بۆیان و دەبێ بە نووری چاو و هۆی ئولفەت پێوە گرتنی دڵ و چاکەی ڕووتی دوور لە هەموو مەبەست و نیازێك بۆیان.

«مەحوی» لەم دوو بەیتەدا: ئیشارەتی بەو ئایەتە کردووە کە دەفەرموێت: «مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ» واتە: موحەممەد فروستادەی خوایە و ئەوانەی لەگەڵینی سەختگیرن لەگەڵ کافرەکان، بەڵام لەناو خۆیاندا زۆر بەڕەحم و بەزەیین.

(٣١) گەهـ: کات. تەمکین: حورمەت و خۆ بە قورس گرتن. خەرامان: ئەوەی بەنازەوە بەڕێدا بڕوا.

گەهی دانیشتنی (ن): لە دانیشتنیەدا. سەروە(ن): سەروی.

(٣٢) جەعد: مووی لوول. دڵستان: وڵاتی دڵان.

واتە: گوڵ لە ڕوخساری دەجۆشێ و لە مووی لوولی بۆنخۆشیەوە دڵ دەبارێ. بۆیە ڕووی بووە بە گوڵزار و مووی لوولی بووە بە هێلانەی دڵان. مەبەستی لەوەیە وەك چۆن بولبول بەسەر لقی دارگوڵەوە دەنیشێتەوە سەیری گوڵ دەکا، دڵی عاشقانیش بەسەر گێسووی ئەوەوە هێلانەیان کردووە و، هەر تاوێ بایەك تەڵی گێسووی بلەرێنێتەوە، دڵی دڵدارانی لێ دادەوەرێتە خوارەوە.

لەبـی رۆحـی رەوان و، نـێو چـەوانـی رۆژی لێ دەتکێ
زوبـانی تـا شـەکـەررێزە، دەهـانی گـەوهەر ئـەفشانە(٣٣)

مـەلاحەت مـەحوی دیـداری، حـەلاوەت وەقـفی گـوفتاری
تەراوەت نەزری گـوڵزاری، کـە رەشکـی بـاغی ریـزوانـە(٣٤)

وەکوو یـاقووت و بـەردی‌تر، جـەنابی ئـەحمەدی مـورسـەل
کـە تـێفکـری لە ئـینسانە، بـەڵێ، مـا نـەك وەك ئـینسانە(٣٥)

---

(٣٣) واتە: قسەی ئەوەندە خوش و بەتامە گیان لە لێوی دەتکێ و، ناوچاوانی ئەوەندە جوانە رۆژی لێ دەبارێ و تـا قسـە بکـا و زمـانی شـەکـری لێ دابـووەرێ، دەمـی هـەر گـەوهەر بڵاودەکاتەوە، واتە ددانەکانی دەردەکەون.

(٣٤) مەلاحەت: بەخوێیی، کینایەیە لە جوانی. حەلاوەت: شیرینی. تەراوەت: تەڕی و پاراوی. رەشك: خەفەت، بەخیلی‌بردن. ریزوان [«رضوان»]: بەهەشت.

واتە: بەهۆی دیداری ئەوەوە کە لە جوانیدا گەییوەتە ئـەوپەڕ، جـوانـی هـەمووی مـەحو بووەتەوە و، شیرین گوفتاریش هەموو وەقف بووە لەسەر گوفتار و قسەی ئەو و لە چاو تەڕی و پاراوی گوڵزاری رووی ئەودا هەرچی گوڵزاری‌ترە هـەمووی وەك وشك و سیس‌بوو وایـە و تەنانەت ئەوە بووە بەهۆی خەفەتباری باخی بەهەشت و بەخیلی بردنیشی پێی.

وەقفی «ن»: وەفقی.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە.

تەراوەت نەزری گوڵزاری، ئەسەف بۆ ئەهلی حیرمانە

(٣٥) ما: ئەمما، بەڵام.

واتە: ئەگەر ورد ببیتەوە دەزانی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێ هەرچەند یەکێکە لە جینسی ئادەمیزاد، زۆری جیایە لە خەڵکی‌تر، وەك گەوهەر کە لە رەگەزدا لە جینسی بەردە، کەچی ئەوەندە بەنرخە هەرگیز لەگەڵ بەردی‌تر بەراورد ناکرێ.

مورسەل (ن): موختار.

وجـــوودی ئـــەو لەگـــەڵ بـــاقی وجـــوودان ئـەر نـیە فـەرقی
بە قەد رۆح و جەسەد، بـێسـێبـەری خـاریج لە ئـیمکانە(٣٦)

مەگەر ئـەو سـێبـەرانـەی خـەزنە مـەندە کـردووە بـۆ حـەشر
چ دڵســــۆزە کــە لەو گــەرمایەشا ســایەی لەســـەرمانە(٣٧)

لەگەڵ بـێسـایەیی، سـایەی خـەیاڵی کـەوتە سـەر هـەرکەس
چ کـەسدار و چ بـێکـەس، سـەییدە، سـەردارە، سـوڵتـانە(٣٨)

ئـــەوی ســـاتێ لەبـــەر پـــێیـــا ســـەری تـــەسلیمی دانـــابێ
ئـــەبەد مـــالیك ریـــقابی گـــەردنی تـــەسلیمی شـــاهانە(٣٩)

---

(٣٦) واتە: ئەگەر ماددەی لەشی پێغەمبەر، ئەوەندەی جیاوازی گیان و لەش لە ماددەی لەشی خەڵکیتر جیا نەبوایە، مومکین نەدەبوو لەشی سێبەری نەبێ. خۆ دیاریشە لەشی پێغەمبەر سێبەری نەبووە. کەواتە دەبێ ماددەی لەشی ئەو و خەڵکیتر لە هی یەکتر جیا بن.

لە کتێبەکانی سیرەتدا نووسراوە کەوا پێغەمبەر -دروودی خوای لێبێ- سێبەری نەبووە...

(٣٧) خەزمەندە: لە گەنجینەدا هێڵراوە و هەڵگیراو.

واتە: وادیارە پێغەمبەر، دروودی خوای لێ بێ، ئەو هەموو سێبەرەی لەشی خۆی کە دەبوو هەموو تاوێك سیبەری بکردایە، هەڵگرتووە بۆ رۆژی حەشر تـا لەو گـەرما بـەتینەی رۆژی قیامەتدا ئۆممەتەکەی لەبەریا بحەسێنـەوە. کـەواتـە ئـای لەم پـێغـەمبەرە چـەند دڵسـۆزە بـۆ میللەتەکەی!

لە رۆژی حەشریشدا سایەی لەسەرمان نابڕێ.

لەم بەیتەدا حوسنی تەعلیل هەیە بۆ بەیتی پێشوو.

(٣٨) واتە: پێغەمبەر، هەرچەند، لەشی سێبەری نەبووە تا بدا بەسەر خەڵکدا. بەڵام دەوڵەمەند و هەژار هەرکەس کەوتبێتە بەر سێبەری خەیاڵی ئەو. بووە بە گەورە و سەردار.

(٣٩) ساتێ: سەعاتێ. مالیك ریقاب: خاوەنی گەردن، خاوەنی کۆیلە.

واتە: پێغەمبەر زاتێکی ئەوەندە پایە بڵند و بەبەرەکەتە هەرکەسێ تەنها سـەعاتێ سـەری تەسلیم بوون و خۆبەدەستەوەدانی لەبەر پێیدا دانابێ، گەردنی شاهان هەموو بۆ هەمیشە و تا دنیا دنیایە دەکەوێتە دەستی ئەو و دەبن بە کۆیلەی.

**قـــول و بـــەندە و غـــولام و خـادیم و دەربـانی بـەردەرگای:**
**«نەجاشی» و «توببەع» و «هیرقەل»، «عەزیزی میسر» و «خاقان»ە[٤٠]**

**کـــەسێ جـــێ هـەڵتـروشکانێکـی لەو بـەرقاپیە دەسکـەوت**
**بە عاری دێ بـڵێن ئـەم جـێگـە وەك تـەختی سـولەیمانە[٤١]**

**خـــودا پـــێداوەکـــانی فـائیزی ئـیکسیری سـوحبەت بـوون**
**چ من، چی تۆ، مـەلائیك، ئـەنبیا خـۆزگـەی بـە خـۆیـانە[٤٢]**

**عـــولووی مـــەرتەبەی گـــەر شـەممەیێکت تـێ گـەیێنـم مـن**
**دەتـــرسم بـــەردەبارانـــم بکـــەن ئـــەم تـــێنـــەگـەیوانـە[٤٣]**

---

(٤٠) قول: بەندەی رەش. دەربان: دەرگاوان. نەجاشی: لەقـەبی پـادشاهانی حـەبەشە بـووە. لێرەدا مەبەست ئەو نەجاشییەیە کە لە سەردەمی ئەودا ئەسحابەکانی پێغەمبەر لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆلای بۆ حەبەشە و ئەویش رێزی لێ گرتن و پاشانیش پێغەمبەر نامەیەکی بـۆ نووسی بانگی کرد بۆ موسوڵمان بوون. توببەع: لەقەبی پادشاهانی کۆنی یەمەن بووە. هیرقەل: راستەکەی «هیرەقل»ە کە ئەسڵەکەی «هێراکلیووس»ە، ناوی دوانە لە ئەمپەراتووره بێزەنتییەکان، باوك و کوڕ بوون. یەکەمیان لە ٦١٠ تا ٦٤٠ی ز. و دووهەمیان چەند مـانگێ فـەرمانڕەوایـی کردووە. عەزیزی میسر: وەزیری ئەو فیرعەونەی میسر بووە کە حەزرەتی یۆسف لە سەردەمی ئەودا لە فەلەستینەوە گەیشتووەتە میسر. خاقان: لەقەبی پادشاهانی چین بووە.

(٤١) واتە: ئەوەی جێ هەڵتروشکانێکی لە بەردەرگای پێغـەمبەردا دەسگـیر بـبێ، ئـەوەندە سەری بەرز دەبێ بە شوورەیی دەزانێ بەراوردی ئەو جێگایەی بکـەن لەگـەڵ تـەختەکـەی حەزرەتی سولەیماندا.

(٤٢) فائیز: بەختەوەر. ئیکسیر: بە زمانی کیمیاگەرەکان مایەیێکە چیەتی مایەیێك دەگۆڕێ بە مایەیەکی‌تر وەك ئەوە کە جیوە بکا بە زێو و مس بکا بە زێڕ.

واتە: من و تۆ و فریشتە و پێغەمبەران هەموو خۆزگە بەوکەسانە دەخوازین کە ئـیکسیری هاوڕێیەتی پێغەمبەریان دەسکەوتووە و گۆڕیونی و کردوونی بە بنیادەمێکی‌تر.

(٤٣) عولوو: بەرزی. شەممە: کەم.

واتە: پێغەممەر ئەوەندە پایەبەرزە ئەگەر باسی کەمێك لەو پایە بـەرزەی بکـەم بـۆت، ئـەم

نــەزەر دەرکــی عــولووی هــیممەتی نــاکـا یـەقین ئـەمما
لەگــەڵ بـاقی روسـولدا تـێبگـەی، بـۆ فـەرقی بـڕوانـە:[(٤٤)]

شــەفاعەی نــووحە بــۆ کــەنعان و، ئــیبراهـیمە بـۆ ئـازەر
«رســول اللّــە»ە شــافیع بــێ چ بـۆ خـزم و چ بـێگـانە[(٤٥)]

بــە قــوربانی رجــایەك بــم کــە راجــی بــێ مـوحابا بـێ
رجــا قــوربانی یـەئسە، بـێتە سـەر خـۆمـانە خـۆمـانە[(٤٦)]

---

☞

خەڵکە تێنەگەیشتووانە ئەوەندە سەرسام دەبن لەوانەیە بە شێتم بزانن و بەردەبارانم بکەن.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

دەترسم سەنگەسارم کەن بە رۆژ ئەم تێنەگەیوانە

(٤٤) مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٤٥) کەنعان: کوڕە خوانەپەرستەکەی حەزرەتی نووح. ئازەر: بـاوکی حـەزرەتی ئـیبراهـیم. شافیع: تکاکار.

واتە: بیری ئادەمیزاد ناگاتە ئەوە تێبگا پایەی پێغەمبەر چەند بەرزە، بەڵام بۆ ئەوەی شتێکی لێ تێبگەین، بەراوردی دەکەین لەگەڵ پێغەمبەرەکانی تر و دەڵێین: لە رۆژی قیامەتدا حەزرەتی نووح تکای رزگاربوونی کەنعانی کوڕی و، حەزرەتی ئیبراهیم تکای رزگـاربوونی ئازەری باوکی دەکا. بەڵام کە سەرەی تکاکردن هاتەسەر پـێغـەمبەر (د.خ)، تکـا بـۆ هـەموو موسوڵمانان دەکا چ خزم و چ بێگانە.

(٤٦) راجی: تکاکار. موحابا: موحابات، هەڵاوێردن.

واتە: بەقوربانی تکایەك بم کە تکاکەرەکەی کەسی تیا هەڵنەوێرێ بەسەر کەسدا وەك ئەو تکایەی کە پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ دەیکا بۆ هەموو موسوڵمانان. ئەگینا ئەگەر تکـا دەرەتانی ئەوەندە تەسك بێ لە سنووری خزم و کەس و کاری تکاکار دەرنـەچێ، دەبـێ بـە قوربانی نائومێدی و لە نائومێدی بەولاوە ئەنجامێکی تری لێ ناوەشێتەوە.

**کەلیم «أَرِنِي» کـە فـەرموو هـەر جـوابـی «لَـنْ تَـرانـي»ی دی**
**موشەڕڕەف بوو موحەممەد بێ تەڵەب بەو مەرتەبە و شانە(٤٧)**

**عـــورووجی عـــیسەوی تـا ئـاسمان و شـەمسی عـالەم بـوو**
**عـورووجی ئـەحمەدی تـا «لامَکـان» و شـەمسی جـانانە(٤٨)**

**لە زەرفی یـەك نـەفەسدا شـەو هـەزار ئـەندەر هـەزاران سـاڵ**
**زیاتر بەڵکی ڕێ تەی کات و ڕیجعەت کا هـەر ئـەو ئـانە(٤٩)**

---

(٤٧) کەلیم: حەزرەتی مووسا. بۆیە وای پێ دەڵێن چونکە خوا قسەی لەگەڵ کردووە. شـان: شەئن، پایە.

واتە: حەزرەتی مووسا کە داوای لە خوا کرد خـۆی پیشان بـدا. وای وەڵام دایـەوە کـەوا نایبینێ. کەچی حەزرەتی موحەممەد بێ ئەوەیش داوای چاوپێکەوتنی خـوای کـردبێ، خـوا خۆی پیشان دا.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿وَ لَمَّا جاءَ مُوسىٰ لِمِيقاتِنا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ، قالَ لَنْ تَراني﴾ واتە: کە مووسا هات بۆ ئەو جێگەیەی بۆمان دیاری کردبوو، وتی خوایە خۆتم پیشان دە بۆت بڕوانم، خوایش فەرمووی هەرگیز نامبینی.

دی (ن): بوو.

(٤٨) عورووج: سەرکەوتن. عیسەوی: نیسبەت بۆ عیسا.

واتە: خوا حەزرەتی عیسای تا ئاسمان و تا لای ئـەو خـۆرە سـەرخست کـە دنیا ڕۆشـن دەکاتەوە، بەڵام پێغەمبەر (د.خ) لە شوێنی بێ شوێنیش سەرکەوت وگەیشتە لای خواکە ڕۆژی ڕووناك کەرەوەی دڵانە.

مەبەست لە سەرکەوتنی حەزرەتی عیسا ئەوەیە کە جوولەکەکان ویستیان بیکوژن، خـوا یەکێکیانی خستە پێستی ئەو و ئەمی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، وەکوو لە کـتێبـە ئـایینییەکـاندا بەدرێژی باسی کراوە.

(٤٩) نەفەس: هەناسە. ئەندەر: لە. ڕیجعەت: گەڕانەوە. ئان: کات. ئەم بەیتە ئەو «عورووج»ە ڕوون دەکاتەوە کە لەبەیتی پێشوودا باسی لێ کرا و ئیشارەتە بۆ مەسەلەی میعراج. هـەروەها بەیتەکانی پاشەوەیشی هەر باسی میعراج دەکەن.

واتە: سـەرکەوتنێکی وا بوو لە ماوەی هەناسەیەکدا بە شـەو ڕێگای هەزاران هەزار سـاڵی بڕی و هەر لەوکاتەیشدا گەڕایەوە بۆ جێی خۆی...

چ رێــەك؟ بــەو هــەموو شــابالّەوە جــیبریلی «ذِی قُــوَّة»
بـەجێ مـابوو لە رێ، دەیـوت: خـزم مـەیدانـی سـووتانە(٥٠)

کــە گــەییە زاتـی بـاری، نـووری بـێچـوونی لەسـەر بـاری
کە هەڵگیرسا، بە دەوری شەمعی خۆیـا بـوو بـە پـەروانـە(٥١)

قــوبووڵی لێ کــرا هــەرچـی رجـا بـوو، پـێی درا هـەرچـی
عەتا بوو، هـاتەجێ هـەرچـی سـزای ئـیکرامـی مـیهمانە(٥٢)

لەگەڵ هەر خەتوەیەك تـەحسیلی عـیلمێکـی «لَـدُنّی»ی کـرد
لە هی ئەو سەر دەپرسی رۆحی حیکمەت نووری عیرفانە(٥٣)

---

(٥٠) واتە: ئەو رێگا دوور و درێژەیش کە لە ماوەی هەناسەیەکدا بڕی و رێگایەکی ئەوەندە سەخت بوو، حەزرەتی جوبرەئیل بەو هەموو هێز و تواناوە کە هەیەتی پەکی تیا کەوتبوو، نەیدەتوانی بڕوا، دەیوت ئەگەر تۆزێکی تر سەرکەوم ئاگرم تێبەردەبێ.

ناوبردنی جوبرەئیل بە «ذی قوّة» واتە: بەهێز، لەسەر ئەوەیە کە هەندێ لەوانەی مەعنای قورئانیان لێداوەتەوە وتوویانە مەبەست لە «ذی قوّة» لەو ئایەتەدا کە دەڵێ: «ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ» واتە: بەهێز و پایەدارە لای خوای خاوەن عەرش، حەزرەتی جوبرەئیلە.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

بەجێ مابێ بڵێ: ئەمجارە رێگەی عیشق و سووتانە

(٥١) «باری»ی یەکەم: خوا. بێچوون: بێهاوتا. یـا مـەبەست لە خـوایـە یـا سـیفەتی نـوورە. «باری»ی دووهەم: فیعلی بارینە.

واتە: کە پێغەمبەر گەیشتە حوزووری خوا نووری خوای بەسەردا باری. کە نووری خوایش لە بەردەمیا دەرکەوت، بۆی بوو بە مۆم و ئەمیش بەدەوری ئەو مۆمەدا بوو بە پەروانە.

لە نێوان هەردوو «باری»دا جیناسی تەواو هەیە.

(٥٢) سزا: شایان.

واتە: هەر تکایەکی کرد هەمووی بۆ جێبەجێ کرا و، هەر بەخششێ هەبوو هەمووی درایە و هەرچی شایانی قەدرگرتنی میوان بێ لەگەڵی کرا.

(٥٣) خەتوە «خطوة»: هەنگاو. «لدنّی»: نیسبەتە بۆ «لدُن» بەمەعنا لا.

به «مافِیها»یەوە هەرچی هەیە عیلمی کورەی نۆ چەرخ
بە قەترێکی بزانە، دیدەکەم، لەو بەحری عەممانە(٥٤)

لەبەر نوقسانی تەشبیهم پەشیمانیشم و دەشلێم
کە رۆیی، بەدری کامیل، هاتەوە خورشیدی پەخشانە(٥٥)

بە ئاوابوونی نووری ون دەبێ خورشید و ئەم شەمسە
لە ئاوابوونیا نوور و ئیزائەی سەد دووچەندانە(٥٦)

---

☞

واتە: لەم سەرەوەکە رۆیی بۆ ئاسمان لە هەر هەنگاوێکیا زانستێکی تایبەتی لەلایەن خواوە وەرگرت. ئەگەر لە خەڵاتی ئەوسەریشی دەپرسی، پوختە و خۆلاسەی تێگەیشتن و خواناسی لەگەڵ خۆی هێنایەوە.

لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەرابەر بە «تەحسیلی عیلمێکی لەدوننی کرد» نووسراویشە: «تەحسیلی سەد عیلمی غەریبەی کرد».

(٥٤) نۆچەرخ: حەوت ئاسمان و عەرش و کورسی. قەترێکی: قەترەیێکی، دڵۆپێکی. بەحری عەممان: مەبەست لە کەنداوی عوممانە لە نێوان ئێران و عوممان‌دا لە پێشدەمی کەنداوی عەرەبەوە. کینایەیە لە پێغەمەر درووودی خوای لێ بێ.

واتە: هەرچی زانستی ناو ئاسمان و عەرش و کورسی هەیە و هەرچی زانست لەبارەی خۆیشیانەوە هەیە، هەمووی لەچاو ئەو زانستەداکە پێغەمبەر بوویەتی وەك دڵۆپێك ئاو وایە لە چاو دەریای عوممان‌دا...

لەم بەیتەدا ئیستیعارەیەکی مەکنییە هەیە ئەوەتە زانستی پێغەمبەر شوبهێنراوە بە دەریای عوممان و مولائیمی پێ شوبهێنراوەکەیش وشەی «قەترێکی»یە.

(٥٥) واتە: هەرچەند لەبەر ناتەواوی تەشبیهەکەم پەشیمانم لەم جۆرە شوبهاندنە، بەڵام چونکە هیچی‌ترم بە خەیاڵدا نایەت ناچارم دەڵێم کەوا پێغەمبەر کە تەشریفی برد بۆ میعراج وەك مانگی چواردە وابوو، کە گەڕایەوە بووبوو بە رۆژی رووناك.

(٥٦) شەمس: رۆژ. ئیزائە [«إضائَة»]: روونکردنەوە. دووچەندان: دوو قات.

واتە: بەڵام ئەم جیاوازییەکی زۆریشی هەیە لەگەڵ رۆژ، چونکە رۆژ کە ئاوابوو رۆشنایی نامێنێ، کەچی ئەم پاش وەفاتیشی زیاتر لە سەردەمی ژیانی، تیشك دەداتەوە، چونکە ئایینەکەی لەوسا زیاتر بڵاو بووەتەوە.

ئــەوەندەی لێ دەزانــم بــەم نــەزانــی خــۆمــەوە «مــەحوی»
بــە چــاوی ســەر خــودابــینە، بــە چــاوی دڵ خــودازانــە[٥٧]

چ چاوێ؟ کوحلی «مـا زاغَ البـصَر» سـورمەی سـەوادی بـێ
مونەووەر بێ بە نووری روئیەتی بـێ چـوون و چـەندانـە[٥٨]

چ دڵ؟ قــەترێکــە، ئــەمما عــەرشی رەحــمانی تـیا دەرجـە
چ دڵ؟ نــوقتێکـە، ئـەمما مـەرکەزی پـەرگـاری ئـیمکانە[٥٩]

---

(٥٧) واتە: هەر ئەوەندەم پێ دەکرێ لەبابەتی میعراجەوە بڵێم لەو سەفەرەدا بە چاوی سەر خوای دی و بە چاوی دڵ ناسی.

(٥٨) کوحل: کلە. سەواد: رەشی. روئیەت: بینین.

واتە: بۆیە توانی بە چاوی سەر خودا ببینێ چونکە چاوی بە کلەی ﴿ما زاغَ الْبَصَرُ وَ ما طَغیٰ﴾ رێژراوە و بە نووری دیتنی خوا رۆشن بووەتەوە.

مەعنای ئەم ئایەتە ئەوەیە چاوی لە دیتنی ئەو هەموو شتە سەرسامکەرانەی ناو ئاسمانەکان نەشێوا و رەشکە و پێشکەی نەکرد. گەلێك لەوانەی مەعنای قورئانیان لێ‌داوەتەوە وتوویانە ئەم ئایەتە باسی پێغەمبەر دەکا لە شەوی میعراجدا.

(٥٩) قەترێك: قەترەیێك. دەرج: نووسراو. نوقتێك: نوقتەیێك. پەرگار: ئامێرێکی دوو لقە لە ئامێرەکانی ئەندازیاری، دائیرە و نیودائیرەی پێ دەکێشن و ئەندازەی خەتی راستی پێ دەزانن.

واتە: کام دڵە ئەو دڵەی کە پێغەمبەر خودای بە چاوی ئەو ناسیوە؟ ئەو دڵەیە کە هەرچەند خۆی بەنیسبەت ئەم گێتییەوە ئەوەندەی دڵۆپە ئاوێکە، بەڵام عەرشی خودای تیایە، وەك لە حەدیسدا وتراوە: «قَلْبُ الْمُؤْمِنِ عَرْشُ الرَّحْمٰنِ» واتە: دڵی موسوڵمان عەرشی خودایە، بەم مەعنا ئینسان تا موسوڵمانتر بێ باشتر خوا لەدڵیا جێگیر دەبێ. ئەو دڵەیە کە هەرچەند خۆی ئەوەندەی نوختەیەکە، بەڵام نوختەیەکی ئەوەندە گرنگە نووکی پەرگاری عالەمی مومکینات لەویادا جێگیر بووە. ئەمە ئیشارەتە بۆ حەدیسی قودسی: «لَوْلاكَ لَوْلاكَ لَما خَلَقْتُ الْأَفْلاك» کە خوا بە پێغەمبەری فەرمووە و واتە: ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئەم گێتییەم دروست نەدەکرد.

دەشگونجێ وشەی «قەترێکە» بە «قوترێکە» بخوێنرێتەوە. قوتر لە زاراوەی ئەندازیاریدا خەتێکی راستە لە سەرێکی دائیرەوە دەست پێ‌دەکا و بە مەرکەزی دائیرەکەدا تێ‌دەپەڕێ و دەگاتە ئەوسەری دائیرەکە و موحیتی دائیرەکە دەکا بە دوو بەشی چوونیەکەوە.

مەعنای بەیتەکە لەسەر بناغەی شوبهاندن، بەم پێیەش، دێ.

فەقەت چاوی حەسوود و قەلبی مونکیر کوێر و بێدەرکە
لەم ئیدراکاتە، بەهرەی هەر عەزابی یەئس و حیرمانە[٦٠]

دەبێ چاو و دڵێکی پاك و بێغەش میسلی ئاوێنە
ببێ ئەو سوورەت و مەعنایە بنوێنێ «کما کانَ»[٦١]

خودا ئەم ئاینەی لائیق بە بووبەکر و عومەر دیوە
کە ئەووەڵ سانیو، سانی شەرەفیابە بە «لَو کانَ»[٦٢]

لە بەعدی ئەو دووە عوسمانی «ذی النّورین»ە «ذوالأنوار»
عەلی شاهی ویلایەت، بابی عیلم و شێری یەزدانە[٦٣]

---

(٦٠) واتە: دڵی پێغەمبەر ئەو دڵەیە کە باسمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئینسانی کینەدار دەڵێی چی کە چاوی لە ئاستی ئەم راستیانە کوێرە. چی دەکەی لە ئینسانی گوێ ناڕایەڵ کە دڵی ئەوەندە تێنەگەیشتووە، ئاگای لەم راستیانە نیە. ئەمانە لەبەر ئەم وەزعەیان هەر بەدبەختی و نائومێدییان بۆ دەمێنێتەوە و بە بەهرەی تێگەیشتنی راستی ناگەن.

(٦١) واتە: هەموو چاو و دڵێك لەوانە نین ئەم راستییە ببینن و لێی حاڵی ببن... چاو و دڵێکی وەك ئاوێنە پێویستە بۆ ئەمە. ئەو سوورەت و مەعنای پێغەمبەرە وەك خۆی چۆنە وا پیشانی بدا.

(٦٢) واتە: خوا دڵی وا وەك ئاوێنە بێگەردی بە ئەبووبەکر و عومەر رەوا بینیوە کە یەکەمیان دووهەمی ئەو دووکەسە بوو لە شەوی کۆچکردنی پێغەمبەردا لە مەککەوە بۆ مەدینە، چوونە ئەشکەوتی سەور، کە ئەویان پێغەمبەر خۆی بوو. دووهەمیشیان ئەوکەسە بوو پێغەمبەر پێی فەرموو: «لَوْ كَانَ بَعْدِي نَبِيٌّ لَكَانَ عُمَر» واتە: ئەگەر پێغەمبەرێکی تر پاش خۆم بوایە، عومەر دەبوو.

مەسەلەکەی ئەبووبەکر ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ﴾ واتە: دووهەمی دووکەس بوو لەکاتێکاکە لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون. مەبەست لەم دووهەمە لێرەدا پێغەمبەرە، کەچی لە بەیتەکەدا مەبەست لێی ئەبووبەکر بوو. بۆ چاری ئەم ناکۆکییەی نێوان بەیتەکە و ئایەتەکە دەڵێین راستەکەی کەسیان نە یەکەمە و نە دووهەم و هەرکامیان بەشبەحاڵی ئەویان دووهەمە و ئەوی تریان یەکەم.

(٦٣) ویلایەت: لە «موالاة»ەوە هاتووە کە ئەوەتە ئەوسا لەناو عەرەبدا باو بووە کەسێك هۆزی

بــــەسەریانا، بـــەسەر بـــاقی ســـەحابە و ئـــال و یـــارانـــا
بـــبارێنـــێ خـــودا هـــەر ئـــان و وەقت و ســـاعە «رِضْـــوانَـــە» (٦٤)

به نووری عەکسی پێغـەمبەر ئـەوەندە مـونعەکـیس بـووبوون
غـــەریبی تـــازە هـــاتوو دەیـــوت: ئـــەم پـــێغـــەمبەرستانە (٦٥)

خـــودا هـــەر مـوعجیزەی لائـیق بـە هـەر پـێغـەمبەرێ دیـوە
هەموو ئەو مـوعجیزاتـەی داوە بـەم سـەرداری هـەموانـە (٦٦)

---



نەبووبێ چووەتە پاڵ هۆزێك و هەموو ئەو مافانەی دەسگیر بووە کە ئـەندامـانی ئـەو هـۆزە بوویانە وەکوو لەسەرکردنەوە و لەسەر هاتنەدەنگ و هەموو ئەو ئەرکانەشی کەوتووەتە ئەستۆ کە لە ئەستۆی ئەندامانی هۆزەکەدا بوون. باب: دەرگا.

بۆیە بە عوسمانی کوڕی عەففان وتـراوە «ذی النّـورین» چـونکە دوو کـچی پـێغـەمبەری مارەکردووە. بۆیە بە عەلی کوڕی ئەبووتالیبیش وتراوە «شاهی ویلایەت» چونکە پـێغـەمبەر لەبارەیەوە فەرموویەتی: «مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ» واتە: ئەوەی من دۆسـتی بـم، عـەلیش دۆستیەتی. بۆیەش پێی وتراوە «بابی عیلم» چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: «أَنَا مَدِينَةُ الْعِلْمِ وَ عَلِيٌّ بَابُهَا» واتە: من شاری زانستم و عەلی دەرگاکەیەتی. بۆیەش بە «شێری یەزدان» ناوی براوە چونکە لە غەزادا بە «أسد اللّه» ناوبانگی دەرکردووە.

ئەم بەیتە لە دەسنووسەکەی مەحوی خۆیدا نیە، بەڵام لە دەسنووسەکەی شێخ عومەری کوڕیدا هەیە.

(٦٤) ئان: کات. ساعە: سەعات. «رضوانە»: ڕەزامەندی خۆی.

(٦٥) مونعەکیس: وێنە وەرگرتوو.

واتە: ئەم خەلیفە و ئەسحابانەی پێغەمبەر ئەوەندەیان لە نوور و بەرەکەتی ئەو وەرگرتبوو، هـەر نـاشارەزایـەك رووی بکـردایـەتە مـەدینە لە وەزعـیان سـەرسام دەبـوو و مـەدینەی بـە پێغەمبەرستان دەزانی.

(٦٦) واتە: پێغەمبەری ئیسلام هەموو ئەو موعجیزانەی بووە کـە هـەرکام لە پـێغـەمبەرەکـان بوویانە. ئەم موعجیزانە لە بەیتەکانی پاشەوەدا باس دەکرێن.

**یەدی بەیزا چیە، هەر تاقە ئەنگوشتێکی چەند ئیعجا-**
**-زی لێ زاهیر بووە، هەر یەك وەكوو ماهێ كە تابانە(٦٧)**

**ئیشارەی یەك سەرئەنگوشتی، مەهی لەو دوورەوە شەق كرد**
**هەر ئەو ئەنگوشتە بوو دەتوت فوارەی ئاوی حەیوانە(٦٨)**

---

(٦٧) یەدی بەیزا [«ید بیضاء»]: دەستی سپی. موعجیزەیەكی حەزرەتی مووسایە، ئەوەتە دەستی دەكرد بە باخەڵیدا و دەردیدەهێنا وەك چرا دەگرا. لە قورئانیشدا بە ئایەتی: ﴿وَ نَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ﴾ وە چەند ئایەتێكی تر ئیشارەتی بۆكراوە. ئایەتەكە واتە: كە دەستی لە باخەڵی دەرهێنا، هەركەس بۆی بڕوانییایە وا دەهاتە پێش چاوی كە سپی بێ. ئەنگوشت: پەنجە. تابان: تیشكدار.

واتە: موعجیزەی دەستی سپی كە موعجیزەی حەزرەتی مووسا بووە، لەچاو موعجیزەكانی پێغەمبەردا ئەهمیەتێكی ئەوتۆی نیە، چونكە هەركام لە پەنجەكانی ئەم چەند موعجیزەی وەك موعجیزەی دەستی سپی مووسای لێ دیاری داوە، مەبەستی لەوەیە هەر پەنجەیەكی پێغەمبەر بگری چەند ئەوەندەی دەستی مووسا موعجیزەی لێ وەشاوەتەوە. هەركامیان وەك مانگی تابان لە دنیادا دیاری بووە.

دەتوانرێ رستەی «وەكوو ماهێ كە تابانە» بەمجۆرەیش بخوێنرێتەوە: «وەكوو ماهێكە تابانە».

(٦٨) ئاوی حەیوان: ئاوی حەیات. لە ئەفسانەی كۆندا هەیە كەواكانی ئاوێكە لە تاریكاییەكدا هەركەس لێی بخواتەوە هەرگیز نامرێ.

واتە: بە ئیشارەتێكی سەرپەنجەی مانگی لەت كرد. هەر ئەو سەر پەنجەیەش بوو كە مانگی پێ لەت كرد، جارێكیان ئاوێكی پاك و پیرۆزی وەك ئاوی حەیاتی لێهات.

بە نیسبەت موعجیزەی یەكەمەوە لە كتێبەكانی سیرەتدا هەیە كەوا جارێكیان پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ بۆ بەرپەرچ دانەوەی كافرەكان بە پەنجە ئیشارەتی بۆ مانگ كردووە و كردوویە بە دوو لەتەوە. تەنانەت هەندێ لە زانایانی ئایین دەڵێن ئایەتی: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾یش كە واتە قیامەت نزیك بووەتەوە و مانگ لەت بوو، ئیشارەتە بەم رووداوە. بەنیسبەت موعجیزەی دووهەمیشەوە هەروا لە كتێبەكانی سیرەتدا هەیە كەوا جارێكیان لە غەزایەكدا ئەسحابەكان تەنها كاسەیەك ئاویان لا بوو، دیارە بەشی هەموویانی نەدەكرد، پێغەمبەر پەنجەی

سـەری کـرد ئـاو ئـەوەندە، لەشکـرێکـی سێسـەدی دا ئـاو
لەگـەڵ ئـاوی وزوو، بـەخوا ئـەو ئـاوە ئـابڕوومـانە(٦٩)

هـەر ئـەو ئـاوە بـووە تـۆفـانی داغسـتانی کـوفر و شـیرك
هـەر ئـەو ئـاوە تـەراوەتبـەخشی بـاغستانی ئـیمانە(٧٠)

شەوی هیجرەت کـە ئـەعدا زۆری هـێنـا، مشـتەخاکـێ بـوو
پـیا چـەندن، دەبـەنگ و کـوێر و کـەڕمـان ئـەو لەعـینانە(٧١)

---

☞

خستە ناو کاسە ئاوەکە، ئاو لەنێوان پەنجەکانیەوە هەڵقوڵی بەجۆرێ کە لەشکرێکی سێسەد کەسی ئاویان لێ خواردەوە و دەستنوێژیان پێ گرت، وەك لە سێ بەیتی داهاتوودا باسی لێ دەکا...

شەق (ن): لەت.

(٦٩) وزوو [«وضو»]: دەستنوێژ.

(٧٠) داغستان: وڵاتی ڕەقەن و شاخاوی. ناوی یەکێ لە وڵاتەکانی قەفقازیشە. تەراوەتبەخش: ئەوەی تەڕی و شینی بکاتەوە بەگیانی درەختدا. باغستان: وڵاتی باخاوی.

وا بـەخەیاڵا دێ ئـەم هـێنـانی نـاوی «داغسـتان»ە لەگـەڵ وشـەی «کـوفر» و «شـیرك»دا پەیوەندییێکی بە داگیرکردنی داغستانەوە بێ لەلایەن سوپای رووسیای قەیسەرییەوە.

ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

هەر ئەو ئاوە بیناغەی مەحکەمی کوفری بە ئاودا دا
هەر ئەو ئاوە تەراوەتبەخشی بـاغی دیـن و ئـیمانە

(٧١) ئەعدا: «اعداء»، جەمعی «عدو»ە بەمەعنا دوژمن. لەعین: مەلعوون، لە ڕەحمەتی خوا دوور.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ.

ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

وەکوو ئەو مشتە خاکە و ئەو هەموو «أعدی عدو»ی دینە
کە تێی گرتن، دەبەنگ و کوێر و کەڕ مـان ئـەو لەعـینانە

لەناو ئەو گورگ و ورچ و سەگ گەلە دەرچوو «بِإِذْنِ اللّه»
بە یاری غارەوە، یاری لە باری، ڕێ لەبەریانە(٧٢)

وەکوو خورشید و مەه پێی سەیریان لێ هەڵبڕی تا غار
لە غارا سەیری کرد ئەعدا کە وەك سێبەر لە دوویانە(٧٣)

بە یەك دوو عەنکەبووت و کۆتری بێ‌فام و بەستەزمان
شوعوور و فەهمی گۆڕی لەو سەگ و ئیبلیس و دێوانە(٧٤)

---

(٧٢) یاری غار: مەبەست لە حەزرەتی ئەبوویەکرە. یاری: یارمەتی. باری: خوا.

واتە: ئەو شەوە کە لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەگەڵ حەزرەتی ئەبووبەکردا بەرەو ئەشکەوتی «سەور» کەوتەڕێ، کافرەکان پێیان زانین، ئەویش لەوە زیاتری لەگەڵ نەکردن کە مشتێ خۆڵی کرد بە روویاندا و، بەو مشتە خۆڵە کوێر وکەڕ و دەبەنگی کردن و ئەمانیش ڕێیان بۆ چۆڵ بوو توانییان لە چنگی ئەوکافرە وەك سەگ و گورگانە دەرباز بین و بە یارمەتی خوا ڕێ بگرنەبەر.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

بە یاری غارەوە پێی نایە ئەو چۆڵ و بیابانە

لە نێوان «یاری» و «یاری»دا جیناسی تەواو و، لە نێوان ئەوان و «باری»دا جیناسی ناتەواو هەیە.

(٧٣) سەیری «ی یەکەم»: ڕۆیشتن.

مەعنای ئەم بەیتەیش لەگەڵ بەیتی پاشەوەیدا دێ.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوە:

لە غارا تێگەیین ئەو جەمعە مەلعوونە لە دوویانە

(٧٤) عەنکەبووت: جاڵجاڵۆکە. ئیبلیس: شەیتان.

واتە: پێغەمبەر و ئەبووبەکر وەك مانگ و ڕۆژ سەرکەوتن بۆ ئەشکەوتی «سەور». کافرەکان پێیان زانیبوون، وەك سێبەر دوایان کەوتن بیانگرنەوە. خوایش چەند جاڵجاڵۆکە و کۆترێکی نارد، جاڵجاڵۆکەکان دەرگای ئەشکەوتەکەیان تەنی و کۆترەکەیش هێلانەی تیا کرد. کە کافرەکان دییان دەرگای ئەشکەوتەکە تەنراوە و کۆتریش هێلانەی تیا کردووە، وتیان دیارە کەسی تیا نیە. بەوجۆرە ئەوان سەریان لێ شێوا و گەڕانەوە و ئەمانیش ڕزگار بوون.

بەهەشتی داخڵی «یەسریب» دەبێ، «طوبی» لەبۆ ئەنسار
بە کوففارانی مەککە تا ئەبەد «یا وَیْلَنا» مانە(٧٥)

ئەگەر ئەم هیجرەتە نەبوایە، دین ئەم شەوکەتەی کەی بوو
کە هەرکەس تێبگا بەم دینە نەسخی جوملە ئەدیانە(٧٦)

بە هیجرەت، غیرەتی دینی موهاجیر، خدمەتی ئەنسار
لە قووە هاتە فیعل و بوو لە عالەمدا بە دەستانە(٧٧)

---



لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەرابەر بە «لەو سەگ و ئیبلیس و دێوانە»، «لەو هەموو ئیبلیسی دەورانە»یش نووسراوە.

(٧٥) یەسریب [«یثرب»]: ناوی شاری مەدینە بووە پێش ئیسلام. ئەنسار [«انصار»]: موسوڵمانانی مەدینە کە یارمەتی پێغەمبەر و ئەسحابە کۆچکردووەکانی مەککەیان دا.

واتە: بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ئەوەی بەهەشتی نەبێ ناچێتە مەدینە و کافر ئەگەر تێیشی بچێ تیا نامێنێتەوە. کەواتە ئەسحابە کۆچکردووەکان هەموو بەهەشتین. خۆزگەیش بەو مەدینەیی‌یانە کە یارمەتی پێغەمبەریان دا و بانگیان کرد بۆلای خۆیان. کافرە مەککەییەکانیش هەر هاواریان بۆ دەمێنێتەوە و دەبێ هەر بڵێن هەی قور بەسەر خۆمان!.

وشەی «طوبیٰ» ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَآبٍ﴾ واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە خوا بووە و کاری چاکیان کردووە، خۆزگەیان پێ دەخوازرێ و ئەنجامێکی باشیان دەبێ. رستەی «یا ویلَنا»یش ئیشارەتە بۆ ئایەتی: ﴿يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ واتە: قوڕمان بەسەر چاکمان نەکرد بە خۆمان. یاخود ئیشارەتە بۆ یەکێکی تر لە ئایەتەکانی لەم چەشنە.

(٧٦) نەسخ: هەڵوەشاندنەوە. جوملە: هەموو.

واتە: ئەگەر پێغەمبەر هەر لە مەککە بمابایەتەوە و کۆچی نەکردایە بۆ مەدینە، ئایینی ئیسلام پایەی ئەوەندە بەرز نەدەبووەوە بگاتە رادەیەك هەمووکەس تێبگا بۆ ئەوە هاتووە هەموو ئایینێکی پێ هەڵوەشێتەوە.

(٧٧) قووە: «قوّة»، ئەوەی نەهاتبێتە دی، بەڵام بگونجێ بێتە دی. فیعل، «فعل»: ئەوەی هاتبێتە دی و بووبێ بە راست. دەستانە: داستان، راز و داستان و ئەفسانە.

**لە فەیزی هیجرەتە ئەسحابی «بەدر» ئەمشەو هیلالی بوون**
**سبەی هەریەك بووە بەدرێكی كامیل ئەو هیلالانە(٧٨)**

**چ هیجرەت؟ شەهدی وەسڵ، ئارامی جانە بۆ هەواخواهان**
**چ هیجرەت؟ بۆ عەدوو تەعزیبی رۆح و زەهری هیجرانە(٧٩)**

---

☞

واتە: لەسایەی كۆچكردنەوە بوو، غیرەتی ئەسحابە كۆچكردووەكانی مەككە و خزمەتی ئەسحابە گفتی یارمەتیدەرەكانی مەدینە دەركەوت و لە توانای هاتنەدییەوە بوو بە راست و هاتە دی و لە عالەمدا بوو بە راز و قسەی سەر زاری خەڵكی.

(٧٨) بەدر: مانگی چواردە. دێیێكە لە باشووری رۆژاوای مەدینەوە شەڕێكی قورسی لە نێوان هاوڕێكانی پێغەمبەر و بتپەرستەكانی مەككەدا تیا روودا، شەڕەكە بە سەركەوتنی موسوڵمانەكان دوایی هات و دەسەڵاتی پێغەمبەری پێ جێگیر بوو. ئەسحابی بەدر: ئەو هاوڕێیانەی پێغەمبەر كە لەم شەڕەدا بەشدار بوون. ئەمانە پلەیەكی بەرزیان لە ئیسلامدا هەیە. هیلالی: وەك مانگی یەكشەوە.

واتە: ئەسحابەی پێغەمبەر كە وەك مانگی چواردە تەواو و رووناكە. یا ئەو ئەسحابانە كە پاشان غەزای بەدریان كرد، لە شەوی كۆچكردندا وەك مانگی یەكشەوە لاواز و بێهێز بوون. كەچی لەسایەی كوچكردنەوە، سبەینێ كە گەیشتنە مەدینە، یا پاش غەزای بەدر، ئەوەندە بەهێز بوون هەریەكێ بوون بە مانگێكی چواردە.

دەگونجێ «هیلالی» بە «هیلالێ»یش بخوێنرێتەوە و بەوجۆرەیش مەعنای بەیتەكە دێ.

لە وشەی «بەدر»دا لەتافەت و، لە نێوان «بەدر» و «هیلال»دا تەناسوب هەیە.

ئەم بەیتەیش لە دەسنووسەكەی مەحوی خۆیدا نیە.

(٧٩) شەهد: شیلەی هەنگوێن. هەواخواه: لایەنگر. هیجران: دووری.

مەبەست لەوە كە ئەم كۆچكردنەی پێغەمبەر (د.خ) مایەی عەزابی رۆح و دەردی دوورییە بۆ دوژمنان، ئەوەتەكەوا پێغەمبەر و یارانی پاش كۆچكردنیان لە ژێر دەسەڵاتی دوژمنا نەمان و بوون بە مایەی دڵ نارەحەتی بۆ كافرەكانی مەككە.

جانە (ن): جانا، بەڵام مەعنا نادا بەدەستەوە.

هـەواخـواهـی «عَـلَیْهِ الرَّحـمَةَ وَالرِّضـوان»یـان بـۆ مـا
ئـەعادیشی «عَـلَیه اللَّـعْنَة»یـە بـەشیان و بـەسیانە(٨٠)

کـەسێ ئـایەی «عَـفا اللّٰـه عـنْكَ» مـەحزی دڵـنەوایـی بـێ
«مَـعاذَ اللّٰـه» دڵی ئـەو رەنـجەکـردن عـەینی خـوسرانـە(٨١)

کەسێ بێنـێتـە نـوتق ئـاسك، بـەعیر و سـووسەمار و گـورگ
بە تەسدیقی مـوقیرڕ بـن یـەك بـە یـەك ئـەم بـێزوبـانانە(٨٢)

---

(٨٠) ئەعادی: جەمعی «اعداء»ی جەمعی «عَدو»وە. مەبەست لەم دوو جار جەمعکردنەوەیە گەیاندنی مەعنای توندی دوژمنایەتییەکەیە.

واتە: لایەنگرانی پێغەمبەر رەحمەت و رەزامەندی خوایان بۆ ما. دوژمنەکانیشی لەعنەتی خوا بوو بە بەشیان و بەسیشیانە و شایانی لەوە پتر نین.

(٨١) مەحز [«محض»]: رووت، تەنها بۆ. رەنجەکردن: ئازاردان. خوسران: زەرەرکردن.

لە غەزای خەندەقدا هەندێ لە دوورووە بە دیمەن موسوڵمان و بە دڵ کافرەکان هاتنە لای پێغەمبەر و پێیان وت: ناتوانین بێین بۆ غەزا و داوایان لێ کرد رێگایان بدا بەشدار نەبن، ئەویش رێگای دان. تا خوا ئایەتی نارد بۆ پێغەمبەرکەوا: ﴿عَفَا اللّٰهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ حَتّٰى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَ تَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾واتە: خوا لێت خۆش بێ، بۆچی رێگات دان؟ دەبوو رێگات نەدانایە تا درکەوتایە کامیان بەراستی ئیشی هەیە و ناتوانێ بێت بۆ غەزا وکامیان درۆ دەکا، چونکە ئەگەر رێگاشت نەدانایە هەر نەدەهاتن و دەتزانی درۆزنن.

جا مەحویش ئیشارەت بۆ ئەم رووداوە دەکا و دەڵێ: پێغەمبەرێك خـوا لە شـوێنـی وادا بەمجۆرە دڵی بداتەوە، پەنابەخوا هەرکەس دڵی ئازار بدا لە زیان بەولاوە هیچی نایەتە رێ.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

ئەوی ئینکاری جاهی ئەو بکا بووجەهل و شەیتانە

(٨٢) نوتق: قسەکردن. بەعیر: حوشتر. موقیرڕ «مُقِرّ»: ئەوەی دان بە شتێکدا بنێ.

وەڵامی ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە بەیتی پاشەوەتردایە.

بــە ئــەمری یـا ئـیشارەی بـەس درەخـتی ریشـە دابـەستوو
لە رەگ دەربــێت و بــێتــە خـدمەتی رەقسـانە رەقسانە[٨٣]

بە تەکـزیبی کـەسی وا، نـاکـەسێ جـورئەت بکـا «لا شكّ»...
سـەگـی هـارە، بـەرازە، مـولحیدە، بـووجەهلە، شـەیتانە[٨٤]

سـەبیر «اهْـبِط» ئـیفادەی بـوو، حـیرا «اِیتِ اِلَـیَّ»ی عـەرز
نــەوەك ئــەو وەحشـیانە پـڕ دەنـە ئـەو رۆحـی ئـینسانە[٨٥]

لە دەســتیدا کــە بــەردە وردە دەســتی کــردە تــەسبیحات
چووە سێ دەستیکەو هەر جۆشی بوو «سُبْحانَ سُبحانَ»[٨٦]

---

(٨٣) رەقسانە رەقسانە: بە سەماکردنەوە.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

لەسەر ئەمرو ئیرادەی بەس درەختی ریشە رۆ بردووم

(٨٤) بووجەهل: عەمری کوڕی هیشامی سەرکردەی بنەماڵەی بەنی مەخزووم کە یەکێکە لە بنەماڵەکانی قوڕەیش. لە دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەر و ئایینی ئیسلام بوو، ساڵی ٦٢٣ی ز، لە شەڕی بەدردا کوژرا. بووە بە کینایە لە کەسێ کە لە رادەبەدەر دوژمنی موسوڵمانەتی بێ.

ئەم بەیتە وەڵامی دوو بەیتەکەی پێشەوەی بوو.

(٨٥) سەبیر [«ثَبِیر»]: شاخی موزدەلیفە لە نزیکی مەککە. حیرا: ئەو ئەشکەوتەی پێغەمبەر خەڵوەی تیا دەگرت و یەکەمجار وەحی تیا بۆ هات.

واتە: کاتێك کە پێغەمبەر لە تاو دەس‌درێژی کافرەکان مەککەی بەجێ‌هیشت، شاخی «سەبیر» بانگی لێ‌دەکرد: داپەڕە نەوەك کافرەکان بەسەر منەوە بتکوژن. ئەشکەوتی حیرایش هاواری لێ‌دەکرد: وەرە لام خۆت لە مندا بشارەوە نەوەك ئەو دڕوندانە دەست‌درێژیت بکەنە سەر.

(٨٦) تەسبیحات: «سُبحانَ اللّٰه» کردن.

جارێکیان پێغەمبەر مشتێ وردە بەردی کردە ناو دەستی. ئەو وردە بەردانە لە دەستیا کەوتنە «سبحان اللّٰه» کردن. پاشان بە سەرەکردنیە مشتی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمانیش، لە مشتی ئەوانیشدا هەروا «سبحان اللّٰه»یان دەکرد... ئەم بەیتەی «مەحوی» باسی ئەو موعجیزەیە دەکا.

**لە رۆژی ئـەربەعادا بـوو کـە سـاتێ حـەپسی رۆژی کـرد**
**لە سـەهبادا تـولووعی پـێ دەکـا دووبـارە لەو شـانە**[(٨٧)]

**چتیرێ بوو و مەنێ جۆ رۆژی خەندەق قووتی دەھ سەد کەس**
**بـە تـەکـمیلی، بـە رووخـۆشـی عـەتا فـەرمووکـەریمانە**[(٨٨)]

---

(٨٧) ئەربەعا «اربعاء»: چوارشەممە. سەهبا، [«صهباء»]: شوێنێکە لە نزیکی خەیبەرەوە.

ئەم بەیتەیش باسی دوو موعجیزەی تری پێغەمبەر (د.خ) دەکا. یەکەمیان ئەوەکە لە میعراج گەڕایەوە و باسی بۆ کافرەکان کرد، باوەڕیان پێ نەکرد و وتیان ئەگەر راست دەکەی چووی بۆ ئاسمان، لەکوێ تووشی کاروانەکەی ئێمە بووی کە چووە بۆ قـودس؟ نـاو و نـیشانیمان بـۆ هەڵدە... ئەویش فەرمووی لە فلانە شوێن تووشی بووم و رۆژی چوارشەممەیش دەگەڕێتەوە. رۆژی چوارشەممە تا نزیکی خۆراوا چاوەڕوانی کاروانەکە بـوون بگـەڕێتـەوە، دیـار نـەبوو. پێغەمبەر لە دواکەوتنی دڵگران بوو و لە خوا پاڕایەوە کەوا ئاوابوونی خۆر دوابخا تا کاروانەکە دەگاتە بەرەوە. خوایش دوعاکەی گیراکرد و ئاوابوونی رۆژی بۆ ماوەی سەعاتێك دواخست تا کاروانەکە پێش شێوان گەیشتە بەرەوە...

دووهەمیشیان ئەوەیە جارێکیان لە سەهبادا پێغەمبەر سەری لەسەر رانی حەزرەتی عەلی دانابوو و خەوی لێ کەوتبوو. کە خەبەری بووەوە خۆر ئاوا بوو بـوو. لە عـەلی پـرسی ئـاخۆ نوێژی عەسری کردووە یا نە؟ ئەویش وتی نەمکردووە. پێغەمبەر لە خوا پاڕایەوە وتی: عەلی بەهۆی منەوە نوێژەکەی دواکەوتووە، بەڵکوو رۆژ بگەڕێتە دواوە تا نوێژەکەی بکات. کوتووپڕ لەو شوێنەدا خۆر هەڵاتەوە و عەلی نوێژەکەی کرد.

(٨٨)چتیر: بزنی یەك ساڵەی پێ لە دوو. خەندەق: شەڕێ بووە قورەیشییەکان و هاوکارەکانیان گەمارۆی مەدینەیان تیادا. پێغەمبەریش بەپێی راوێژی سەلمانی فارسی فەرمانی دا خەندەکێ بە دەوری شارەکەدا هەڵبکەنن کافرەکان نەتوانن لێی بپەڕنەوە. وایش بوو، کافرەکان ناچاربوون بێ ئەنجام بگەڕێنەوە. تەنها چەند کەسێکیان ویستیان لە خەندەکەکە بکەنە ئەوبەر، ئەوانەیش زوربەیان کوژران. ئەم شەڕە لە ساڵی پێنجەمی کۆچی «٦٢٧ی.ز»دا رووی دا. تەکمیل: تەواو.

**واتە: لە غەزای خەندەقدا ئەسحابەکان هەزار کەس بوون، لە چتیرێك و مەنێ جۆ بەولاوە هیچیان نەبوو. کەچی پێغەمبەر لەو چتیر و مەنە جۆیە نانی هەموو ئەو ئەسحابانەی دا و تێری کردن.**

**لە هەر رێیەك دەڕۆیی، بۆ سەلام و سوجدە بەر بردن**
**چ جۆشێ بوو دەکەوتە دار و بەردی ئەو مەکانانە!(٨٩)**

**بە هەوری تێ‌مەگەن، ئیللا مەلائیك شەهپەڕی خۆیان**
**هەموو دەم یەك دەدا بۆ سایەبانی ئەو سولەیمانە(٩٠)**

**دوعا فەرموونی بۆ عاهات و دەردی بێ دەوا سەیرە**
**لە دڵیایە کە ئاساری ئیجابەی مەرهەمی جانە(٩١)**

---



لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا لە بەرابەری «چتیرێ بوو و»وەوە نووسراویشە: «لە گێسکێك و».

(٨٩) واتە: چ جۆشێ بوو دەکەوتە دار و بەردی هەر جێگایەك پێغەمبەری پیادا بڕۆیشتایە، هەموو راست دەبوونەوە سەلامی لێ‌بکەن و سوجدەی بۆ بەرن.

ئەم موعجیزەیە، وەك لە کتێبەکانی سیرەتدا نووسراوە، لە سەرەتای پێغەمبەریەتیدا بووە.

(٩٠) شەهپەڕ: شاپەڕ، شاباڵ، پەڕە گەورەکانی پەلەوەر. سایەبانی: سێبەر بەسەردا کردن.

پێغەمبەر (د.خ) پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر یەك دوو جار لەجیاتی خەدیجەی خێزانی بۆ بازرگانی چووە بۆ شام. هاوڕێکانی گێڕاویانەتەوە کە لەڕێدا پارچە هەورێك سێبەری بەسەر سەریەوە دەکرد تا خۆر نەدا بەسەریا. جا مەحوی لەم بەیتەدا باسی ئەو رووداوە دەکا کە لە دیندا پێی دەوترێ «ارهاص» واتە نیشانەی پێغەمبەرێتی بەر لە بوون بە پێغەمبەر. مەحوی دەڵێ: ئەو پەڵە هەورەی سێبەری بەسەر سەری پێغەمبەرەوە دەکرد، بە هەوری تێ‌مەگەن، فریشتە بووە هاتووە لە شێوەی هەوردا چەتری بەسەر سەری ئەو حەزرەتی سولەیمانەوە دروست کردووە.

(٩١) عاهات: جەمعی «عاهە»یە بەمەعنا دەردی وا ببێ بە مایەی سووکی بۆ ئەوکەسەی تووشی بووە، وەك گولی و کەچەڵی و شتی وا. ئیجابە: قوبوولکردنی دوعا. مەرهەم: مەڵهەم.

واتە: دوعاکردنی پێغەمبەر (د.خ) بۆ دەردەدارە بێ‌دەرمانەکان شتێکی سەیرە، چونکە گەلێ دەردی قورس بە دوعای ئەو چاك بووەتەوە و ئەم دوعایانەی بە دڵ کردووە، بۆیە نیشانەی قوبووڵ بوونیان ئەوەندە دیارییە، بووە بە مەڵهەمی گیان.

چــیە ئــیبرا، وەرە ســەر مـوعجیزەی ئـیحیا بـە حـەددێکـە
لە ئــــەنفاسی «نَــفَخْتُ فـیهِ مِـنْ روحــي» نــومایانە(٩٢)

ئەوەندە چـاوی پـڕ بـێ نـووری پـڕ نـوور و مـونەووەر کـرد
کــە نـەرگس چـاوەچاوی نـووریە لەو نـووری چـاوانـە(٩٣)

خەبەردانــی لە مـوستەقبەل قسـەی چـی لێ بکـەم تـا حـەشر
هــەموو بــەر تـیبقی فـەرموودەی ئـەوە ئـەم واقـیعاتانە(٩٤)

---

(٩٢) ئیبرا: «ابراء»، چاك کردنەوە. ئیحیا: زیندووکردنەوە. حەد: رادە. ئەنفاس: هەناسە. نومایان: ئاشکرا.

واتە: چاك کردنەوەی دەردەدار قیمەتی چیە کە موعجیزەی حـەزرەتی عـیسا بـووە. وەرە سەیری زیندووکردنەوەی مردوو بکە، کە لەسەر دەستی پێغـەمبەردا رووی داوە، نـیشانەی دروستکردنی ئینسانی پێوەیە کە ئایەتی: ﴿وَ نَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي﴾ دەیگەیێنێ، واتە: لە گیانی خۆمم کرد بە بەردا.

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئەوە کە جارێکیان ژنە جوولەکەیەك ویستبووی پێغەمبەر دەرمانخوارد بکا، زەهری بۆ کردبوو بە گۆشتەوە، کەچی گۆشتەکە خۆی بە کوڵاوی هاتبووە دەنگ و بـە پێغەمبەری وتبوو نەکەی بمخۆی، زەهرم پێوە کراوە...

(٩٣) واتە: ئەوەندە چاوی پڕ لە نابینایی روونکردەوە، نەرگسیش بە بێ گیانی خۆی چاوەچاویەتی بەڵکوو لە نووری حەزرەتی پێغەمبەرەوە چاوی بینا بێ. ئەم بەیتەیش باسی یەکێکـی ترە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر کە چاك کردنەوەی چاوی کوێرە.

(٩٤) موستەقبەل: دواڕۆژ. تیبق «طِبق»: دەق. واقیعات: رووداو.

واتە: پێغەمبەر باسی روودانـی گـەلێ شـتی کـردووە کـە لەوەوپـاش روودەدەن تـا رۆژی قیامەت و، ئەو رووداوانە هەموو بەوجۆرە کە ئەو باسی کردوون هاتوونەتە دی. ئەو شتانەیش وەك شەهیدبوونی حەزرەتی عـومەر و عـوسمان و ئـاشتکردنەوەی مـوسوڵمـانان لەسـەر دەستی حەزرەتی حەسەندا و مردنی «امّ ملحان» لە غەزای رۆمدا و روودانی ئاژاوە لە نێوان موسوڵمانان‌دا و ئەوکارەساتانەی پێش رۆژی قیامەت روودەدەن وەك بەدرێژی لە کتێبەکانی سیرەتدا باسیان لێ کراوە.

لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا لە بەرابەری «هـەموو بـەرتیبقی»یـەوە نـووسراویشـە: «ئەبینی تیبقی».

بەیانی شەش حەو ئیعجازی لە جوملەی سەد هەزار ئیعجاز
ئەوی دەیکا پەشیمانە، ئەوی نەیکا پەشیمانە[٩٥]

ئەگەر بێ موعجیزاتی سەدیەکێکی بێنمە تەحریر
دەبێ هەر تاقە بەیتێکم ببێتە سەد کوتوبخانە[٩٦]

چ قابیل من بە سەد بەیتێکی کوردی، سەد هەزار ئەسرار
بدەم شەرح و بەیانی کەم لەگەڵ ئەم عەقڵی نوقسانە![٩٧]

کە هەر سیرڕێکی عەقڵی کول تیا کول مایەوە «بِالکُل»
کە هەر سیرڕێکی سەد عاریف تیا مەدهۆش و حەیرانە[٩٨]

---

(٩٥) حەو: حەوت.

واتە: لەناو سەد هەزار موعجیزەدا ئەگەر ئینسان باسی شەش حەوتێکیان بکا پەشیمان دەبێتەوە لەبەرکەمی. ئەگەر باسیشی نەکا هەر پەشیمان دەبێتەوە چونکە نابێ هەمووی بخرێتە پشت گوێ.

(٩٦) تەحریر: نووسینەوە.

واتە: ئەگەر بمەوێ سەدیەکێکی موعجیزەکانی باس بکەم، دەبێ لەجیاتی هەر بەیتێکی ئێستام ئەوەندە بنووسم سەد کتێبخانە پڕ بکا.

(٩٧) مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە دوو بەیتی پاشەوەیەوە.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی «مەحوی» خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

بە «ایضاح» و بەیانی پەی بەرم بەم عەقڵی نوقسانە

(٩٨) عەقڵی کول: «العقل الکلّ» یا «العقلُ الفعال العاشر» لە ئیستیلاحی فەلسەفییەکاندا، دەهەمی ئەو دە عەقڵە بێ ماددەیەیە کە کاروباری گێتی بەڕێوە دەبەن، عەقڵی هەموان. عاریف: خواناس.

لە نێوان هەردوو وشەی «کول»دا جیناسی تەواو و لە نێوان ئەوان و «بِالکُل»دا جۆرە جیناسێکی ناقیس هەیە.

فەقەت نابێ کە دەرکی کول نەبوو یەکبارە تەرکی کول
بە باغێکە لە کن بولبول گوڵێ لەو باغ و بوستانە[٩٩]

لە «هَمزيّة» و لە «بُرْدَه»م چونکە کەم دی ئیستیفادەی کورد
منیش ئەم کوردییەم دانا لە ریزی ئەو قەسیدانە[١٠٠]

---

(٩٩) یەکبارە: بەیەکجاری.

واتە: من بەم عەقڵی ناتەواوەمەوە چۆن دەتوانم بە سەد شیعرێکی کوردی سەد هەزار شتی نهێنی روون بکەمەوە کە هەر کامیان بگری «عەقڵی گشتی» بە تەواوی تیا کول بووە و سەد پیاوی زانا و تێگەیشتوو سەرسام بوون تیایا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ مادەم هەموو شتێکم بۆ باس ناکرێ تەواو بێدەنگ ببم و هیچ نەڵێم، چونکە وەك دەڵێن: «ما لا یدرك کله لا یترك کله» واتە: ئەوەی هەمووی دەسگیر نەکرێ، لە هەموویشی دەست هەڵناگیرێ، لەبەر ئەوە کە لای بولبولی دڵی دڵداران تاقە گوڵێك لە باغچەی موعجیزەکانی پێغەمبەر بە باخچەیەکی تەواو دەڕوا.

لەم بەیتەیشدا لە نێوان هەردوو «کول»دا جیناسی تەواو هەیە. هەروا لە نێوان «بولبول» و «گوڵ» و «باغ» و «بوستان»یشدا تەناسوب هەیە.

(١٠٠) «هَمْزِيّة»: کتێبێکە بە شیعری عەرەبی لە تەعریفکردن و پیاهەڵدانی پێغەمبەردا، دروودی خوای لێ بێ، شێخ «شرف‌الدّین ابوعبدالله» محمدی کوڕی سعیدی بوسیری دایناوە کە لە ٦٩٤ی ك «١٢٩٤ ـ ١٢٩٥ی ز»دا مردووە، پێیشی دەڵێن «أمّ‌القریٰ»،گەلێ شەرحی لەسەر نووسراوە. «بُردة»: یاخود «بُردِیَة»، ئەمیش قەسیدەیەکی ترە لە تەعریفکردنی پێغەمبەر و باسی رازی دەروون و باسی قورئان و، پاڕانەوە لە خوادا، هەر خاوەنی «همزیة» دایناوە. ئەم قەسیدەی دووهەمە لە کوردستاندا زۆر بڵاوە و جاران فەقێکان بە شەوانی سێ‌شەممە و جومعەدا بە کۆمەڵ بە ئاوازێکی تایبەتی بۆ بەرەکەت دەیانخوێندەوە و زۆر لە مەلا شاعیرە کوردەکان قەسیدەی کوردییان لەسەر ئاوازی داناوە یا خۆییان کردووە بە کوردی.

واتە: لەبەر ئەوەی کە کوردەکان لەبەر عەرەبی نەزانین کەڵکێکی کەمیان لە قەسیدەی «همزیة» و «بردیة» وەردەگرت، هاتم ئەم قەسیدە کوردییەم دانا تا بچێتە ریزی ئەوانە و خەڵك وەك ئەوان بۆ بەرەکەت بیخوێننەوە. مەحوی دەیەوێ بڵێ ئەم قەسیدەیەیش بۆ هاوئاوازی «همزیة» و «بردیة» ناوی قەسیدەی «کردیّة»یە.

**زوبـانی عـیشقبازی خـۆشـە گـەر کـوردی وەگـەر تـازی**
**قسەی بێسۆزی عیشق ئەر گەوهەرە، مەحبووبی بێئـانە(١٠١)**

**ئـــەلا ئـــەی فـــەخری عـــالەم «رحـــمةٌ للـــعالمین»ی تـــۆ**
**لە دەرحەق ناکەس و کەس رەحم و لوتفی ئێوە یەکسانە(١٠٢)**

**بدە ئـیزن، ئـەم قـەسیدەی کـوردییەش بـێتـە مـەقامی عـەرز**
**ئەگـەرچـی وەك شـوعوورم شـیعرەکـانیشم پـەرێشـانە(١٠٣)**

---

(١٠١) تازی: عەرەبی. ئەر: ئەگەر. بێئان: ناوەخت.

لەم بەیتەدا «مەحوی» وەك بلێی وەڵامی کەسێك بداتەوە کە بـڵێ چـۆن ئـەبێ تـەعریفی پێغەمبەر بە غەیری عەرەبی بکرێ، دەڵێ مەسەلە مەسەلەی زمـان نـیە، مـەسەلەی سـۆزی عـیشقە. کە سۆزی عیشق هەبوو زوبان عەرەبی بێ یا کوردی بێ خۆشە. کە سۆزی عیشقیش نەبوو، قسەگەوهەریش بێ دەبێ بە دڵداری ناوەخت کە هیچ کەڵك و سوودێکی لێ وەرناگیرێ.

ئەم بەیتە «حوسنی تەعلیل»ە بۆ بەیتی پێشوو.

لە دەستنووسێکی مەحوی خۆیدا بەرابەر بە «بێسۆزی» نووسراویشە «بێشۆری».

لە نوسخەی پاکنووس نەکراوی «مەحوی» خۆیدا، پاش ئەم بەیتە بەیتێکی تر هەیە وادیارە پاشان دەستی لێ هەڵگرتبێ چونکە دوابڕگەی خراوەتە بەیتی داهاتووەوە. بەیتەکە ئەمەیە:

بـەمەعنا عـاشقە ئـەم پـادشـەی مـەعنی پـەناهانە
کە عیشقێ تێکەڵی مەعنا نەبوو مەحبووبی بێئانە

هەر لەم نوسخە پاکنووس نەکراوەدا بەرابەر «پەناهانە» نووسراویشە «شوناسانە».

(١٠٢) ئەم بەیتە سەرەتایە و رێ خۆشکردن بۆ پاڕانەوە لە پێغەمبەر کە ئەم قەسیدەیەی لێ وەر بگرێ و پەسەندی بکا.

(١٠٣) مەقامی عەرز: مەیدانی خوێندنەوە یا مەیدانی پیشاندان. شوعوور: هەست.

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی مەحوی خۆیدا بەمجۆرەیش نووسراوەتەوە:

ئەگەرچی شیعرەکانیشم وەکوو فیکرم پەرێشانە

موکەڕڕەڕ بوو قەسیدەی بوردە نەشئەی عالەمی پڕ کرد
بفەرموو بەم قەسیدەی کوردە نۆبەی نەشئە پێوانە[١٠٤]

ئەگەر بوردە، ئەگەر کوردە، ئەگەر سافە، ئەگەر دوردە
قوبوولی تۆ کە بوو لەبرێزی نەشئەی ڕەوح و ڕەیحانە[١٠٥]

قوبووڵی تۆ نەبوو، سەد با عەرەب بێ، هەر ئەبووجەهلە
قوبووڵی تۆ ئەگەر بوو، فورسی دووسەد ساڵە سەلمانە[١٠٦]

---

(١٠٤) واتە: قەسیدەی بوردییە ئەوەندە خوێنراوەتەوە عالەمی سەرخۆش کردووە. ئەنجا نۆبەی ئەوەتە بفەرمووی دواگڵاسی پڕ بخورێتەوە و ئەم قەسیدە کوردییەی من بکرێ بەو دواگڵاسە و نۆش بکرێ.

لە نوسخەی پاکنووس نەکراوی مەحوی خۆیدا بەرابەر بە «نەشئەی عالەمی پڕ کرد»، «نەشئەی گەییە عیللییین»یش نووسراوە.

(١٠٥) دورد: خڵتەی بنی پیاڵەی مەی. لەبرێز: سەر کردوو. ڕەوح: حەسانەوە.

واتە: مەی ئەگەر مەیی قەسیدەی بوردییە بێ یا هی قەسیدەی کوردی بێ... ئەگەر پوختە بێ یا خڵتەی بنی پیاڵە بێ، هەر ئەوە مەبەستە کەوا پەسەندی تۆبێ، چونکە کە تۆ پەسەندت کرد وەك پیاڵە شەرابێکی وای لێ دێ حەسانەوە و بۆنی خۆشی لێوە سەر بکا.

لەم بەیتەدا ئیشارەت کراوە بۆ ئایەتی: ﴿فَرَوْحٌ وَ رَيْحَانٌ وَ جَنَّتُ نَعِيمٍ﴾ لە باسی ژیانی ئەهلی بەهەشتدا، کە واتە: ئیتر هەر حەسانەوە و بۆنی خۆش و بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتە.

(١٠٦) فورس: فارس. سەلمان: سەلمانی فارسی، یەکێکە لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر، خەڵکی ئێران بووە، ناوی پێشووی «رووزبیە» بووە. پێغەمبەر لە جوولەکەیەکی کڕییەوە و ئازادی کرد. چەند حەدیسێك لە بارەی پایە و شانیەوە گێڕراوەتەوە. ئەو بوو لە غەزای خەندەقدا بە پێغەمبەری وت خەندەکێك بە دەوری مەدینەدا هەڵکەنن تا کافرەکان نەتوانن بێنە ناو شارەوە.

«مەحوی» لەم بەیتەدا دیسانەوە دەگەڕێتەوە سەر بابەتی تەعریفکردنی پێغەمبەر بە غەیری زمانی عەرەبی و دەڵێ: وەنەبێ بەرەکەتی قەسیدەی پیاهەڵدانی پێغەمبەر بەسرابێ بەوەوە کە زمانەکەی عەرەبی بێ یا زمانێکی تر بێ، بەوەوە بەسراوە کە لای پێغەمبەر پەسەندە یا نە. ئەبووجەهل سەردارێکی عەرەب بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کە عەرەب بوو، لەبەر

مـــنم وەك ئـــەو زەعـــيفە، ئـــەم قـــەسيدە، ئـــەو گـــلە دەزوە
ئـــەمن كـــڕيـــاری مـــاهی «لامَكـــان»، ئـــەو مـــاهی كـــەنعانە (١٠٧)

مـــنم مـــووری زەعـــيف و ئـــەم قـــەسيدە لاقـــە كـــوللەی مـــن
فەقەت من هەديەكـەم خـدمەت سـولەيمانی سـولەيمانە (١٠٨)

بـــە چـــاوی مـــەرحـــەمەت بـــڕوانـــە هـــەديە و ســـاحێبـــی هـــەديە
بـــــە زۆری رابـــــوێرە ئـــــەم كـــــەمە لەم كـــەمترينانە (١٠٩)

---



ئەوە كە پێغەمبەر لەبەر كافری حەزی لێ نەبوو، ئەبووجەهل بوو. سەلمانی فارسيش كە بن و بنەچەی فارس بوون، چونكە موسوڵمانی چاك بوو، بوو بەو پياوە گەورەيە كە پێغەمبەر لەبارەيەوە فەرمووی: «سَلْمانُ مِنّا أَهل البَيْت» واتە: سەلمان لە خۆمانە، لە كەس‌وكاری پێغەمبەرە.

(١٠٧) زەعيفە: ئافرەتی بێدەسەڵات. گلە دەزوو: گوڵۆڵە دەزووی لوول كراو. ماه: مانگ. كەنعان: ناوچەی ماڵی باوكی حەزرەتی يۆسف.

ئەم بەيتە ئيشارەتە بۆ ئەو رازەی دەيگێرنەوە گوايە كە حەزرەتی يۆسف لە بازاڕی ميسردا خرايە مەزات بۆ فرۆشتن، پيرەژنێكيش گوڵۆڵەيەك دەزووی هەڵگرت و چوو بۆ مەزاتخانە. لەوێ لێيان پرسی تۆ كە دەسمايەت تەنها ئەم گوڵۆڵە دەزووەيە، چۆن بەتەمای كڕينی شۆخێكی وەك ئەم كوڕەی؟ ئەويش وتی: بەس نيە خەڵك دەڵێن هاتووە يۆسف بكڕێ!.

واتە: من وەك ئەو ئافرەتە بێدەسەڵاتە وام كە هات حەزرەتی يۆسف بكڕێ و، ئەم قەسيدەيەش وەك گوڵۆڵە دەزووەكەی دەستيەتی. ئەوەندەمان جيايە ئەو يووسفی كەنعانی وەك مانگی جوانی دەكڕی و منيش رەزامەندی ئەو مانگە دەكڕم كە تايبەت نيە بە جێگايەكەوە و هەموو لايەكی روونكردووەتەوە.

(١٠٨) موور: مێروولە. فەقەت: ئەوەندە هەيە.

ئەم بەيتە ئيشارەتە بۆ ئەوە كە دەگێرنەوە جارێكيان مێرووڵەيەك لاقە كوللەيەكی بە دياری برد بۆ حەزرەتی سولەيمان و عەرزی كرد دياری بەپێی پايەی خاوەنەكەيەتی.

مەبەست لە «سولەيمانی سولەيمان» ئەوەيە پێغەمبەر بەنيسبەت حەزرەتی سولەيمانەوە وەك حەزرەتی سولەيمان وايە بەنيسبەت خەڵكی ترەوە.

(١٠٩) هەديە: دياری. رابوێرە: تێپەڕێنە.

قـــوبووڵی کـــەم لە کـــەمکردن، وەهـــا وا تـــێبگـــا زۆرە
بـــە تـــۆ زۆری بـــزانـــم، کـــەمتری شـــیمەی کـــەریمانە(١١٠)

ئەدەب وایـە کـە لەم گـوستاخییانەش تـۆبـە کـەی «مـەحوی»
خـــەیاڵی خـــاوە عـــەنقا نـــاکـــەوێتـــە داوی ئـــەفسانە(١١١)

دەبـــێ هـــەر مـــوو زوبـــانێ، هـــەر زوبـــانێ داســـتانێ بـــێ
بکـــەم نـــەختێ بـــەیانی نـــاکـــەسی خـــۆ بـــەو زوبـانانە(١١٢)

ئـــەوەندەی زاتـــی ئـــێوە مـــەخزەنی فـــەزڵ و کـــەمالاتـــە
لە مـــندا بـــەو حـــەدە نـــەقس و رەزائـیل دەرج و پـــەنهانە(١١٣)

---

(١١٠) شیمە: رەوشت.

واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! من چۆن لە تۆی بە زۆر بزانم ئەم دیارییە کەمە لە منی کەم و ناچیز وەربگری، بەجۆرێ کە من وا تێبگەم دیارییەکەم گەلێ زۆر و بەنرخە، لەکاتێکا کە ئەمە بچووکترین رەوشتی بەرزی پیاوانی مەردە و تۆیش لە هەموو مەردێ مەردتری.

(١١١)گوستاخی: پڕکێشیکردن و رووهەڵماڵراوی و بێشەرمی. عەنقا: باڵدارێکی ئەفسانەییە بەکوردی پێی دەڵێن سیمورغ.

«مەحوی» لەم بەیتەدا رووی دەمی دەکاتە خۆی و دەڵێ: باشتر ئەوەیە دەسبەرداری ئەم قسانەت ببی کە نیشانەی بێشەرمی و روو هەڵماڵراوین لە حوزووری پێغـەمبەردا، چـونکە ناتوانی بەم قسانەت کارێك بکەی پێغەمبەر لە خۆت رازی بکەی و دەسمایەکەی دەسـتت ئەوە نیە بۆ حوزووری ئەو بشێ.

(١١٢)واتە: من ئەوەندە گوناهبار و شەرمەزارم دەبێ هەر موویەکی لەشم ببێ بە زمانێك و هەر زمانێکم ئەوەندە بدوێ داستانێك بخوێنێتەوە، ئەوجا دەتوانم بەو هەموو زوبانە زۆر بڵێیانەوە کەمێك لە باسی خراپی و ناکەسی خۆم بگێڕمەوە.

داستانێ (ن): قیسـەخوانێ.

(١١٣) حەد: رادە. رەزائیل: جـەمعی «رَذیـل»ەیـە واتـە سـووکی و پـەستی. دەرج: دانـراو و نووسراوە.

**دەخیلی ئەو سەگی بەرقاپیەم جارێ بە یەگجاری**
**سەرئەفرازم بکە، فەرموو: سەگی بەردەرکی خۆمانە(١١٤)**

**وەکوو «جامی» دەڵێ، دەم وشك هەڵاتوو من سەگێکی گەڕ**
**جگەر تینووم و دەخوازم نمێ لەو بەحری ئیحسانە(١١٥)**

**بە یەك دوو قەترە تێر ئاوی حەیاتی کە وەکوو قیتمیر**
**لە کەهفی خۆتیا ڕێ دە، سەگی ئەسحابی خۆتانە(١١٦)**

---

(١١٤) فەرموو: بفەرموو.

واتە: دەسم بە دامێنی سەگی بەردەرگاتان، ئەی پێغەمبەری گەورە، کەڕەتێك بۆ هەمیشە سەربەرزم بکە و بفەرموو فلانەکەس سەگی بەردەرگای خۆمانە...

(١١٥) جامی: «نورالدّین عبدالرّحمان»ی جامی «١٤١٤-١٤٩٢ی ز» یەکێکە لە شاعیرە عیرفانییە بەناوبانگەکانی ئێران، خاوەنی «هفت اورنگ»ە.

واتە: هەروەك مەولانای جامی لە بەیتێکیدا دەڵێ، من سەگێکی گەڕی جگەر تینووم و لە تینوانا دەمم وشك هەڵاتووە، داوای دڵۆپێك ئاو دەکەم لە دەریای چاکەی تۆ، لێومی پێ تەڕ کەم و جۆشی جگەرمی پێ دابمرێنمەوە.

(١١٦) قیتمیر [«قطمیر»]: دەڵێن ناوی سەگەکەی «اصحاب الکهف» بووە. کەهف: ئەشکەوت.

«مەحوی» بەم بەیتە ئیشارەت بۆ ئەوە دەکا کە مەشهوورە سەگەکەی ئەسحابی کەهف کە پاسی دەرگای ئەشکەوتەکەی بۆ دەکردن دەچێتە بەهەشت. جا دەڵێ: تۆیش من لە ئەشکەوتی خۆتا ڕێ بکەرەوە و بە سەگی ئەسحابەکانی خۆتم پەسەند بکە، بەڵکوو بەهۆی ئەوانەوە خوا رەحمم پێ بکا.

ئەم وێنەیە لە شیعری گەلێ شاعیریتریشدا هەیە. شێخ رەزای تاڵەبانی دەڵێ:

یا رسول اللّٰه چه باشد چون سگ اصحاب کهف
داخل جنّت شوم در زمرەی اصحاب تو
او بە جنت میرود، من بە جهنم کی رواست
او سگ اصحاب کهف و من سگ اصحاب تو؟!

لە دەسنووسێکی تردا لەجیاتی «ڕێ دە» نووسراوە «جێ دە».

دەکەم عەرزی نیاز، ئەرچی لە تۆ نایابە مەخفی راز
بە جان و دڵ، دڵ و جانم، خودا خواهانە، خواهانە[117]

لە تۆ حوببی خودا بۆ خۆم و بۆ ئەولاد و ئەحبابم
کە حوببی ماسیوا دەرکا لە دڵ وەك بت لە بتخانە[118]

خودایا هەم لە تۆ حوببی رەسوول و ئیتتیباعی ئەو
کە ئیکسیری مسی ماهییەتی مەغشووشی ئینسانە[119]

بباریّ، یارەبی هەر لەحزە سەد لەك بارشی رەحمەت
لەسەر ئەو، هەم لەسەر ئەو جەمعی ئال و سەحب و یارانە[120]

---

(١١٧) خوداخواهانە: وەك ئەوانەی کە خوایان دەویّ. خواهان: داواکەر. نایاب: ناوازە، دەستنەکەوتوو.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دیّ.

(١١٨) واتە: هەرچەند هیچ لە تۆ پەنهان نیە، بەڵام دەمەویّ عەرزت بکەم کە گیان و دڵم بە دڵ و بە گیان وەك پیاوە خواخواهەکان ئەوەیان لە تۆ دەویّ ببی بەهۆی خۆشەویستی خوا لە دڵی خۆم و نەوە و دۆستانمدا، بەجۆرێك وەك چۆن بت لە بتخانەی دەرکریّ ئەویش خۆشەویستی کەسی تری تێدا نەهێڵریّ.

مەحوی لەم بەیتەدا خۆشەویستی غەیری خوای بە جۆرێك لە شەریك بۆ خوا دانان داناوە، وەك چۆن بتپەرستی شەریك دانانە بۆی.

ئەحبابم (ن): ئەتباعم.

(١١٩) ئیتتیباع: شوێنکەوتن. ماهییەت: چیەتی. مەغشووش: خڵتەدار، ناپاك.

واتە: خوایە داوای ئەوەیش لە تۆ دەکەم کە خۆشەویستی پێغەمبەر و شوێنکەوتنی ئەو لە دڵما جێگیر بکەی، چونکە ئەم خۆشویستن و شوێنکەوتنە بۆ دەروونی ناپوختی ئادەمیزاد وەك ئیکسیر وایە کە مس دەکا بە زێڕ، ئەویش دەروون لە گەردی گوناه پاك دەکاتەوە.

حوببی (ن): عیشقی.

(١٢٠) لەحزە: چاوترووکاندن. لەك: سەد هەزار. وشەیەکی هیندییە. بارش: بارین.

مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

**هەتا ئاگر گرێنی شۆڕشی تەبع و خورۆشی دڵ**
**کزە و سۆزەی نەسیمی سوبح و ئێوارەی بەهارانە**(١٢١)

**سەبا، تا لێوی غونچەی گوڵ دەکا تەعلیمی شەککەرخەند**
**نەسیمی سوبحدەم تا پەرچەمی سونبول دەکا شانە**(١٢٢)

**هەتا هەوری بەهاری غازەکاری گوڵشەنە ئیشی**
**هەتا بولبول لەسەر گوڵ نەغمەخوان و ناڵە سەنجانە**(١٢٣)

**بڵێن ئینس و مەلەك پڕ بەم زەمین و ئاسمانانە:**
**«و صلّی اللّه علی» ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە**
**کە دەرکی غەوری ناکا «غیرُ عِلمِ اللّهِ سُبْحانَه»**(١٢٤)

---

(١٢١) واتە: خوایە هەمیشە سەد هەزار بارانی رەحمەت بەسەر هاوڕێیان و خزمانی موسوڵمانی پێغەمبەردا بباریٚ، بەدرێژایی ئەوە کە کزەی ئێواران و سۆزەی نەسیمی بەیانیانی بەهار ئاگری شۆڕشی سروشت و خورۆشی دڵ تاو بدا و گڕی پیٚ بسێنیٚ.

(١٢٢) شەککەرخەند: ئەوەی پێکەنینێکی وەك شەکر شیرینی بیٚ.

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتەکانی پاشەوەی پێکەوە دیٚ.

لە نوسخەیەکی دەستنووسی مەحوی خۆیدا بەرابەر بە «دەکا تەعلیمی» نووسراویشە: «دەکاتن فێری».

(١٢٣) غازەکاری: رەنگاوڕەنگکردن وەك گوڵ. وشەیەکی فارسییە. گوڵشەن: گوڵزار، باخیٚ گوڵی زۆری تیا بیٚ. سەنجان: رێکخەر.

لە نوسخەیەکی دەستنووسی مەحوی خۆیدا بەرابەر بە «نەغمەخوان و ناڵە سەنجانە» نووسراویشە: «نەغمەپەرداز و نەوا خوانە».

(١٢٤) ئینس: بنیادەم. غەور: قووڵی.

واتە: تا سبەینان لێوی غونچەی گوڵ فێری زەردەخەنەی شیرین دەکەن و دەیپشکوێنن و، تا نەسیمی دەمی بەیان شانەی زوڵفی سونبول دەکا و، تا هەوری بەهار گوڵزار بە گوڵی نویٚ رەنگاوڕەنگ دەکا و، تا بولبول لەسەر چڵی گوڵ بە ئاوازی خۆش و گونجاو دەخوێنیٚ، بەدرێژایی هەموو ئەم کاتە با ئادەمیزادی سەرزەوی و فریشتەی ئاسمان، ئاسمان و زەوی پڕ بکەن لە رەحمەت ناردن بۆ پێغەمبەر (د.خ)، کە مەگەر هەر خوا خۆی بزانیٚ زاتێکی چەند گەورە و پایەبەرز و قووڵە...

## ستایشی حەزرەتی مولانا خالیدی نەقشبەندی

دڵم ئـــەمشەو نـــەخۆشـــی نـیسبەتی چـاوێکـی بـیمارە
جگەر غەڵتانی خوێنی حەسرەتی لێوێکی خوونخوارە[١]

سەرم شێواوی شێوەی فیتنە هـەڵگـیرسێنـی شـۆخـێکـە
حەواسم تەفرەقەی عیشوەی دڵئاشووبێکـی عـەییارە[٢]

---

ئەم پارچە شیعرە لە چاپە پێشووەکەی دیوانی مەحویدا نیە.

**(١)** نیسبەت: پێوەند. بیمار: نەخۆش، مەبەست لێرەدا لە نەرمە. غەڵتان: تێوەگلاو. حەسرەت: داخ.
مەبەستی لەوەیە ئەو هەموو دەردی دڵەی کە هـەیەتی لەوەوەیـە دڵی رووی کـردووەتە چاوی بیماری یارێك و لە بیماری ئەو چاوەوە دڵی تووشی دەرد بووە. جگەریشی کـە یـەك پارچە بووە بە خوێن هی ئەوەیە داخی لێوێکی سووری یارێکی خوێنخۆری دڵداران دەخوا، خوێنی ئەو لێویە جگەری یەكپارچە کردووە بە خوێن...
ناسکی بەیتەکە لەوەوە دەست پێدەکا کە چاوی نەرم بە چاوێکی جوان دادەنرێ و هەر یارێکی جوانیش دەبێ چاوی نەرم بێ و، لێویش هەر لە خۆیدا سوور دەکـاتەوە وەك بـڵێی خوێنی دڵدارانی مژیوە.

**(٢)** حەواس: «حواس»، جەمعی «حاسّە»یە بەو پێنـج هـەستە دەڵێن لە ئـادەمیزادا هـەن کـە بریتین لە هەستی بینین و بیستن و بۆنکردن و چەشتن و لێکەوتن. تەفرەقە: پرژوبڵاو. عیشوە: ناز. عەییار: زۆرزان.
ناسکی ئەم بەیتە لەوەوە دێ کەوا فیتنە لە هەر شوێنێکدا بەرپا ببێ ئەو شوێنە دەشێوێ و تێكدەچێ. لەلایەکی‌کەشەوە «فتنە» واتە لە خشتە بردن. شێوەی یاریش ئەوەندە جوانە بنیادەم لە خشتە دەبا و عەقڵ و تێگەیشتنی تێك دەدا و دەیشێوێنێ. حـەواسیش کـە دەبـێ لە هـەر ئادەمیزادێکی تەواو لەسەر خۆدا کۆمەڵ و لەجێی خۆیاندا بـن، بـەهۆی یـارێکـی زۆرزانـی ئاشووبخەرە ناو دڵەوە پەرت و بڵاو بوون و لە جێی خۆیاندا نەماون.

خـەیاڵی زوڵفـی دەرنـاچێ لە دڵ تـا دەرنـەچێ ڕۆحـم
سـپێراوە خـەزێنـەی بـەختی ئێمـە بـەو سـیا مـارە(٣)

لە شینی فیرقەتی ئـەودا ئـەوەندە ئـەشکی سـوورم ڕیت
بـە دەوری جـێگـەما تـا بـڕ دەکـاتن دیـدە، گـوڵزارە(٤)

لەبۆ سـەیرانـی بـاغ و سـەبزە تـەکـلیفم مـەکـەن یـاران
کە سەبزە و گوڵ لە چاومدا بەبێ ئەو هەر خەس و خارە(٥)

نەمامی قامەتی پـەروەردەی ئـاوی دیـدەکـەی مـن بـوو
کەچی گوڵچینی باغی وەسڵی ئەو ئێسـتاکـە ئـەغیارە(٦)

---

(٣) مەبەستی ئەوەیە: زوڵفی یار کەمەندێکی ئەوەندە کاریگەرە بۆ ڕاکێشان و گیرۆدەکردنی دڵی دڵداران، تەنانەت خەیاڵەکەشی لە دڵیان دەرناچێ تا گیانیان لەگەڵ خۆی بەکێش نەکاتە دەرەوە و، گەنجینەی بەختی دڵداران کە لە دڵیانایە سپێرراوە بە ڕەشماوی زوڵفی یـار و ئـەو پەپکەی بەسەرەوە کردووە و یا هەر لە سەری هەڵناسێ یا کە هەستا لەگەڵ خۆیدا دەیبا...

نیوە بەیتی دووهەم ئیشارەتە بەو ئەفسانەیە کە دەڵێ لە هەر شـوێنـێکـدا گـەنجینەیەکـی شارراوە هەبێ، ڕەشمار دەچێ لەویادا پەپکە دەکا...

بەکارهێنانی وشـەی «سپێراوە» لەجیاتی «سپێرراوە» کـە ئـەسڵەکـەی «سـپێردراوە» بـووە نیشانەی ئەوەیە کەوا لەم جۆرە فیعلە مەبنی بۆ مـەجهوولانەدا کـە پـیتێکـی ڕیشـەیی‌یان تـیا دووبارە دەبێتەوە، دروستە یەکێکیان حەزف بکرێ.

(٤) ئەشك: فرمێسك. ڕیت: ڕشت.

مەبەستی ئەوەیە بڵێ تا چاو بڕ کا، لەتاو دووری یار، چوار دەوری خۆی بـە فـرمێسکـی خوێنین ڕەنگین کردووە و کردوویە بە گوڵاڵە سوورە.

لە کۆکردنەوەی «شین» و «سوور»دا تەناسوبێکی جوان هەیە.

لە یەکێ لە دەستنووسەکانی بەردەستمانا وشەی «ڕیت» بەمجۆرە نووسراوە: «ڕییت».

(٥) سەبزە: سەوزایی. خەس: پڵوپووش. خار: دڕك. مـەبەستی لەوەیـە مـادەم یـارم لەگـەڵ نەبێ دنیا پووشێ ناهێنێ لام.

(٦) گوڵچین: ئەوەی گوڵ دەکاتەوە. ئەغیار: بێگانە.

به دەردی خۆمەوە گەر گۆشـەیەك دەگـرم بـە بێدەنگـی
بە لاما دێ بە خەشم و رق، دەڵێ: خۆ نـەقشی دیـوارە (٧)

کە دێم ئیزهاری شۆر و شینی دڵ کەم، بەڵکی رەحمێ کا
بە خەندە دێ، دەڵێ: خۆڵی بـەسەردا بـێژن ئـەم هـارە (٨)

وتم با بـەس وجـوودی بـێ وجـوودم بـاری خـاتر بـێ
لەگەڵ دڵ گۆشەیێکم گرت، ئـەوم بـەردا بـە یـەکبارە (٩)

لە کـونجی بـێکـەسیدا مـوددەیێکـم بـردەسەر، ئـاخر
شەوێ دڵ کەوتە بەحسی بێوەفـایی ئـەو سـتەمکارە (١٠)

---



واتە: نەمامی باڵای یار بە فرمێسکی چاوی من پەروەردە بوو و پێگەیشت، کەچی ئێستا بێگانەگوڵی باغی وەسڵی ئەو لە نەمامی باڵای دەکاتەوە.مەبەستی ئەوەیە بڵێ: کردەی من بوو و بردەی خەڵك...

(٧) مەعنای ئەم بەیتە بەسراوە بە بەیتی پاشەوەیەوە.

(٨) شۆر: هاوار و فوغان. بێژن: بیێژن.

واتە: بەدەست یارەوە داماوم و گیرم خواردووە، نازانم چۆن لەگەڵی هەڵسووڕێم. کە بە دەردی خۆمەوە دادەکەوم و دەمەوێ بێدەنگ بیم و گۆشەیەك بۆ خۆم بگرم، لێم تووڕە دەبێ و دەڵێ: دەڵێی وێنەی بە دیوارا کوتراوە دەنگی لێوە نایەت. کە دەشمەوێ هاوار و دادێك بەرمە لای بەڵکوو بەزەییەکی پێمدا بێتەوە و رەحمێ بکا بە حاڵم، دەڵێ ئەم کابرا هار بووە خۆڵی بەسەردا بکەن بەڵکوو بمرێ. مەشهوورە هار ئەگەر خۆڵی بەسەردا بکرێ، دەمرێ.

«بێژن»یش وەك «سپێراوە» نیشانەی دروستی حەزفکردنی پیتی دووبارە کراوەیە لە فیعلدا، لە زمانی کوردیدا.

(٩) وجوود: بوون. بێ وجوود: بێ کارە و بێ سوودکە وەك نەبوو وابێ. خاتر: دڵ. یەکبارە: یەکجاری.

واتە: وتم ئیتر با بەس گیانی ناچیزم ببێ بە باری سەر دڵی یار. هاتم لەگەڵ دڵەی گرفتاری خۆمدا گۆشەیەکمان گرت و بە یەکجاری دەسبەرداری ئەو بووم.

(١٠) واتە: بەڵام دڵ نەیتوانی ئەو گۆشەگیرییە تا سەر راگرێ، شەوێکیان کەوتە باسی بێوەفایی ئەو یارە ستەمکارە.

وتم: ئەی دڵ لە دولبەر شەکوەکردن حەیفە، دڵ دەیوت:
ئەمە بۆ دولبەرێکی دڵنەوازە، ئەو دڵئازارە[11]

وتم: خۆشە بە ئوممێدی وەفا جەور و جەفا، دەیوت:
بەسەرچوو عومرم و نەمدی وەفایێك لەو جەفاکارە[12]

وتم: پەنهانییە دەرحەق بە عاشق لوتفی مەعشووقان
وتی: ئەو زاهیر و باتین لە زورمرەی ئێمە بێزارە[13]

وەگەرنا، دەفعەیەك لەم بەینە بۆ دەفعی گلە دەیوت
هەواڵێکی بپرسن، چۆنە ئەو مەزلوومی بێچارە؟[14]

لەپڕ بایێك لەگەڵ بۆی ئاشنا هات و وتی: «مەحوی»!
بەشارەت بێ کە ئیقباڵت موبارەك، تالیعت یارە[15]

کە هاتم، شۆخەکەی غارەتگەری دین و دڵت دەیوت:
بپرسە حاڵی ئەو سەودازەدەی بەدبەختی ئاوارە[16]

---

(١١) شەکوە: شکات و گلەیی و گازندە. دڵنەواز: ئەوەی دڵی خەڵك بداتەوە و بلاوێنێتەوە. دڵئازار: ئەوەی دڵی خەڵك ئازار بدا، پێچەوانەی دڵنەوازە.

مەحوی لەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەدا گفتوگۆی بەینی خۆی و دڵی دەگێڕێتەوە لەبارەی بێوەفایی یارەوە.

(١٢) واتە:وتم بە دڵ لەوە نارەحەت مەبە کە یار ئازارت دەدا، چونکە ئازاری یار بەهیوای وەفای پاشەوەی شتێکی خۆش و بەتامە. دڵیش لە وەڵامدا وتی: تا ئێستا وەفام لێ نەدیوە... نازانم دەبێ ئەم وەفایەکەی بێ و کەی ئەم جەور و جەفایە دوایی بێ.

(١٣) زومرە: دەستە، تاقم.

(١٤) وەگەرنا: وە ئەگەر نا، ئەگینا، ئەگەر وا نیە. گلە: گلەیی.

هەواڵێکی (ن): هەوارێکی.

(١٥) بۆی ئاشنا: بۆنی یارکە لێی شارەزام و دەیناسمەوە. ئیقباڵ: بەخت روو تێ کردن. تالیع: بەخت.

مەعنای ئەم بەیتە بەمەعنای دوو بەیتی پاشەوەیەوە بەستراوە.

(١٦) غارەتگەر: تاڵانکەر. سەودازەدە: خەیاڵ لە کەللە داو.

دەبـــێ بـــێ ئـافتابی روومـەت و سـوبحی جـەبینی مـن
چ فەرقێکی ببێ رۆژی لە شـەو، سـوبحی لە ئـێوارە![١٧]

وتـــم: وا سـەرفەرازت کـردم، ئـەمجا سـا دەخـیلت بـم
لەباتی من، سەبا، تۆ دەچـیەوە عـەرزیکە ئـەمجارە:[١٨]

ئـەگـەرچـی مـوددەیێکـە مـن لە زوڵمـاتی سـیابەختی
ونە زەڕڕەی وجوودم، رۆژی رووناکم شـەوی تـارە[١٩]

لە فـــەیزی نـــاوی «مـــەولانا ضـــیاءالدّیـن»ەوە ئـێستە
هەموو رۆژە شەوم، قەترەی وجوودم بەحری ئەنوارە[٢٠]

هەتا ئەو ناوە پاکـەم کـردە زیکـر و فـیکری رۆژ و شـەو
هەناسەم بـۆنـی مـیسکی گـرتووە، لێوم شـەکـەربارە[٢١]

---

(١٧) واتە: لەم گلەیی و بناشتەدا بووم لەگەڵ دڵ، لەپڕ شنەی باێك بۆنی بە یاد ئاشنای یاری دا بە لووتما و پێی وتم: مەحوی! موژدەت بدەمێ کەوا بەختت یارە، من کە هاتم لە رێدا تووشی یارەکەت بووم کە دین و دڵتی بەتاڵان بردووە، پێی وتم: هەواڵێکت بپرسم و وتی بۆچی خەم دڵی داگرتووە، دووری و نزیکی من بۆ ئەو چوونیەکە، دیاریش نەبم هەروەك دیار بم وایە، رۆژی روومەت و سبەینێی ناوچاوانم فەرقی شەو و رۆژ و بەیانی و ئێوارەیان بۆ نیە.

(١٨) سەبا: بای بەیانی. لە ئەدەبی کۆندا بە پەیامبەری نێوان یاران و دڵداران دانراوە.

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی بەسراون بەیەکەوە.

(١٩) زوڵمات: تاریکایی. سیابەختی: چارەڕەشی. تار: تارێك.

(٢٠) فەیز: بەرەکەت. «مولانا ضیاءالدّین»: لەقەبی مەولانا خالیدی نەقشبەندییە.

واتە: بە بای سەبام وت: خۆش موژدە بی وا سەرفەرازت کردم و ئـەم مـوژدەی یـارەت پێ گەیاندم. بەڵام تۆ کە دەگەڕێیتەوە لەجیاتی من عەرزی بکە کەوا هەرچەند ماوەیێکە من لە چارەڕەشی خۆم هەموو زەڕڕاتی وجوودم و نەو رۆژی رووناکم بووە بە تاریکە شەو، بەڵام ئێستا لەسایەی بەرەکەتی ناوی پیرۆزی مەولانا خالیدەوە شەوم هەموو بووە بە رۆژ و گیانی وەك دڵۆپ ناچیزم وەك دەریای نووری لێ هاتووە.

(٢١) شەکەربار: بار توێژێکی تام تاڵە بەسەر لێوی گرانـەتادارەوە پـەیدا دەبـێ، شـەکـەربار پێچەوانەی ئەوە، واتە بارێکی سەر لێو کە وەك شەکر شیرین بێ.

بــە یــومنی ئــەو، بــەهارە پــاییز و زســتان و هــاوینم
کە هەر گاهێ بکەم بەحسی لە دەورم گوڵ بە خەروارە[٢٢]

بــە ئــیخلاسی ئــەوم ئــاوێنــەکــەی دڵ وا جــەلا داوە
کە چیهرەی شـاهیدی مـەقسوودمی تـێدا نـموودارە[٢٣]

جــەمالی رابــیتەی، وا دڵبــەرە، بــەختی خـەواڵووشـم
بــە ئـومێدی تـەماشایەك هـەمیشە چـاوی بـێدارە[٢٤]

---

(٢٢) یومن: بەرەکەت. گاه: کات. خەروار: باری وڵاخ، کینایەیە لە زۆری.

واتە: بە بەرەکەتی مەولاناوە هەر چوار وەرزی ساڵم هەموو هەر بەهارە، ئەوەتە هەرکاتێ ناوی ئەو بەرم بۆنی خۆش بە دەورمدا بڵاو دەبێتەوە وەك چوار دەورم گـوڵ بـێ، کـە دیـارە گوڵیش هەر لە بەهارا هەیە.

(٢٣) جەلادار: پاك و رۆشن. چیهرە: روو. شاهید: دڵبەر. نموودار: ئاشکرا.

واتە: ئاوێنەی دڵی خۆمم بە چەشنێ، بە دڵسۆزی بۆ ئەو، رۆشن کـردووەتەوە، دیـمەنی ئەوی هەمیشە تیا دیارە کە یار و مەبەستمە.

(٢٤) رابیتە: لە عورفی ئەهلی تەسەووفدا ئەوەتە سۆفییەکان بە تەرتیبێکی تایبەتی دادەنیشن و چاو دەنێن بەیەکدا و سوورەتی مورشیدەکەیان دەهـێنـنە بـەرچـاو و بـە دڵ بـەرەکـەتی لێ وەردەگرن.

واتــە: جـوانـی هـێنـانە بـەرچـاوی دۆست بـەجۆرێ دڵ رادەکـێشـێ، تـەنانەت بـەختی چاوبەخەوبشم بەهیوای ئەوەی سوودێکی لێ وەربگرێ هەمیشە بێدارە و خەو ناچێتە چاوی.

ز طنز شیخ و طعن ناصحم آگه نگـردد هـوش
چنانم واله بنموده است عشـق شـوخ طـنازی
به مشتاقان زخم دلنشینش مـژده ده «مـحوی»
نگــارم تـیغ ابـرو داده آب از سـرمه‌ی نـازی

-۵-

خلیل از بت شکستن در نظر می‌داشت اشکالی
اگــر آذر تـراشـیدی بـه شکـل یـار تـمثالی
جگر خـط دم تـیغش بـود پـیرایـه دل را داغ
ز حـسنش کم ندانی عشق هم دارد خط و خالی
بــر اقـلیم بـیابان غـم لیـلا کـه یـابد دست؟
مگر شاهنشه عشقی، چو مجنون صاحب اقبالی
نشسته تا پرش هر تیر در دل دید چون، گـفتا
به صحرای فنا پر زن تو چون داری پر و بـالی
همین از سوختن وز زاری آبادست دیر عشـق
به بلبل گفت پروانـه، ز مـن خـالی زتـو قـالی
به کنج بـی‌کسی از خـاطر هـرکس فـرامـوشم
مگر دردی، بلایی، گـاه گـاهم پـرسد احـوالی
ندارم هیچ از خود چشم سر برداشتن تا حشـر
منم «محوی» چو نقش پا به پای عجز پـامالی

-۶-

دهـــــن نــمای شــرفیاب گــوهرافشــانی
نـــــفس‌گشای بـــه وصــف امــام ربــانی
عـــــلوّ مــرتبه‌اش زیــن دقــیقه دریــابید
کــه نــامور شـده شـخصش بـه نـام ربـانی

بود مجدد الف او، ستایمش من هم
هزار بار به عالی مقام ربانی
نبرده پی به خدا هیچ «عارف بالله»
چو او به کشف رموز کلام ربانی
فرود آمده گفت آن که دید عرفانش
همیشه بر دل این شه پیام ربانی
به بال «سیر الی الله» مخلصش پر زن
مپرس حال گرفتار دام ربانی
بر احمد عربی بارد و بر این احمد
ز ابر فضل همیشه سلام ربانی
به نسبتش بگزا «محوی» ار به سر داری
هوای باده کشیدن ز جام ربانی
به فیضها برسی گر شوی ز یاری بخت
تو فیض یاب ز لطف امام ربانی

## تقریظ شرح مثنوی
## تألیف والی عابدین

«جامی» آن از جام عشق دوست مست
«مثنوی» را این چنین بستوده است
آن فریدون جهان معنوی
بس بود برهان ذاتش مثنوی
من چه گویم وصف آن عالی جناب
نیست پیغمبر ولی دارد کتاب
وصف مولانا و وصف مثنوی
هم ز جامی هم ز عامی بشنوی

لیك ای یـــاران ز «مـــحوی» بشـــنوید
شـمه‌ای از وصـف ایـن شـرح جـدید
انـــدکی وصـــافی ایـــن شـــرح نـــو
بـــر کـــتاب مـــثنوی از مـــن شـنو
شـــرح والی عـــابدین پـــاشای راد
آن مـــدار حکـــمت و فـضل و رشـاد
«جـــاء شـــرحاً مـــوضحاً مُســتکشِفا»
«فــیه للــمرضی مِـن الجـهلِ الشّـفا»
وافـــــی حـــــل عـــبارات مـــتون
کـــــاشف ســـــر اشـــارات بـــطون
ســـر تـــوحید وجـــود از وی جـــلی
آشکـــــار از وی مـــــقام هـــر ولی
کشـــف هـــر اســـرار و احـوالی در او
حـــل هـــر اغـــلاق و اشکـــالی در او
پـــــرده از روی تـــعینهای پـــنج
بـر گـرفته چـون طـلسم از روی گـنج
مـــثنوی را گـرچـه بـاشد بس شـروح
لیك آن‌هـــا را شـــبح دان، ایـنش روح
شارحان پـیش ازیـن گـر پـیش ازیـن
یك نـــظر دیـدندی ایـن شـرح گـزین
شـــرح خـــود را پس‌تـــر افگـندند یـا
رو بـــاین شـــرح پســـین کـــردند یـا
از مـــحقی وز خـــوش اســـتعدادیش
حـــقی اول حـــق بـــه جـانب دادیش
کاشفی «احسـنت» یـا کشـاف خـوان
لب گشـــــادی در ثـــنا و وصـــف آن

شـــمعی از وی شـــمع فـهم افـروختی
ســـــودی از وی ســودها انـــدوختی
هر که دید ایـن شـرح زیـبا و شگـفت
آفــرین بـر شـارح و بـر شـرح گـفت
هـر کـه جـوید عـلم فـتح‌البـاب دیـن
گــو بــجو یــابی ز شـــرح عــابدین
ای خــــــدا ایـــن شـــارح والا تـــبار
از هــــــمه گــــونه عـــوارض دور دار

## قطعه‌ها

-۱-

ای بسته کمر به قصد قتل سر مـا
امر تو بود مطاع و حکم تـو روا
آورده‌ام اینك سر خود ماه رخـا
آخر تو بفرما و بکش تیغ و بیا(۱)

***

-۲-

فـرستادی ز روی التـفاتم سـرو را یك سـیب
که از بویش تو گویی عنبر و مشکم بود در جیب
مگر سـیب بـهشتی بـود کـز بـوی دلاویـزش
دل و جانم رهایی یـافتند از مـحنت و آسـیب

***

-۱-

(۱) سه حرف اخیر هر کدام از مصرع‌های این قطعه، از پس به پیش، سه حرف اول مصرع بعدی را از پس به پس تشکیل می‌دهند.

-۳-

رزق را روزی رسان پر می‌دهد
بی‌مگس هرگز نباشد عنکبوت
بی‌توکل آن کـه حـیله مـی‌تند
عنکبوت‌آسا برای جلب قـوت

***

-۴-

شهنشاهی غلام و بـندگی کـردن بکـرد ایـجاد
ز ایـزد آفـرین بـی‌حد و مـرز بـر پـیمبر بـاد
اگر بر باد رانی تخت چون جم روزها، یك روز
ز یك گردش فلك چون گرد تختت میدهد بر باد

***

-۵-

ز نور عشق تا هوشم بدل، جوشم به سر بـاشد
رجـــا از بـارگاه ذوالجـلالم ایـن قـدر بـاشد
که این سـالار دولت شـه مـظفر زاده هـمواره
سپه‌سالار حشـمت قـرةالعـین ظـفر بـاشد[1]

***

-۶-

«عــــالمی خـــواهــم ازیـــن عـــالم بـــدر»
عـــنصر وی خـــاك بـــاشد ســـر بـــه ســـر

---

-۵-

(۱) گمان می‌رود که محوی این قطعه را در ستودن محمدعلی شاه قاجار سروده است.

وز بـــن هـــر مـــویی دســتی رویـدم
«تـا بـه کـام خـود کـنم خـاکـی بـه سـر»[۱]

***

-۷-

«بـرگ درخـتان سـبز در نـظر هـوشیار»
از چـمن فـهم رمـز بـار گـل آرد بـبار
هر گل ازان یك کتیب بار ورق‌ها به جیب
«هر ورقی دفتریست معرفت کـردگار»[۱]

-۸-

تا سر و دست است بکار ای جوان
بندگی وجـود و عـطا پـیش گـیر
سر چو سجودش نبود سفچه خوان
کف چو جودش نبود کـفچه گـیر

***

-۹-

چون شجاع‌المـلك دیـدم بـا جـنابت در نـزاع
می‌شنیدم دولت و ملکش که می‌گفت «الوداع»
گر شـجاع‌المـلك از قـهرت بـیازارد چـه غـم
کـز سـر لطـف و کـرم بـنوازدت شـاه شـجاع

***

-۶-
(۱) مصرع اول و چهارم از مولانا خالد نقشبندی است.
-۷-
(۱) مصرع اول و چهارم از سعدی شیرازی است.

- ١٠ -

«بین‌الدّول» چو رو سیه رو زرد شد به جنگ
شخص قضا بـه گـوش قـدر گـفت بـی‌درنگ:
اعـــجاز ســـرخ رویـــی دیـن مـحمدی است
بعد از سیاهی این کـه دگـرگونه است رنگ[١]

***

- ١١ -

از افــق دیـدم بـرآمـد بـدر در شکـل هـلال
خوش جوابی داد چون کردم ز احوالش سؤال
آفتاب روی رحمت عکس را چـون وا گـرفت
کیست گوید کاملم یا کی بـه کـار آیـد کـمال

***

- ١٢ -

بـــا صـــد قـــصور بـــاز طـلبکارت آمـــدم
کـــم مـــایه‌ام بـــه رحـــمت بسـیارت آمـدم
از غـــافر و غـــفور گـــذشته‌ست کـــار مـــن
بـــارم گـــنه بـــه حـضرت غـفارت آمـدم[١]

***

- ١٠ -

(١) محوی رباعی بالا را به طور زیر هم گفته است:

«بین‌الدّول» چو روسیه رو زرد شد زجنگ
شخص قضا به گوش قدر داد ایـن نـوید
اعجاز سرخ رویـی دیـن مـحمدی است
بعد از سیاهی این که دگر رنگ شد پدید

- ١٢ -

(١) این رباعی با کمی تغییر در قصیده‌ی یکم حرف (م) هم هست.

- ۱۳ -

در قافله‌ای که اوست دانم نرسم
بر شهد وصالش ننشیند مگسم
با این همه از سعی نشاید آسود
این بس که رسد زدور بانگ جرسم

***

- ۱۴ -

جایی که بود جلوه‌گه‌ی نیر اعظم
انجم ز شب افروزی خویشش چه زند دم
تو مهر جهان‌تابی و من هم چو سها، چون
من لاف زنم با چو تویی نور مجسم

***

- ۱۵ -

دو بیتی را نمودم بهر این شهزاده من تنظیم
ندیدم در جواب او نه یك هدیه نه یك تعظیم
مگر این است تا حال این سپه‌سالار محبوبان
به پیشش بیشتر از شعر گشته هدیه‌ها تقدیم

***

- ۱۶ -

آفریده تا جهان اندوه و شادی آفرین
مار با هر گنج بوده، خار با هر گل قرین
نخوت سادات و استکبار ابنای عرب
مار و خار و گنج اسلام و گل دین مبین

***

-١٧-

در خـــرمن كـــائنات كـــرديم نگـــاه
چندان كه به خوشه خوشه‌اش بردم راه
دیدیم به کُـنه کـار چـون پـی بـردیم
یك دانه محبت است و باقی همه كاه[1]

***

-١٨-

یك پـــند بـــی‌مناسبه و پـــر مـــناسبه
از مـــن بـــبر بـــه خـــدمت اهـــل مـــحاسبه
امـــروز مـــی‌کنید بـــغش آن‌چـــه مـــی‌کنید
فـــردا چـــه مـــی‌کنید ز هـــول مـــحاسبه

***

-١٩-

ای دل عـــرفا جـــمله نـــجوم‌انـــد، بـــود مـه
«شـــیخ احـــمد سـرهند» کـه حـق قـدّس‌سره
دریـــا دل او خـــوانـــی و زنـــهار نـــخوانـــی
ســـردفتر اربـــاب مـــعانی بـــجز آن شـــه[1]

***

-١٧-
(١) محوی قطعه‌ی بالا را به طور زیر هم تضمین نموده است:
در کسب نـظر عـمر نـمودیم تـباه
در خـــرمن کـائنات کـردیم نگـاه
چون نیك نظر نموده شـد فـهمیدیم
یك دانه محبت است و باقی همه کاه
-١٩-
(١) این رباعی معما است به اسم «امام ربانی».

-۲۰-

در جـــنت ســـرای لطـف بـر عـالم چـو بگشـادی
به «محوی» تحفه‌ی خوش رنگ و بو سیبی فرستادی
ز رنگش دیده شد روشن، ز بویش جان و دل گلشن
«جزاك اللّٰه خیراً» قـوت چشـم و جـان و دل دادی

***

## تخمیس دو بیت مـثنوی

دوری از این شهر و این قوم عنود
خواستم لیکن قضا با صد قـیود
در «ســـلیمانیه» پـــیوندم نـمود
«احمدم درمانده در دست جهود»
«صالحم افتاده در حبس ثـمود»

پس همان به هر دم آری «محویا»
رو بـــه ســـوی بـــارگاه کـبریا
با دو صد زاری از این شه خواهیا
«ای کرامت بـخش جـان اولیـا»
«یا بکش، یا باز خوانم، گو: بیا»

***

## تخمیس دو بیت سعدی شیرازی

ای مـبرّا وجـودت از هـمه ریب
در کـمال ظـهور ذات تـو غـیب

پاك كن بنده را ز نقص و ز عیب
«ای کریمی که از خزانەی غیب»
«گبر و ترسا وظـیفەخور داری»

***

شـــد مـحمد ز رحـمتت مـعلوم
گشت «لا تــقنطوا» ازو مـفهوم
شـــده نـامم بـه نـام او مـوسوم
«دوستان را کجا کـنی مـحروم»
«تو که بـا دشـمنان نـظر داری»

***

## فردها

-۱-

حاجت چو روا می‌نشود ز اهل کرامات
من بعد ز رندان طلبم طـی مـقامات[۱]

***

-۲-

تـــا آن بت مـــه پـــاره زرخ پـــرده بـــرانـــداخت
خجلت عرق از چهرەی خـورشید روان سـاخت[۱]

***

-۱-

(۱) محوی این فرد را برای یکی از دوستان خودش نوشته، کتاب «مقامات حریری» را از او خواسته.

-۲-

(۱) این فرد معما است به اسم «رشید».

ـ ۳ ـ

ز چشم اشکبارم هر طرف در خون دل باید
در آن میدان که نام سرخ‌پوشم در میان آید[۱]

***

ـ ۴ ـ

چو نقش پا به حال چشم پر امید من بنگر
تو بگزار ای صنم این نخوت و یك ره برو بگذر[۱]

***

ـ ۵ ـ

چرا سربسته ماند قصه‌ی دل
کنم آغاز و انجامش چو بلبل[۱]

***

ـ ۶ ـ

ای بیرون از وهم و قیل و قال من
خاك بر فرق من و امثال من[۱]

***

---

ـ ۳ ـ

(۱) این فرد معما است به اسم «محمد».

ـ ۴ ـ

(۱) این فرد معما است به اسم «محمد امین».

ـ ۵ ـ

(۱) این فرد معما است به اسم «سید حسن».

ـ ۶ ـ

(۱) این فرد تحریف یك بیت مثنوی است. بیت مثنوی این است:
ای بیرون از وهم و قال و قیل من
خاك بر فرق من و تمثیل من

-۷-

هر دم آرم لب ساقی به خیال

بر لبم باده بود می‌گویی[1]

---

-۷-

(۱) این فرد معما است به اسم «سلیم».

## پاشبەند

- ١ -

پاش لێبوونەوە لە چاپی بەشی کوردی ئەم دیوانە، لە نێوان پەڕەکانی لێکۆڵینەوە پاکنووس نەکراوەکەی باوکمدا لەسەر ئەم دیوانە پارچە قاقەزێکم دی یەکێك بۆی ناردبوو ئەم سێ بەیتەی تیا نووسرابووەوە:

که دولبەر لێوی لەعل و ماهی روخساری هووەیدا بێ
دەبێ سەرگەشتە بێ بولبول، مەسیحا رەنگی سەودا بێ

ئەوا گوڵ وەختی رۆینیە، دەبێ شیوەن بکا بولبول
ئەمە سەرمەشقە، هەر عەیشێ سەرەنجامی دەبێ وا بێ

نەوەك بشکێ بە دەم بێگانەوە، «مەحوی» سەد ئامانت
کە ناوی ئاشنا هەر گەوهەری دورجی موعەمما بێ

نووسرابوویش کە ئەم سێ بەیتە بەیتی یەکەم و شەشەم و حەوتەمی پارچە شیعرێکن. کە لەمبارەوە لە باوکمم پرسی وتی هیچم لەیاد نیە. نامەیەکم بۆ مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوی نووسی و داوام لێ کرد چی لە بابەتی ئەم سێ بەیتەوە دەزانێ بۆم بنووسێ. ئەویش نوسخەیەکی تری ئەو سێ بەیتەی بە خەتی خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا ئەسعەدی مەحوی بۆ ناردم لەپاڵ بەیتی یەکەمدا تیا نووسرابوو: موعەمما بە ئیسمی «الله» و لەپاڵ بەیتی شەشەمیدا نووسرابوو: موعەمما بە ئیسمی «علی» و لەپاڵ بەیتی حەوتەمیدا نووسرابوو موعەمما بە ئیسمی «یاری» واتە

یاری مەحوی... خۆیشی. واتە مامۆستا شێخ موحەممەد. نامەیەکی بۆ نووسیم تیا نووسیبوو: «رۆژێ چووم خانەقای خۆمان بۆ دیدەنی حاجی مەلا ئەسعەدی ئامۆزام لەکاتی قسەکردنا پارچەیەك قاقەزکە ئەو سێ بەیتەی لێ نووسرابوو دایە دەستم و وتی ئەم بەیتانەم لە مەرحوومی حاجی مەلا عەزیزی بالیکدەریی بیستووە و بەیتەکانیش حەوتن. ئەنجا من خۆم لەبیرم نەماوە حاجی مەلا ئەسعەد لەبارەی چوار بەیتەکەی کە نەینووسیونەوە چی وت. یان وتی هەر ئەو سێ بەیتەم لە حاجی مەلا عەزیز بیستووە، یان وتی خۆم لەبیرم نەماوە... هەروەها وتی ئەم پارچە شیعرە موعەممایە، بەیتی یەکەم بەناوی «الله»، دووهەم بە ناوی «محمد»، سێ و چوار و پێنج و شەش بە ناوی خولەفای راشیدین «ابوبکر و عمر و عثمان و علی». بەیتی حەوتەمیش بە ناوی یاریەوەیە، یەعنی یەکێك لە خۆشەویستانی مەحوی خۆی. ئەنجا ئەو خۆشەویستەی کێ بووە و چی بووە؟ نایزانین». هەروەها نووسیبووی: «من ئەو غەزەلەم نە لە دەستنووسەکانی مەحوی خۆی و نە لە دەستنووسەکانی باوکمدا نەدیوە و لە هیچ کەسێکیشم نەبیستووە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە مەحوی زۆر شیعری هەیە کە لەلای ئێمە نیە و لە دەستنووسی لای ئەم و ئەودا دیومە و ئەوانەم لە دەستنووسەکەی خۆمدا نووسیوەتەوە».

لێکدانەوەی بەیتی یەکەم کە موعەممایە بە ناوی «الله»ەوە بەمجۆرەیە:

«لێو» واتە «قەراخ». قەراخی «لەعل»یش هەردوو «لام = ل»ەکەیەتی. «ماهی روخسار»یش «هێ = ە»یە چونکە «ە» خڕە وەك مانگ. سەرلێشێوانی «بولبول»یش ئەوەیە ببێ بە «هوزار» و، «هوزار» و «هەزار»یش بە رێنووسی فارسی ئامێزی کۆن وەك یەك دەنووسرێن. «هزار = هەزار»یش واتە «ئەلف» کە لەگەڵ پیتی «ئەلف = ا»دا وەك یەك دەنووسرێن. «مەسیحا»یش کە رەنگی «سەودا» بگرێ، واتە «زەرد» دەبێ. زەردیش نیشانەی «لاوازی»یشە. لاوازیش «ئەلف»ە واتە باریکییە وەك «ئەلف». وا بەمجۆرە پیتی «ئەلف» دووجار و پیتی «لام» دووجار و پیتی «هێ»مان جارێ دەسگیر بوو و ئەم تیپانەش تێکڕا وشەی «الله»یان لێ پێك دێ.

دەشگونجێ وشەکە بەمجۆرە بدۆزینەوە:

«سەرگەشتە» بە عەرەبی پێی‌دەڵێن «آلە = ئالیە» کە «ئەلف = ا» و «لام = ل» و «هێ = ە»ی تێدایە. «بولبول»یش واتە «هوزار» کە لەگەڵ «هەزار» وەك یەك دەنووسران. «هەزار = ١٠٠٠»یش بە عەرەبی «ئەلف = الف»ە و «الف»ی ژمارەش لەگەڵ «الف»ی تیپ واتە «١» وەك یەك دەوترێن. سەرگەشتە بوونی ئەم «بولبول»ەیش کە لە ئەنجامدا بوو بە «١» ئەوەتە کە جێگای خۆی لێ گۆڕاوە و کەوتووەتە نێوان تیپەکانی «آلە»وە و بەمجۆرە «ئەلف = ا» و «لام = ل» و «ئەلف = ا» و «هێ = ە»مان دەسگیر دەبێ. لەمجۆرە لێکدانەوانەیشدا پیتی دەغم‌کراو و دەغم‌نەکراو هەر بە یەك تیپ دادەنرێن، کەواتە وا «الاە» بوو بە «الله».

لێکدانەوەی بەیتی شەشەمیش کە موعەممایە بە ناوی «علی»یەوە بەمجۆرەیە:

«رۆیشتنی گوڵ» دوایی هاتنیەتی. «دوایی هاتنیشی» وەرگـرتنی دوا پـیتیەتی کـە «لام = ل»ەکەیەتی. ئەمەیش کە «سەرەنجامی هەموو [عەیش = عیش]ێکیش هەر وایە»، ئەوەتەکە هەمو «عیش»ێك دوایی دێ، واتە دواییەکەی کە «شین = ش»ەکەیەتی نامێنێ و «عەین = ع» و «یێ = ی»ەکەی دەمێنێتەوە. وا بەمجۆرە لە «لام = ل» و «عەین = ع» و «یێ = ی» وشەی «علی»مان پێك هێنا.

بەش بە حاڵی موعەممای بەیتی حەوتەمیش کە موعەممایە بە نـاوی یـارەکـەی مەحوییەوە، لەبەرئەوە کە ناوی یارەکەمان لا دیار نیە و مەحوی خۆیشی ویستوویە زیاتری بشارێتەوە، لەوانەیە لێکدانەوەی بەمجۆرە بێ:

«یار» بە حیسابی حـورووفی ئـەبجەد دەکـاتە «٢١١». «گـەوهەر»یش بـەشێوەی فارسی‌ئامێزی نووسینی جاران «واتە [گوهر]» دەکاتە «٢٣١». ئەگەر ناوی «گەوهەر» دەرکەوێ و بکەوێتە دەمی بێگانە، یەکەمجار کە دانی پیا دەنـێن «گـاف = گ»ەکـەی دەشکێ و «وهر»ەکەی دەمێنێتەوە کە ئەویش وەك «یار» بە حیسابی حورووفی ئەبجەد دەکاتە «٢١١» و، وا دەردەکەوێ کە «یار»ی مەحوی «گەوهەر»ی ناو بووە.

***

- ٢ -

هەروا پاش لێبوونەوە لە چاپی بەشی کوردی ئەم دیوانە، نامەیەکم لە مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوییەوە بۆ هات تیا نووسیبوو ئەم بەیتەی خوارەوەی لەم رۆژانەدا لە مەلا رەسوول ناوێك بیست و ئەویش وتی لە مەلا حوسەینی مەرگەیی بیستووە کە گوایە هی مەحوییە:

من لە یەکدا یەك دەبینم، چل لە دوودا، دەه لە سێ

مەنهەجی عیشقی حەقیقی «نوون»ە پەنجای جێبەجێ

ئەم بەیتەیش موعەممایە بە ناوی «ئەمین = امین»ەوە و، لێکدانەوەکەیشی بەمجۆرەیە: لە سەرەتا و لە پلەی یەکەمدا «یەك» دەبینم کە «١»ی ژمارە وەك پیتی «ئەلف = ا» وایە. لە پلەی دووهەمیشدا «چل» دەبینم کە ژمارەی «٤٠» بە حیسابی حورووفی ئەبجەد دەکاتە پیتی «میم = م». لە پلەی سێهەمیشدا «دە» دەبینم کە ژمارەی «١٠»یش بە حیسابی حورووفی ئەبجەد دەکاتە پیتی «یێ = ی». رێبازی عیشقی راستەقینەیش چەمینەوەیە لە رێگای خۆشەویستیدا وەك پیتی «نوون = ن» کە بە حیسابی حورووفی ئەبجەد دەکاتە «٥٠» و دەبێتەوە بە «ن». ئا بەمجۆرە وشەی «امین» لە «ا» و «م» و «ی» و «ن» پێك دێ.

**موحەممەدی مەلا کەریم**

***

## لەبارەی «مەحوی»یەوە نووسیویانە

تا ئێستا گەلێ لە شاعیر و نووسەر و رەخنەگرانی کورد، کەم یا زۆر، لەبارەی مەحوییەوە نووسیویانە. ئێمە، وەك لە دیوانەکەی «نالی»داکردمان، وای بەباش دەزانین لێرەیشدا باشترینی ئەو شیعر و نووسینانەی لەبارەی مەحوییەوە نووسراون، کۆیان بکەینەوە و بیانخەینە پاڵ ئەم دیوانە، بۆ ئەوەی هەرکەس کە دیوانەکە دەخوێنێتەوە، لە هەمانکاتدا بیشتوانێ قەدری مەحوی لای ئەدیبانی کورد و باری سەرنجی

رەخنەگرانی ئەدەب و جۆری هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەم شاعیرە خاوەن بەهرەیەمان شارەزا و ئاگادار بێ.[١]

سەرەتای ئەم بابەتە لە شاعیری پایەبڵند «ئەورەحمان بەگی سالم»ەوە دەست پێدەکەین کە بە «سالمی ساحێبقەران» ناوبانگی دەرکردووە. ئەم شاعیرە خاوەن بەهرەیە لە پارچە شیعرێکیدا بە شانازییەوە ناوی مەحوی هێناوە کە ئەو کاتە هێشتا نازناوی شیعری «مەشوی»[٢] بووە. ئەمە تێکستی پارچە شیعرەکەی سالمە:

لە عەرسەی ئەوجی عیشقت بازی دڵ هەڵسا لە دەورانا

بە بەرقی پورتەوی حوسنت پەڕی سووتا لە تەیرانا

لە رۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر روئیەتی مەعشووق

کەمەربەستەی هونەر هاتن بە پیتی عیشقبازانا

لەلایێ «نالی»و «مەشوی»، لەلایێ «سالم» و «کوردی»

لە هەنگامەی هونەرگەرمی تکاجۆ بوون لە «مەولانا»

لە مەیدانی بەلاغەتدا سواری مەرکەبی مەزموون

بە کوردی هەر یەکەتازی سوارێ بوو لە «بابان»ا

---

(١) بەشێکی زۆری کەرەستەی ئەم باسە مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوی خستیە بەردەستمان.

شایانی وتنە ئێمە لەبارەی شێوەی رێنووسەوە، نەبێ، هیچ‌جۆرە دەسکارییەکی تێکستی هیچکام لەم بابەتانەمان نەکردووە. هەر بەوجۆرەمان نووسیونەتەوە کە لە سەرچاوە بنچییەکانیاندا نووسرابوونەوە.

(٢) نووسەرانی مێژووی ئەدەبی کورد و رەخنەگرانی ئەدەب لە زمانی کوردیدا تا ئێستا کەسیان نەیانوتووە «مەشوی» و «مەحوی» دوو شاعیری جیان. ئەوەی باوە ئەوەتە «مەشوی» نازناوی پێشووی شیعری مەحوی بووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە پارچە شیعرێکی مەحویمان نە بە دەسنووس «و دیارە نە بە چاپیش» نەدیوە لەجیاتی «مەحوی» تیا نووسرابێ «مەشوی». وادیارە مەحوی خۆی کە وازی لە ناوی «مەشوی» هێناوە، هەر پارچە شیعرێکیشی بەو ناوەوە بووبێ گۆڕیبێتیە سەر «مەحوی».

کە «نالی» تەوسەنی تەبعی بە تەرزێ گەرمی جوستەن بوو

بە چەوگانی خیرەد گۆی دانشی دەرکرد لە مەیدانا

کە رەخشی تەبعی رامی هاتە سەر میقرازەکەی تەعلیم

ریکابی پای‌بۆسن «سالم» و «مەشوی» لە دەورانا

***

«مەلا موحەممەدی خاکی»یش کە شاعیرێکی‌تری سەدەی نۆزدەهەمە، لە قەسیدەیەکی درێژیدا کە ستایشی پێغەمبەری پێ کردووە «سەلامی خوای لێ بێ» و شوێن پێی «مەحوی»ی تیا هەڵگرتووە لە قەسیدەی «بەحری نوور»دا، بە چەند بەیتێك بە شان و باڵی «مەحوی»دا هەڵداوە و دەڵێ:

لە جارِ و خەرمەنی فەزڵ و کەماڵی «مەحوی»یا «خاکی»

خەریکی خاکەرِۆیە، گوڵ دەچێنێ دانە مۆرانە

نوعووتی ئەحمەدی فەرموو، نەمامی سەرمەدی هەڵناشت

منی «خاکی» کە رێم دایم لە دەوری باغەوانانە

سوورشك ئاو و، موژە پەرژین، ئومێدی دڵ چ غونچەی گوڵ

بە چاو، چاودێری وەك بولبول بکەم ئەم تەرزە باغانە

«تعالى الله» چ دیهقانە، جەزای غوفران و ریزوانە

سەمەر خۆر بین، خودا، ئێمەش لە سایەی ئەم نەمامانە!

***

شاعیری رۆشنبیری کورد «حاجی قادری کۆیی»یش لە پارچە شیعرێکیدا کە شانازی بە شاعیرە هەڵکەوتووەکانی کوردەوە تیا دەکا، ناوی مەحوی هێناوە کە لەودەمەدا هێشتا نازناوی شیعری هەر «مەشوی» بووە. حاجی قادر دەڵێ:

«سالم» و «مەشوی»، «شێخ رەزا» و «خەستە»

شاعیرن، هەر چواری بەرجەستە

***

شاعیری پایە بڵند «مەلاکاکە حەمەی ناری»یش کە بە «مەلاکاکە حەمەی بێلوو»یش بەناوبانگە، پارچە شیعرێکی لەسەر کێش و قافیەی ئەو دوو پارچە شیعرەی مەحوی وتووەکە سەرەتاکانیان ئەمەیە: «لە رۆژێ هەڵدرا ئەم کۆنە خەیمەی تان‌وپۆ شینە» و «لە سەیری خەستەخانەی عیشق، ئەوی سەوزەی کەوا شینە». ناری لەم پارچە شیعرە نایاب و سوارەیدا شیوەنی کۆچی دوایی مەحوی دەکات. لە دوا بەیتیشیەوە وا دیارە کەوا لەو سەردەمەدا بە نەخۆشی لە سلێمانی بووە. ئەمەش تێکستی تەواوی پارچە شیعرەکەی ناری:

لەبەر تیری موژەی بێ مروەتی ئەو شۆخە نەخشینە
لە هەرجێ دەنگی یا تەڵقینە، یا یاسینە، یا شینە
لە داخی خارە هەردەم شیوەنی بولبول بەسەر گوڵدا
لەسەر ئەو وەجهەیە شینم کە رووی موحتاجی تاشینە
بڕۆ زاهید کە دڵ نادەم بە وەعزی پووچ و ئەفسانە
نیشانەی سەفوەتی دڵ کەی بە ریش و خەرقە پۆشینە!
لە هەر وەقتێ بە موژدەی مەی، خرۆشی بەربەت و نەی بێ
بە ئەمری پیری مەیخانە زەمانی بادە نۆشینە
نە هەر مل لایقە دەستی بە سەربەستی لە گەردەن کەی
نە هەر سەر واجبی دەستەی گوڵ و سەرپۆش و پووشینە
یەکێ وا چاکە سەر بۆ ئەفسەری شاهانەیی کەچ کا
یەکێ موستەوجیبی بەرگی پەڵاس و کۆنە پۆشینە
بوزورگی کەی بە فیکر و دانش و ئاداب و ئیدراکە!
مەعیشەت کەی بە سەعی و ئیهتیمام و کەسب و کۆشینە!
بە شوێنی مەحوییا نەزمم سەراسەر شینە بۆ مەرگی
لە ئەشعارم تەماشا کەن سەراپا ئاخری شینە

بە رووخۆشی کە فەرموویە ئـەبێ «نـاری» عـەیادەت کـەم

ئــەوا مـردم لە خـۆشـیدا، لە خـۆشـی ئـەم نـەخۆشـینە...

***

سەیید ئەحمەدی نەقیبی زانا و شاعیری پایەبەرزیش، بەبۆنـەی کـۆچـی دوایـی مەحوییەوە ئەم پارچە شیعرەی لە لاواندنەوەیا وتووە[1]:

ئـەوا یـاران هـەموو رۆیـین، بـەبێ جـێ مـن بـەجێ مـاوم

دڵم رەش، رەنگ و روو زەرد و، سپی بوو، دیدەکەم، چاوم

شـــەرابـــی کـــەئسی دنـــیا وا دەمـاغ و کـەللەمی پـڕ کـرد

لەبـــەر مـــەستیو سســـتی مـن هـەمیشە کـاس و تـاساوم

عـــەجەب مـــاوم کـەوا مـاوم لەبـەر سـۆز و بـڵێسـەی دڵ

لە ســـایەی ئـاوی چـاوی خـۆمـەوە هێشـتا نـەسووتاوم

بـە نـاری حـیرسی دنـیا خـەرمەنی ئـەعمالی مـن سـووتا

لەبـــەر کـوێری بـەسیرەت خـۆم نـەدیوە چـەندە شێواوم

لەباتی بێتە عەرشی حەقق و جـێگـەی سـیڕی سـوبحانی

دڵم بـــــتخانەیی ئـــــەغیارە بـــــۆ دنـــــیا کـــە بـــرژاوم

مەتاعی ئـابڕووم هـێنـد سـەوقی سـووقی نـامورادی کـرد

لە دووکـــــانی زەرەردا دەســـــتە ئـــەژنۆ لات و دامـــاوم

بـــەدەس شـەیتانەوە حـەیران و بـووم مـەلعەبەی سـوبیان

لە بـەحری قـەسوەتا کـەشتی شکـاو و غـەرق و خـنکاوم

بە رۆژم تـێ ئـەگـەن جـەمعێ، ئـەسەفمە چـونکی نـازانـن

لەبـــەر حـــەیلوولەتی ئـــەرزی مـــەعاسی مـانگی گـیراوم

بـــە خـــۆبـــادانـــی بـــێهـــوودەم ئـەوا مـەعلوومە نـادانـم

نـــیە فـــەهمم کـــە تـــۆزێ تـۆزم و چـەند قـەترەیێ ئـاوم

---

(١) دەستنووسی ئەم پارچە شیعرە، بـە خـەتی شـاعیر خـۆی، ئێـستاش مـاوە و لای شێخ رەئووفی کوڕی سەیید نووری نەقیبە.

بنازم بەم هەموو حیلمی خودایە و لوتفی پێغەمبەر
کە بەم زۆری گوناهە من بە روو وەك ئادەمی ماوم
ئەمیش نەوعە ریاییکە دەم و دڵ یەك نەبێ «ئەحمەد»
لە دیوانی ئەدەبدا بۆیە وا مەحوە قسە و ناوم

***

«شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی»یش کە نازناوی شیعری «فەوزی» بووە، بەبۆنەی دەرچوونی دیوانەکەی «حەمدی»یەوە، چەند بەیتێکی وتووە بە شان و باڵی مەحویشیدا تیا هەڵداوە. شایانی وتنە فەوزی هەمیشە ئاواتەخوازی ئەوە بوو دیوانەکەی مەحوی بەشێوەیەکی جوان و بێ هەڵە لە چاپ بدرێ و پارچە شیعرێکی ستایشی بۆ دابنێ. بەڵام بەداخەوە نەژیا ئەو ئاواتەی بە چاوی خۆی ببینێ بێتە دی و لەگەڵ خۆیدا بردیە گۆڕ. ئەمەش تێکستی ئەو چەند بەیتەی فەوزی:

گەرچی «نالی» و «کوردی»و «سالم» لە دەوری «ماضی»یا
خاوەنی دیوانی عالی بوون لە شیعری کوردییا
گۆیی سەبقەت هەر لەناوا مابوو «مەحوی» پێی گەیشت
خستیەوە مەیدان بەجێی هێشتن لە عەسری «ثانی»یا
دایە بەر چەوگانی تەشبیە و بەلاغەت، رای فڕان
ئەو بەیان و ئیستیعارەی وا لە شیعری «حەمدی»یا

***

«عەلی کەمال باپیر ئاغا»ی شاعیریش ئەم دوو پارچە شیعرەی بۆ مەحوی وتووە:
پارچەی یەکەم:

گەهێ مەخموور و سەرخۆشم بە نەشئەی دیدەکەی مەستی
گەهێ دڵ لەت ئەکا شمشێری ئەبرۆی تیژی پەیوەستی
لەکاتی پیرییا گەر حەز لە باڵای یار بکەم حەقمە
کە چونکە پیاوی پیر دایم عەسا پێویستە بۆ دەستی

لە گــۆڕی پـاكـتا سـەر دەربـهێنـە حـەزرەتی «مـەحوی»!
بزانە چی بە سەرهات كـوردەواری و شـیعر و هـەڵبـەستی
لەنــاو بـاغچەی ئـەدەبدا تـا ئـەبەد نـابینی تـۆ یـەك گـوڵ
كە لایـق بـێ بـە دەسـتی یـار و بـیدەیتێ بـە سـەربەستیی
تەوافی كەعبەیی بەردەركی یار نـاكـرێ بـە مـانگ و سـاڵ
ئـەبێ دەسـتەو نـەزەر تـا مـاوی تـۆ ئـازانـە راوەسـتی

پارچەی دووهەم كە چوار خشتەكییەكە:
چونكە بەندەی حەزرەتی «مەحوی»م و شاگردی‌ئەوم
وائـەزانـم «واریسـی» تـەختی شـەهی كـەیخوسرەوم
داخـــەكـەم ئـەولادەكـانی دەرحـەقی مـن بـێ‌وەفـان
وائـەزانـن بـەندە مـردووم یـاخۆ سـەرمەستی خـەوم

***

«ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی ساحێبقەران»یش كە نازناوی شیعری «حەمدی» بووە لەم چوار خشتەكییەیدا بە شان و باڵی مەحویدا هەڵداوە:
خەرمانی لەفزی كوردی، «كوردی» كە كردی پێوان
«نـالی» كـە نـاڵی كـاسەیێكـی دابـەویش لێوان
تاراجی كرد كە «مەحوی ئەفەندی» بە لوتفی خۆی
عوشریشی دا بە «حەمدی» وتـی بـیبەرە دیـوان[1]

***

---

(١) ئەم چوار خشتەكییەمان لە نوسخە لەچاپ دراوەكەی «دیوانی حەمدی» وەرگرتووە كـە لە ١٩٥٧دا لەلایەن «كـتێبـخانەی گـەلاوێژ»ی سـلێمـانییەوە لەچـاپ دراوە و د. مـەعرووف خەزنەدار پێشەكی بۆ نووسیوە. لەنگی چوارخشتەكییەكە ئاشكرایە. بەداخەوە لەبەر نەبوونی نوسخەیەكی تر لەبەردەستماندا بۆمان راست نەكرایەوە.

«گۆران»ی نەمریش لە پارچە شیعری «بە رێگادا... بەرەو کۆنفرانس»، کە لە یەکێ لە شەونشینییەکانی کۆنگرەی دووهەمی مامۆستایانی کورددا لە شەقلاوە خوێندیەوە لە هاوینی ١٩٦٠دا، بەمجۆرە ناوی مەحوی هێناوە:

ئــەگــەر دوێنــێ مــامۆسـتاکـان یــەك ســولْتـانیان پـێ ئـەگـەیان
ئــەمڕۆ ئـەبێ مـامۆسـتای کـورد دانـــــیشێ و بـــە راوێژی ورد
ڕێگـــــای پــێگــەیاندن دانــێ: بــۆ مــلیۆنــان، نــەك سـولْتـانێ!
لە بـێشکـەی بـن هـەر سێبـەرێ ســبەی ئــەگــەر بـێتــە دەرێ:
خــــانزادێ، ســـــەلاحەددینێ، کــاکـــە مــەمێ، خــاتو زیـنێ...
ئــەوسا بــەستەی بـێ خـەمیمان چ هــی پـێنـووس، چ دەمـیمان
بـــە تــاقە یــەك زاری شــیرین شــاخ پــڕ ئـەکـا لە پێکـەنین!
ئەوسا: «خانی»، خـانی سـەردەم بــە زمــانێك ئــەنووسێ «مـەم»
کە پێی ئەدون «نالی» و «مەحوی» وەك «قوبادی»، وەك «مـەولەوی»!

مامۆستا گۆران، لە یەکێ لە موحازەرەکانیشیدا لە بەردەمی قوتابیانی بەشی کوردی کۆلێژی ئەدەبی زانکۆی بەغدادا، لە مەیدانی هەڵسەنگاندنی خاسیەتە هونەرییەکانی شاعیرانی غەزەلدا، لەبارەی مەحوییەوە دەڵێ:

«بوێژێك بووە لە ژیانی خۆیدا دڵتەنگ بووە. دەڵێن هۆنراوەکانی لەسەر ڕێچکەی هیندی وتووە. لە قووڵی بیردا، لە وردی واتادا، لە ڕێکوپێکی وشەکاندا زۆر هونەری نواندووە. مەحوی زۆر بەتەنگ ئەوەوە بووە هۆنراوەکانی کورت بن، قسەکانی لەژێر پەردەوە بکا».

***

مامۆستا «نجم الدّین مەلا»یش، لە هەڵسەنگاندنی مەحوی و دیوانی مەحویدا لە ژێر ناو و نیشانی «چەند وشەیەك»دا نووسیویە [1] دەڵێ:

---

(١) شێخ موحەممەدی مەحوی لە سەرەتایساڵی ١٩٥٨دا دەسنووسەکانی دیوانی مەحوی داوەتە لای مامۆستا نەجمەددین مەلا تا نوسخەیەکی پاکنووس کراویان لەبەر بنووسێتەوە بۆ لەچاپدان. ناوبراو لەگەڵ نووسینەوەی نوسخەکەدا ئەم وتارەشی نووسیوە تا لەگەڵ دیوانەکەدا لەچاپ بدرێ.

## چەند وشەیەك

خوێندەوارانی خۆشەویست!

به ستایشی ناڵێم، راست و دروست ئەم چەند وشەیەم خستە پێش چاوتان:

له خوێندنەوە و سەرنج‌دانی ئەم دیوانە بەنرخەدا بۆم دەرکەوت کە خاوەنی دیوان، پێشەوا و مامۆستای مەزن خوا لێ‌خۆش بوو «مەحوی»، وەك له پایەی شیعر و ئەدەبدا شابازە، له خواپەرستیشدا جێی نیازە. هەرکەسێ واتە و ئەشعاری ئەم زاتە بخوێنێتەوە چاو و دڵی روون ئەبێتەوە. ئەگەر بێینە سەر باری راستی و بە چاوێکی ژیری شیعرەکانی ورد بکەینەوە و هەڵبەستی «تەوحید» و «تەنزیە»ی سەرنج بدەین، ئەبینین مەحوی له «عەقیدە ـ باوەڕ»دا له «جامی» و «مەولانای رۆم» کەمتر نیە. خۆ ئەگەر تەماشایەکی هەڵبەستی «بەحری نوور»ی بکەین کە ١٢٤ شیعرەکە ئەمەیش رەوشت و خووی جوان و بەرزی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان دروودی خوای لەسەر بێ، پیشان ئەدا. مەحوی چووەتە جەنگی حەسسانی کوڕی «ثابت»ەوە کە شاعیری تایبەتی پێغەمبەر بووە. خۆ ئەگەر له شیعری فەلسەفە و عیشق و زەوقی بکۆڵینەوە، مەحوی شان بە شانی «حافظ» و «سەعدی»ی شیرازی رۆیشتووە. هەروەها مەحوی نیشتمان پەروەر و دڵسۆزی قەومەکەی بووە. ئەم شیعرەی بەڵگەیە کە ئەڵێ:

له «همزیّه» و له «بُردە»م چونکە کەم دی ئیستیفادەی کورد
منیش ئەم کوردییەم دانا له ریزی ئەو قەسیدانە

لێرەدا شاعیر دڵی به قەومەکەی سووتاوە کە هەڵبەستی «همزیە» و «بردە» عەرەبییەکە رەقە و کەم دا بێژێك [کەم تا بێشێك] خەڵك تێی‌ئەگا، هاتووە هەڵبەستی «بەحری نوور»ی بەکوردی رێك خستووە بۆئەوەی خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ له دڵیانا چەسپ بێ و له مەزایای جوانی تێ‌بگەن. له سەرێکی‌ترەوە مەحوی له فەلسەفەی ژیان و کۆمەڵایەتیدا رابەرێکی بێ‌وێنە بووە. تو خوا له شاعیراندا کێ فەلسەفەی وا جوانی وتووە کە ئەڵێ:

برا، فیکری چرا، کیبریتی فرسەت تا لە دەستایە
شەوی یەلدا لەپێشە، ڕۆژی عومرت وەختە ئاوا بێ

لەم شیعرەدا بۆ دین و بۆ دنیا مرۆڤ هان ئەداکە تێکۆشێ و بەرەو پێشکەوتن بڕوا و لەکۆشش سارد نەبێتەوە.

ئیتر خۆم بە بەختیار ئەزانم کە ئەم چەند وشەیەم نووسی و پێشکەشی خوێندەوارانی بەڕێزم کرد.

**سولەیمانی**
**مامۆستا نجم‌الدّین مەلا**
**١٩٥٨/٩/١٩**

***

ئەمەش ئەو بە باڵابڕینەی کە پایەبڵند حاجی «میرزا عبدالله»ی کۆیی، کە نازناوی شیعری «خادیم» بووە، بۆ «دیوانی مەحوی»ی نووسیوە:*

شوکر و سوپاس و ستایشی بێژمارە و حەمد و سەنای فراوانی زیاتر لە ژمارەی ستارە، شایانی خودایێکە کە بێ‌شەریك و بێ‌موشیر و بێ‌وەزیرە، وە لە ئومووراتی کاری خۆی و بەڕێوەبردنی جیهان موحتاجی موعین نیە، وە بێ‌جێگە و مەکانە، وە ڕاوەستانی بە مەکان و زەمان نیە، بەڵکی مەکان و زەمان ڕاوەستانی بە قودرەتی زاتی پاکی ئەوەوەیە. سەلات و سەلام لەسەر ئەو پێغەمەرەی «موحەممەد»ی ناوە کە نێرراوی ئەوە بۆ ئیسلاحی مەخلووقاتی ئینس و جین. وە ئەو «موحەممەد»ەی لە نووری مەحز خەلق کرد و شەرابی عیشقی لە مەیخانەی ئەزەل پێ‌نۆشاند، وە مەستی جیلوەی ئەبەدی تەجەللای خۆی کرد، وە پاشماوەی ئەم شەرابی مەحەبەتە مایەوە بۆ خاسان و تابیعانی ئوممەتەکەی. هەرکەسێ جورعەیێکی لەم شەرابە نۆش کرد لە حاڵی بەشەرییەت «ئاو و گڵ» کەوتە حاڵی مەلەکییەت، وە کەوتە زەمزەمە و «اضطراب»ەوە،

(*) حاجی میرزا «عبدالله»یش، هەروەك مامۆستا «نجم‌الدّین» مەلا، ئەم بەباڵابڕینەی بۆ ئەو دیوانەی مەحوی نووسیوە کە شێخ موحەممەدی مەحوی خەریکی ئامادەکردنی بووە بۆ چاپ.

وە زەمزەمە و شۆری عەشق لە بن هەر موویەکی ئەندامـی پـەیدابـوو، هـەروەکـوو مەشهووره ئەڵێن: گۆزە چی تیابێ ئەوە ئەدەڵێنێ. لە جوملەی ئەم خـاسانە جـەنابی «مەحوی» کە سەرچاوەی عیلم و عیرفان و قاتیعی بورهان بوو لەم شەرابەی نۆش کرد لە مەیخانەی حەقیقەت:

چ مـەیخانە، مـەیخانەیی بـەزمی یـار — چ مەیخانە، سەد جۆشی جیلوەی بەهار
چ مەیخانە، فـیردەوسی گـەوهەرنەژاد — چ مەیخانە، جـۆشـی بـەهاری مـوراد
چ مـــەیخانە، ئـــاییندەداری حـــەرەم — چ مەیخانە، نەیرەنگـی بـەزمی قـیدەم

وە قووەی جازیبەی شۆری عیشق خستیە سەر ئەشعار و دانانی ئەم دیوانـە کـە گەنجێکی نیهانییە پڕ لە دوڕڕ و گەوهەر، چونکی ئەم تائیفە هەریەك بە نەوعێ مەستی و مەجزووبی روویان تێ ئەکا. بەعزێ نەعرەی سوبحانی ئەخاتە دنیاوە، وە هێندێ بۆ سەری دار بۆ سەرداری هەوڵ ئەدات، وە ئەوەیتر بە شیعر و زەمزمە رووی زەوی پڕ ئەکا:

هەموو سەرخۆشـی بـادەیی وەحـدەتن — مـوبەڕڕا لە چـوون و چـرا و کـەسرەتن
وەکوو رەنگی گوڵشەن هەموو مەیپەرست — وەکوو بەرگی گوڵ جوملە ساغیر بە دەست
هەموو مەحوی جیلوەی تەجەللایی یار — لە عەشقا جگـەرخـوێن وەکـوو لالەزار

وە لە وەسفی جەنابی عاشقی دڵسۆز «مـەحوی ئـەفەندی» چـەند هـەڵبـەستێك ئەخوێننەوە:

دڵی مـــەیخانەیی ئـــەسرارە «مـــەحوی»
کـــەلامی گـــەوهەری شـــەهوارە «مـــەحوی»
چ مـــەحوی؟ مـەحوی بـادەی دەسـتی سـاقی
چ مـەحوی؟ مـەحوی چـاوی مـەستی سـاقی
چ ســـاقی؟ ســـاقی مـــەیخانەی عـــەشق
چ عـەشقێ؟ عـەشقی سـەوداخـانەیی عـەشق

ئــەوەندەی گــوت «هـو الحـق» تـا زوبـانی...
بـــە ئـــەسراری «انَــا الحــق» بــوو بــەیانی
خـیرەد حــەیرانــە بــۆ ئــەفکاری بـیکری
لە ســـــافی تـــینەتا ئـــیلهامە شـــیعری
لە جــۆشـــی خــودپەرستی دوورە مــەحوی
بــە مــەستی هـەم لە هـەستی دوورە مـەحوی
لە هـــــەر لەفـــــزێکـــــی ئــەیبینی مــەجازە
لە مـــــــەعنیدا حــــــەقیقەت ســـــیڕڕ و رازە
بـە بـەرقی شـیرك سـۆزی عـەشقی وەحـدەت
هەمووی سووتاند خەس و خاشاکی کەسرەت
لە ســاقی عــەشقەوە گــەر جــامی وەرگـرت
بــە وەســڵی دولبــەری ئــارامــی وەرگـرت
لە فـــەیزی نــەشئەیی ئــەم بــادە دوو جــام
لەوا مـــــەغموورە کــوفر و مــەستە ئـیسلام
خــەتی ئــەم ســاغیرە شـەرحـی یـەقین بـوو
لەوا «عــــلم‌الیــــقین»، «عــین‌الیـقین» بــوو

عومری عەزیز و ئەوقاتی شەریفی خۆی لە شەو و رۆژا سەرفی ئـەو مـەحەببەتە حەقیقییە کرد. هەر شەوێ بە یادی کۆی یارەوە سەر بە ئەژنۆ لە ئەسراری وجوودەوە سەفەری ئەکرد. کە جۆشی عیشقەکە زۆری بۆ ئەهێنا. زمانی بە شیعر ئەکرایەوە.

وە لە وەسفی دیوانەکەشی چەند هەڵبەستێکی تر ئەخوێنینەوە:

ئــەی دڵ وەرە بــنوارە، تــۆ مـەحرەمی پـەنهانی
ئــەسراری دڵی مـەحوی لەم سـەفحەیی دیـوانـی
قیبلەی ئەدەب و عـیشقە، هـەم فـارسی‌و کـوردی
بــاغێکـــی ســـەفابەخشە، ئــەوراقـی گـوڵستانی

ئــەلفاز و مــەعانی ئــەو، وەك ســەبزە و گــوڵزارە
گوڵچین بە ئەدەب ئەی دڵ هەرچەندە کـە بـتوانـی
ئــەم گــوڵشــەنە خــەندانــە پـڕ لالە و رەیـحانە
مورغانی مەعانی ئەو مـەشغووڵی غـەزەلخوانـی
سروەی سەحەری مەعنا، خەندەی دەهەنی غونچە
ئــەسراری نـومایان کـرد بـۆ عـالەمی جـیسمانی
سەد جەننەتی جـاویدان پـەیدایـە لە یـەك ئـەیوان
هـەر مـەتڵەعـی ئـەشعاری «رزوانـە» بـە دەربـانی
ئــەلفازی ســەدەفـواری پـڕ گـەوهەری مـەعنایە
غەوواسـی مـەعانی بـوو بـۆ سـەفحەیی دیـوانـی
سەد کەوسەری جانپەروەر، پەیدایە لە یەك دەفتەر
سەرچەشمەیی هەر کەوسەر پڕ لوئلوئی عـوممانی
یــەك گــۆشــە گــوڵســتانە، پـڕ لالە و رەیـحانە
یــەك گــۆشــە شـەبستانە، پـڕ مـاهی شـەبستانی
ئەوراقی گـوڵی مـەعنی مـەحفووتی خـەزان مـاوە
بــۆ هــەدیەیی یــارانـە گـوڵ دەسـتەیی عـیرفانی
گــەرمی ســوخەن ئــارایـی، دنـیاییو عـوقبایی
ئــەسراری بــە زێــایی تــا حـیکمەتی یـۆنـانی
ئــەم گــوڵشــەنی دیــوانــە، رازی دڵی پــەنهانە
ئــەسراری دڵ و جــانە بــۆ مـەستیو حـەیرانـی
شـۆر و شـەغەفێکـی وا، عـەشق و تـەرەبێکـی وا
قـیبلەی ئـەدەب و غـەوغا، بـازاڕی سـوخەندانـی
رازی دڵە ئـــــەشعاری، مــەیلی گــوڵە گــوفتاری
گـوڵچـینە لە گـوڵزاری، بـولبول بـە سـوخەنڕانـی

**من «خادیم»ی دەرگاهم، شەو تا بە سـەحەر ئـاهم**
**بـۆ زامـی جگـەرگاهم تـۆ مـەرهەم و دەرمـانی**

***

**لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی دوور و درێژیشدا لە شیعری مەحوی، دوو وتاری ماموّستا «علاءالدّین سجّادی»ی و ماموّستا «کاکەی فەللاحمان» لە بەردەستدایە، وا لێرەدا دووبارە بڵاویان دەکەینەوە. ماموّستا «علاءالدّین» لە «مێژوی ئەدەبی کوردی»یەکەیدا وای لەبارەی مەحوییەوە نووسیوە:**

**مەحوی**

**١٨٣٠ـ١٩٠٤**

**شاگردی مەیخانەی مەیفرۆشانی مەعریفەت لە سۆزدا، خەلفەی کۆڕی چلەکێشی ئەشکەوتان لە خورۆشدا، شێخی سەر بەرماڵی دڵ رووناکان بەو چاوی پڕفرمێسکی خوێنینەوە، پیری دیواخانی پاڵەوانان بەو باوەڕی قایمی ئاسنینەوە، شەیدا بە کشتی قسەی نەستەق لەباری ئایینی، والەه بە زوشتی لەگەڵ نەفسی پیسی رابەری بێدینی. ئاشنا بووە عەشقی تەنها بە باسی کردەوە بۆ رۆژی دوایی، نەیداوە خەرمەنی فیکری بە دەس خەیاڵی شەن و بای دنیایی. دانا بووە بە فەلسەفەی ئەو رێگەیەکە رێی تەریقەتە، زانا بووە بە وردەکاری ئەو باوەڕەکە بیری شەریعەتە. قسەی ئاوێنەی دڵیە. شیعری تێکڵاوی گڵیە. نەفسیەتی سۆفی بووە، بیری تیژ و قووڵی بووە...**

**شاعیری بەرزی ئەم داستانە ناوی «موحەممەد» و کوڕی مەلا وەسمانی باڵخییە ـ باڵخ دێیەکە لە ناوچەی ماوەت لە لیوای سولەیمانی ـ لە ساڵی ١٨٣٠ ی میلادی لە شاری سولەیمانی هاتووەتە دنیاوە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، لە کتێبە وردەڵەکان بووەتەوە و سەرەتای خوێندنی عولوومی ئیسلامی لای باوکی دەست پێ کردووە، لەپاشا بە فەقیەتی چووە بۆ سابڵاخ بۆلای مەلا «عبداللە»ی پیرەباب، سێ ساڵێك لەوێ ماوەتەوە، گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمانی، لەو ناوەدا و لەلای مەلا چاکەکانی ئەو دەورەدا گەلێ دەرزی وەرگرتووە، ئینجا چووە بۆ بەغدا بۆ لای موفتی زەهاوی.**

ماوەیەك لەلای زەهاوی ماوەتەوە و ئیجازەی مەلایەتی پێ داوە و لە ١٨٥٩دا کردوویە بە مامۆستای مزگەوتی ئیمام ئەعزەم. لە ١٨٦٢دا بەغدای بەجێ‌هێشتووە و چووەتەوە بۆ سولەیمانی. لە سولەیمانی بووە بە ئەندامی مەحکەمە. لە ١٨٦٨دا کە باوکی ئەمرێ، خۆی لە ئیشی حوکوومەت ئەکێشێتەوە و دەست ئەکا بە دەرز وتنەوە بە فەقێیان. مەلا وەسمانی باوکی خەلیفەی شێخ «سراج‌الدّین»ی تەوێڵە بووە. خۆیشی هەر لەو بنەماڵەیەدا خەلیفەیەتی شێخی «بهاءالدّین» وەرئەگرێ. لە دوو لاوە بە دوولادا مەردوم فێری عیلم و تەسەووف ئەکا...

لە ١٨٨٣دا بارگە ئەپێچێتەوە ئەچێ بۆ حەج. هەر کە لە حەجەکەی ئەبێتەوە لەوێوە ئەچێ بۆ ئەستەمووڵ. پیاوە کوردەکان ئەیگەیەنن بە سوڵتان «عبدالحمید». سوڵتان شێخ موحەممەدی بە عیلم و تەسەووفەوە ئەچێتە دڵەوە، نەوازشێکی زۆری لەگەڵا ئەکا و فەرمان ئەدا لە سولەیمانی خانەقایێکی بۆ دروست ئەکەن ـ کە بە ناوی خانەقای مەحوییەوە ناوبانگ ئەسێنێ و ئێستەش ئەو خانەقایە ماوە ـ کە ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی ئیتر دەست ئەکا بە دەرز وتنەوەی عیلم و رابەری کردنی مەردوم لە باری تەسەووفدا، تا لە ١٩٠٤ی میلادی لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا شەربەتی مردن ئەخواتەوە و لە خانەقاکەی خۆیدا ئەنێژرێت.

شێخ موحەممەد پیاوێکی باڵابەرز و کەڵەگەت، سوور و سپی و چاو گەورە و ریشێکی درێژی پێوە بوو، بە نەرمی و لەسەرخۆ قسەی کردووە. میزەری سپی کوردانەی لەسەر ناوە و کەوا و سەڵتە و جوبەی لەبەر کردووە. لە دەوری ئاخردا ژوورێکی لە خانەقاکەی خۆی بۆ خۆی تەرخان کردووە لەوێدا وەختی کردووە بە سێ بەشەوە؛ بەشێکی بۆ دەرز وتنەوە، بەشێکی بۆ دانیشتن لەگەڵ مەردوما و ئامۆژگاری کردنیان لەباری شێخایەتی، بەشێکیشی بۆ نوێژ و زیکر و فیکر. لە سەرەتای ژیانیشیەوە زۆرتر حەزی بە گۆشەگیری و تێکەڵاو نەبوون کردووە و لای وا بووە کە سووسەی نەسیمی مەعنەوییات لەم سووچەوە دەست ئەکەوێ. کە ماوەیێك ماوەتەوە و بۆنی هیچی نەکردووە، کەوتووەتە سەر ئەو باوەڕە کە تا جۆش و خوروشێکی نەبێ ناگاتە رووی ئازیزان، بە خۆی ئەڵێ:

سەر کە جۆشێکی نەبێ، من زرکە تاڵم بۆچیە!

دڵ کە هۆشێکی نەبێ، شیشەی بەتاڵم بۆچیە!

پێی ئەڵێن ئەم جۆش و خورۆشە ئەتکێشێ بۆلای ئەو مەیدانە کە مەیدانی عیشق و عاشقانە و مەیدانێکی ترسێنەرە؛ مەیدانێکە کە سەرچاوەی ئیلهاماتی شیعر و ئەدەبە. بازاڕی شیعریش گەلێ لقی لێ ئەبێتەوە. ئەڵێ:

ئـــــەزانـــم بـــادیەی عـــیشقە خـــەتەرناك

کەچی هەر چووم، ئەگەر ماوم، ئەگەر چووم

کە ئەکەوێتە ئەو مەیدانەوە، بە بێ‌ئیختیار شەرابی عیشقی شاعیران ئەخواتەوە و «مەحوی» ئەکا بە ناوی شیعری..

کەوابوو مەحوی لەو کەسانە بوو کە تەنها سۆزی مەعنەوییات قاپی شـیعری بـۆ خستە سەر گازی پشت بەبێ ئەوە دڵی کردبێ بە هێلانەی خەیاڵی روومەت گوڵان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە. بەڵێ مەحوی بەمجۆرە خۆی هاوێشتە کۆڕی شاعیرانەوە، بەڵام ئایا هەستی بەوە کرد کە پـەردەی خـەیاڵی شـاعیر پـەردەیێکـی نـازکی کـامێرایـە، رووبەڕووی هەر شتێکی کردەوە وێنەکەی وەرئەگرێت و بۆ پاشەڕۆژ ئەیهێڵێتەوە؟ یا هەر دەنگی ئاوازی شیعری لە بەینی چوار سنووری عیشقی حەقیقیدا مایەوە و هیچ جموجووڵێکی نەکرد؟ من لام وایە ئەمەی دواییانە. مەگەر جارجارێکی زۆر کەم نەبێ کە سەرێکی لەسەر دیواری سنوورەکەوە کێشابێتەوە بەم دیوا بۆئەوە بزانێ چی هەیە و چی نیە!

ئەو ماڵە کە مەحوی تیایا گەورە بووبوو ناچاری کردبوو بـەوە کـە سـەر بـەرێتـە مووزەخانەی ئەهلی تەسەووف و بەراوردێکی بیروباوەڕەکانیان لەگەڵ دڵی خۆیـدا بکا، کەوابوو دیسان هەر تەسەووف مەحوی کرد بە شاعیرێکی تەسەووفی و کـردی بەوە کە دەستووری میتافیزیکییەکان، لە پشت پەردەی تەبیعەتەوە شت بڵێت، وەکوو بڵێت فەلسەفە و تەسەووفی لە سوێنەیەکدا شێلاوە، بەم بۆنەوە گوایە بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ شەیتان و نەفسدا دەستەویەخە بوون!

بەڵێ مەحوی شاعیرێکی وردەکاریش بووە. وردەکار بووە نەوەك گاڵتە! بۆیە هەندێ قەسیدەی لە مانگێکەوە تا ساڵێك درێژەی کێشاوە. بەڵام ئەم وردەکارییەی ئەگەر تێکڵاو بە فەلسەفەی تەسەووفەوە نەکردایە نەیئەتوانی بستێ بەولاوە بچێ. هەروەها شاعیرێکی قسە نەستەق و جیناس پەروەریش بووە. دیسان ئەویش تا بە تەسەووف ئاوی نەدایە هەر بۆی نەهاتووە. کەوابوو مەحوی چۆن خۆی شاعیرێکی سووفی بووە شیعرەکانیشی گران و قووڵ و زۆر بەشوێنیاناگەڕاوە و خۆی تووشی عەزیەت کردووە تا دایانی ناوە. ئینجا ئەتوانین لێرەدا بێینە سەر باس کردن لە هەندێ لە شیعریەوە بۆ ئەوە ئەو پایەیەمان بۆ دەرکەوێ کە مەحوی لە شیعردا گرتوویەتی... باسێکی خۆی و نەفس و دنیا ئەگێڕێتەوە ئەڵێ:

لە ناکەس کارییا، خاکم بەسەر، رۆیی بە با عومرم

خودا، سا بمژێنی تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم

بە زایع چوو لە «ما لا یعنی»یا وەقتم هەموو، یەعنی

دەبێ وەختێ لە «بوالوقت»ی بخوازم تا تیا بمرم

ئەجەل دەورم دەدا حازر بە وەعدەی دەور و تەسلیمە

منی غەفڵەتزەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم!

خەیاڵی پووچی دنیا وا دەماغ و دڵمی پێچاوە

قیامەت هەر مەگەر رۆژی قیامەت بێتەوە فیکرم

لە پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکوو منداڵ

لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم

چیە سووچ و گوناهم، بۆچی دەمکاتە جەزاخانە

لە قەبر هەڵکەن هەتا رۆژی جەزا دەعوا چیە قەبرم

سبەینێ «یُحشر المرء»ە، براگەل، فرسەتە ئیمڕۆ

تەبەڕڕا بن لە من، با کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم

لە من نازانم ئیتر نـەفسی بـەدخۆ چـی دەویٚ «مـەحوی»
کـە بـەدکردار و، بـەدڕەفـتار و، بـەدئەفکار و، بـەدتەورم
مەگەر بەر مەوجی بەحری رەحمەتم خا وەسفی سەتتاری
وەگــەرنە زەحـــمەتە پــابوونەوەم، نـامومکینە حـەشرم

مەحوی حاڵەتێکی تەسەووف و دەروێشی بە بیرێکی وردی فەلسەفی دەرئەبڕیٚ، ئێجگار لەبەر ئەوە خۆی بە سووچدارێکی تەواو ئەبینیٚ. دەردەدڵێکی بەسۆز ئەکا و ئەڵیٚ:

داخی گرانم من کەڵکی ژیانم نیە؛ ئەو ژیانە کە ئەڵێن باخچەی ئاخیرەتە و تۆوی تێدا ئەچێنریٚ بۆ ئەوە بەری پڕ خێر و بیری رۆژی دوای بدا بەدەستەوە، چونکە تەماشا ئەکەم ـهەش بە سەرم ـ هەموو عومرم رۆیی و هیچم نەکرد، کەوابوو خوایە ئەوەندە بمژیێنە تا خۆم ئەگەیەنمە بەر قاپی کەسێکی وەها کە ژیان بۆ ئەو باشە و ئەو ئەزانیٚ چۆن لەو زەوی و زارەدا کشتوکاڵ بکا؟ بۆ دروونەوەی خەرمانی ئەو دنیا، بەڵکوو بەهۆی پاشەرۆکی ئەو خەرمانەوە منیش شتێکم دەستکەویٚ. من فیکر ئەکەمەوە ئەم ژیانە خۆشەویستە ـکە گەلیٚ لە ئاڵتوون بەنرخترە ـ بەجۆرێك دۆڕاندوومە تـەنانەت بەشی تاقە هەناسەیەکی خاوێنیشم بۆ نەماوەتەوە کە بتوانم بە روو سووری تیایا بمرم. بە ناچاری ئەبیٚ بۆ ئەوەش هەر پەنا بەرمە بەر یەکێکی وەها کە لاپەڕەی ژیانی ـلە باری چاکە و چاکە کردندا ـ وەکوو ئاوێنەی بیٚ گەرد وابیٚ و تۆزێکی لیٚ بسێنم بۆئەوە لەو وەختەدا رۆحم بدەم بەدەستەوە.

ئەوا من ئەوە حاڵمە، کەچی مردنیش وەکوو شمڵی شەڕ گل و خولیەتی بەدەورما ئەڵیٚ: وەرە مەیدان چیت وەرگرتووە بیدەرە دواوە؟! بەڵیٚ من شتم وەرگرتووە ـکە گیان و شوعوورە ـ رۆح و هەست بـۆ ئـەوە وەرئـەگـیرێت کـە خـوای پـیٚ بـناسرێت و فەرمانبەرداری خوای پیٚ بکرێت، بەڵام من لەبەر ئەوە کە ئەو مەبەستەم پێك نەهێناوە وەکوو هیچم وەرنەگرتبیٚ وایە. ئێستە ئەوا کەوتوومەتە سەر ئەوە هۆشم هاتووەتەوە بەخۆما کە ژیان ئەبیٚ بۆ فەرمانبەری خوا خەرج بکرێت و ئێستە بەتەمای ئەوەم کە پیٚ

بهاویژمە ئەو مەیدانەوە!... کەوابوو مردن! من هێشتا لە دەوری ئەوەڵدام تۆ چۆن ئەڵێیت بێنە بیدەرە دواوە؟!... چیم پەیداکردووە تا بتدەمێ؟. منێ خەیاڵی پڕوپووچی دنیا وای خەو لێ خستبێتم کە مەگەر رۆژی قیامەت خەبەرم بێتەوە و بزانم ئەمە قیامەتە، ئیتر تۆ چۆن ئێستە ئەڵێی بێنە حیسابی خۆت بدەرە دواوە؟! منێ کە بەناو ئەوەندە پیر بووم لەپێ کەوتووم و سەرم ئەلەرزێ، کەچی نەفسم وەکوو منالێکی ساوا چۆن پێ بگرێت و بە شنەشن بەپیر شتەوە بچێت، بەوجۆرە تازە خەریکە ئەکەوێتە گڕوگاڵ و پێ ئەگرێت و ئەچێ بە ئارەزووی شەهوانیەتەوە! من کە نەفسێکی وام ببێ ئەی مردن! تۆ چۆن ئەلێیت بێنە چیت وەرگرتووە و پەیدات کردووە بمدەرێ؟...

ئایا من کە هاتمە دنیاوە بۆئەوە هاتم کە فەرمانبەری خوا بکەم، یا لێی هەڵتەکێنم؟!. دیارە هێنانەکەم بۆ فەرمانبەری بووە، کەچی نەفسەکەم ئەو کەتنەی گێڕا، ماوەی ژیانەکەمی بەو دەردە برد کە بردی نەیهێشت ئیشێکی چاکەی تیدا بکەم. من کە بەمجۆرە گیرۆدەی زنجیری نەفس بوویێتم، ئیتر نازانم ئەبێ چ سووچ و گوناحێکم ببێ و ئەبێ بۆچی بخرێمە ئەو بەندیخانەیەوە و ئەشکەنجە و ئازار بدرێم؟ ئەبێ بۆچی لەبەر ئەوە کە ئەوەندە خراپ بم گۆڕەکەم تا رۆژی قیامەت موحاکەمەی گۆڕ هەڵکەنەکەم بکا و پێی بڵێ: من خاوێنم و ئەمەش لەمن دروست کراوە، ئێستە بۆچی بەم پیسییە هێناوتە و پێت داومەتەوە؟...

ئەوا من بەو دەردە چووم. کەوا بوو کوڕینە هەل لە دەست بەرمەدەن؛ توخنم مەکەون با ئێوەش وەکوو منتان لێ نەیێ، هەتا زووە ئیمڕۆ خۆتانم لێ دوور خەنەوە، با سبەی رۆژ کە حیساب و کیتابی عالەم ئەکێشرێتەوە حەشرتان لەگەڵ من نەکرێ، نەوەك ئێوەش پێوە ببن، ئەوا چاوتان پێکەوت کە نەفسی پیسم بەمجۆرەکەمەری دوژمنایەتی لەگەڵما بەستووە و وای لێ کردووم کە کردەوە و قسە و هۆش و بیر و خوو و رەوشتی بەجارێ تێکداوم، کەچی لەسەر ئەمەش هەر وازم لێ نایەنێ. کەوابوو مەگەر خوا بە میهرەبانی خۆی بمخاتە بەر شەپۆلی رەحمەتی خۆی و بمشارێتەوە و بمشواتەوە، ئەگینە زۆر گرانە بە شتێکی تر پاك ببمەوە و داڵدە بدرێم!!

تەماشا ئەکەی لێرەدا مەحوی بە بیرێکی زۆر زۆر ورد لەم فەلسەفەی ژیان و نەفسە ورد ئەبێتەوە؛ لەلایەکەوە خۆی زۆر بە خراپ ئەزانێ، لە لایەکی ترەوە ئەڵێ من خراپ نیم ئەگەر نەفسم لەگەڵ نەبوایە. لە ئاخری کاریشا ئیشی خۆی بەرەورووی خوای خۆی ئەکاتەوە. کەوابوو مەحوی رێگەیەکی گرتووە کە فەلسەفەچییەکانی دەوری ناوەڕاست لە عالەمی ئەرواحدا گرتوویانە.

***

دیسان مەحوی دێنێ بە جیناس و وردەکاری و رێکخستنی عیبارەتی گران هەر لە باری تەسەووفدا پێ ئەخاتە قاپییەکی ترەوە و ئەڵێ:

لە سەیری خەستەخانەی عیشقی ئەو سەوزەی کەوا شینە
لەسەر هەر خەستە دێ یا خوێندنی یاسینە یا شینە
شەهیدی غەمزەیە بەعزێ، سەقیمی عیشوەیە جەمعێ
دیارە سەرنویشتی ئەهلی دڵ یا شینە یا سینە
لە بەنگ ئەم بەنگییانە چی دەبینن؟: خۆ لە خۆ گۆڕان
لە دنیادا مەداری عەیش و خۆشی خۆ نەناسینە
بەسەر دڵدا لە قاپی فەیزەوە دێ نەشئە پەی‌دەرپەی
چ غەمزەی دیدە مەخموورێکە ئەمشەو، ژان ئەکا سینە!
هەناسەم دا بە ناڵە عەرزی حاڵم‌کەم کە تاساوە
لە خوێناوا دڵ و جەرگم، دەروونم کەیلە تا سینە
لە عالەمدا عەلامەی سوبحی حەشر ئەمشەو بەیانی دا
خوا عالەم لە چاکی ئەو بەرۆکە دەردەخا سینە
مەلا تەڵقینی «مەحوی» دانەدا، «حبل‌المَتین»ی ئەو
لە جێگەی زەللە زەیلی رەئفەتی «طاها» و «یاسین»ە

نازانم مەحوی چی ناچاری کردووەتە سەر ئەوە کە بەمجۆرە ئەزیەتی خۆی بدا بۆئەوە شیعر دابنێ! ئایا شیعر دەنگێکی نهێنی نیە کە تەلی عاتیفە ئەبزوێنێ؟ ئایا شیعر

دەوارێکی ئاوریشم نیە کە لە لالەزاری گێتی دا هەڵئەدرێ بۆ ئەوە پیاو لە سێبەریا خۆی لە گەرما و سەرما حەشار بدات و لەپێناویا دڵ و دیدەی بە بۆن و دیمەنی گوڵاڵەی رەنگاورەنگ بگەشێنێتەوە؟.. بەڵێ شیعر ئەمانەیە، بەڵام وەختێ ئەمانەیە کە بە جۆرێ بوترێ پیاو لێی تێ بگا، بە جۆرێ بوترێ کە ئەو مەبەستە وەکوو ئاوی گەوارا بکرێ بە گەروودا، نەوەك شاعیر بێنێ تەنها بۆ کامەرانییەکی رۆحی خۆی شیعرەکانی بخاتە پلە پلەیەکەوە کە بێجگە لە خۆی کەسی تر دەستی نەیگاتێ!. بەڵام لۆمەش ناکرێ چونکە ویستوویەتی ببێ بە شاعیرێکی ئیبتیداعی.

ئەوا من لێرەدا مەبەستی ئەم شیعرانە لەباتی مەحوی دەرئەبڕم بۆ ئەوە لە گۆڕەکەدا سەر راست کاتەوە بڵێ: بەڕاستی لە عالەمی شیعری تەسەووف و نوکتە زانیدا مـنت پیشانی مەردوم دا.

ئەوا کۆشکێکە سەری بردۆتە ئاسمان، ژوورەکانی لەپاش گەچکاری بـە بـۆیـەی رەنگاورەنگ بۆیە کراوە، گوڵۆپەکانیش رووناکی بڵاو ئەکەنەوە، کورسی و قەرەوێڵە و نوێنیان تیا دانراوە، ماسێر و برینپێچەکان بە بەرگی ئاوەڵدامەنی ترسێنەرەوە تیایانا وەستاون، پزیشکەکان لە تەنیشت جانتاکانیانەوە بە عەینەکـەکـانی بـەرچـاویانەوە موژدەی خۆشی بڵاو ئەکەنەوە، مەلایەکی نوورانیش بە ریشە جوانـەکـەیەوە لەبـەر هەیوانەکە لەسەر بەرماڵێك دانیشتووە جامێ ئاوی حـەوسوون کـراوی لە تـەنیشت خۆیەوە داناوە، جزمێکیشی لە بەردەمایە، بە نەوایێکی لاهووتی دەنگی خـوێنـدنی «یاسین»ی بەرز کردووەتەوە.. بەرامبەر بەم کۆشکە «کانی و سەراوێکە». داری عەرعەر و سنەوبەر چووە بە ئاسمانا، سەرچاوەی ئاوەکە ئەوەندە جوانە وردە بەردەکانی بووە بە مرواری! نەونەمامێك کە دەستی کردگار نەخشەی ئەندامی کێشاوە بەو لەش و لار و گەردنی وەك مینایەوە، بەو روومەتی گەنمڕەنگی دڵڕوبایەوە کەوایێکی شینی ئاسمانی لەبەر کردووە و لەسەر کانییەکە دانیشتووە یاری بە ئاوەکە ئەکا لەگەڵ فریشتەکان...

شێخ ئەمانەی بەرچاو ئـەکـەوێ ئـەڵێ: ئـای! تـەماشای ئـەو کـۆشکـە کـە، کـە خەستەخانەی عیشقە، خەستەخانەی ئەو کەسانەیە کە نیگاری ئـەو سـەوزەی کـەوا

شینەی سەرئاوەکە کاری تێ کردوون و بە دەردەوە گلاندوونی. ئەو، بۆیە لەوێ دانیشتووە کە ببێ بە ڕێبازی مەفتوونانی بازاڕی عیشق، هەرکەس کە چاوی پێ کەوت گرفتاری داوی بەڵای ببێ و بیبەنە ئەو خەستەخانەیەوە، چونکە پێی خۆشە بڵێن ئەم کۆشکە خەستەخانەی ئەو کەسانەیە کە گرفتاری داوی تۆ بوون، ئەیەوێ بێجگە لە جوانییەکەشی بەمجۆرە ناوبانگێکی تر بۆ خۆی دەرکا! ئینجا نەخۆشەکانیش یا ئەمەتە بەهۆی دەنگی خوێندنی ئایاتی «یاسین»ی مەلا نوورانییەکەوە -کە بۆنی مـوژدەی لاکردنەوە و دڵ نەرمبوونی یاری لێ دێ-؛ بۆنی دڵ نەرمبوونی یاری لێ‌دێ، چونکە کە ئەو شۆخە گوێی لە دەنگی ئەم یاسینە بوو سەرێك بەرز ئەکاتەوە و ڕوویەك ئەکاتە دەنگەکە و ئەزانێ ئەمە بۆچیە، دڵی نەرم ئەبێ و ڕوویەکیش ئەکاتە نەخۆشەکان. کە ڕووی تێکردن بای شیفا لەلای قیبلەوە هەڵئەکا و ڕزگاریان ئەبێ. یا ئەمەتە بە هیچا ڕاناگەن، بەداخەوە ئەمرن و دەنگی گریان و زاری ماسێرەکان بەرز ئەبێتەوە!

شێخ بە ڕوومەتی سەوزە و کەوای شین جیناسێکی لەگەڵ سوورەی «یاسین» و دەنگی شین و گریان پێك هێناوە. لە پاشا ئەڵێ ئەوانەی بریندارى عیشقن و لەو خەستەخانەیەدا کەوتوون، هەندێکیان شەهیدن بەدەست نازی یارەوە، زۆریشیان نەخۆشی دەستی عیشوەین. دیارە ئەوانەی کە ئەهلی دڵ و مەفتوونی حەقیقەتن حەرفی هەوەڵی سەرەنجامی ئیشەکەیان یا شینە یا سینە، یانێ یا شەهیدن یا سەقیمن. کە لە نیوە شیعرەکەدا ئەڵێ «شەهیدی غەمزە و سەقیمی عیشوە». بەم شین و سینە «لەف و نەشر»ێکی لەگەڵ ئەودا پێك هێناوە و جیناسێکیشی لەگەڵ ئاخری نیوە شیعری دووەمی شیعری یەکەمدا دروست کردووە.

لەپاشا ئەڵێ: ئەوکەسەی دێتە دنیاوە ئەگەر بەتەمای ئەوە بێ کە بگا بە ژیانێکی کامەرانی بەهەشت، ئەبێ بە هەموو جۆر تێکۆشێ و لە دنیا لاریی بێ؛ تێکۆشێ بۆ قیامەت بەجۆرێکی وەها کە خۆی لە دنیادا ون کا و وەکوو «مەنسوور» خۆی بۆ نەناسرێتەوە! ئایا ئەم بەنگ‌کێشانە لە بەنگ‌کێشانەکەیان چییان دەست ئەکەوی؟.. خۆشی؟ کام خۆشی ئەو خۆشییە کە خۆیانیان لێ ئەگۆڕێ! کەوابوو نوختەی خۆشی

دنیا ئەوەیە کە پیاو خۆی لێ بگۆڕێ. دەی دنیایەك کە ئەمە خۆشییەکەی بێ ئەبێ بە چ ڕوویەکەوە پیاو ڕووی تێ کا؟!...

تەماشا ئەکەم لە قاپییەکی نهێنییەوە لەسەر یەك لەسەر یەك باێکی ڕەحمەت ئەدا بەسەر دڵما. ئاخۆ ئەم بایەکاری چ چاومەستێك بێت کەوا هەواکە ئەبڕێ و تەوژمی ئەو هەوایە ئەم کارەساتە لە سینەمدا پەیدا ئەکا؟... ویستم هەناسەیەك هەڵکێشم کە بەهۆی ناڵەی ئەوەوە دەردەدڵی خۆم ئاشکرا بکەم، سەیرم کرد بەهۆی قوڵپی خوێنەوە تاساوە و دڵ و جەرگ و دەروونم تا گەیشتووەتە سەر سینگم هەمووی لە خوێنا کەیل بووە. ئیتر نەمتوانی هەناسەکەش هەڵێنمەوە!... ئایا هیچ ئاگات لێیە کە ئیمشەو لەم کەونەدا نیشانەی بەیانی حەشر چۆن دەرکەوت؟.. خوا عالمە لەبەر ئەوە کە ئەو شۆخە لەبەر بەرۆکیەوە سینگی دەرخست، ئەوەبوو کە بوو بەهۆی سپیدەی ڕووناکی حەشر لە بەرەبەیاندا!!...

مەحوی لەبەر ئەوە کە زۆر گوناهبارە مەلا نەهاتە سەر گۆڕەکەی تەڵقینی بخوێنێ، بەڵام دەستگیری قایمی ئەو لەباتی هەموو خراپەیەك ـکە کردوویەتی ـ میهرەبانی «تاها» و «یاسین»ە کە موحەممەدﷺ، وەیا دوو ئایەتی: ﴿قُلْ كُلٌّ مُتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَابُ الصِّرَاطِ السَّوِيِّ وَ مَنِ اهْتَدَىٰ﴾ وە: ﴿فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ە، کە ئاخری سوورەی تاها و یاسینن و موژدەی خۆشی ئەدەن. کەوابوو مەحوی با خراپەکەریش بێ هەر یاس نابێ لە ڕەحمەتی خوا.

***

مەحوی ڕاستە بە فەلسەفەپەرستی و دەروێشی و عیبارەت ڕێکخستنەوە خەریك بووە، بەڵام لە بن‌دەست ئەمەشەوە لایەنی قسەی نەستەق و حیکەمیاتی بەرنەداوە، بەڵکوو لەم بابەتەوە گەلێ باڵاتر و قسەکانی بۆ دانسقە ئەشێن... لەبابەت ئەوەوە کە هەروا وەکوو نقوم بووی سەر پارچە تەختە ماوەتەوە، ئەڵێ:

چ بکەم نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لەلا بە کەس

خۆیشم نەگەیمە ئەو کەسەی من بکا بە کەس

دیارە پارسەنگی کۆمەڵایەتی چاك چاك هەڵسەنگاندووە، بۆیە ئەڵێ:

نـــــامەرد ئـــــەوەندە مـــوعتەبەرن لەم زەمـــانەدا

مەرد ئیعتیباری کەم بووە، مەردی خوا خوسووس!

دیسان ئەڵێ:

لە هەموو جێ لە چ کەس بێنـی مـرووەت نـایە

کەرەم و سیدق و وەفا ئێستە لە عالەم بووە قات!

ئای چەند جوانە ئەو شیعرەی کە ئەڵێ:

زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە تیرۆك لەتێ نانت ئەداتێ دوو بەشی نـۆك

لەباری زوهددا ئەڵێ بەڵام بە جیناسەوە:

دنیا تـیاترۆیـە مـەوەستە تـیا، بـڕۆ کێ مایەوە تیا، کە نەبووبێ تیا تڕۆا؟

بە دوو بەیت فەلسەفەی دوو ڕێ‌گر دەرئەخا. هەرچەندە فـیکرەکـە گـەلێ پـێش مەحوی کەوتووە، چونکە «مەعەڕڕی» و «خەییام»یش قسەیان لێوە کـردووە، بـەڵام نرخی مەحوی لەمەدا بەوە دەرئەکەوێ کە بە شوێن بیروباوەڕی فـەلسەفەچییەکـانی پێشوودا گەلێ سووڕاوەتەوە و، ویستوویەتی ئەدەبیاتی کـوردیش لەو جـۆرە شـتانە بێبەش نەبێ، بۆیە هاتووە بەو دوو بەیتە جوانەی ئەو قسەیە ئەکا کە ئەڵێ:

شێخی هەمەوەندێکی ئـەدا وەعـز و نـەسیحەت

ئەو قوڕبەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەزیحەت

خۆش هاتە جواب و وتی: تۆ حەقتە فەقەت مـن

قـوتتاعی تـەریقم، نـەکـوو قـوتتاعی تـەریقەت

مەحوی بڕە شیعرێکی هەیە لەژێر ناوی «قەسیدەی بەحری نوور» کە عیبارەتە لە ١٢٣ شیعر، سەرەتای ئەکاتەوە ئەڵێ:

«و صلی الله علی» ئەو بەحری نوری عیلم و عیرفانە

کە دەرکی غەوری ناکا غـەیری «عـلم الله سـبحانە»

لە شیعری چوارەمدا ئەڵێ:

**لە زوڵماتی شەوی کوفرا بە یەکدەم لەمعەیێکی دا**

**هەزار و سێسەد و بیست و دووە، دنیا چراخانە**

بەڕاستی چاکتر شیعرگەلێکن کە لە وەسفی بارەگای موحەممەد و عیشقی موحەممەددا وترابێ:

بەڵێ مەحوی شاعیرێکی تەسەووفی بووە، بەڵام ئەو بڕە شیعرانەی کە دایناون و ناوی ناونەتە «قەسیدە» من لام وایە لە هەر قەسیدەیەکدا تاقە شیعرێکی بۆ ئەوە ئەشێ کە سەربەخۆ بکرێ بە باسی قەسیدەیەك، چونکە شاعیر کە ویستی ئامانجێکی تایبەتی خۆی بخاتە قەسیدەیەکەوە، ئیتر نابێ لابدا، ئەبێ سەروبنی ئەو قەسیدەیە وەکوو زنجیر پێکەوە بەسترابێتن، لە قەسائیدی مەحویدا کەمتر ئەوەت بەرچاو ئەکەوێ.

مەحوی وەکوو چۆن لە کوردیدا شاعیر بووە، لە فارسی و تورکی و عەرەبیشدا هەر بەوجۆرە ئامادە بووە. دیوانە کوردییەکەی بۆ جاری یەکەم لەلایەن «عەلی کەمال باپیر»ەوە لە ساڵی ١٩٢٢ی میلادی لە چاپخانەی حوکوومەت لە سولەیمانی لەچاپ دراوە...

***

کاکەی فەلاحی ئەدیب و شاعیریش وتارێکی لەبارەی مەحوییەوە لەژێر شادێڕی «چەند سرنجێك دەربارەی شیعرەکانی مەحوی»دا لە ژمارە «٦» و «٧» و «٩»ی ساڵی «١»ی خولی دووەمی گۆڤاری «برایی»دا بڵاو کردووەتەوە، ئەمە تێکستی تەواوی ئەو وتارەیە:

## چەند سرنجێك دەربارەی شیعرەکانی مەحوی

ئاشکرایە کە «مەحوی» یەکێکە لە شاعیرە بەرز و نەمرەکانی کورد لە سەدەی نۆزدەهەما. ئەگەر شوێنی شایان و پێشیاوی خۆی لە ریزی پێشەوەی «نالی» و «سالم» و «کوردی» و شاعیرانی تری هاوچەرخیەوە نەبێ، ئەوا بێگومان لە شانبەشانی ئەو شاعیرە بلیمەت و هەڵکەوتووانەی کوردەوە ئەڕوات. جا لەبەر ئەوەی کە ئەم شاعیرە تا

ئێستە بەگشتی نرخ و بایەخی خۆی نەدراوەتێ و بە چاوێکی ورد و سەرنجێکی تیژەوە شیعر و هونەری بەرزی شاعیریەتی تەماشا نەکراوە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەرکە ناوی «مەحوی» و شیعرەکانی براوە، زۆر جار خۆی بە شاعیرێکی «کەسبی» و شیعرەکانی بە رەق و تەق و چەند پارچە مسێکی ژێر زەبری چەکوشکاری دراونەتە قەڵەم، کە هۆی ئەم جۆرە حوکمە ناڕەوایانەش، بەپێی بیر و را و بۆچوونی ئێمە، ئەوەیە کە شیعرەکانی لە رادەیەکی، ئەتوانم بڵێم نزیك لە ئەندازە بەدەر، لەنگەری بایەخ و پێ لێ داگرتنی لەسەر مانا و بیر لێ کردنەیەوەکی تەواو قووڵ راگرتووە، بە هونەری رەنگینی شیعری کلاسیکییەوە، بەو هێز و پێزەوە کە لە دەستەڵات و توانای ئەو وەشاوەتەوە، بە زمانێکی تەڕ و پاراوی کوردی و کوردییەکی روون و رەوانی شارەزا و لێزانەوە... یان بە ناڕەوا وا دراوەتە قەڵەم کە گوایە «مەحوی» تەنیا شیعرەکانی لەسەر کاروباری ئایینی و باس و خواستی تەسەووف تەرخان کردووە. جا بۆ روونکردنەوەی چەند کەل و قوژبنێکی تاریك و شارراوەی ئەم بابەتانە و دیاری کردنی پلەی شاعیرییەت و جۆری فەلسەفە و شێوەی بیرکردنەوە و چۆنێتی داڕشتنی شیعرەکانی لە قاڵب و چوارچێوەی هونەری شیعری کلاسیکی و ناسکی هەست و توانای دەربڕین و بەکارهێنانی کەرەسەی لێهاتووی زمانی کوردی لەلایەن شاعیرەوە، بە پێویستم زانی کە ئەم چەند سەرنجەی لای خوارەوە بگرم:

**یەکەم ـ شانازی کردنی «مەحوی» بە نەتەوەی کورد و زمانی شیرینی کوردییەوە:**

یەکێك لەو شتانەی سەرنجی خوێنەری دیوانەکەی «مەحوی» رائەکیشێ، لەگەڵ ئەوەشا کە پیاوێکی ئایینی و زانایەکی سۆفی مەشرەب و نەقشبەندی بووە، گیانی بەهێزی شانازی کردن و دەربڕینی هەستی پیرۆزی بووە بەرامبەر نەتەوەی کورد و زمانی شیرینی کوردی. ئەم راستییە ئەوە دەرئەخات کە ئەم شاعیرە لە کانگای دڵ و ناخی دەروونییەوە، هونەرمەندێکی دڵسۆز و شاعیرێکی دڵسوتاو بووە بەرامبەر بە نەتەوەی کورد و زمانەکەی، لەو سەردەمەدا کە ئەم یەکێکی دەرکەوتوو بووە لەناو ئەو دەستە شاعیرەی سەدەی نۆزدەهەمدا کە بەڕاستی بەردی بناغەی شیعر وتن بە کوردی

و شیرینکردنی زمانی کوردییان بە شێوەی کرمانجی خواروو گرتە ئەستۆی خۆیان. لە سەردەمێکا کە شیعر پێ وتنی فارسی و تورکی لە برەو و باوا بووە و بەکارهێنانی نیشانەی هەرە باڵای پلەی شارەزایی و خوێندەواری شاعیران بووە.

بە وێنە چەند شیعرێك ئەهێنینەوە بۆ دەرخستنی راستی ئەم قسەیەمان. «مەحوی» دەرگای سەرەتا و پێشەکی دیوانەکەی بەم چوارینە ئەکاتەوە و ئەڵێت:

بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیتاعەم کرد

لە ئیبتیداوە کە بەیتێ موناسیبی دیوان

گەدایەکی وەکوو «مەحوی»، قەلەندەرێکی کورد

میسالی پادشەهی فورسە ساحێبی دیوان

واتە: پیری دڵم فەرمانی پێ کردم لە سەرەتاوە شیعرێکی وا بنووسم بۆ پێشەکی دیوانەکەم کە هەڵبگرێت. منیش ملم کەچ کرد و ئاواتەکەیم هێنایە دی. گەدایەکی وەکوو «مەحوی» کە قەلەندەر و دێوانەیەکی کوردە خۆی بە پاشایەکی فورس ئەزانێ بەوەی کە خاوەنی دیوانێکی کوردییە.

ئەم جۆرە تێبینی و بیرکردنەوەیە گیانی شانازیکردن بە کورد و زمانی کوردییەوە ئەنوێنێ، بەوەی کە هەرچەند شاعیر لە پلەی ژیانا خۆی بە هەژار و دێوانە داناوە، لەگەڵ ئەوەشا مادام کوردە و دیوانی بە کوردی هەیە، خۆی لە پاشایەك هیچ بە کەمتر نازانێت.

یان لە قەسیدەی «بەحری نوور»دا کە ئەڵێت:

لە «همزیە» و لە «بردە»م چونکە کەم دی ئیستیفادەی کورد

منیش ئەم «کوردیە»م دانا لە ریزی ئەو قەسیدانە

زوبانی عیشقبازی خۆشە گەر کوردی وەگەر تازی

قسەی بێسۆزی عیشق ئەر گەوهەرە مەحبووبی بێ ئانە

موکەڕڕەڕ بوو قەسیدەی بوردە، نەشئەی عالەمی پڕ کرد

بفەرموا بەم قەسیدەی کوردە نۆبەی نەشئە پێوانە

واتە: لەبەرئەوەی کـە لە «هـمزیە» و لە «بـردە» کـە دوو قـەسیدەی عـەرەبی زۆر بەناوبانگن لە ستایشی پێغەمبەردا(د.خ)، کەڵکی کوردم کەم دی چونکە بە عەرەبین، منیش هاتم ئـەم قـەسیدە کـوردییەم دانـا لە ریـزی ئـەوانـا. زوبـانی عـیشقبازی و خۆشەویستی ئەگەر بە کوردی بێ یان عەرەبی، خۆشە. بەڵام قسەیێك کە سۆزی عیشق و خۆشەویستی تیا نەبێ، گەوهەریش بێ شتێکـی وەخـتی و بـێ‌بـەهایە. قـەسیدەی «بوردە» زۆر جار دووپات کراوەتەوە و بە نەشئەی خۆی دنیای پڕ کردووە، ئیتر با بەم قەسیدە کوردییە کە یەکەمجارە، نۆرەی نەشئە پێوان بێت.

ئەم قەسیدەیە هەرچەند لە مەقامی ستایشێکـی وادا وتـراوە، بـەڵام شـاعیر ئـەو لایەنەی فەرامۆش نەکردووە کە پڕ بە دڵ شانازی بکا بە زمانی کوردییەوە و لە ریزی قەسیدە بەناوبانگە عەرەبییەکانی دابنێت و جۆش و خرۆش و نەشئە و سۆزی عەشق و خۆشەویستی پێ بپێوێت.

لە غەزەلێکی ترا ئەڵێت:

کوردی زوبانی ئەسڵمە، گەر تەرکی کەم بە کول

بـۆ فـارسی، بـە کـوللی ئـەمن دەبـمە بـێ‌وەفـا

واتە: کوردی زمانی نەتەوایەتی خۆمە، ئەگەر بێتو بەتەوایی وازی لێ بێنم و سەر بکەمە سەر فارسی ـ وەك ئەم و ئەو کە پشتی فەرامۆشییان کردە زمانەکەی خۆیان ـ ئەوا بە تەواوی ئەبم بە پیاوێکی بێ‌وەفا و سپڵەی نەتەوەکەی خۆم.

لە شوێنێکی ترا، لە غەزەلێکی فارسیا ئەم جۆرە شانازی‌کردنە روون‌تر و ئاشکراتر دەرئەخات کە ئەڵێت:

فخر هرکس به زبان خودش است ای «محوی»

فارسی را که تو بـرگزیده‌ای بـر کـردی، حـیف

واتە: ئەی «مەحوی»! شانازی هەمووکەسێك بە زمانەکەی خۆیەوەیەتی. ئـەگـەر تۆش چاکەی فارسی بدەی بەسەر کوردییا، بەڕاستی جێگەی داخ و خەفەتە.

ئەمە هەرچەند لەپڕ ئەوە ئەگەیەنێ کە «مەحوی» سێبەری چاکەی فارسی کێشابێ بەسەر کوردییا، بەڵام لە راستییا ئەگەر وردی‌کەینەوە، وا نیە. چونکە شاعیر لە کاتێکا کە

جڵەوی خەیاڵ و دەسەڵاتی بۆ غەزەلێکی فارسی شل کردووە، لەپڕ، وەك یەکێك لە خەوێکی زۆر ناخۆش و کاریگەر رابچەنێت، ئەسڵەمێتەوە و پەشیمان ئەبێتەوە کە بۆچی هەر بە زمانە قەشەنگەکەی خۆی کە کوردییە، هونەری شاعیریەت و توانای بەهرەی خۆی بەخت نەکات و دانەرێژێت. بۆیە هاوار ئەکات: «شانازی هەرکەس بە زمانی خۆیەوەیەتی». واتە: ئەگەر هەڵیگێڕینەوە، هیچ کوردێك مافی شانازیکردنی نیە بە زمانەکانی تری غەیری کوردییەوە کە بەرهەمی پێ نووسیون.

***

دووەم ـ هەڵوێستی شاعیر بەرامبەر زۆردار و ستەمکاران:

لەم بارەیەوە «مەحوی» پلار و توانجی سەخت و تیژی گرتووەتە سەر دڵی ستەمکار و زۆردارەکانی سەردەمی خۆی، تەنانەت بەم هۆیەشەوە دوچاری ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر هاتووە. بەڵام ئەم جۆرە سزا و چەرمەسەرێیانە هیچ کارێکی تێ نەکردووە ئەوە نەبێ کە لەسەر بیرو باوەڕی راستی خۆی سوورتر بێت.

بە وێنە سەرنجێکی وردی ئەم چوارینە بەرزەی بدەن کە چۆن زۆرداری لەگەڵ بەردی رەق و دڕکی تیژا بەراورد و جووت کردووە، ئەڵێت:

زاڵمی دڵ رەقی روو گرژی موسوڵمان ئازار
هەر بە ئیزایە کە رەنگی بگەڕێتە روخسار
بەرد ئەگەر سەر نەشکێنێ بە چی روو رەنگین کا!
کە لە پێ هەڵچەقی ئەوسا روخی گوڵنارییە خار

واتە: ستەمکاری دڵڕەقی رووگرژی ئەم و ئەو ئازاردەر، هەر بە سزا و ئەشکەنجەدانی خەڵکی لە خۆشییانا رەنگی سوور هەڵئەگەڕێ و خوێنی پێ خۆشبوون و دڵنیایی ئەزێتە دەم و چاوی، وەك بەرد، کە ئەگەر سەری ئەم و ئەو نەشکێنێ و خوێنی بێتاوانی خەڵکی بەسەرا نەڕژێ، ئەی بە چی رووی خۆی سوور بکات؟ یان وەکوو دڕکێك کە لە پێ هەڵچەقێ ئەوسا رووی گەش و ئاڵە بەو خوێنەی کە پیا ئەڕژێ.

کەواتە زۆر شتێکی راست و بەجێیە کە «مەحوی» دڵی رەق و بێبەزەیی زۆردار بە بەرد و دڕکی تیژ بداتە قەڵەم و، زۆردار بەپێی سرۆشتی جانەوەرانەی خۆی لە

چەوسانەوە و ئازاردانی هەژار و لێقەوماوان خۆشی و لەززەت ببینێ بۆ ژیانی خۆی و لووتی شانازی و خۆبادان بکاتە ئاسمان و پێی دەستەڵات و گەورەیی ستەمکارانە بنێ بەسەر ئەرزی هەوا و ئارەزووی رەش و تاریکی خۆیا.

یان لە شوێنێکی ترا ئەڵێت:

**رەشێ، بۆ کوشتنی یەك رووڕەشێ، بەدەستەوە بوو**

**بـەدزیەوە وتـی: فـتوا دە، روخسـەتم فـەرموو**

**وتم: کە دەرئەکەوێ زوو، کە ئەم غـەزاکـەرە تـۆی**

**بە دەستی سەوز و سپی بـوونەوەی جـەمال و روو**

واتە: پیاوێکی رەشتاڵە ئەیویست ستەمکارێکی تاوانبار و رووڕەش بکوژێت، هات بۆ لام، بە دزییەوە داوای فتوای لێ کردم کە رێگای بدەم. منیش پێم وت: ئەگەر بیکوژی زوو دەرئەکەوێ کە ئەم غەزایە تۆ کردووتە، بەوەداکە دەست‌بەجێ دەستت سەوز ئەبێ و دەم و چاویشت سپی ئەبێتەوە. واتە: هەرکە ئەو تاوانبارە بکوژێ دەستی سـەوز و رووی سپی ئەبێت. کەواتە بڕۆ بیکوژە.

بەم‌ڕەنگە شاعیر تیری نووك تیژی رق و داخی خەست و خوڵی پەنگ خواردووی دڵی خۆی، لە کەوانی هەڵبەستا، بێ‌پەروایانە ئاراستەی چاوی ستەمکار و خوێن‌ڕێژی تاوانبار ئەکات و پشتی هەژار و کەساس و لێقەوماوان ئەگرێت، کە بەو هەوێنی رق و قینە راست و پیرۆزە گۆش ببن و تـوڵەی جـۆش خـواردووی تـەواوی خـۆیـان لە زۆرداران بسێنن...

لەلایەکی ترەوە شاعیر رووی دەمی ئەکاتە زۆردارێك، لە بەرگی شـێخـێـکـدا و، بەم‌ڕەنگە پەنجەی بۆ رائەکێشێت و ئەڵێت:

**شێخێ هـەمەوەندێکـی دەدا پـەند و نـەسیحەت**

**ئەو قوڕبەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەزیحەت**

**خۆش هاتە جواب و وتی: تۆ حـەقتە، وەلێ مـن**

**قوتتاعی تەریقم، نـەکـوو قـوتتاعی تـەریقەت...**

واتە: شێخێك بەسەر هەمەوەندێکا ئەهات و ئەو قوڕبەسەرەی هێنابووە گیروگاز و حەیابردن. ئەویش بەڕاستی جوان هاتە دەست و وتی: هەرچی ئەڵێی بەجێیە، ئەوەیش بزانە کە من تەنها ڕێگر و جەردەم. بەڵام تۆ ڕێگر و چەتەی ڕێگای تەریقەتی.

ئەم چوارینە هەرچەند وادەرئەکەوێ کە پەیوەندی بەسەر بەشی خوارەوەی نووسینەکەمانەوە هەبێ کە دەربارەی بازرگانانی ئایینە، بەڵام بە رای ئێمە، پەیوەندییەکە تەنها شتێکی سەرزارەکییە. لە راستییا پەیوەندی راستەوخۆی بەسەر ئەم بەشەوەیە، ئەگەرچی وادیارە ئەو زۆرداره لەژێر ناوی ئایینا جووڵاوەتەوە.

لە سەرێکی ترەوە «مەحوی» لەگەڵ زۆرداری پارە پەرستا بەم شێوەیەی لای خوارەوە ئەدوێت:

ئەم پارە پەرستانە لە خۆیان کە دەچن زوو
دەخلی نە پەلی دێوە، نە بای باڵی پەری بوو
عاقڵن و فەقەت فێ لەگەڵی دیتنی پارەن
ماهی نەوی ئەم قەومە هیلالی «قەمەری» بوو

واتە: خوێنمژە پارەپەرستەکان کە خۆیان شێت ئەکەن و کەف ئەچێنن، لەبەر ئەوە نیە کە پەلی دێو یان بای باڵی پەری خۆی لێداون، بەڵکوو ژیرن، بەڵام ئەوەندە پارەپەرستن کە هەر چاویان بە گۆشەی پارە ئەکەوێ دەستبەجێ فێ ئەیانگرێ، چونکە مانگی نوێی ئەم پارە پەرستانە کەناری قەمەرییە -کە جۆرە دراوێك بووە-

بەڵێ پارەپەرستی خوێنمژ، لە خۆشی سەرمایە و رووتاندنەوەی ئەم و ئەو ئاگا و هۆشی لە سەرا نامێنی و ئەگاتە رادەی شێت بوون و فێ لێهاتن، هەزکە چاوی بە گۆشەی مانگی یەکشەوەی جەژنی خۆشبەختی و شادمانی خۆی ئەکەوێ کە ئەویش کەناری قەمەرییە کە ئەڵێی مانگی یەکشەوەی هات و بەختی -بە حیسابی خۆی- تا سەر خواردووی بە باڵا بڕاوی خۆیەتی.

لەلایەکی تریشەوە زۆردار بە فیرعەون ئەداتە قەڵەم و بەم رەنگە ئەینێتەوە بەنیشان:

دەنی تەبعی وەها غاڵب بووە، فیرعەونی ئەم عەسرە
نە وەك مووسا، لەکن جوو پارە بوو ئیمانی پێ دێنێ

واتە: نامەردی و نەفس نزمی وەها پەرەی سەندووە ئەبینی فیرعەونی ئەم چەرخە، نەك هەر بە مووسا، بەڵکوو بە جوولەکەیەکیش ئیمان ئەهێنێ، بە مەرجێك پارەی پێ شلك بەرێت.

ئاشکرایە کە فیرعەون لە زەمانی خۆیا نەك هەر ملی بۆ مووسا کەچ نەکرد، بەڵکوو ئەوەندە لووتبەرز و بایی بوو داوای خوایەتیشی ئەکرد، کەچی فیرعەونی زەمانی «مەحوی» کە زۆردار و خوێنمژێکی بێهاوتا بووە، نەك هەر مل بۆ مووسای پێغەمبەری جوولەکەکان کەچ ئەکات، بەڵکوو جوولەکەیەکی پارەداریشی دەست بکەوتایە، بە دڵ ئیمانی پێئەهێنا و بە کردەوەش دوای ئەکەوت.

***

**سێیەم ـ بەگژاچوونی زاهید و واعیز و وشکە سۆفی کە بازرگانی بەسەر ئایینەوە ئەکەن:**

شاعیر لە زۆر گۆشە و قوژبنی دیوانەکەیەوە هێرشی رەوای بردووەتە سەر ئەو کەسانەی کە لەژێر پەردەی خواپەرستی و ئایینداهەزاران ئاین و ئۆینیان لەژێر سەردایە، بێبەزەیییانە پەنجەی تیژی سەرزەنشت و توانج ئەکا بە چاویانا و ئەیانخاتە روو.

بە وێنە:

لەڕم دی زاهید ئەم زستانە، زانیم کلك نادا بە زڕپونگی بەهارا

واتە: ئەم زستانە زاهیدم لەڕ و لاواز هاتە بەرچاو، بەوەدا زانیم کە ناگاتە بەهار و کلك ناکێشێ بە زڕپونگی بەهارا و کورد وتەنی: بە گیای بەهارا ناتووڕێنێ.

ئەم جۆرە سەرزەنشت و تەوس و پلار تێگرتن و بە سووك روانینەی شاعیر بەرامبەر زاهید لەو بڕوایەوە هەڵقوڵاوە کە زۆر بێگومان بووە لەوەی کە ئەو جۆرە کەسانە تا چ رادەیەك درۆزن و رواڵەتباز و چاوبرسی و بە ئۆین بوون، بۆیە «مەحوی»، بە کوڵ و دڵ، ئەیانزڕێنێ و ئاوات بە مردنیان ئەخوازێ بۆئەوەی کۆمەڵ لە ژەهری دەم و ئازاری دەستیان رزگار بێت.

لە غەزەلێکی ترا:

**واعـــیزم پــرسی، یــەكـێ شـۆخـانە جـوابـی دامـەوە**

**وەعزی چی؟! سەر لنگە دەستاڕێ كرەی دەستاڕی هات**

**شێخ و توڕڕەی مێزەر و نەقل و نوقوولی هـیچ و پـووچ**

**من بە توڕڕەی یار ئەسیرم، ئـەو بـە كـۆڵێ تـوڕڕەهـات**

واتە: هەواڵی واعیزم لە یەكێك پرسی كە لە چییایە؟ ئـەویش زۆر جـوانـی وەڵام دامەوە: بێ‌قەزا بی واعیزی چی؟! سەر لنگە دەستاڕێكم دی كە هەر كرەی دەستاڕی ئەهات، بەو قسانەی كە مایەی سەریەشان و ناڕەحەتی خەڵكی بوو. شێخیش، بێ‌بەڵا بێ، بە پێچی مێزەر و قسە و باسی هیچ و پووچەوە، من بە پێچ و لوولی توڕڕەی یار دیلم، ئەویش بە كۆڵێ شتی توڕڕەهات و بێ‌ماناوە.

ئەم شەپۆلی هێرش و لافاوی پەلاماردانە، جگە لەوەی كە نیشانەی بڕوایەكی قایم و دڵێكی پتەو و دەروونێكی دامەزراوە، ئەوەش ئەگەیەنێ كە شاعیر وەك پیاوێكی ئایینی راستەقینە، ئازا و بەجەرگ و چاونەترس بووە، كە توانیویەتی لەو سەردەمەدا، ئاوزەنگی تەقێن، هەڵكوتێتە سەر تەخت و بەختی ئەو جۆرە بازرگانە ریاكار و رواڵەت بازانە.

لە شوێنێكی ترا ئەڵێت:

**لالغاوەی واعیز ئەمڕۆ مـەوج ئەدا دەم پـڕ لە كـەف**

**ریشی قیروسیا، كتێبی وەعزەكەی بوو بـەرتەرەف**

**زاهید و سۆفی بە شەڕ هاتن لەسەر تەزویر و شەید**

**خێری رەندانە، خوا كا بەرتەرەف بێ هەر تـەرەف**

واتە: لالغاوەی واعیز شەپۆل ئەدا لە كەفی پڕ لە دەمی. ریشی قیروسیا كە بە جارێ خووسایەوە. بەڵام داخی گرانم بۆ كتێبەكەیەتی كە تەواو فەوتاو لە كیس چوو. زاهید و سۆفی بەشەڕهاتن لەسەر فێڵ و ریا و تەڵەكەبازی، هەرلایەكیان لەناو بـچن خـێر و قازانجی مەردانی خوایە.

وێنەگرتنی دیمەنی لالغاوەی واعـیز و شـەپۆلی كـەف و خـووسانەوەی ریش و خەفەت‌خواردنی شاعیر بۆ لە كیس‌چوونی كتێبەكەی و بەشەڕهاتنی زاهید و سۆفی

لەسەر فێڵ و حیلە و حەواڵە و رواڵەت پەرستی و لەناوچوونی هەرلایەکیان کە مایەی خێر و خۆشی پیاوچاکانە. بەڕاستی رق و قینێکی خەست و خۆڵ و پیرۆز دەرئەخات کە لە کوورەی دەروونی شاعیرا بەم چەشنە جۆشی خواردبێ بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە.
یان:

ریشێکی پان و تووکی بناگـوێ درێژ و لوول
سۆفی لە دینی لادە بە دیـمەن لە جـوو دەکـا
ئەشکەوتی بایەکە دەمی واعیز کە دێتە وەعـز
وەختی سکووتی، نەقشی سمێڵی لە قوو دەکا

بەم شێوەیە شاعیر بۆمان دەرئەخات کە راستی و ئـایین‌پەروەری بـێ‌ڕواڵەت بـە دیمەنی ریش و پرچی درێژ و لوول و ئاڵۆز نابێ و دەمی واعیزیش وەك ئەشکەوتی بایەك وایە، ئەو قسانەی کە لە دەمی دێنە دەرەوە هەموویان وەك «با» وان. خۆ ئەگەر دەمی ئەو ئەشکەوتەش بێتەوە یەك و تاوێك بێدەنگ بێ، ئەوا نەقش و نیگاری سمێڵی هەر لە پەڕی قوو ئەکات.

***

**چوارەم ـ لە رووی فەلسەفە و راستی پەرستییەوە:**

شاعیر، وەکوو لە ئاوێنەی دیوانەکەیا دەرئەکەوێ، زۆر مەراقی وردەکاری فەلسەفە و راستی پەرستی و یەكڕەنگی بووە و زۆر خۆی بەم بابەتە رەنگینەوە خەریك کردووە. گەوهەر و مرواری نایاب نایابی کردووەتە گەردنی دیوانەکەی و ئەڵێت:

لە کێ پرسم: دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت
عەزاپۆشی چیە و کـێیـە، جـلی پـیرۆزە بـۆ شـینە؟!

واتە: پرسیار لە کێ بکەم کە بۆچی یاقووت دڵی پڕە لە خوێنی حەسرەت و ئاخ و داخ و پیرۆزەش پرسەی بۆ کێ گرتووە و شین‌پۆشی چیە؟ یاقووت و پیرۆزە کە دوو گەوهەری جوان و نایابن، ئەویان ئاڵ و ئەمیان شینە و شاعیرانی تر بۆ بابەتی جوانی و شۆخ و شەنگی بەکاریان هێناوە، یاقووت نەبێ جاروبار بە فرمێسکی خوێنین ناویان

بردووه. بەڵام «مەحوی»، بەپێچەوانەی ئەوانەوە، رووی دەمی پرسیار ئەکاتەوه و سەری لەوه سورِ ماوه کە بۆچی دڵ و ناو جەرگی یاقووت شەپۆل ئەدا لە خوێنی حەسرەت و نائومێدییا و پیرۆزەش سەرتاپای بەرگی خۆی شین کردووه، ئاخۆ ئەم پرسەی هەتا هەتایەی بۆ کێ و لەبەرچی گرتووه؟ بەڵام وەڵامی راستەقینەی ئەم پرسیارەی وادیاره هەرگیز دەست ناکەوێ تا ئەم دوو گەوهەره پیرۆزه ناویان لە فەرهەنگی ژیانا بمێنێ. وابزانم جێی خۆیەتی کە بڵێم لە مامۆستا «گۆران»ی شاعیری بلیمەت و هەڵکەوتووی کوردم بیستووه کە ئەم بەیتی لای سەرەوه شابەیتی «دیوانی مەحوی»یە، بەلای ئەوەوه.

یان کەمێك لەم فەلسەفەیە ورد بنەوه کە لە دوو توێی ئەم بەیتەدا ئەدرەوشێتەوه:

گەر ئیشی رۆحتە کە نەبوو «کەس» بە دەستەوه

دەست هەڵگره لە رۆح و مەبە ئیلتیجا بە «کەس»

واتە: با ژیانیشت لەسەر پێویستییەك وەستابێ، ئەگەر خۆ کەسێکی دڵسۆزت دەست نەکەوت بۆت جێبەجێ بکا، راستتر ئەوەیە دەست بەرداری ژیان ببی و پەنا بۆ هەموو کەسێك نەبەی.

ئەم فەلسەفەیە ئەوەمان تێ ئەگەیەنێ کە تەنها ئیش و کاری پیویستی ژیانی خۆمان بە کەسانی دڵسۆز و راست و دۆستی بێهاوتای راستەقینەی خۆمان بسپێرین و پشت بەوانە ببەستین کە دۆستی تەنگانەن، نەك ئاشنا و رۆشنای پار و گلێنی سەر سفره و خوانی ناز و نیعمەتی رواڵەت.

لە شوێنێکی ترا ئەڵێت:

بە ئاوی تێگەیشتین ئێمە دنیا، هەر سەرابێ بوو

هەموو ئەشچن بە خنکان و لە وشکیشە مەلەی مەخلووق

واتە: ئێمەی کاروانی تینوو و ماندوو وا تێگەیشتین کە دنیا ئاوێکە و تینوێتیمان لێی ئەشکێ، کەچی بەپێچەوانەی نیازی ئێمەوه، تەنها تەم و مژێکی ئەوتۆ بوو کە لە دوورەوه هەر بە رەنگ لە ئاو ئەچوو، جا لەبەر ئەوەی کە دنیا ئاو نەبوو و هەموو

گیانلەبەران لە تینوانا ئەخنکێن و ئەڕۆن، هەرچی هەڵپە هەڵپ و چەپ و گوپێکیشیان هەیە وەك وشکە مەلە وایە و لە هەوادا پەل ئەکوتن تا بە تەواوی پرزەی خۆیان ئەبڕن.

ئەم بیرە، ئەگەر لە رووی فەلسەفەوە سەرنجی بدرێتێ، ئەبینین هەموو کەسێك چۆن، چاو برسیانە، باوەشی کردووە بە دنیادا و ئەو تەماعە شیرینەی کە لە ژیانا هەیە بە وێنەی ئاوێك هەموو یەکێکی تینووی هەناو سووتاو چۆن بە پەرۆشەوە خۆی بۆ ئەکوتێت، کەچی ئەو تەماع و نیازە تا دێ زیاتر دوور ئەکەوێتەوە وەك تەمومژێکی رەنگ شینی ئاوی کە هەرگیز نایگاتێ، تا ئەو رۆژەی بە کزی و نائومێدییەوە سەر ئەنێتەوە بە هەزاران خولیا و ئاواتی جوانەمەرگەوە. ئەم شەڕ و شۆڕ و بەگژاچوون و هەڵپە و فڕکان فڕکانەش لەنێوان خەڵکییا وەك وشکە مەلەیەك وایە کە ئەنجامی خنکان و رۆیشتنە.

لە کونجێکیکەی دیوانەکەیەوە شاعیر ئەڵێت:

هەر گفتوگۆمە، کەچی هەر ئەڵێم و تێ ناگەم

هەر جوستوجۆمە، کەچی هەر ئەڕۆم و پێ ناگەم

چاوم روا و گۆشەی ئەو ئەبرووەم نەدی

دڵ بوو بە بەحری عولووم و لە ئەلف و بێ ناگەم

واتە: شەو و رۆژ هەر گفتوگۆمە کەچی ناگەمە مەبەستی خۆم، هەمیشە بەڕێوەم کەچی هەر ناگەمە قۆناغی نیازم. چاوم وەکوو نەمام روا لە تەماشاکردن و سەرنجی چاوەڕوانییا کەچی گۆشەیەکی ئەبرۆی ئاواتم نەدی. دڵ بوو بە دەریای هەموو جۆرە زانیارییەك کەچی لە ئەلف و بێ ناگەم.

ئەم جۆرە بیرکردنەوە و قووڵ تەماشاکردنە ئەوە ئەگەیەنێ کە «مەحوی» لەبەر ئەوەی زۆر شتی زانیوە، بەهۆی ئەوەوە هەستی زیاتر بە ناتەواوی خۆی کردووە. پەنجە بۆ ئەوە رائەکێشێت کە نهێنییەکانی دەریای بوون و نەبوون و لەنگەری کەون و کائینات و کردگار و زۆر شتی ناو ئەم جیهانە گەورە و فراوان و سەرسووڕهێنەرە بە چۆرە زانینێکی ئەو ساغ نابێتەوە و ناگاتە سەر بناوانی راستی و پتەوی، چونکە ئەو زانینەی

ئەو وەك ئەڵێن قەترە بە دەریاش نیە. بۆیە ناچار هـاواری لێ هـەڵئـەستێ و دەسـتی بێدەستەڵاتی و تەسلیمبوون بەرز ئەکاتەوە و ئەڵێت: «دڵ بوو بەحری عـولووم و لە ئەلف و بێ ناگەم» ئەم بیرە فەلسەفییە رامان ئەکێشێ بۆ ئەو راستییەی کە ئەڵێ تا زیاتر شت بزانی، زیاتر هەست بە نەزانینی خۆت ئەکەی، نەك بەنیسبەت ئـەم و ئـەوەوە، بەڵکوو بەنیسبەت ئەو هەموو شتە زۆر و قووڵ و پڕ لە نهێنییانەوە کە ئەتەوێ بیانزانی و ناتوانی. بەپێچەوانەی ئەو خۆ هەڵکێش و بایی بوانەوە کە ئەگەر ئـەلف و بـێیـەکـی عادەتییان ناسی وائەزانن تاکە مەلەوانی بێهاوتای ناو دەریای بێپایان و بێسنووری هەموو جۆرە زانیارییەکن.

یان لە لایەکی ترەوە ئەڵێت:

بۆ پارە حەیفە خۆ ئەکـەیە پـوولی نـارەواج

بۆ پاروێکی نان ئەسەفە روو ئەکەی بە ساج

واتە: حەیفە بە ئیشێکی ناڕەوای ئەوتۆ هەڵسیت لەپێناوی پارەدا کە خۆت بێنرخ بکەی. رەوا نیە لە رێگای پاروە نانێکدا رووی خۆت بکەی بە ساجی رەش.

«مەحوی» وەك شاعیرێکی نەفس بەرز و زانایەکی هیممەت بڵند ئەوە دەرئەخاکە ژیان تەنها بریتی نیە لە پارە و پاروە نانێك، بەڵکوو لەوانە گرنگتر دەروونی خاوێن و هەستی بەرز و ناسك و کەرامەتی پیرۆزی مرۆڤە کە هەرگیز نابێ لەپێناوی پارە و پاروە نانا سووك و بێنرخ بکرێن.

لەبارەی راستی پەرستی و یەك رەنگیشەوە «مەحوی» زۆرجار هەست و نـەستی بێگەردی خۆی بە هەڵبەستی بەسۆز دەربڕیوە کە لە زۆر لاوە ئەم بابەتەی تێهەڵکێشی شیعرەکانی کردووە و ئەڵێت:

لە حەق بێژی بووە بەحری «انا الحق» هەر قەسیدێکم

لەبـاتی جـائیزە واجب گـەڕا قـەتڵم بکـەن واجب

واتە: هەر قەسیدەیەکم لە راست بێژیا بۆتە دەریایەکی «من حەقم». جـا لەبـاتی ئەوەی خەڵاتم بکەن پێویستە بکوژرێم.

بەم شیعرە «مەحوی» بەسەرهاتەکەی مەنسوور دێنێتەوە یاد کە لە ڕێگای بیروباوەڕی تەسەووف و خواپەرستیدا گەیشتە پلەیەك کە یەك پارچە وابزانێ لە زاتی خوادا تواوەتەوە و بەشێك بێ لەو. بۆیە هاوار ئەکا: من حەقم، واتە من خوام. لەسەر ئەوە فتوای کوشتنی درا لەلایەن پیاوانی سەردەمی ئایینەوە. بەم‌پێیە «مەحوی»یش ئەڵێ ئەوەندە بازاڕی پیاوی چەوت و دەردی ناڕاستی لەبرەودایە ئەبینن «هەر قەسیدەیەکم لە ڕاست بێژییا مەنسوورێکە بۆ خۆی» بەبێ ئەوەی دەربەستی ئەوەش بێ کە لە پێناوی ڕاستی و دروستییا سەری خۆی دابنێت.

بۆیە ئەڵێت:

هەتا حەق ناسرە، هەر حەقمە مەنزوور   وەکوو مەنسوور ئەگەر بمکەن بە دارا

واتە: هەتا خوا پشتیوان بێ هەر ڕاستیم مەبەستە، ئەگەر وەکوو مەنسووریش هەڵمواسن بە سێدارەدا هیچ باکم نیە.

***

پێنجەم ـ لە ڕووی عەشق و خۆشەویستی و جوانییەوە:

ئەتوانم بڵێم بەشی زۆری دیوانەکەی «مەحوی» بۆ ئەم بابەتە تەرخان کراوە و شیعری گەرم‌وگوڕی بەسۆزی لەم‌بارەیەوە داناوە.

تەماشا ئەم جۆش و خرۆش و خوشەویستی و جوانییەی کە لە گیانی ئەم شیعرەدا خۆی ئەنوێنێ.

لە کن پشکووتنی خونچەی دەمی، وەك گوڵ سەراسەر گوێم

گوڵی ڕوخساری دەرخا، نێرگس ئاسا سەربەسەر چاوم

واتە: لەو شوێنەی کە خونچەی تەڕ و ناسك و سووری دەم و لێوی خۆشەویستەکەم ئەپشکوێت و ئەکرێتەوە، من سەرانسەری گیانم وەك گوڵەباخ ئەبێ بە گوێ تا بزانم ئەڵێ چی؟ خۆ ئەگەر بێت و گوڵی ڕوخساری بەتەواوی دەرکەوێت، من بەجارێ سەرتاپای گیانم، وەك نێرگسەجاڕ ئەبێ بە چاو بۆ تەماشاکردنی.

ئەم بەیتە، بێجگە لە هونەری وردەکاری و جۆش‌دانی ئەو هەموو پەیوەندییانەی هەن لەنێوان خونچە و پشکووتن و دەم و گوڵ و گوێ و ڕوخسار و نێرگس و چاوا، لە

رووی مەعنا و ناوەڕۆکیشەوە عەجەب وێنەیەکی جوانی و تەلیسمێکی خۆشەویستی و گیانێکی هەرگیز نەمردووی سەیری کردووە بەبەر ئەم هەڵوێستەیا.

ئەمە لەنزیك خۆشەویستەکەیەوە. بەڵام کە دوور ئەکەوێتەوە ئەڵێت:

بەبێ بەزمی حوزووری تۆ حەرامم کردووە بادە

نەوەك بشکێ بە نەشئەی مەی خوماری دەردی بێ تۆیی

واتە: لەبەر ئەوەی لە بەزمی نزیکی تۆ بێبەش و دوورم، بادەم لە خۆم حەرام کردووە تا بە نەشئەی مەی خوماری دەردی بێتۆیی لەسەری منا نەشکێ.

ئەم جۆرە هەست و بیرکردنەوەیە ئەوپەڕی خۆشەویستی ئەگەیەنێ، چونکە «مەحوی» ئەوەندە پەرێشان و سووتاوی دوورکەوتنەوەی خۆشەویستەکەیەتی و شەو و ڕۆژ هەر بیری لێ ئەکاتەوە، گەیشتووەتە ئەو پلەیەی کە لەزەت لە دووری یار ببینێ. جا بۆ ئەوەی ئەو نەشئەی خەیاڵ و لەززەتی بیرکردنەوەیەی لە دوور کەوتنەوەی خۆشەویستەکەیا کە مەستی کردووە و پێوەی خوماری بووە، نەشکێ و دڵ و دەروونی بە هیچ شتێکی ترەوە خەریك نەبێ، لە خوشەویستەکەی بەولاوە، ئەوا نایەوێ بادە بخواتەوە نەك بەو خواردنەوەیە ئەو نەشئە و خومارەی لە کەللەدا بشکێت.

هەر لەژێر زەبر و زەنگی ئەم جۆرە بیر و باوەڕە گەرمەدا، بەم شێوەیەی لای خوارەوە بە قەد و باڵای خۆشەویستیدا هەڵئەدات و ئەڵێت:

ئەی مەحەببەت ئاگرێکی هێندە خۆش و دڵنشین

ئەوکەسەی سووتووتە هەر ئەو هەوڵئەدا بۆ سووبەسووت

واتە: ئەی خۆشەویستی! تۆ ئەوەندە ئاگرێکی خۆش و دڵگیری، ئەوکەسەی سووتووی تۆیە ڕووبەڕووی تۆ دێتەوە بۆ سووتانی تر. لێرەدا مەحوی دەرسی خۆشەویستی ڕاستی دائەدا، کە لە پێناویا ئەبێ قوربانی بەسەر بدرێ و لە شیعرەکەیا پەنجەی نەهێنی بۆ بەسەرهاتی عیشق و خۆشەویستی پەروانە و چرا ڕائەکێشێ کە لەپێناوی ڕووناکییا پەروانە خۆی بەخت ئەکات.

لە شیعرێکی ترا ئەڵێت:

دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ

وەگەرنا غەم نیە بمرم لە حەسرەت لێوی مـەیگوونت

واتە: ئەگەر بمرم لە حەسرەت لێوی ئاڵی مەیڕەنگی تۆ هیچ باکم نیە، بەڵام بۆیە نامەوێ بمرم، نەوەك گەردی خوێنی من لە شووشەی گەردنی تۆ بنیشێ.

خەمخۆری و بەهانە دۆزینەوە بۆ خۆشەویست هەروا ئەبێ، کە «مەحوی» لە ترسی ئەوەی نەوەك گەردی خوێنی لە شووشەی گەردنی یار بنیشێ و راستی ئەوە بڵێن کە «مەحوی» کوژراوی لێوی ئاڵی ئەم خۆشەویستەیە و بە بکوژی شاعیر نەدرێتە قەڵەم و سزا نەدرێ لەسەر ئەو، بۆیە نایەوێ بمرێ، ئەگینا زۆر شادمانە و ئاواتەخوازی ئەوەیە کە کوژراوی لێوی ئاڵی خۆشەویستەکەی بێت.

جا هەر بۆئەوەی کە راستی و وەفا و گیانی خـۆبـەختکردنی خـۆی لەپـێنـاوی خۆشەویستا بەرێتە سەر، بە کوڵ و دڵ ئەڵێت:

مردنێکی لەبـەر ئـەو قـاپییەدا مـەردانـە     بە خودا چاترە لای من لە گلاراوی حەیات

ئەی ئەم خەیاڵە وردەی کە لەم شیعرەدا سەرنج رائەکێشێ و ئەڵێت:

کــەی بـە لەعـل و گـەوهەر ئـەو لێو و ددانـی دا نـیشان

ئەو رەهەندەی شاخە، ئەم خۆشارەوەی ژووری سەدەف

واتە: کەی خۆشەویستەکەم لێو و دانی خۆی نیشان داوە بە لەعل و گەوهەر، وا لەعل ئاوارەی شاخەکانە و گەوهەریش خۆی لە توێکڵی سەدەفا لە دەریاکانا شاردووەتەوە.

ئەم مەعنا و خەیاڵە ئەگەر وردتر بکرێتەوە ئەوە ئەگەیەنێ کە لەو رۆژەوە لەعل چاوی بە لێوی ئاڵی خۆشەویست کەوتووە، لەتاو جوانی ئەو شێت و سەرگەردان بووە و شاخ و کێوەکانی گرتووەتەبەر، گەوهەری هاودەردیش لەو سایەوە دانی خۆشەویستەکەی دیوە لە شەرم و شوورەیی‌یا خۆی لە جەرگی دەریاکانا شاردووەتەوە، هەرچەند ئەکا رووی نایە سەر هەڵداتەوە و بێتە ناو ناوان.

یان کە لە باخا «مەحوی» گوڵی سەوسەن و نێرگس و سونبول ئەبینێ، تـاسێکـی سەرسامی ئەیباتەوە و ئەڵێت:

**زوبـــانی لاڵە، بـــۆ حـــەیرانـــە، حـــاڵی بـــۆ پـــەرێشـانە؟!**

**لە سەوسەن دەفکرم «مەحوی» لە وەزعی نێرگس و سونبول**

واتە: کە تەماشای سەوسەن و نێرگس و سونبول ئەکەم، نازانم بۆ زمانی سەوسەن لاڵە؟ نێرگس بۆچی سەرسامە؟ سونبول بۆ پەرێشانە؟ بەم شێوەیە ئەگەر بێتو قووڵتر بکرێتەوە ئەوا رامانئەکێشێ بۆ دەریایەکی بێ‌سـنوور و بـێ‌پـایانی نـەهێنـییەکـانی سروشت کە هەریەکەیان کەم تا زۆر، چەند پرسیارێکی بێ‌وەڵامیان لەسەر نووسراوە.

لە هەڵوێستێکی ترا کە شاعیر ئەیەوێ باسی جوانـی پـڕ بـە پـێسـتی روخسـار و چەناکەی خۆشەویست بکا، ئەپرسێ:

**لە باخی سێو و بەیدا باسی روخسار و چەنەی کـێ بـوو**

**خەجڵ ما سێو و، بەی ترسا، کەوا ئەو سوورە، ئەم زەردە؟**

واتە: ئاخۆ لە باخی سێو و بەهێدا باسی جوانی روخسار و چەناکەی کێ کراوە وا سێو لە شەرمەزارییا سوور هەڵگەڕاوە و بەهێیش لەترسانا رەنگی زەرد بووە؟

خەیاڵی ورد و کار تێ‌کردنی جوانی گەیشتووەتە پلەیەك لە شاعیرا کـە تـەنها بـە ناوهێنانی جوانی روخسار و چەناکەی خۆشەویستەکەی سـێو لە شـەرمانا سـوور هەڵگەڕێ و بەهێیش لە ترسی شکانی بازاڕی جوانی خۆی زەرد داگەڕێ، ئـەگـینا، بەلای شاعیرەوە، پێش ئەو ناوهێنـانە، سـێو و بـەهێ هـەریەکـەیان رەنگـێکـی‌تری تایبەتییان بووە، نەك ئەم رەنگەی ئێستایان.

پاش ئەم گەشت و گەڕان و نەخشەکێشانی دیمەن و وێنەی جوانـی و نـازداری خۆشەویست و سروشتە لەلایەن شاعیرەوە، ئەکەوێتە بەراوردکردن و سـەرنجدانـی ژیانی خۆی و بەدەم هەناسەیەکی قووڵی ئاگرینەوە ئەڵێت:

**بەهارێ بوو جوانی، بوو بە سوخرەی پاییزی پیری**

**بەسەرچوو باخ و باقی ماوەوەی مشتێ چڵ و چێوە**

واتە: تەمەنی جوانی و لاوی بەهارێك بوو کەوتە بەر پلاری گەمە و گاڵتەی پاییزی پیری، باخ بەسەرچوو. ئەوەی کە ماوە مشتێ چڵ و چێوە.

بەڕاستی سەرنجێکی بەجێ و بیرکردنەوەیەکی قووڵە. ژیان ژیانی مرۆڤ کە بەشێکە لە سروشت و ژیانی سروشتیش بەتێکڕایی لەژێر زەبر و فەرمانی یەك یاسا و بەرنامەی نەگۆڕاوایە کە ئەویش یاسا و بەرنامەی هاتن و ڕۆینە. تەمەنی جوانی و لاوێتی مرۆڤیش، وەك سروشت، بەهارێکی تەڕ و پاراو و یەکجار دڵگیر و خۆشە کە بە هەزاران گوڵی ئاوات و هیوای ڕەنگین ڕازاوەتەوە. تەمەنی پیریش پاییزێکی پەست و خەفەتاوی ئەوتۆیە کە یەكبەیەك پەڕەی گوڵ و گەڵای سەوز و سووری درەختی ئەو باخی جوانییە زەرد ئەکات و ئەوەرێنێ و بەتەنها چەن چڵ و چێوێکی رووت و قووت ئەمێنێتەوە کە ئەویش چەن رەگ و دەمار و ئێسقانێکە.

***

**شەشەم ـ تەسەووف لە شیعری «مەحوی»دا:**

وەك لە سەرەتای باسەکەوە وتمان، شاعیر زانایەکی موتەسەوویف بووە. تەسەووف کە لە بناغەدا بیروباوەڕێکی ئایینیە و ئامانجی شکاندن و کوشتنی نەفس و ئارەزووی مرۆڤ و پاك کردنەوەی گیانی ئادەمیزادە لە چڵك و پەڵەی دنیاپەرستی و پوولەکێتی و بەو چاوە سەیری ژیان و سروشت ئەکات کە «یەکێتی بوون» هەموولایەکی گرتووەتەوە و جیهانێکی پڕ لە خۆشەویستی ڕاستەقینە و ڕێبازێکی گیانی بە گیانی دوور لە ماددەپەرستی بە دەوری خۆیا دروست کردووە کە پڕ بێ لە کەڵکەڵە و خەیاڵی ناسك و هەستی پیرۆز کە دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و جگەرسۆزی لێ هەڵقوڵێت.

بەم پێیە، شاعیر لە زۆر لای دیوانەکەیەوە ئەم بیروباوەڕی تەسەووفەی دەربڕیوە و بێبایەخی دنیای خستووەتە بەرچاو و خۆشەویستییەکی بێهاوتای پەروەردە کردووە لە دڵ و دەروونی خۆیا و هەمیشە لە نەفسی خۆی داوە. بە وێنە:

حەققی ئیخلاسە بەجێهێنانی ئادابی خولووس

پێ بزانێ، یا نەزانێ، من بە دڵ یادێ دەکەم

ئاوی تێغی وەقفی هەر توشنە لەبێکە، من نەبم

کاریگەر بێ، یا نەبێ، لەم مەزڵەمە دادێ دەکەم

واتە: پێویستی سەرشانی دڵسۆزییە کە رەوشت و ئادابی تەواو بەجێ‌بێنم. ئیتر خۆشەویستەکەم پێ بزانێ یا نەزانێ من دەربەست نیم، چونکە من بۆئەوەی ناکەم کەوا ئەو پێ بزانێ، بەڵکوو تەنها ئەمەوێ بە دڵ یادێکی بکەم. ئاوی تێغەکەی تەرخانە بۆ هەموو لێو وشك و تینوویەك، بەتەنها من لێی بێ‌بەشم. لەبەر ئەوە لەم جەور و سزای بێ‌بەش کردنەم هاوار و داد ئەکەم.

ئەم جۆرە هەست و نەستە تەنها لە دنیای گیان و تەسەووفدا ئەم پلەی بەرزی خۆشەویستی و بێ‌باکییە ئەگرێت کە شاعیر دڵسۆزی خۆی بەو شێوەیە دەرئەبڕێت بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشی پێ‌زانینی خۆشەویستەکەی بکات. لەمەش زیاتر پێ دائەگرێت و هاوار و سکاڵای گەرمی لە دەست ئەوەیە کە خۆشەویستەکەی لە سەری هەزاران عاشقی داوە. کەچی ئەم لە شەرەفی ئەو کوشتنە بێ‌بەش و رەنجەڕۆ ئەکات.

یان لە شوێنێکی ترا:

لە ئاوی تێغی هەر زامێ بوو ئاوا　　　برینی من نەبێ هەر وایە وێران

واتە: بە ئاوی تێغی دولبەر هەموو برینێك ئاوەدان بووەوە، تەنها برینی من نەبێ کە لەبەر ئەوەی ئەو ئاوەی بەر نەکەوتووە هەروا بە وێرانی ماوەتەوە.

شاعیر لێرەدا ئاوات بۆئەوە ئەخوازێ کە برینی وێرانی دڵی بە ئاوی تێغی خۆشەویستەکەی ئاوەدان بکاتەوە و لە رێگەی ئەو خۆشەویستییەدا سەری خۆی دابنێت و شەهید بکرێت. وێرانی برین لەلای شاعیر ئەوەیە کە ئەوەندە کاریگەر نیە بیکوژێت. ئاوەدان کردنەوەی برینیش یەعنی کولاندنەوە و دووبارە کردنەوەی، کە ئەبێتە هۆی بەختکردنی ژیانی شاعیر لەو رێیەدا.

یان:

کە رۆحم تێگەیی تۆ حەز لە دەرچوونی دەکەی، دەرچوو

دەبێ عاشق کە دی بێزارە یاری، بێ بڕۆ بڕوا

واتە: گیانم کە بۆی دەرکەوت تۆ حەز بە دەرچوونی ئەکەی دەرچوو، چونکە عاشق کە زانی یار لێی بێزار و پەستە ئەبێ بێ‌ئەوەی پێی بڵێن بڕۆ، خۆی لەخۆیەوە بڕوات.

لە رووی بێنرخی دنیا و کوشتنی گیانی تەماع و چاوچنووکی مرۆڤەوە ئەڵێت:

تا سەر نەبۆتە گۆ، دە لە دنیا دە تۆ شەقێ    هەر ئەو شەقە بەکارەکەوا هەڵدرێ لە هیچ

واتە: تا نەمردوویت و سەرت نەبووەتە تۆپی پێ بۆ شەقشەقێنی زەمانە، تۆ دنیا بکە بە تۆپ و تێی هەڵدە، چونکە هەر ئەو شەقەی تۆ جێ ئەگرێ کە هەڵدرێ لە دنیا کە هیچە. ئەم جۆرە تێبینی و فەلسەفەیە، هەرچەندە بە گیانێکی تاریکبینی «تشـاءوم» ئاودراوە و دنیا لە بەرچاوی مرۆڤ ئەخات و بە شتێکی زۆر هیچ و پووچی ناو ئەبات، بەڵام بەپێی بیروباوەڕی تەسەووفی ئایینی شاعیر جۆرە یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەیەکە کە بەرهەڵستی نەفس و ئارەزووی چاوبرسییانەی مرۆڤ ئەکـات. هـەروەها جـۆرە بێزاری و هاوارێکی گەرمە بەرامبەر بەو دەستەڵاتدارە دنیا پەرستانەی کە لەپێنـاوی مەبەست و ئارەزووی چاوچنۆکی خۆیان پف لە دۆ ناکەن و بە هەموو دنیا داناکەون.

بۆیە لە لایەکیترەوە ئەم ژیان و دنیایە بەمشێوەیەی لای خوارەوە ئەداتە قەڵەم و ئەلێت:

لە مانمدا نەدیوە حاسڵێ، غەیری تەوەححوش من

خودا پێداو ئەوانەن لەم وحووشستانە زوو ڕۆیـین

واتە: بەروبووی مانەوەم تەنها غەریبی و وەحشەتە. خوا پێداویش ئەوانەن کە لەم وحووشستانە دەرچوون و مردن.

لێرەدا تۆ بڵێی شاعیر ئەوەندە خۆی بەدەم هـێزی تـاریك بـینییەوە شـل کـردبێ بەجارێك ژیان و دنیای لە بەرچاو کەوتبێ و پڕ بە دڵ ئارەزووی مردن بکات؟ نـەء، بـەڵکـوو تـەنها ویسـتوویەتی لە رێی ئـەم جـۆرە دەربـڕیـنی بـێزاری و پـەستییەوە نارەزاییەکی بەکوڵ دەربیڕێت بەرامبەر بەو دەستەڵاتدارانەی کە لە بەرچاوی شاعیر بە جانەوەر خۆیان پێشان داوە، ئەگینا هەر «مەحوی»یە کە ئەڵێت:

پیری نەمامی باغی جوانیمی کردە پووش    تازەم دەرەختی تووڵی ئەمەل دەردەکا چرۆ

واتە: هەرچەندە پاییزی پیری باخی جوانیمی زەردکرد وەکوو پووش، کەچی تازە دەرەختی ئاوات و هیوای دوور و درێژم چرۆ دەرئەکات.

ئەم فەلسەفەیە جوانترین و راسترین شێوەی دەربڕینی مەبەست و ئارەزووی غەریزەی مرۆڤە لە ژیانا، کە هەرچەندە بەرەو پیری و مردن بڕوات پتر پاشماوەی دواچۆڕی ژیانی لەلا شیرین‌تر و خۆشەویست‌تر ئەبێت، وە لە تافی لاوییا ئەوەندە بەتەنگ ژیانی خۆیەوە نیە و ئەو چاوچنۆکی و ژیان پەرستییەی کە لە دواساڵەکانی تەمەن و ژیانا هەیەتی لە گەنجییا زۆر کەمترە، وەك پارەدارێکی نابووت رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر بەتەنگ ئەو قەرز و قۆڵە و پارە کەمەوەیە کە ماویەتی، کەچی لە لووتکەی بوون و دەوڵەمەندییا دەربەستی زۆر شت نەبووە.

هەر لەژێر تەم و مژی ئەو نارەحەتی و بێزارییەی کە شاعیری تیا ژیاوە و لەبەر دووکەڵی ئەو ناتەواوی و ئەشکەنجە و سزایانەی کە دیویەتی لەدەست دنیاپەرستانی زەمانە و لەژێر زەبری هەست ناسکی و باوەڕی نەفس کوشتنا، پەنای بردووەتە بەر پیش خواردنەوە و خەفەتێکی خەست و خۆڵ و ئەڵێت:

بێ‌منەت رزقێکە غەم، بمرم لەبرسا ئەو دەخۆم

تەفرە ناخۆم و تەڵەب ناکەم لە دنیا قووتی رۆح

واتە: خەم و خەفەت زەخیرەی بێ‌منەتی خۆمە. ئەگەر لەبرسانا خەریك بوو بمرم وا خەم ئەخۆم. هەرگیز تەفرە ناخۆم و دەستی داوا بۆ خۆراکی گیان لەم دنیایە پان ناکەمەوە.

ئەم هەڵوێستەی شاعیر ئەوە ئەگەیەنێ کە ژیان ئەوە ناهێنێ لەسەر رێگای «بۆ ئامانج هەموو هۆیەك دروستە» بڕۆین. ئامانجی بەرز و پیرۆز ئەبێ بەهۆی پیرۆزەوە بێت. ئەگەر زەخیرەی‌تر لە رێگای راست و دروستەوە دەستگیر نەبوو، ئەوا زەخیرەی بێ‌منەتی هەڵ‌کردن و خەم و نەفس بەرزی هەیە قنیاتی پێ بکرێ و تەفرە کەس تەفرەت نەدات.

یان لە لایەکی‌ترەوە ئەڵێت:

«تاك»ی رواوی ئاوی چ مەینەت زەدە بووە

پشکووتووە لە بەزمی مەی ئەمشەو هەر «انقباض»

واتە: داری مێوی ئەو شەرابەی کە من لە بەزمی ئەمشەودا ئەیخۆمەوە، ئاخۆ رواوی ئاوی دەستی چ کلۆڵ و ناشاد و مەینەت پێکراوێکە وا ئەم هەموو دڵتەنگی و سەغڵەتەم پێ ئەبەخشێ!

***

ئەمەبوو ئەو چەن سەرنجەی، بەکورتی، کە بە پێویستم زانی دەربارەی شیعرەکانی «مەحوی» بیگرم و پێشکەشی بکەم.

لەئەنجاما، لەوانەیە بەجێ بێ، ئەگەر بڵێم دیوانی «مەحوی» بۆ یەکەمجار لەلایەن شاعیری ناودار و بەڕێز مامۆستا «عەلی کەمال باپیر ئاغا»وە لە ساڵی ١٩٢٢ی زایینیدا لە چاپخانەی شارەوانی «حکوومەت» لە سلێمانی چاپ کراو بڵاوکرایەوە. لە ساڵەکانی ٩٦٠ و ٦١یشدا بۆ ماوەی چەند مانگێك شاعیری گەورەی کورد مامۆستا گۆران و مامۆستا شێخ موحەممەدی مەحوی کوڕەزای شاعیری ناوبراو و من خەریکی راستکردنەوە و شیکردنەوە و رێکخستنەوەی دیوانەکەی بووین، کە لەم رووەوە بەرهەمێکی دیاربووی هەنگاوە سەرکەوتووەکەمان بەدەستەوەیە. هەروەها زانای ناسراو مامۆستا مەلا «عبدالکریم مدرّس» و مامۆستا موحەممەدی مەلا «عبدالکریم» بۆ ماوەیەکی باش تەواو خۆیان ماندوو کرد و رەنج و تەقەلایەکی پیرۆزیان دا بۆ شی کردنەوە و لێدانەوەی شیعرەکان و رێکخستنەوەی دیوانەکەی بە شێوەیەکی تێر و تەسەل کە ئامادە کراوە بۆ چاپ.

***

هەندێ کەسی تریش وتاریان لەبارەی «مەحوی»یەوە لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا بڵاو کردووەتەوە. بەڵام لەبەر ئەوە کە ناوەڕۆکی وتارەکانیان لە سنووری ئەم ئەندازەیە دەرنەدەچوو کە ئێمە لێرەدا نووسیومانەتەوە، بە پێویستمان نەزانی دووبارە بڵاویان بکەینەوە و لەم ئاستەدا راوەستاین.

***

**لەبارەی مێژوویشەوە، مێژوونووسی کورد موحەممەد ئەمین زەکی چ لە کتێبی «خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان» و چ لە کتێبی «ناودارانی کورد» و چ لە کتێبی «تەئریخی سولەیمانی و وڵاتی»دا باسی مەحوی کردووە.(*) لەوانەیە کەسی تریش باسیان کردبێ و ئێمە ئاگامان لێ نەبێ.**

(*) بروانەرە: محمد امین زکی، «خلاصة تاریخ الکرد و کردستان من اقدم العصور التّأریخیّة حتّی الآن»، ترجمة محمّد علی عونی، القاهرة، ١٩٣٦، ص ٣٦٤ ـ ٣٦٥، هەروەها: «مشاهیر الکرد و کردستان فی الدّور الإسلامیّ»، ترجمة کریمته، الجزء الثانی، القاهرة ١٣٦٦، ١٩٤٧، ص ١٦٢ ـ ١٦٣، هەروەها: «تأریخ سلیمانی و ولاتی»، بغداد، ١٣٥٨، ١٩٣٩، ل ٢٣٠ ـ ٢٣١.

# پێڕستی پارچە شیعرەکانی دیوانی مەحوی

## ❑ پیتی «ئەلف»

(١) لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خودا........................ ٣٦
(٢) بۆ گوم‌بووانی چۆڵی مەحەببەتیەتی، خودا........................ ٣٨
(٣) بەجێ نایێ، دەبێ روو کەینە سارا،........................ ٤٠
(٤) «یار از وفا گذشت بر این کشتەی جفا»........................ ٤٣
(٥) ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ رەنگت لە گوڵ چبکا؟........................ ٤٦
(٦) تێ گەیوو شیوەنیە ئەمڕۆ، دا سبەی شایی بکا........................ ٤٨
(٧) مژدێکی چەندە خۆشە رەقیبی ملی شکا........................ ٥٢
(٨) گەردی رێی هەستاوە جێ داوا دەکا........................ ٥٥
(٩) وەك بولبول ئەو دڵە بە گوڵی روو کە روو دەکا،........................ ٥٧
(١٠) دەوری هەر چاوێکی ئەمڕۆ داوە سەد فەوجی بەڵا........................ ٦٠
(١١) دەم و زارێ تیا مابێتەوە رەنگاری ریق ئەمما،........................ ٦٢
(١٢) بوومە خاکی سەری رێی، پێیەکی تا پێما نا........................ ٦٥
(١٣) کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو رۆژە تۆ بڕوا........................ ٦٧
(١٤) کەی لەکن ئەحمەق دەبێ حاجەتی دانا رەوا؟!........................ ٦٩
(١٥) ئەی جەمالت نووری دیدەی ئەنبیا........................ ٧١
(١٦) کە ئەمری فەرمو ئەو شاهە بە (إقْرأ)........................ ٧٢

## ❑ پیتی «بێ»

(١) بۆ شەوی هیجر ئەو مەهە وەك ئافتاب........................ ٧٦
(٢) ماهی من رۆژێ لە روو لادا نیقاب........................ ٧٨
(٣) زلڵەی موعەللیم، ئەو گوڵی روومەتیە خستە تەب........................ ٧٩

(٤) بە یادی ئەو لەبە، ئەی شۆخی روومەت رۆژی مەهـ غەبغەب .............. ٨٢
(٥) کە تۆ غایب لە بەرچاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب .................... ٨٤
(٦) دەپرسی: بۆچی من دەرکەوتم و، دڵ بوو لە تۆ غایب؟.................. ٨٥

## ❑ پیتی «تێ»

(١) دڵ لەسەر خۆ چوونی پەیدەرپەی دەلیلی یارە هات.................... ٩٠
(٢) کەم بو وەك ئەو دەمە، سیدق ئەم دەمە هەم کەم بووە قات ................ ٩٥
(٣) خزر ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات.......................... ٩٨
(٤) خەلاسی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زوڵفی زنجیرت ......................... ١٠٠
(٥) جگر ز زخم تو معمور و دل ز غم شاد است)............................. ١٠٢
(٦) نەوەك هەر چاوی مەستە، خۆشی هەر مەست................................ ١٠٦
(٧) خەرامی ناز ئەگەر هێنایە لەنجە سەروی مەوزوونت........................ ١٠٧
(٨) بەدەم مەوجی خوێنی ئەشکەوەم، بڕوانە چۆنم بۆت ........................ ١٠٩
(٩) ئیتتیفاقی، ئافتاب ئانێ موقابیل بوو بە رووت .......................... ١١١
(١٠) دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجێکی یاقووت............................... ١١٣
(١١) دڵدۆزە تیری ئاهی فەقیرانی رووت و قووت................................ ١١٥
(١٢) خودا بیدا، لە هێلێکی دەدا، سەیری هەیە رێکەوت ........................ ١١٨
(١٣) وەکوو رۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەرکەوت .............................. ١٢٠
(١٤) بە کەس نابێ بتی من ئاشنا قەت........................................ ١٢٢

## ❑ پیتی «جیم»

(١) بۆ پارە حەیفە خۆ دەکەیە پوولی ناڕەواج............................... ١٢٦

## ❑ پیتی «چیم»

(١) تۆ نەبینن، نووری ئەم چاوانە بۆچ!.................................. ١٣٠
(٢) ئەم عەسرە عەسر و وەقتە لەبۆ فاجیرێ لە هیچ.......................... ١٣٣

### ❑ پیتی «حێ»

(١) ساقی، ئەی مایەی تەرەب لەب، پەرچەمت رەیحانی رووح ........ ١٣٦
(٢) کە تێغت دڵ دەکا دوو قەد، دەدا تەبشیری «قَدْ أَفْلَحْ» ........ ١٣٨

### ❑ پیتی «خێ»

(١) بە سورمە بۆیە دولبەر خەنجەری موژگانی دا پەرداخ ........ ١٤٢

### ❑ پیتی «دال»

(١) دڵی سووتا بە حاڵی زاری تیفلی دڵم و چاری کرد ........ ١٤٦
(٢) چ خەیاڵێکە لیقا بێ بەفەناچوونی جەسەد ........ ١٤٩

### ❑ پیتی «ڕێ»

(١) لە ئولکەی عیشقەدا بێ چوونە سەر دار ........ ١٥٤
(٢) ئەی ئەوکەسە کە مەستی غورووری بە هاتی کار! ........ ١٥٥
(٣) ئەگەر تۆ روو بە خاڵێکی لە «لەیلا» شۆخ و زێباتر، ........ ١٥٩
(٤) موحەققەق هەرکەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققیە مەنزوور ........ ١٦٢
(٥) ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا، تاقە رۆژێ گەر ........ ١٦٤

### ❑ پیتی «زێ»

(١) ئەو عیشوەبازە دەرحەقی من چارە گرژە باز ........ ١٩٨
(٢) تۆ نەبی مەلجەئی من بی، «أبَداً» نیمە مەلاز ........ ١٧٢
(٣) بۆتە موئنیس، بۆتە مەئوا، قەوم و شارێ ئەلعەیاز ........ ١٧٢
(٤) بە داوە وەعزی و، خۆشی بە تاوە یاحافیز! ........ ١٧٤

### ❑ پیتی «ژێ»

(١) رووتی دی، لەو رۆژەوە، گەر رۆژە سەرگەردانە رۆژ ........ ١٧٨
(٢) پرسرا حاڵم، کە من کەوتم لەبەر پێیا درێژ ........ ١٨٣

❑ **پیتی «سین»**

(١) بپرسە حالْم، ئیهمالی وەفا بەس ........................ ١٨٦
(٢) چبكەم، نە ئەو كەسەم كە كەسم بێ لەلا بەكەس........................ ١٨٧
(٣) بێ میهر و بێ مرووەتیی تۆ هەر عەلەلخوسووس ........................ ١٩٠
(٤) زەمزەم چیە، بە زەمزەمەی ئایات و سەد حەدیس........................ ١٩٢

❑ **پیتی «شین»**

(١) بەس بكە، ئەی ئەشكی خوێنینم، بە غەممازی تەلاش........................ ١٩٦
(٢) لەمن من ئەسڵی نیە و نەبووە عەیشی تەنها خۆش........................ ١٩٧

❑ **پیتی «ضاد»**

(١) واعیز لە رەندی مەیكەدە دەگرێ كە «اعتراض»........................ ٢٠٢

❑ **پیتی «عەین»**

(١) شەتێ ئاوی كە زاهید بۆ وزوویەك كردووە زایع ........................ ٢٠٦
(٢) كەلامێكە لە حیكمەت كەیل و جامیع:........................ ٢٠٧

❑ **پیتی «غەین»**

(١) دۆزەخ لە عیشقە خاڵی و جەننەت لە دەرد و داغ ........................ ٢١٢

❑ **پیتی «فێ»**

(١) لالغاوەی واعیز ئەمڕۆ مەوج ئەدا، دەم پڕ لە كەف ........................ ٢١٦

❑ **پیتی «قاف»**

(١) ئەو دەمە رۆحم لەسەر لەب بوو لەبەر دەردی فیراق........................ ٢٢٠
(٢) ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلووق........................ ٢٢١
(٣) وەك بلبل ئەی تۆ تازە گوڵم، پڕ بە دڵمە شەوق........................ ٢٢٤

### ❑ پیتی «کاف»

(١) چخاکێ کەم بە سەرما، مامەوە تاك ........ ٢٢٨
(٢) مەئلووفە زەوقی زاهید ئەوەندە بە تامی نیسك ........ ٢٣٠
(٣) زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە تیرۆك ........ ٢٣٢
(٤) ئەو سەروی نازە تەوسەنی هێنایە تاز و تەك ........ ٢٣٤
(٥) ئاشتی تۆ، تۆری من، بۆ بێسەباتی هەردو یەك ........ ٢٣٥

### ❑ پیتی «گاف»

(١) وتی: بۆچی وەها بێتین و بێڕەنگ؟ ........ ٢٤٠

### ❑ پیتی «لام»

(١) کە شێخ و واعیز و سۆفی بە جەننەت بەنگەد و گیباڵ ........ ٢٤٤
(٢) شنەی بادی بەهاری هاتەوە، خۆشی لە تۆ بولبول! ........ ٢٤٧
(٣) پەروانەیەك بە بلبلی وا وت کە «بوالفُضول» ........ ٢٤٨
(٤) حەیاتم سەرفی عیشقت کرد بە ئومێدی «فَمَنْ یَعمَلْ» ........ ٢٥١

### ❑ پیتی «میم»

(١) ناڵەم لە سینە، هەم لە دڵم دەرد و غەم حەرام ........ ٢٥٤
(٢) بڕوانە سووتنم، وەرە، بڕوا کە من نەمام ........ ٢٥٦
(٣) بنازم من بە کوفری زوڵفی تۆ ئەی ئافەتی ئیسلام ........ ٢٥٨
(٤) دیارم دەیری عیشقە، جێ بە سووتن بێ لەوێ دەگرم ........ ٢٦٠
(٥) لە ناکەس کاریبا، خاکم بە سەر، رۆیی بە با عومرم ........ ٢٦٢
(٦) ئەوی دڵدار و دولبەرمە ئەوا دەڕوا لە بەرچاوم ........ ٢٦٥
(٧) بە پیر ئەو ماهەوە چووم و بە سەر چووم ........ ٢٦٧
(٨) لە باسی مەینەت و دەردی دەروونی بۆیە دەم نادەم ........ ٢٦٩
(٩) ئەسیر و سەیدی قەیدی کەید و شەیدی نەفسی ئەممارەم ........ ٢٧١
(١٠) بە نووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم، چبکەم! ........ ٢٧٣

(١١) ببینیٚ، یا نەبینیٚ، من داد و بێدادیٚ دەکەم ........................ ٢٧٦
(١٢) تەرەب کەن، شوکر زۆری هێناوە غەم........................ ٢٧٨
(١٣) غونچە دڵ بوونم لە حەسرەت لێوی تۆیە، غونچە دەم!................ ٢٨٠

## ❑ پیتی «نوون»

(١) وەك گوڵ هەموو دەمە دەرەوەم سەربەسەر زوبان ........................ ٢٨٢
(٢) بەهاری عومر ئەواگەییە حوزەیران ........................ ٢٨٣
(٣) هەموو عالەمتە پابەند و لە داماں ........................ ٢٨٤
(٤) نیسبەت بدریٚ حوور و پەری گەر بە لە تۆ چوون ........................ ٢٨٦
(٥) شەخسێکی ساحێب ئەحواڵ پرسی: کە ئەی ئەفلاتوون!................ ٢٨٨
(٦) لە مەیخانە، خودا! گەر ئێمە دەرچین ........................ ٢٩١
(٧) خوداکەی! بەس کە بۆ دنیا ئەمەندە ئاین و ئۆیین........................ ٢٩٢

## ❑ پیتی «واو»

(١) دنیا تیاترۆیە، مەوەستە تیا بڕۆ........................ ٢٩٦
(٢) لەپڕ بەردی ئەجەل بۆ شیشەی عومرم نەوا بیٚ زوو ........................ ٢٩٨
(٣) شەو کەسیٚ پرسی لە خۆ دەرخستنی پەروانە شەو ........................ ٢٩٩
(٤) کەلێوی خوێنمی نۆشی، شەوی خەت گرتی دەوری ئەو........................ ٣٠٣
(٥) لە دنیادا دڵ ئارامێك و ئارامی دڵێکم بوو........................ ٣٠٥

## ❑ پیتی «هیٚ»

(١) لە چاوی بەد خودا حیفزی بکا ئەو شۆخە سەرمەستە ........................ ٣٠٨
(٢) کە دیم ئاڵۆزە چاوی، زوو وتم: ئەم فیتنە هەڵبەستە ........................ ٣٠٩
(٣) لە ڕێگەی مەهلەکەی عیشق ئەر بەلاٚجۆ نی، برا، لادە........................ ٣١١
(٤) عەجیبم دیٚ لە عەقڵی ئەو کەسە وا تیٚ دەگا مەردە ........................ ٣١٣
(٥) دیدە عەینی جارییە، دڵ پڕ لە ناری مووقەدە........................ ٣١٦
(٦) «حَقّاً» لە ڕەقیب ئەو بەر و دەرگانە حەرامە........................ ٣١٨

(٧) بە ئەفسوون و دوعا تەسخیری ئەو شۆخە چ ئیمکانە ........ ٣٢٠
(٨) شمشادە ئەمە، یا قەدە، یا سەروی رەوانە ........ ٣٢٣
(٩) لە رۆژێ هەڵدرا ئەم کۆنە خەیمەی تان و پۆ شینە ........ ٣٢٤
(١٠) لە سەیری خەستەخانەی عیشق ئەوی سەوزەی کەوا شینە........ ٣٢٦
(١١) غائیب لە دیدە، چاوی سەرم، دڵمە پێتەوە!........ ٣٢٨
(١٢) دەوای ئەم نەفسە مەلعوونەت دەوێ، هەر دەردە وەك جیوە ........ ٣٣٠
(١٣) کە بێ لێوی لەسەر لێوم بنێ، رۆحم لەسەر لێوە ........ ٣٣٣
(١٤) سەر کە جۆشێکی نەبێ، من زرکە تاڵم بۆ چیە!........ ٣٣٤

## ❑ پیتی «یێ»

(١) نەڵێ مەردم کە دنیا پشتی لەو، ئەو روو لە دنیا بێ ........ ٣٤٠
(٢) دڵم دەرهات و تۆ هەر دەرنەهاتی! ........ ٣٤٢
(٣) لەتاو ئەعدا عەدوو بەر نیوە دوژمن ئیلتیجا باریێ........ ٣٤٤
(٤) سەروی رەوانە قامەتی لاوی رەواندزی ........ ٣٤٥
(٥) بە نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نێشێ ........ ٣٤٧
(٦) حەقی بوو دڵ لەکۆیا ما بە سینەی ئێمە نارازی ........ ٣٤٩
(٧) پیری نوفووزی کردە بەدەن، بەسیە تەنبەڵی........ ٣٥١
(٨) «لا عاشَ سِوى ذكرِكَ قَلْبي و لِساني» ........ ٣٥٣
(٩) دەبێ دڵ ویسعەتێکی وەك فەلەك زیاتر وەکەف بێنێ ........ ٣٥٤
(١٠) لە سایەی دەوری چەرخی سوفلە پەروەر لەك بە لەك دەدوێ........ ٣٥٦
(١١) دڵی بردم بە شۆخی دولبەرێکی تازە، سەرلەنوێ........ ٣٥٩
(١٢) تێدەگا هەرکەس بکا فەهمی روموزی مەعنەوی........ ٣٦٠
(١٣) گوم کە بوو راهی هودا، شاهرەهە گومڕاهی ........ ٣٦٣
(١٤) دڵفریبی دڵبەری دڵدار، هەی!........ ٣٦٥
(١٥) خەتتی دەوری لێوی ئاڵت ئەی مەسیحا لام و بێ ........ ٣٦٦
چوار خشتەکییەکان........ ٣٦٩
تاکەکان........ ٤٠٤

❑ عقد العقائد

مەسئولمە ئیعانە لە وەهھابی موستەعان........................ ۴۱۲

❑ ستایشی خودا

(سُبحانَ) ئەو خودایە کە عەقڵی پەیەمبەران........................ ۴۵۰

❑ پاڕانەوە لە خودا

خودایا! ئیرادەی موناجاتمە........................ ۴۵۷

❑ قەسیدەی بەحری نوور

(وَ صَلَی اللّٰه عَلی) ئەو بەحری نووری علیم و عیرفانە........................ ۴۶۲

❑ ستایشی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

دڵم ئەمشەو نەخۆشی نیسبەتی چاوێکی بیمارە........................ ۵۰۲

## القسم العربی

(١) سامِعُ عَزْلِهِ عَلَيْهِمُ اعْتَرَضْ........................ ۵۰۹

## قسمت فارسی

❑ (ا)

(١) ای خندە، ز زیر لب جانانە بیرون آ........................ ٥١٤

(٢) بە عشق از ماسویٰ خالی نمودم سینەی خود را........................ ٥١٥

(٣) کرد او گذر بخاك من خفتنە در بلا........................ ٥١٥

(٤) ای شکوە باغ حسن از سرو موزون شما........................ ٥١٦

(٥) ای صفای نور دلها پرتو روی شما........................ ٥١٧

(٦) ألا یا أیها الساقی أدر کأسا و ناولها........................ ٥١٨

(۷) نه ثناخوان تو منم تنها ........ ۵۱۸
(۸) بر سر این مرده ای روح حیات‌افزا بیا ........ ۵۱۹

## ❑ (ب)

(۱) تا برغم من گشودی بر رخ احباب باب ........ ۵۲۰
(۲) چو شمع از آتش دل باشدم تابی بسر امشب ........ ۵۲۱
(۳) زما سرگشتگان شوق گم شد کعبه‌ی مطلب ........ ۵۲۱
(٤) نقاب از چهره بردار ای جبینت ماه شهر آشوب ........ ۵۲۲

## ❑ (ت)

(۱) دلم ز روز ازل طالب ستم شده است ........ ۵۲۳
(۲) بر سینه عاشق اثر کینه حرام است ........ ۵۲۳
(۳) ای دل مگو رقیب بر احوال من گریست ........ ۵۲٤
(٤) هرکه پر زد سوی بود آمد به دنیا مرد و رفت ........ ۵۲۵
(۵) در شهر نتابد ز جبینی مه الفت ........ ۵۲٦

## ❑ (ث)

(۱) آه کز طور تو بس آه کشیدیم عبث ........ ۵۲۷

## ❑ (ج)

(۱) ز مار گیسوت دیدم چها رنج ........ ۵۲۸
(۲) به تعظیم جمالت کج کلاهانند گردن کج ........ ۵۲۹

## ❑ (چ)

(۱) حذر زدام بلا کن، به زلف یار مپیچ ........ ۵۲۹
(۲) هیچ است میان و دهن دلبر ما هیچ ........ ۵۳۰
(۳) باز از من شدی آزرده، ز من دیدی هیچ ........ ۵۳۱

❑ (ح)

(١) زان لب خوش آیدم سخن را به وگر قبیح ........................ ٥٣١

❑ (خ)

(١) به ماهی ماه من بردار یك ساعت نقاب از رخ ........................ ٥٣٢

❑ (د)

(١) به آه و دادکردن دادم آخر رخت خود برباد ........................ ٥٣٣
(٢) خانەی عاشق‌نوازیها پیش آباد باد ........................ ٥٣٣
(٣) از فغان خویشتن، شب بلبلم آمد بیاد ........................ ٥٣٤
(٤) دیده از بس نابجایی دیدنم آمد بدرد ........................ ٥٣٥
(٥) برون شد یار ما از بزم و شمع از انجمن گم شد ........................ ٥٣٦
(٦) به بالین دل از روی تفقد ........................ ٥٣٦
(٧) نگار امشب سوی خونین‌دلان دغدار آمد ........................ ٥٣٧
(٨) گلرخان از جلوەی ناز آتشی افروختند ........................ ٥٣٨
(٩) روحانیان اگر گل کوی تو بو کنند ........................ ٥٣٨
(١٠) گر همه تلخی و زهر و کین بود ........................ ٥٣٩
(١١) چو من بلبل گلی را چون تو رنگین جلوه می‌شاید ........................ ٥٤٠

❑ (ذ)

(١) آن بلای دین و دل شد جلوه‌گر باز، ألعیاذ ........................ ٥٤١

❑ (ر)

(١) سبزەی نورستەی گلزار حسن انکارگر ........................ ٥٤١
(٢) به جانم آتشی افگند و رفت آن بت، جفا بنگر ........................ ٥٤٢

❑ (ز)

(١) رحم بر عاشق دل خسته نیازی هرگز ........................ ٥٤٣

❑ (س)
(١) نپرسد حال زارم را نه اغیار و نه یارم کس ........................ ٥٤٤

❑ (ش)
(١) ز سرخ و زردها شد اشك وین رخسار ما را بخش........................ ٥٤٤

❑ (ص)
(١) دلم زدام زلف دلگیرت نمی‌خواهد خلاص ........................ ٥٤٥

❑ (ض)
(١) ای سوخته جگر پی دنیا تو آب محض ........................ ٥٤٦
(٢) آهم بعکس اشك به اشکم شده نقیض........................ ٥٤٧

❑ (ط)
(١) بر مهر چهره‌ی مه من چون دمید خط........................ ٥٤٧

❑ (ظ)
(١) دلم بگرفت از گفتار پر بی‌مایه‌ی واعظ ........................ ٥٤٨

❑ (ع)
(١) از لعل تو هرکس به مسیحا شده قانع ........................ ٥٤٩

❑ (غ)
(١) از دل گم گشته از من من نمی‌یابم سراغ ........................ ٥٤٩
(٢) از خراب عشق درد اصلا نمیداری دریغ........................ ٥٥٠

❑ (ف)
(١) رحم بر بنده بیچاره نیاوردی حیف........................ ٥٥١

❑ (ق)

(١) کس چه داند از چه شد دریا در آب دیده عرق ........................ ٥٥٢

❑ (ك)

(١) دانی که روز هجر تو چون است هولناك ........................ ٥٥٢

❑ (گ)

(١) صبا بویی برد زان روی گل رنگ ........................ ٥٥٤
(٢) پیام عشق چون خوانند بر سنگ ........................ ٥٥٤

❑ (ل)

(١) گشتم به یاد موی میانت ز ناله نال ........................ ٥٥٥

❑ (م)

(١) با صد قصور باز بدربارت آمدم ........................ ٥٥٦
(٢) خاك ره گشته شدم بلکه بپایی برسم ........................ ٥٥٧
(٣) می می‌چکد از لعل لبت گاه تبسم ........................ ٥٥٨
(٤) چون نیم پروانه بلبل‌وار آهی می‌کنم ........................ ٥٥٨
(٥) ندهد چو رحم، بر در و دیوار بگریم ........................ ٥٥٩

❑ (ن)

(١) نقاب از رخ برافگن، محشری از جلوه برپا کن ........................ ٥٦١
(٢) کس نشد در عشق، گفتم این چنین شیدا که من ........................ ٥٦١
(٣) در فنون ترکتازی، ترك ما ماهر چنین ........................ ٥٦٢

❑ (و)

(١) به من روزی نماید سرو سیم اندام مهرو رو ........................ ٥٦٣

### ❑ (ه)

(١) چ شد خیمه زد دود آهم به چرخ ........................ ٥٦٤
(٢) از دور بر جنازه‌ام افگن یکی نگاه ........................ ٥٦٥
(٣) به عالم گر نمودی ناروا خود را «لوجه الله» ........................ ٥٦٦
(٤) کتانم داد و بیدادش به جایی کی رسد با مه ........................ ٥٦٦

### ❑ (ی)

(١) گم شود نامت شنیدستم که نام پاك من ........................ ٥٦٧
(٢) کس نمی‌پرسد ز لاله داغدار کیستی ........................ ٥٦٧
(٣) محبت یك قلم باشد نیاز و محنت و دردی ........................ ٥٦٨
(٤) نگارم تیغ ابرو داده آب از سرمه‌ی نازی ........................ ٥٦٩
(٥) خلیل از بت شکستن در نظر می‌داشت اشکالی ........................ ٥٧٠
(٦) دهن نمای شرفیاب گوهر افشانی ........................ ٥٧٠

تقریظ شرح مثنوی تألیف والی عابدین ........................ ٥٧١
قطعه‌ها ........................ ٥٧٣
تخمیس دو بیت مثنوی ........................ ٥٧٩
تخمیس دو بیت سعدی شیرازی ........................ ٥٧٩
فردها ........................ ٥٨٠

# THE COLLECTION OF MAHWEE´S POETRY
# «MALA MUHAMMAD I MALA UTHMAN I BALKHI»

COLLATED AND EXPLAINED

BY

MALA ABDULKAREEM I MUDARRIS

AND

MUHAMMAD I MALA KAREEM